## پێشەکی

ژۆزێ ساراماگۆ رۆژی ١٦ی نوامبری ساڵی ١٩٢٢، لە کوێرەدێیەکیناوچەی "لیسبۆن"ی وڵاتی "پۆرتەغاڵ" لە دایک دەبێ. یەکەم جریوەیزاقوزووقی ساوای تازەزاو، ماڵێکی رەقورووت و نەدار ونەخوێندەوار دەتەنێتەوە. گەردوون باری نالەباری ژیانی بەو بارەدادەخا و خۆی گوتەنی: «من لە نێو هەژاریدا لە دایک بووم، باوکم تەنیادەیتوانی ناوی خۆی و هێندێشتی تر بنووسێ، دایکم هەر پیتێکینەخوێندبوو؛ تەنانەت زۆربەی خزمەکانیشم نەخوێندەوار بوون، من بۆئەوە لە دایک نەبووم کە بگەمە ئێستا، بەڵام ئەوە رووی دا.»

ئەوەی راستی بێ ساراماگۆ هەتا سەروبەندی تەمەنی شێست ساڵیبە شێوەیەکی راستەوخۆ و شێلگیر لە بواری ئەدەبیدا هەوڵی نەداوە یاخۆ دەتوانین بڵێین سەرکەوتنێکی ئەوتۆی وەدەس نەهێناوە. بەڵام لەوبیست ساڵەی دواییدا نۆ خەڵاتی بەرچاوی جیهانی و ناوخۆی وڵاتەکەیوەرگرتووە و گرینگترین بەرهەمەکانی بریتین لە: باڵتازار و بلیموندا،ساڵی مردنی ریکاردۆ ریس، ئینجیل بە گوێرەی گێڕانەوەی عیسایمەسیح، لۆتکەی بەردین، مێژووی گەمارۆی لیسبۆن، کوێری و هەمووناوەکان.

ساراماگۆ ئەو دارە پڕ بەر و سێبەرەی بە پیری لک و تووڵەی نوێیدەرکرد و سەرەنجام بازی لە سەر نیشت، هەر ئەوئادەمیزادەخوێنشیرینە زمان تاڵەیە کە بە وردبوونەوە لە هەبوون رەشبینە و لایوایە جیهان دیلی دەستی تاقمێکی تایبەتی چەوسێنەرە و رزگار بوونیئەستەمە. بەڵام دیسانیش هەر ناهومێد نیە و بڕوای بە هێزیکەڵەکەکراوی جەماوەرە بۆ گۆڕینی بەستێنی رووباری ژیان بەرەوهەرێمی مرۆڤایەتی. خۆشەویستی و تێکۆشانی لە بنە نەهاتووی بیریئینسان گرفتاری ئەوینی خۆ دۆزینەوە دەکا و دەڵێ: «هەموو مرۆڤێک بەدوای خودی خۆیدا دەگەڕێو هەر کەس بە شێوەیەک و بە گوێرەیدەسەڵاتی خۆی ئەو رەوگەیە دیاری دەکا...»

ساراماگۆ لە چاوپێکەوتنێکا کوتوویەتی کە ساڵی ١٩٩١ بۆ ماوەیەککوێرایی داهاتووە و هەر ئەو رووداوە بۆتە هەوێنی نووسینی رۆمانی بەهێز و پێزی کوێری و تەنیا سێساڵ پاش بڵاوکرانەوەی توانی خەڵاتینۆبێلی ١٩٩٨ی پێوەربگرێ. بەپێی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان پاشئەو درەوشانەوەیە، رۆمانی کوێری کەوتە ریزی پڕفرۆشترینکتێبەکانی دنیا و لە ماوەیەکی کورتا بە سەدان لێکدانەوە و توێژینەوەیلە سەر کرا و ئێستاش هەر وا بەردەوامە.

کوێری رۆمانێکی ئەخلاقیی پێشکەوتوویە کە دەکەوێتە نێو بازنەیپۆستمۆدێرنیزم. نەقڵ و نەزیلەی پێشینیان و خەیاڵی قوژبنپشکن وزمانی تەوساوی ساراماگۆ ئەو هەلە بۆ مرۆڤ

دەرەخسێنێکە جارێکی‌دیکە بیر لە هەبوونی خۆی بکاتەوە و بە دۆسییەی کردەوەکانیدا بێتەوە.نووسەر تەنیا بە هەڵدانەوەی سووچی پەردەیەک لەسەر ژیانی‌ئادەمیزاد، کە ئەویش روانین و نەدیتنە بەرزترین شوێنەوار لە بابەت‌ژینی لە گرێژنە ترازاوەوە دەخولقێنێو دەوری هەر کەسێک بە پێی پلە وپایەی کۆمەڵایەتی و شێوەی بیر کردنەوەی روون دەکاتەوە. ئەو پەتالەنەکاوەی دەبێتە تەوەرەی سەرەکی رۆمانەکە، دەردێکی شاراوەیە کەئینسان بە خۆ فریو دان دەیخاتە پشت گوێ، بەڵام بە لە قاو دانی‌ساراماگۆ هیچ کەس ناتوانێدەرباز بێ. ئەو کوێرییە کارەساتێکی‌دەروونییە و تایبەت نیە بە هیچ گەل و نەتەوە و وڵاتێک و سنووری‌سەردەمی بۆ دیاری نەکراوە و ناکرێ.

خوێندنەوەی ئەو کتێبە کە تا ئێستا بە ٢٦ زمانی زیندووی دنیاوەرگێردراوە رەنگە لە پێشدا زۆر لە شانان خۆش نەبێ، بەڵام ئاشنابوون لەگەڵ شێوە نووسینی ساراماگۆ هاسانە و پاش خوێندنەوەی‌چەند لاپەرەیەک مرۆڤ لێی رادێ. ئەگەرچی نووسەر بۆ رازاندنەوەی‌رستە دوور و درێژەکانی تەنیا نوختە و دابڕ دێنێتە کایەوە و پەیرەوی لەخاڵبەندی باوی ئەدەبیی ناکا، بەڵام دیسانیش تەنگ و چەڵەمەیەک وەبەرچاو نایا. زمانی پوخت و پاراوی رکەی زەمان ناناسێو لە هەر جێیەک‌پێی خۆش بووبێئێستا و رابردووی لە پەنا یەکتر رۆناوە و جێگۆڕکێی‌بە یەکەم کەس و سێهەم کەس کردووە و بە زیرەکی ئاوڕی لێ‌نەداونەوەو بۆ خوێنەرەوەی بە جێهێشتوون. جا رەنگە لە دڵی خۆیدا گوتبێتی‌قەی ناکا، خۆ کوێرایی مەیلەو سپی رۆژ هەموو لایەکی داگرتووە وکەس نیە ببینێو وەدەنگ بێ!

ئەوەی راستی بێ ئەو رۆمانە لە ساڵی ١٩٩٩ دا لە لایەن بەڕێزان‌ئەسەدوڵڵا ئەمرایی، مینوو موشیری و مێهدی غەبرایی‌یەوە کراوەتە فارسی و سەرەڕای بوونی جیاوازیی لە شێوازی وەرگێڕاندا، دەتوانم‌بڵێم هەر سێکیان لێی حاڵی بوون و توانیویانە کاکڵی مەبەست و ئامانجی‌ساراماگۆ بخەنە روو، بەڵام دیارە پاش هەڵسەنگاندن و لە بەر یەک‌رۆنانی هەرسێک دەقە فارسییەکە، وەرگێڕانەکەی رێزدار غەبرایی، کەپاش دووەکەی دیکە چاپ کراوە زیاتر بە دڵمەوە نووسا، هەڵبەت‌نایشارمەوە کە لە هێندێک شوێنان یارمەتیم لە دوو دەقەکەی دیکەش‌وەرگرتووە. ئاشکرایە بەو ئاکامە گەیشتم کە پتر خۆی پێوە ماندووکردووە و زۆری خۆ بە دەروەست زانیوە کە شێوەی دارشتی نووسەرنەگۆڕێو هەتا ئەو جێیەی بووزی خواردووە لێی دەرناویشتووە.

دەزانم خۆم لە قەرەی کارێکی زۆر دژوار داوە. دەزانم کەوتوومەنێو بازنـەی ئـەزموونێکی گەورە، بەڵام حەقیقەت ئەوەیە، ئەو مەبەستەمهەر لە بەر چاویش نەبووە. پاکانە بۆ گرێو گۆڵـی قەڵەمم ناکەم، با ئەوهەر لە جێی خۆی بێ، زانستی ئەدەبیی چۆنی مەزەندە کرد پێی رازیم.بـەو کارە ویستوومە هەنگاوێک زیاتر لـە مرۆڤـایەتی نیزیـک ببینـەوە وکـەمتر چاومـان بـە کـوێری هەڵێنین.

سەلاحەددین ئاشتی

بۆ نووسینی ئەو پێشەکییە سرنجم داوەتە ئەو سەرچاوانەی خوارەوە:


١ - ساراماگۆ، ژۆزێ، کوێری، وەرگێڕاوی ئەسەدوڵلاٌ ئـەمرایی، چـاپی سـێهەم، **١٣٧٩**ی هەتاوی، ئینتشاراتی مروارید، تاران.

٢ - سـاراماگۆ، ژۆزێ، کـوێری، وەرگێـڕاوی مینـوو موشـیری، چـاپی پێنجـەم، **١٣٧٩**ی هەتاوی، نەشری عەلەم، تاران.

٣ - سـاراماگۆ، ژۆزێ، کـوێری، وەرگێـڕاوی مێهـدی غـەبرایی، چـاپی یەکـەم، **١٣٧٩**ی هەتاوی، نەشری مەرکەز، تاران.

٤ - گۆڤـاری رۆشـنبیریی کـاروان، ژومـارە ١٣٢، ساڵـی **١٩٩٩**، سـەر بـە وەزارەتی رۆشنبیریی حکوومەتی کوردستان.

٥ - گۆڤاری زانستیی، کۆمەلاٌیەتیی و فەرهەنگیی دونیای سوخەن، ژومارە **٨٣**، بەفرانبار و رێبەندانی **١٣٧٧**ی هەتاوی، تاران.

چرا زەرد بوو. دوو ئوتۆمبیلەکەی پێشەوە بەر لەوەی چرا سوور بێ تیژ تێپەڕین. ئینسانۆکەی سەوزەپۆش بۆ پیادەکان درەوشایەوە. ئەوخەڵکەی چاوەڕێ بوون کەوتنە ڕێ تاکوو بە سەر خەتەکانی سپیِ‌ڕاکشاوی بەرینایی شەقامدا رابرن، ئەگەرچی ئەم خەتانە بە هیچ بارێکداوەکوو کەرەکێوی ناچن، بەڵام لە نێو هێندێک زماناندا هاوناون. ئوتۆمبیلەکان لە سەر سنووری بزووتن وێستابوون، شۆفیرەکانچاوەڕێ بوون لەڕێوە پێیان لە سەر کلاج هەڵگرن، ئەوان چەشنی ڕەوکەئەسپی ڕەوەک کە لە ترسی شریخەی قەمچی هەراسیان لێهەڵگیرابێ لەجێوە دەهاژان. ئێستا ماوەی تێپەڕینی پیادەکان بڕاوەتەوە، بەڵام ئەوچرایەی ئیزنی بزووتنی ئوتۆمبیلەکان دەدا چەند پشوویەک درەنگتردەدرەوشێتەوە، هێندێک دەڵێن ئەو کورتیلە ماوەیەی بە ڕواڵەت زۆریهەست پێناکرێ، دەبێ لە هەزاران چرای ڕێنوێنی شار و ژمارەیجارەکانی ڕەنگ گۆڕانیان زەرب کرێت هەتا یەکێک لە هۆکارەسەرەکییەکانی تەنگاوتەنگ بوونی ڕێگاکان یا بە واتەیەکی باوتر،ڕێگیرانەکان دەرکەوێ.

ئاخرییەکەی چرا سەوز بوو، ئوتۆمبیلەکان خێرا کەوتنە ڕێ، بەڵامدوایە دەرکەوت کە هەمووشیان هێندە خۆش‌ئاژۆ نین. ئوتۆمبیلیپێشەوەی سەر خەتی نێرینەی شەقام نابزوێ، وێدەچێ تووشی گرفتێکبووبێ، داخوا پێدالی گاز شل بۆتەوە، دەندە ناچێتە جێوە، فەنەرێشکاوە، تورمیز دەبەریەک ڕاچووە، کارەبا دابڕاوە یان زۆر سادەئاخرین دڵۆپی بێنزین هەڵچۆڕاوە. ئەوە یەکەم جار نیە کە وەهارووداوێک دەقەومێ. پۆلێک مرۆڤی دیکە بۆ تێپەڕین لە ژێر کۆڵەکەی چراوێستاون و شۆفیری ئوتۆمبیلی چەقیو دەبینن کە لە پشتی شووشەیپێشەوەڕا دەستەکانی ڕادەوەشێنێ. ئوتۆمبیلەکانی پشتەوە یەکبینسیگناڵ لێدەدەن. چەند کەس لە ماشێنەکانیان دابەزیون هەتا پاڵیدەنبۆ کەنارێک و ڕێگا نەگیرێ، بە تووڕیی شووشەی ئوتۆمبیلەکە دەدەنەبەر مست، ئەو پیاوەی تێیدا دانیشتووە هەر جارەی سەری بۆ لایەکوەردەسووڕێنێ، وادیارە بە هاوار شتێ دەڵێ، لە جووڵانەوەی دمو لێویڕا وادیارە چەند وشەیەک چەندپات دەکاتەوە، نەک یەک وشەبەڵکوو سێ، چونکە دوای ئەوەی یەکێک هەر چۆنێک بوو دەرکەی کردەوە دەرکەوت کە دەڵێ من کوێر بووم. کێ

بـڕوا دەکـا. بـە تێـڕوانینێکی‌سـاکار دەکـرێ بڵـێی چاوەکـانی سـاخن، چونکـە ڕەشـکێنەکان روون‌دەدرەوشن، سپێنەکان سپی و چەشنی بەردەئاوێنەی لووس دێنە بـەرچاو. جووتـێ چـاوی بەمۆلەق وەستاو و روخسار و نێوچاوانی لەپڕ گرژو تاڵی ژیان دەژاکێنن. هەر کەس ئەو دیمەنە ببینێ دەزانێ لەبەرپەشێوی و نیگەرانی روحی هاتۆتە سەر لێوان. وەکوو ئـەوە دەچـێ هـەرچی لەبەر چاوی بووە لە ناکاو فڕیوەتە نێو مسـتی قووچـاوی وحەشـارگەی هەڵـگرتووە. دەتگـوت ئێستاش هەوڵی دەدا ئاخرین دیمەنی‌ڕەوەکی سوورایی بازنۆکەی چـرای ڕێنـوێن لـە بیرگەیـدا ڕاگرێ.

کاتێک یارمەتییان دا لە ئوتۆمبیلەکەی دابەزێ، دیسان ناهومێدانەگوتی من کوێر بووم، مـن کوێر بووم و ئەسرین ئەو چاوانەی دەیگوت‌نابینن پتر درەوشاندەوە. ژنێ گـوتی پێشـهاتە ئێتـر، دڵنیا بە تەواو دەبێ،بڕێ جار تەوژمی دەمارە وا دەکا. چرای ڕێنوێن دیسانیش ڕەنگـی گـۆڕی، چەنـد ڕێبـواری بـە پرسـیار ئاپۆرەیـان لـە دەوری دان وشـۆفیرەکانی پشـتەوە کـە ئاگایـان لـە ڕووداوەکە نەبوو، دەیانبۆلاند ودەیـانگوت خۆلێـک‌دانێکـی سـووک و ئـەو هـەمووە گێـرە و کێشەیە، باشە چقەوماوە، ئەوپەڕی چرایەکی پێشەوە شکاوە یان لەمپەرێک فیـزاوە. لـەدوورەوە هاواریان دەکـرد هـەواڵ بـدەن بـە پـۆلیس و ئـەو تەنگەشـکاوە لەسـەر ڕێـی خەڵـک لابـەرن. کوێرەپیاو پاڕایەوە یەکێک پیاوەتی بکـا وبمباتـەوە مـاڵ. ئـەو ژنـەی گوتبـووی هـی تـەوژمی دەمارە گوتی هەواڵبنێرن ئامبولانسێک بێـت و ئـەو پیـاوە چارەڕەشـە بەرێتـە نەخۆشـخانە،بەڵام کوێرەپیاو نەیدەسەلماند، پێویستی پێ نـەبوو، تـەنیا دەیویسـت‌یـەکێک ئـەو هـەتا بەردەرکـەی ماڵەکەی بەرێتەوە. هەر لەو نیزیکانەیە وچاکەیەکی گـەورەم لەگـەڵ دەکـەن. یـەکێک پرسـی باشە ئوتۆمبیلەکە چی بەسەر دێت. دەنگێکی تر گوتی ماشێنەکە سویچی لە سـەرە، ڕایـدەن بـۆ لای‌پیادەڕێ. سێهەم دەنگ خۆی تێهەڵقوتاند، پێویست ناکا، ئوتۆمبیلەکـە لەئەسـتۆی مـن، ئـەو پیاوەش دەگەیەنمەوە. دەنگەدەنگی ڕەزامەنـدی بـەرزبۆوە. کوێرەپیـاو هەسـتی کـرد یـەکێک قۆڵی گرتووە و هەر ئەو دەنگە دەڵێ‌وەرە، وەرە. بردیـان لـە سـەر سەندەڵـی تەنیشـتی شـۆفیر سواریان کرد وپشتێندەی پاراستنیان بۆ بەست. هێشتاش فرمێسکی هەڵـدەوەراند، لەبەرخۆیـەوە دەیگوت نابینم، نابینم. پیاوەکە پرسیاری کرد دەی بزانم ماڵت لەکوێیـە، گـەلێ روخسـاری بـە پرسیار لە پشت شووشەوە تێیانهەڵـدەڕوانین‌و دەیانویسـت پتـری لـێ‌بـزانن. کوێرەپیـاو دەسـتی بەرەو چاوەکانی بـرد وئامـاژەی کـرد کـە هـیچ نـابینم، دەڵـێی کەوتوومـە تەمـەوە یـا نـوقمی دەریای‌شیرم. ئەوی دیکە گوتی بەڵام خۆ کوێری ئاوا نیە، دەڵـێن کـوێری ڕەشـە. مـن هـەموو

شتێ بە سپی دەبینم، رەنگە ژنە راستی کردبێ، دەبێ ئیتەوژمی دەمار بێ، نەخۆشی دەمار بۆتە ملۆزمی گیانی ئێمە. ئەوەی بەمن دەڵێی، نەهامەتییە، بەڵێ، نەهامەتی، تکایە بفەرموو ماڵەکەت لە کوێیەو هەر لەو کاتەدا ماتۆڕی ئوتۆمبیلەکە هەڵکرا. کوێرەپیاو بە تورەتورنیشانی ماڵێی دایە، دەتگوت نابینایی بیری کول کردبوو، پاشان گوتیNازانم چۆنت سپاس بکەم و ئەوی تر وڵامی داوە دەی، دەی هەرلێی گەڕێ پێویست ناکا، ئەورۆ نۆرەی تۆیە، سۆزی نۆرەی من، کێ لەسبەی خۆی ئاگادارە. راست دەکەی، بەیانی کە لە ماڵ وەدەرکەوتم کێدەیزانی کە تووشی وەها بەڵایەک دێم. لەوەی کە دیسانەوە راوەستاونپتر ئاڵۆزا، پرسی بۆ راوەستاوی، ئەوی دیکە وڵامی داوە چرا سوورە،لەوەی بەولاوە ئیتر نەیدەزانی کەی چرا سوور دەبێ.

بە پێی کوتەی کوێرەپیاو ماڵەکەی نیزیک بوو. بەڵام پیادەڕێیەکان پڕبوون لە ماشێن و شوێنێک بۆ راوەستان بەدی نەدەکرا، بە ناچاری لەشەقامێکی لابڕدا بە دوای شوێنێکی بەتاڵدا گەڕان. چونکە پیادەڕێیەکانتەسک بوو و دەرکەی لای راست بستێک پتر نەدەکراوە، کوێرەپیاوە بۆئەوەی ناچار نەبێ بە کوێرەوەری خۆی بکێشێتە سەر سەندەڵی شۆفیرو لە دەندە و فەرمان نەگیرێ، بەر لە راگرتن دابەزی. لە نێوەڕاستیشەقام بە تەنیا مایەوە، هەستی کرد بەر پێی رۆدەچێ، بەڵام هەوڵی دا بەسەر ترسی خوێدا زاڵ بێ. بە نیگەرانییەوە دەستەکانی بە بەرچاویدا دێناو دەبرد، دەتگوت هەر لەو دەریا شیرەدا کە باسی کردبوو مەلە دەکا،دمی بۆ هاواری فریاخوازی داچەقاندبوو کە هەستی کرد دەستی ئەویدیکە بە هێمنی قۆڵی دەگرێ، ئارام بە، ئاگام لێتە. بە نەرمی دەڕۆیشتن،کوێرەپیاو کە دەترسا بکەوێ لاقی دەخشکاند، بەڵام هەر ئەمە بوو بەهۆی هەڵەنگووتنی، ئەوی دیکە لەسەرخۆ گوتی ئارام بە، لام وایەگەیشتینەوە. کە برێکی دیکە چوونە پێش پرسیاری کرد کەس لە ماڵە کەئاگاداریت لێ بکا، کوێرەپیاو بە نازانم وڵامی دایەوە، زۆربەی ئەو دەمانەخێزانم لە سەر کارە، منیش بە هەڵکەوت ئەورۆ زووتر دەستم لە کارکێشایەوە و ئەو بەڵایەم بە سەر هات. نیگەران مەبە، شتێکی گرینگ نیە،من کە هەرگیز نەمبیستووە مرۆڤ لە پڕ کوێر بێ. چاوت لە من بێ فیزملێدەدا کە چاویلکەش ناکەمە چاوم، دەی هەموومان فیز و هەوای والێدەدەین. گەیشتنە بەر دەرگای ئاپارتمانەکە، دوو ژنی جیرانیان بەروخسارێکی پرسیاراوی لە کابرای هاوسێ رامابوون کە یەکێک بن پیلیگرتووە و دەیهێنێتەوە، بە بیریاندا نەهات بپرسن داخوا شتێک چۆتەچاوتانەوە، نە ئەوان بە فکریاندا هات و نە پیاوەکە وڵامی داوە، بەڵێدەریایەک شیر. کە چوونە ژوورەوە کوێرەپیاو گوتی گەلێ گەلێ سپاس،ببوورە کە ئەو هەموویەم زەحمەت دای، ئێستا خۆم دەتوانم برۆم،پێویست

نیە داوای لێبووردن بکەی، لەگەڵت دێمە بان، بێتوو لێرەجێتھێڵم دڵم ناحەسێتەوە. بە زەحمەت سواری ئاسانسۆری بچووکبوون، لە نهۆمی چەندی، نهۆمی سێ، بەڕاستی زۆر خۆم بە ئەمەگداریتۆ دەزانم. ئەمەگداری ناوێ، ئەورۆ نۆرەی تۆیە، بەڵێ راستدەفەرمووی، رەنگە سبەی نۆرەی ئێوە بێت. ئاسانسۆر وێستا،هەردووک پێیان نایە رێڕەوەکە، دەخوازی دەرکەت بۆ بکەمەوە،سپاس، لاموایە خۆم بتوانم بیکەمەوە. دەستە کلیلێکی بچووکی لەگیرفانی هێنایەدەر، قامکی بە سەر ددانەی هەموویاندا کێشا و گوتیدەبێ ئەوەیان بێ و بە پەنجەی چەپی لە کونی قفڵ گەڕا و هەوڵی دادەرکە بکاتەوە. ئەوەیان نیە، ئیزن بدە بزانم، من یارمەتیت دەکەم. بەکلیلی سێهەم دەرکە کرایەوە. پاشان کوێرەپیاو بە دەنگێکی بەرز هاواریکرد کەس لەماڵە، وڵامێ نەبوو، درێژەی دا هەر وەک گوتم هێشتا خێزانمنەهاتۆتەوە، دەستی لێک ئاواڵە کرد و بە کوێرەکوێرە بە رێڕەوکەدارۆیشت، پاشان بە پارێزەوە گەڕایەوە و سەری بۆ لایەک وەرسووڕاندکە بە بڕوای خۆی کابرای دیکەی لێراوەستابوو، گوتی نازانم چۆنتسپاس بکەم، پیاوی خێرومەند گوتی ئەرکی خۆم بوو، پێویست بە سپاسناکا، پێت خۆشە یارمەتیت بکەم دانیشی و لە لات بمێنمەوە هەتا خێزانتدێتەوە. رادەی تامەزرۆیی پیاوەکە بۆ مانەوە لەپڕ کوێرەی خستەگومانەوە، دیار بوو پێی خۆش نیە غەوارەیەک لە ماڵیدا بێت، چووزانی کەشەیتان ناچێتە کەڵیشەی بۆ ئەوەی دەست و پێی کوێرەی بێدەسەلاتببەستێ و پەڕۆیەکی دە زاری ئاخنێ و پاشانیش دار و نەداری بەتالانبەرێ، گوتی پێویست ناکا، تکایە زەحمەت مەکێشە، من باشم. وێڕایئەوەی بە ئارامی دەرکەی دادەخست دووپاتی کردەوە پێویست ناکا،پێویست ناکا.

بە بیستنی دەنگی چوونەوە خواری ئاسانسۆر ئۆخژنێکی هاتەوەبەر. چۆنیەتی حاڵی خۆی فەرامۆش کرد و بە جووڵانەوەیەکی لە خۆوەسەرپۆشی چاویلکۆکەی سەر دەرگای لادا و بۆ دەرێی روانی. دەتگوتدیوارێکی سپی لەوبەری دەرگاوەیە. بازنەی چاویلکۆکەی بە بڕۆ هەستپێ دەکرد، مژۆڵی بە شووشەدا دەخشان، بەلام دەرێی نەدەدیت، سپیاییبێبوار هەموو شتێکی نوقم کردبوو. دەیزانی لە ماڵی خۆیەتی، بۆن وکەش و هەوا و بێدەنگی ماڵی بە لاوە ئاشنا بوو، بە دەستەکوتە ئامراز وکەلوپەلی دەناسینەوە، نەرم و هێدی دەستی بە سەردا دەکێشان، بەلامهەر لەو کاتەدا تەواوی ئەو شتانە رەنگی نامۆیان بەخۆوە گرتبوو، نەئەملا و ئەولا، نە سەر و خوار، نە ژێر و ژوور، هیچکام دەسپێک وبڕانەوەیان دیار نەبوو. ئەویش چەشنی زۆربەی خەڵک لە سەردەمیمناڵیدا جارجار لاسای کوێرانی دەکردەوە و دوای

ئەوەی چەندچرکەیەک چاوی دەقووچاند دەگەیشتە ئەو ئاکامە کە کوێری دەردێکی ئەستەمە، هەڵبەت ئەگەر مرۆڤی بەخت وەرگەڕاو بیرەوەری ڕەنگ وروخسار و بیچم و قەبارە و بارستایی شتەکانی تەواوێک لە بیرگەدابایە، یانی بێتوو زگماک کوێر نەبووبا دیسانیش شان وە بەردان وخۆڕاگری زیاتر دەبوو. تەنانەت بیری کردبۆوە کە تاریکایی ژیانی کوێرەکان مەبەستێ نیە جگە لە خەوتنی نوور و کوێری تەنیا ڕواڵەتی کەلوپەل و بوونەوەران دەشارێتەوە و لە پشت پەچەی ڕەشیاندا دەقیانناشکێنێ. ئێستا بە پێچەوانە وەها نوقمی سپیایەکی روون ببوو کە نەک تەنیا ڕەنگەکان، بەڵکوو خودی کەلوپەل و بوونەوەرانی ڕاکێش دەکردو قووتی دەدان و دووقات بزری دەکردن.

بەرەو هۆدەی دانیشتن بزووت، بەڵام ئەگەرچی بە دەستەکوتە وپارێزەوە هەنگاوی دەنا، دیسانیش تلاسکەی بەست و سەرەنگرێی دا ولە گوڵدانێکی هەڵنەگووت و ختی و شکاندی و وردوپردی کرد. وەهاگوڵدانێکی لە یاد نەبوو، ڕەنگە خێزانی وەختی چوونە سەر کار هەر والەوێی دانابێ هەتا شوێنێکی باشی بۆ وەدۆزێ. داهاتەوە هەتا بزانێ چقەلێکی لە داوێنی هەڵفڕیوە. ئاو بە تەرکی ترووسکەداری ژووریّوەرببوو. گوڵدانی شکاوی لە یاد بردەوە و هەوڵی دا گوڵەکان کۆ کاتەوە،تیزماڵکە شووشەیەکی تیژ و درێژ ئەنگوستی بڕی و لەبەر ژانی دەستیوەکوو منالی لیّقەوماو لە پڕمەی گریانی دا، لە نێوەڕاستی ماڵێدا کە بەداهاتنی شەو تاریک دەبوو، لە کوێرایی سپی خۆی چەقی بوو. گوڵ بەدەستەوە هەستی کرد قامکی خوێنی پێدا دێتە خوار، بە زەحمەت دەستیبۆ گیرفانی برد و دەسرۆکەیەکی دەرێنا و هەر چۆنێک بوو ئەنگوستیپێ بەست. پاشان بە کوێرەکوێرە و گۆدە گۆد بزووت و وریای ئەوە بووکە لاقی لە مافوورەکە نەگیرێ، بە دەوری مۆبڵ و کورسیاندا هات وگەیشتە لای ئەو کورسیلە نەرمەی کە لەگەڵ ژنەکەی لە سەریدادەنیشتن و چاویان لە تلەویزیۆن دەکرد. دانیشت و گوڵەکانی لە سەررانی دانا و زۆر بە وردی دەسرەکەی لە قامکی کردەوە. خوێنی پێوەرەق هەڵاتوو نیگەرانی کرد، بە خۆی گوت ڕەنگە هۆی نەدیتن بێ، برێلە خوێنی دەستی ببوو بە شیلەیەکی بێڕەنگ، ببوو بە شتێکی کەم و زۆرنامۆ و زیاتر وەک مەترسییەک دەچوو کە خۆی تووشی خۆی کردبێت. زۆر بە پارێزەوە بە دەستە ساخەکەی ئەو تیزماڵکە شووشەیەی چەشنینووکی کێردێکی بچووک تیژ بوو دۆزییەوە و بە نینۆکی قامکی گەورە وشادەی توانی تەواو دەریکێشێتەوە. دیسانیش دەسرەکەی لە دەوریقامکی هاڵاندەوە و توند بەستی هەتا خوێنی نەیە، شەکەت و وەڕەز پاڵیدایەوە. برێ دواتر بە هۆی یەکێک لەو حاڵەتانەی کە

لەش لە کاتێکی پڕناهومێدی و دڵەڕاوکەدا ئەرکی خۆی فەرامۆش دەکا و لەخۆ دەبێتەوە،جۆرێک ماندوویەتی بە سەریدا زاڵ بوو کە پتر وەک خەواڵوویی دەچووهەتا شەکەتی، لە حاڵێکا ئەگەر مێشک و دەماری تەنیا ملکەچی مەنتیقبووبان پێویست بوو لەم کاتەدا وریا و چالاک خۆ بنوێنن. لەڕێوە خەونیدیت کە لاسای کوێران دەکاتەوە، خەونی دیت کە چاوی دەقووچێنێ ودەیکاتەوە و هەموو جارێش وەکوو ئەوەی کە لە سەفەر گەڕابێتەوەتەواوی ئەو وێنە و ڕەنگانەی لە دنیادا بۆی ئاشنا بوون، بێ هیچئاڵوگۆڕێک چاوەڕێی بوون. سەرەڕای ئەوەش لەوبەری سنووری ئەمباوڕە دڵنیاییدەرە، دوودڵییەکی تەماوی و ئازاردەری هەست پێدەکرد،ڕەنگە ئەوە تەنیا خەون و تراویلکەیەک زیاتر نەبا، خەوێکی کە درەنگ وزوو کۆتایی پێدەهات، بێئەوەی بزانێ لەو کاتەدا چ ڕاستەقینەیەکبەرەو رووی دەبێتەوە. پاشان لە مەودای ئەو شەکەتییەدا کە تەنیا چەندچرکەیەکی خایاند وردە وردە رووی کردە قۆناخی وریا بوونەوە، زۆرورد و پتەو بیری کردەوە کە هەر وا مانەوە کارێکی ئاقلانە نیە، هەڵبەتئەگەر وتەیەکی وا لە وەها کاتێکا بەجێ بێ. بۆخۆی بە خۆی دەگوتهەستم، هەڵنەستم، هەستم هەڵنەستم، جاری وایە مرۆڤ دەبێ خۆ باوێتەنێو مەترسی، من لێرە چ دەکەم بەم چەپکە گوڵ و چاوەنووساوانەی کەدەڵێی دەترسم هەڵیانهێنم. بۆچی ئاوا خەوتووی، بۆچی ئەو گوڵانەت لەسەر رانت داناوە، ئەوە ژنەکەی بوو کە لێی دەپرسی.

چاوەڕێی وڵام نەمایەوە و بۆ ئەوەی گوڵدانە شکاوەکەی بە چاوداداتەوە کاتی کۆ کردنەوەی سواڵەتەکان و خاوێن کردنەوەی بەر پێیانتووڕەیی خۆی نیشان دا و هەر بۆڵەی هات، لە جیاتی ئەوەی خرپ لێیبنوویی خۆ دەتتوانی ئەو کارە جوانەت خاوێن کەیەوە. پیاوەکە هیچینەگوت، چاوەکانی لە ژێر پێلووی وێک نراودا حەشار دا، لە ناکاو بیرێکئۆخژنێکی بە دەروونیدا گێڕا، ئەگەر چاو هەڵێنم و ببینم چی، شەوق وئومێد تەواوی لەشی تەنییەوە. خێزانی لێی هاتە پێش، دەسرۆکەخوێناوییەکەی دیت و رقەکەی لەڕێوە نیشتەوە، هەی فەقیرە، بەدڵسۆزی پرسی چ بووە و برینپێچانە ناشیانەی کردەوە. لەو کاتەداپیاوەکە لە قووڵایی دڵییەوە دەیویست خێزانی کە لەبەر پێی چۆکی داداوەبینێ و پاشان دڵنیا لەوەی کە نایبینێ چاوی هەڵێنا، ژنەکەی بزەیەکیهاتێ و گوتی دەی ئاخری لە خەو هەستای، هەی خەو خەو. بێدەنگییەکبینی خواردەوە و پیاوەکە گوتی من کوێر بووم، نابینم. خێزانی تاقەتی بەسەرچوو. دەس هەڵگرە لەو گاڵتە نەفامانەیە، هێندێک مەبەست بۆ گاڵتەنابن.

چەندە پێم خۆش بوو گاڵتە بێ، بەڵام هەر بەڕاستی من کوێرم وهیچ نابینم. تکایە دەس هەڵگرە، مەمترسێنە، چاوم لێبکە، بڕوانە ئێرە،من لێرەم، چرا هەڵکراوە. دەزانم لێرەی گوێم لە دەنگت دەبێ، دەتوانمدەستت لێبدەم، دەتوانم وا بزانم چراکەت هەڵکردووە، بەڵام کوێرم. ژنەوەگریان کەوت، ئامێزی پێداکرد، راست نیە، دەی بڵێ وا نیە. گوڵەکانکەوتبوونە بەر پێیان، دەسرەکە خوێنی دەلاندبوو، پیاوەکە وەکووئەوەی بیهەوێ بە شێوەیەکی تر مەبەستی خۆی دەربڕێ گوتی، خۆ ئەوەهەر هیچ نیە، هەموو شتێکیش هەر بە سپی دەبینم و بزەیەکی تاڵی هاتەسەر لێو. ژنە لە پەنای دانیشت و لە باوەشی گرت و بە خۆیەوە کوشی،نێوچاوان و روومەت و چاوەکانی بە ئارامی رامووسی، خاترجەم بەچاک دەبییەوە، خۆ تۆ نەخۆش نەبووی، تا ئێستا نەمدیوە کەس لەخۆوەکوێر بێ، رەنگە، دەی بۆم بگێڕەوە بزانم چ بووە، تووشی چ هەستێکبووی، کەی، لە کوێ، نا ئێستا لێی گەڕێ، راوەستە، دەبێ لە پێشدا بچینەلای دوکتۆری چاوان، کەست پێشک دیت، نا بەداخەوە، خۆ ئێمەچاویلکە ناکەینە چاومانەوە، چۆنە بتبەمە نەخۆشخانە، بڕوا ناکەم لەئوورژانس کوێران وەرگرن، تۆ راست دەکەی، وا باشە لەڕێوە بچینەلای دوکتۆر، هەر ئێستا لە رووی رێنوێنی تەلەیفوون دوکتۆرێدەدۆزمەوە کە لەم نیزیکانە بێ، هەستا پێ، بەڵام دەستی لە پرسیارانهەڵنەگرت، چاوت فەرقێکی کردووە، پیاوەکە وڵامی داوە نەخیر، سرنجبدە، چرا دەکووژێنمەوە و بزانە چۆنە، ئێستا، هیچ، هیچ یانی چی، یانیهیچ، بێبڕانەوە سپیایی دەبینم، دەڵێی زەمان لە شەو بێ بەرییە.

گوێی لێبوو کە خێزانی خێرا خێرا پەڕەکانی رێنوێنی تەلەیفوونیهەڵدەدایەوە و دەیفینگاند و هەناسەی هەڵدەکێشا و ئاخرییەکەی گوتی،ئەوەیان خراپ نیە، خودا بکا دەرفەتی هەبێ، ژومارەیەکی گرت،پرسیاری کرد مەتەبە، دوکتۆر لەوێیە، دەکرێ قسەی لەگەڵ بکەم، نا، نا،دوکتۆر من ناناسێ، مەبەستەکە زۆر گرینگە، بەڵێ، تکا دەکەم، دەزانم،جا کە وایە با پێتان بڵێم، بەڵام تکا دەکەم تەواوی قسەکانم بۆ دوکتۆربگێڕەوە، راستییەکەی ئەوەیە کە مێردەکەم لەخۆوە کوێر بووە، بەڵێبەڵێ هەر لەخۆڕا، نا، لە نەخۆشەکانی دوکتۆر نیە، پیاوەکەم هەرگیزچاویلکەی نەکردۆتە چاوی، بەڵێ، بڕشتی چاوی زۆر باشە، هەر وەکووخۆم، منیش زۆر چاک دەبینم، ئەها، زۆر سپاس، بەچاوان چاوەڕێدەبم، بەڵێ دوکتۆر، هەر لەڕێوە، دەڵێ هەموو شتێ بە سپی دەبینم،نازانم چ رووی داوە، ماوە نەبوو لێی بپرسم، ئێستا گەیشتوومەوە ماڵ وئەوە وەزعەکەیە، پێت خۆشە لە خۆی بپرسم، ئێ، باشە زۆر سپاس

هەرئێستا دێین، هەر ئێستا. کوێرە هەستا پێ، راوەستە جارێ با قامکت تیمارکەم، ماوەیەک ون بوو، پاشان بە شووشەیەک ئاوی خاوێنی تایبەتی،شووشەیەک وێد و بڕێک لۆکە و تەنزیلەوە گەڕایەوە. کاتی برینپێچانپرسی ئوتۆمبیلەکەت لە کوێ راگرتووە و لە ناکاو رووبەرووی‌راوەستا، بەڵام خۆ تۆ ئاوا نەتتوانیوە ماشێن لێ بخوڕی، یان رەنگە لەماڵێ ئەو بەڵایەت بەسەر هاتبێ، نا لە شەقام وام بەسەرهات، لە پشت‌چرای سوور، یەکێک منی تا ماڵ هێنایەوە، ئوتۆمبیلەکە لەو شەقامەی‌ئەولایەمانە، زۆر باشە کە وایە بابڕۆینە خوار، تۆ لەبەر دەرگا راوەستەهەتا من بچم بیدۆزمەوە، سویچەکان کوان، نازانم، نەیدامەوە، کێ، ئەوکەسەی منی هێنایەوە ماڵ، پیاوێک بوو، داخوا لە کوێی داناوە، دەگەڕێم‌بزانم، لە خۆڕا مەگەڕێ، هەر نەهاتە ژوور، بەڵام خۆ دەبێ سویچەکان لەجێیەک بن، بێ‌شک لە یادی چووە و بردوونی، هەر ئەوەمان کەم بوو،سویچەکانی خۆت دەست دەیە، وەختی خۆی دەیدۆزینەوە، باشە بابڕۆین، دەستم بگرە، کوێرەپیاو گوتی ئەگەر قەرار وا بێ هەر ئاوا بم،باشتر وایە بمرم، تۆ خودا قسەی وا مەکە، هەر ئەو نەهامەتییەمان بەسە،منم کە کوێرم نەک تۆ، تۆ کە نازانی، دوکتۆر چاکت دەکاتەوە، خاترجەم‌بە، باشە.

رۆیشتن. لە خوارێ خێزانی چرای سەرسەرای هەڵکرد و بە سرتەپێی گوت لێرە چاوەڕێم بە، ئەگەر دەروجیران هاتن زۆر ئاسایی بە ولەگەڵیان بدوێ. بلێ چاوەڕێی منی، هەر کەس ئاوا بتبینێ وا دەزانێ‌ساخی، ئەوجار خۆ ناکرێ پرێسکەی دڵ بۆ هەموو کەس هەڵڕێژی،حاڵی بووم، بەڵام خێراکە. خێزانی بە پەلە رۆیی. هاوسێیەک هات‌وچۆی‌نەکرد. کوێرەپیاو بە ئەزموون دەیزانی هەتا وزەوزی کلیلی خۆکاری‌کارەبای بێتە گوێ سەرپلیکانەکان روونا‌کن، هەر بۆیە هەتا بێ‌دەنگی‌پەیدا دەبوو دەستی بۆ کلیلەکە دەبرد و گڵۆپەکەی هەڵدەکردەوە. نوور،نووری ئەو چرایە بۆی ببوو بە دەنگ. نەیدەزانی بۆچی خێزانی هێندەی‌پێ‌چووە، شەقامەکە سەت گەزێکیان لێ دوور بوو، بە خۆی گوت ئەگەردرەنگ بچین دوکتۆر دەڕواتەوە. بە بێ ئیختیار دەستی چەپی هەڵێنا وچاوی تێبڕی تا بزانی سەعات چەندە. دەتگوت لەبەر ژانی دەردێکی لەنەکاو لێوی هەڵقرچاند و شوکور بۆ خودا کە لەو کاتەدا جیرانێک دیارنەبوو، چونکە هەر کەسێک ئەحواڵی پرسیبا لە پرمەی گریانی دەدا. ئوتۆمبیلێک لە شەقام راوەستا، لە دڵی خۆیا گوتی ئاخرییەکەی هاتەوە،بەڵام بە دەنگی‌را زانی دەنگی ماشێنەکەی خۆی نیە، گوتی ماتۆڕی‌ئوتۆمبیلی دزێلە، بێ‌گومان تاکسییە و دیسانیش کلیلی گڵۆپەکەی‌لێ‌دایەوە. خێزانی ئاڵۆز و پەرێشان گەڕایەوە. ئەو پیاوە خێرۆمەندەی‌جەنابت، ئەو

کەسەی ماکەی پیاوچاکی و ئینساف بوو، ئوتۆمبیلەکەی‌بردووین، شتی وا نابێ، رەنگە باش نەگەڕابی، بێ‌گومان زۆر چاک‌گەڕام، خۆ چاوی من نوقسانی نەهێناوە، رستەی ئاخری هەر وا لەخۆوە لە زاری دەرپەڕی، پاشان تێی‌هەڵێناوە، چما نەتگوت ماشێنەکەلەو شەقامەی پەنا ماڵە خۆمانە، دەی با، لێی نیە، مەگین لە شەقامەکەی‌تری راگرتبێ، نا، نا، دڵنیام هەر لەو شەقامە بوو، دەی ئەگەر وا بێ غەیب‌بووە، کە وایە سویچەکان کوان، دەرفەتی لە پەشۆکاوی و پەرێشانی تۆهێناوە و ماشێنەکەی دزیوە، جا قەت ئەوە کارە، خۆم رێم نەدا بێتەژووری ماڵەوە نەوەک شتێ بدزێ، بەڵام بێتوو لە لام مابایەوە تا تۆدەگەڕایەوە نەیدەتوانی ئوتۆمبیلەکە بدزێ، باشە با بڕۆین تاکسی‌چاوەڕێیە، سوێند دەخۆم ئامادەم ساڵێ لە تەمەنم ببەخشم هەتا ئەونامەردەش کوێر بێ. دەنگت هەڵمەهێنە، خودا بکا ساف لە ساف تالانبکرێ. رەنگە بشگەڕێتەوە، دەی‌دەی پێت‌وایە سبەینێ لە دەرکە دەدا ودەڵێ ببوورن هۆشم لە سەر خۆ نەماوە بۆیە ئوتۆمبیلەکەتانم بردووە،دەی حاڵتان باشە یان نا.

هەتا لای دوکتۆر متەقیان نەکرد. ژنە هەوڵی دەدا بیرلە ماشێنەدزراوەکە نەکاتەوە و بە گەرمی دەستی مێردەکەی دەکوشی وپیاوەکەش کە سەری داخستبوو هەتا شۆفیرەکە لە ئاوێنەوە چاوەکانی‌نەبینێ یەک‌وچان لە خۆی دەپرسی چۆن دەکرێ تووشی ئەو نەهامەتییەبووبێ، باشە بۆچی من. هەر جارێک تاکسی رادەوەستا گوێی لە دەنگی‌ئامرازگەلی هات‌وچۆکەری نێو شەقام دەبوو، زۆر جار تووشی وەهارووداوێک بووین، یانی بەر لەوەی وەخەبەر بێین دەنگەدەنگی دەرێ‌پەردەی دەروونی نائاگامانی کە چەشنی مەلافەیەکی سپی تێمانەوەپێچراوە ئاژنیوەتەوە. چەشنی مەلافەیەکی سپی. سەرێکی راوەشاند وهەناسەیەکی هەڵکێشا، خێزانی بە ئارامی دەستێکی بە روومەتی داکێشاو لاواندییەوە، مەبەستی ئەوە بوو کە هێمن بە، من لە پەناتم. کابرابێ‌ئەوەی لە شۆفیرەکە سڵ کاتەوە سەری وەشانی ژنەکەی کرد، زۆرمنداڵانە بیری کردەوە بریا تۆ لە جێی من بای و ئیتر نەتدەتوانی‌ئوتۆمبیل لێ بخوڕی، بێ ئەوەی لەم قەیران و ئاستەنگییەدا لە پووچ‌بوونی ئەو بیرە خورد بێتەوە، پیرۆزبایی لە خۆی کرد کە هێشتاش ئاقڵی‌تەواو کار دەکا. کاتێک بە یارمەتی بە پارێزی خێزانی دابەزی ئارام‌دەهاتە بەرچاو، بەڵام کاتێک چوونە ژووری مەتەبی دوکتۆر، یانی ئەوشوێنەی قەرار وا بوو چارەنووسی خۆی لێ روون بێتەوە، بە دەنگێکی‌لەرزۆک بە گوێی خێزانیدا چرپاند، نازانم بە حاڵێکی چەندە پەرێشان‌لێرە دەر دەکەوم، لێرەدا بە جۆرێک سەری راوەشاند دەتگوت هیچ‌ئومێدێک بەدی ناکا.

ژنەکەی بە بەردەستی دوکتۆرەکەی گوت من نیوسەعات لێرەوبەر لەبابەت مێردەکەمەوە تەلەیفوونم کرد و بەردەستەکەش ئاماژەی کردەهۆدەیەکی بچووک کە چەند نەخۆش لەوێ چاوەڕێ بوون، پیرەپیاوێک‌چاوبێنێکی رەش لە سەر چاوێکی، کوڕێکی تەمەن کاڵی خێل لەگەڵژنێکی کە وێدەچوو دایکی بێ، کچێک بە چاویلکەیەکی رەشەوە، دووکەسی دیکە بێ هیچ تایبەتمەندییەک، بەڵام هیچ‌کامیان کوێر نەبوون، خۆکوێر ناچنە لای دوکتۆری چاوان. ژنە مێردەکەی لە سەر کورسییەک‌رۆنا و چونکە کورسییەکانی تر هەموو پڕ بوون، خۆی لە پەنای راوەستاو بە گوێیدا چرپاند دەبێ چاوەڕێ بین. زانی بۆ دەبێ پەلە نەکەن، دەنگی‌نەخۆشەکانی لە هۆدەی چاوەڕوانییا بیستبوو، ئێستا بیرێکی دیکەمێشکی دەسمی، بە خۆی دەگوت هەتا دوکتۆر زیاتر پێیەوە خەریک بێ،رەنگە دۆزرانەوەی دەرمانی دەردەکەی ئەستەمتر بێ. پەشێو و بێ‌قەرارلە سەر کورسییەکەی هەژا، خەریک بوو ئەو دڵەڕاوکەیە لە گوێی‌ژنەکەی سریوێنێ کە لەپڕ دەرگا کرایەوە و بەردەستەکە گوتی تکایە ئەودووەتان بەو لایەدا فەرموون و رووی کردە نەخۆشەکان، ویستی‌دوکتۆرە، دەبێ خێرا چاوی پێی بکەوێ. دایکی کوڕە خێلەکەنارەزامەندی دەربڕی کە نۆرەی براوە و ئەو یەکەم کەسە و پتر لەکاتەژمێرێک چاوەڕوان بووە. نەخۆشەکانی دیکە بوونە هاودەنگی ودەستیان کرد بە بۆڵەبۆڵ، بەڵام هیچ‌کامیان، تەنانەت ژنەش، بە باشیاننەزانی کێشەکە گەورە کەنەوە، نەکا دوکتۆر پێی ناخۆش بێ و لەبەر ئەوبێ ئەدەبییە وە درەنگیان بخا، هەر وەک دەزانین ئەو شێوە ئاکارەپێشینەدارە. ئەو پیرەپیاوەی چاوبێنی رەشی لە سەر چاوێکی بەستبووگەورەیی فەرموو، ئێزن بدەن ئەو پیاوە سیاچارەیە زووتر بڕوا، حاڵی‌زۆر لە ئی ئێمەمانان خراپ‌ترە. کوێرەپیاو ئەو قسەیەی نەبیست، چونکەلەو کاتەدا بە لای دوکتۆرەوە راوەستابوو، خێزانی دەیگوت زۆر سپاس،خۆمان بە ئەمەگداری ئێوە دەزانین، دوکتۆر بەڕاستی مێردەکەم، لێرەداقسەکەی لە دم بڕایەوە، چونکە بەڕاستی نەیدەزانی چ رووداوێک‌قەوماوە، تەنیا دەیزانی مێردەکەی کوێر بووە و ئوتۆمبیلەکەیان‌لێ‌دزراوە. دوکتۆر گوتی تکایە فەرموون دانیشن، خۆی نیزیک بۆوە هەتایارمەتی نەخۆشەکە بدا، پاشان بە هێمنی دەستی گرت و دواندی،دەی فەرموو، ئێستا رووداوەکەم لە نووکەوە بۆ بگێڕەوە، کوێرەپیاوگوتی لە پشت چرای سوور لە ئوتۆمبیلەکەیا دانیشتبوو کە لە نەکاو ئیترنەیتوانی هیچ شتێ ببینێ، پاشان چەند کەس هاتبوونە یاریدەی، ژنێک کەلە دەنگی‌را وەک کەسێکی بەسالاچوو دەچوو گوتبووی رەنگە تەوژمی‌دەمار بێ،

پاشان پیاوێک بردبوویەوە ماڵ، چونکە خۆی نەیدەتوانیلێ بخورێ. هەموو شتێک بە سپی دەبینم دوکتۆر، باسی دزرانیئوتۆمبیلەکەی نەکرد.
پزیشک پرسیاری کرد، قەت لە پێشدا تووشی رووداوێکی ئاوا یانئەوتۆ بووی، نا دوکتۆر، تەنانەت چاویلکەش ناکەمە چاوم. دەی گوتت لەپڕ ئاوات بە سەر هات، بەڵێ دوکتۆر، وەکوو چرایەک کە بکوژێتەوە، نازیاتر چەشنی چرایەکی بگرێ، لە چەند رۆژی رابردوودا فەرقێکت لەبڕشت و سۆمایی چاوتا هەست پێنەکردووە، نا دوکتۆر، پێشینەیکوێری لە بنەماڵەتاندا هەیە، لەنێو ئەو خزمانەی دەیانناسم کەسم پێشکنایا، نەخۆشیی قەندت هەیە، نا دوکتۆر، سفلیس چی، نا دوکتۆر، تەوژمیخوێن یا گرفتی دەماری مێشک چۆن، سەبارەت بە گیروگرفتی دەماریمێشک دڵنیا نیم، بەڵام بێشک ئەو نەخۆشیانەی دیکەم نیە و لە شوێنیکار بە تەواوی لە ژێر چاوەدێری دوکتۆر داین، ئەورۆ یا دوێنێ زەبرێکتوە سەری نەکەوتووە، نا دوکتۆر، تەمەنت چەندە، سی و هەشت ساڵ،زۆر باشە، با ئێستا چاوت موعایەنە کەم. کوێرەپیاو ئەوەندەی توانیچاوی داپچڕی، هەر وەک بیهەوێ موعایەنەکە هاسانتر کاتەوە، بەڵامدوکتۆر دەستی وەبن پیلی دا ولە پشت ئامێری موعایەنەی دانا، هەرکەسێ بە بڕێ هەست و خەیاڵ بوایە دەیتوانی ئەوێ بە وێنەیەکی نوێیشوێنی دانپێداهێنانی کلیسا بشوبهێنێ، لێرە چاو دەچوونە شوێنیوشان و ئەو کەسەی قسەی لە زمانان دەردەکێشا راستەوخۆ ناخیرووحی تاوانباری دەبینی، دوکتۆر گوتی چەنەت لە سەر ئێرە دابنێ،چاوت زەق کە و جووڵەی مەکە. ژنە لە مێردەکەی نیزیک بۆوە و دەستیلە سەر شانی دانا و گوتی چا دەبی، خاترجەم بە. دوکتۆر ئامێرەکەیئامادە کرد و دەستی کرد بە موعایەنە، بیلبیلە، رەشکێنە، سپێنە و هیچکاملە بەشەکانی تری چاوی کەمایەسییان نەهێنابوو. ئامێرەکەی لادا،چاوەکانی هەڵگلۆفی و بێ ئەوەی قسەیەک بکا سەرلەنۆی دەسبەکاربوویەوە و کاتێک کاری تەواو بوو سەرسوڕمان لە روخساریدا شەپۆلیدەدا، هیچ زەدەیەک نابینم، چاوەکانت ساغن. ژنە بە خۆشییەوەدەستەکانی پێکداسوو و بەوپەڕی شادمانییەوە گوتی، نەمگوت،نەمگوت، دیتت چاک دەبی. کوێرەپیاو وەک نەیبیستبێ پرسیاری کرددەتوانم چەنەم لە سەر ئێرە لابەم دوکتۆر، هەڵبەت، بمبوورە، ئەگەروەک تۆ دەڵێی چاوم ساخن، ئەدی بۆچی کوێرم، جارێ نازانم، دەبێزۆر بە وردی بتئەزمووم، دەبێ بتنێرمە ئەزموونگا، دەبێ سۆنۆگرافی وشریتی مێشک هەڵگرینەوە، لات وایە پەیوەندی بە مێشکەوە هەبێ،رەنگە، بەڵام گومانم هەیە. سەرەڕای ئەوەش دەڵێی چاوم زەدە ونوقسانیان نیە، بەڵێ وایە، سەیرە، مەبەستم ئەوەیە کە بێتوو کوێری بێ،ئێستا هیچم بۆ

ناگوترێ، چما له کوێریی من بهگومانی، نا نا، مهبهستنائاسایی بوونی نهخۆشیی ئێوهیه، له تهواوی ماوهی ئهو چهند ساڵهداکه خهریکی کارم تووشی وهها نهخۆشییهک نهبووم و به راشکاویدهتوانم بڵێم له مێژووی چاوپزیشکیدا هەڵکهوتێکی بێوێنهیه. به بڕوایئێوه دهرمان دهکرێت، بێ گومان چونکه زهده و نوقسانێکی زگماکی وبنهماڵهیی بهدی ناکهم، دهبێ وڵامهکهم روون و باش بێ، بهڵام وا دیارهوا نیه،تهنیا به پارێزهوه را دهردهبڕم، چونکه نامهوێ ئومێدێکت وهبهربنێم و پاشان ببێته بڵقی سهر ئاو، دهزانم، جارێ وهزعهکه ئاوایه، دهوا ودهرمانیش پێویست نیه، ئێستا هیچ دهرمانێک به پێویست نازانم، چونکهوهک پلاری کوێری وایه. کوێرهپیاو گوتی چهنده قسهیهکی بهجێیه. دوکتۆر وای نواند که وتهکهی ئهمی نهبیستووه، له سهر چوارپێچکهی گهڕۆکی موعایهنه ههستا و به سهر پێوه ههر ئهزموونێکی به پێویستیزانی بۆی نووسی. نوسخهکهی دایه دهس خێزانی، فهرموون، ههر کاتوڵامهکان ئامادە بوون لهگهڵ مێردهکهت وهرهوه، لهو ماوهدا ئهگهروهزعی مێردهکهت تووشی ئاڵوگۆڕێک بوو تهلهیفوونم بۆ بکه، دهبێچهندت بدهمه خزمهتی دوکتۆر، مونشییهکهم دهزانێ، ههتا بهر دهرگابهرێی کردن و ورهی وهبهرنان، دهبێ سهبر بکهین و چاوهڕێ بین، دهبێسهبر بکهین و چاوهڕێ بین، نائومێد مهبن. ههر که ئهوان وهدهرکهوتنچووه دهسشۆری بچووکی ژووری موعایهنه و ماوهیهکی درێژ لهئاوێنه راما و لهبهر خۆیهوه گوتی بهڕاستی ئهوه چ بوو. پاشان هاتهوهژووری خۆی و ههرای بهردهستهکهی کرد، نهخۆشێکی دیکه بنێره.

ئهو شهوه کوێرهپیاو خهونی دیت که کوێره.

## کوێری

ئەو پیاوەی کە ماشێنی مرۆی کـوێری دزی، ئـەو کاتـەی پێشـنیارییارمـەتی دانی دا هـیچ مەبەستێکی دزێو و چەپەڵی نەبوو، تەواو بەپێچەوانە، ئەو کارەی تەنیا وڵامێک بوو بۆ نوانـدن و دابین کردنیپیاوەتی و هەستی مرۆڤدۆستانەی، ئەو دوو خدەیەی هەموومانده‌زانین بەرزترین رەوشتی ئادەمیزادانن و بە لای پیاوکوژانی لەوەشدڵڕەقترەوە خۆ دەنوێنن، ئەو پیاوە جگـە لـە دزێکی پووچەکەی ئوتۆمبیل کە هیچ ئومێدێکی پێشکەوتی بۆ ئیشی خۆی بەدی نەدەکرد زیاتر نەبوو،ئەو بە دەستی خاوەنانی سەرەکی ئەو کارە دەچەوسایەوە و ئەوە تەنیاچەوسێنەرانن کە لە نەداری و تێماوی هەژاران دەرفەت دێنن و کەلکیدزێو وەردەگـرن. دەبـێ ئەوەنـدەش بـزانین کە جیاوازییەکی ئـەوتۆ لـەنێوان ئـەو دوو کەسـەدا نیـە کـە یـەکیان بـە مەبەسـتی دزیـنی ماڵـی کوێرێک وئەوی تر بە تەمای میراتۆکـەی پیرێکـی لـەرزۆک و بـێهێـز دەسـتییارمـەتییان بـۆ رادەکێشن. تەنیا کاتێک لە ماڵی کوێرەپیاو نیزیک بوویەوەئەو بیرە بە شـێوەیەکی سروشـتیی و دەکرێ بڵێین زۆر ورد و باریکداوی تەنی، هـەر وەک بـە دیـتنی بڵـیت فرۆشـێکی گـەڕۆک کەوتبێتە فکریکڕینی بڵیتێکی شانس و بەخت هیچ دڵنیایەکی نەبوو، بڵێتێکی کـڕی هـەتابزانێ چۆن دەبێ، لە پێشدا هەوسبازانە ملی بۆ شانس و بەخت راکێشا،بەڵکوو شتێک بووبا و نـەبووبا، رەنگە هێندێ کەس بڵێن کـە لـە جـەغزیرەوشـتی کەسـایەتی خۆیـدا جووڵاوەتـەوە. مرۆڤـی گومانـدار فـرە زۆر و لاو کەللـەڕەقن. کاتێـک باسـی سروشـتی ئـادەمێزاد دێتـە گـۆڕ، دەڵـێن ئەگەردروستیش نەبێ کە هەڵومەرج دز پەروەردە دەکا، بەڵام بێشکیارمەتییـەکی زۆر دەکـا بۆ گەڵاڵە کردنی. بەڵام ئێمە خۆمان زیاتر پێمانخۆشە وا بـیر بکەینـەوە کـە ئەگـەر کوێرەپیـاو پێشـنیاری دووهـەمی ئـەمخێرخـوازە دڵاوایـەی قبـووڵ کردبـا، رەنـگ بـوو لـە ئاخریـدا جوامێریسەرکەوتبا. ئاماژەی ئێمە بۆ ئەو پێشنیارەی کابرای دزە کە گوتیئامادەیە هەتا خێزانی کوێرەپیاو دەگاتەوە ماڵ لە لای بمێنێتەوە، کێدەتوانێ بڵێ نەدەشیا بەرپرسایەتی ئـەخلاقیی لـە جەغزی وەها بڕواپێکردنێکا بەرگێڕەوەی بێ و ببێتە هۆی زاڵ بوونی هەستی پاک و پیرۆزکە هەموو کات تەنانەت بە لای رووحە چەپەڵەکانیشـەوە دەس دەکـەوێ. بـۆ کۆتـایی هێنـان بـەو

بەشە بادەدەینەوە سەر شێوەیەکی کە خەڵکیئاسایی و رەشۆکی پێیان خۆشە و بە پێی پەندێکی کۆن کە هەمیشە بۆتەئاڵقەی گوێمان، هات برۆیی هەڵگرێ، چاوی خۆی کوێر کرد.

هەر ئەو ویژدانە کە زۆرێک لە ئادەمیزادە بێفکرەکان دەیخەنە ژێرپاوە و گەلێکیش هەر بە نەبووی دەزانن، شتێکە هەیە و هەر بووە. ئەومەبەستە داهێنانی فەیلەسووفەکانی سەردەمی تەقیانووس نیە، ئەوزەمانەی کە کێشەی رووح تەنیا مەبەستێکی لێڵ و تەماوی بوو. بە تێپەڕبوونی زەمان و گەشە کردنی بیری کۆمەلایەتی و تێکەلاوی تۆو ورەگەز ئێمە گەیشتووینە ئەو شوێنە کە ویژدانمان لە رەنگی خوێن وسوێرایی ئەسرین هەڵکێشاوە و دەڵێی ئەو کارەشمان پێ ناتەواوە،چاوەکانمان بە جۆرێک کردۆتە ئاوێنەی رووەو دەروون، زۆر جارئەوەی دەمانهەوێ بە زمان لابەلای کەین، چاو بێترس دەیدرکێنێ. هەلومەرجی مرۆڤێکی ئاسایی کە زۆر جار پەشیمان بوونەوەی دوایتاوانی لەگەڵ ترسی جۆراوجۆری تۆرەمەی باوک و باپیرانی بە هەڵەتێکەڵ دەکرێن بخەنە سەر ئەو باوەڕە گشتییە، لە ئاکامدا سزا دانیتاوانبار بە بێ روحم و بەزەیی دووقات دەبێتەوە. جا لێرەدایە کە بەدروستی ناکرێ بڵێین کاتێک دزە ئوتۆمبیلەکەی هەڵکرد و وەڕێ کەوتبە چ رادەیەک ترس و ناڕەحەتیی ویژدانی لێکدرابوون هەتا ئازاریبدەن. بێگومان نەدەشیا بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە لە جێی کەسێ دانیشێ کە هەر ئەو فەرمانەی بە دەستەوە بوو و لە پڕێ کوێر بوو، ئەو مرۆڤەیلە پشت ئەم شووشەوە دەیڕوانی و لە نەکاو تازە هیچی نەدیت،خەیاڵێکی زۆر بەهێز پێویست نیە هەتا وەها بیر و هەستێ، دۆڵپای دزیوو ناخۆشەویستی ترس وەخەبەر بێنێ، کە هەر لە ئێستاوە سەریهەڵێناوە. بەلام هەستی بە پەشیمانیش دەکرد، هەر ئەو گوشاریویژدانەی ئاماژەی پێکرا یا ئەگەر پێمان خۆشە بە تەوسەوە قسانبکەین، ئەو ویژدانە گازگرەی کە دیمەنی خەماوی کوێرەپیاوی لە کاتیدەرگا داخستنا دێنایە بەر چاو. پیاوەی لێقەوماو گوتی پێویست ناکا،پێویست ناکا و لەو کاتە بە دواوە بە بێ یارمەتی کەسێ نەیدەتوانی پێدەبەر پێ بنێ.

دزە بۆ رزگاری لە چنگ ئەو بیرە ئازاردەرانە تەواوی فکری خستەسەر ماشێن لێخوڕین، زۆر باش دەیزانی کە نابێ بچووکترین تاوانیلێ روو بدا یا هۆشی بپەڕێ. پۆلیس لە هەموو شوێنێ هەبوو و تەنیائەوەندە بەس بوو یەکیان پێشی بگرێ و بڵێ دەکرێ کارتی پێناس وماشێن لێخوڕینت ببینم، دوایە دەبوو بچێتە جێیەکی مار خۆی لێدەبوارد، ئەوەش چ ژیانێکی ناخۆشە، زۆری هەوڵ دەدا بە گوێرەی چراڕێنوێنەکان باژوێ و بە هیچ کلۆجێ سنووری چرای سەوز هەڵنەبوێرێ،چرای زەردی لەبەر چاو بێ و راوەستێ هەتا چرای سەوز هەڵدەبێ.

لەپرێۆی دەرکەوت زۆر بە سەیری چاوی دەبڕیتە چراکان. لەو دەمەی‌ڕا توندو شل رۆیشتنی ئوتۆمبیلەکەی وا ریک کرد هەمیشە هەر بگاتە سەر چراسەوزەکان، تەنانەت ئەگەر ناچاریش بوایە تیژتر بڕوا یان بە پێچەوانە وببایە هۆی تووڕە بوونی شۆفیرەکانی دوای خۆی. ئاخرییەکەی بە سەرلێ‌شێواوی و وەڕەزی لای‌دایە شەقامێکی لابرِی بێ چرای رێنوێن و بەبێ دەردەسەر ماشێنەکەی راگرت، هەر بەڕاستی ئەو کابرایە شۆفیرێکی‌کارامە بوو. وای هەست پێ‌کرد خەریکە مێشکی دەتەقێ. نێو ئوتۆمبیلەکەپشووبڕ بوو. شووشەکانی هەر دوو لای داکێشا، بەڵام، هەوای دەرێ‌ئەگەر بزووتنێکیشی هەبوو نەیتوانی هەوای نێو ماشێنەکە تازەکاتەوە. بە خۆی گوت ئێستا چ بکەم. ئەو کاولاشەی دەیهەویست ئوتۆمبیلەکەی‌تێدا حەشار دا لە دێیەکی دوورەشار بوو، ئەویش بەو حاڵە شڕەوەنەیدەتوانی بگاتە ئەوێندەرێ. بە ورتە گوتی یا پۆلیس دەمگرێ یان‌خراپتر تووشی وەرگەڕان و خۆ لێک‌دان دێم. وای بە دڵی‌دا هات کەباشترە تاوێک دابەزێ و بیری ئاڵۆزی برێک بەرێتەوە سەر یەک، بەڵکووهەوای نوێ تۆڕ و داوی دەست و پێ‌گری بیری هەڵپسێنێ. بە خۆی گوت‌ناکرێ چونکە ئەو بێ ئەنوا چارەڕەشە کوێر بووە منیش وام بە سەربێت، خۆ ئەوە هەڵامەت نیە هەتا خەڵک بگرێتەوە، تاوێک لەو دەور وبەرانە دەسووڕێمەوە هەتا لەو حاڵە رزگاریم بێ. دابەزی و زەحمەتی‌داخستنی دەرکەی ماشێنەکەی وەبەر خۆی نەنا، زۆر زوو دەگەڕێتەوە،وردە وردە دوور کەوتەوە. سی هەنگاوی پتر نەنابوو کە کوێر بوو.

ئاخرین کەس لە لای دوکتۆر هەمان پیرەپیاوە خوێن‌شیرینەکە بوو،هەر ئەو کەسەی بەزەیی و مێهرەبانی بۆ کوێری لێ‌قەماو نواند. هاتبووهەتا بۆ چارەسەر کردنی ئاومرواری تاقە چاوەکەی نۆرە بگرێتەوە،چاوبێنە رەشەکە بە چاوێکیدا کشابوو و هیچ پێوەندییەکی بە مەبەستی‌ئێستاوە نەبوو، ماوەیەک پێشتر پزیشک پێی گوتبوو ئەوانە نەخۆشی‌پیرین و هەر کات ئاومرواریيەکە گەیشت لای دەبەم. کاتێک پیرەپیاوی‌چاوبێن لە چاو رۆیی، بەردەستەکە گوتی هیچ نەخۆشی دیکەی‌لێ‌نەماوە، دوکتۆر پەروەندەی کوێرەپیاوی دەست‌دایە، یەک دوو جارپێیداهاتەوە، ماوەیەک لە بیران راچوو و لە ئاخریدا تەلەیفوونی بۆ یەکێک‌لە هاوکارانی کرد: دەبێ بڵێم ئەورۆ تووشی نەخۆشێکی سەیر بووم،موعایەنە هیچ زەدە و نوقسانێکی زگماکی نیشان نەدا، دەڵێ هەموو شتێ‌بە سپی دەبینێ، جۆرێک سپیایی خەستی رەنگ شیر کە بە چاوێوەدەنووسێ، هەوڵ دەدەم بە باشترین شێوە قسەکانی بگێڕمەوە، بەڵێ،راستە مەبەستێکی زەینییە، نا، پیاوێکی برێک جحێڵە، سی و هەشت‌ساڵەیە، تۆ تا ئێستا شتی ئاوات

بیستووه یان خوێندووتەتەوە، منیش‌هەر وای بۆچووم، جارێ هیچم بە بیردا نایە، بۆ ئەوەی ماوەم هەبێ‌پێشنیاری چەند ئەزموونم داوە، بەڵێ، دەکرێ هەر لەو رۆژانەدا پێکەوەموعایەنەی بکەین، دوای شێو کردن چەند کتێبان دەپشکنم، چاوێکی‌دیکە بە کتێبنامەدا دەخشێنم، رەنگە سەرەداوێکم وەدەست کەوێ، بەڵێ،بەڵێ نەخۆشیی ئەگنۆزیا دەناسم، رەنگە کوێریی رەوانی بێ، ئەگەر وابێ ئەوە یەکەمین کەسە ئەو تایبەتمەندییەی هەیە، چونکە شک لەوەدا نیەکە ئەو پیاوە هەر بەراستی کوێرە و هەر وەک دەزانین ئەگنۆزیابێ‌دەسەڵاتییە لە ئاست ناسینەوەی شتە ئاشناکاندا، چونکە بە بیری‌منیشدا هات کە رەنگە جۆرێک ئامۆرۆزیس بێت، بەڵام لەبیرتان بێ کە لەپێشا چیم گوت، ئەو کوێرییە سپییە، تەواو بە پێچەوانەی ئامۆرۆزیس کەساماڵ تاریکییە، مەگین ئامۆرۆزیسی سپیش هەبێ، بەڵێ تاریکایی سپی،بەڵێ دەزانم تا ئێستا کەس نەیبیستووە، وایە، سبەی تەلەیفوونی بۆدەکەم، پێی‌دەڵێم پێمان خۆشە پێکەوە موعایەنەی بکەین. پاش برانەوەی‌ئەو وت‌ووێژە دوکتۆر پاڵی وەپشتیی سەندەڵییەکەی دا، ماوەیەک راما،پاشان هەستا و رووپۆشە سپییەکەی بە شلی و بێ‌وازی داکەند. چووهەتا دەستی بشوا، بەڵام ئەو جارەیان لەبەر ئاوێنە نەوێستا هەتا بەشێوەیەکی مێتافیزیکی بپرسێ ئاخر چلۆن شتی وادەبێ، روانگەی‌زانستیی روونتر ببۆوە و دەیزانی کە ئەگنۆزیا و ئامۆرۆزیس دوونەخۆشیی تەواو ناسراون و کتێبە پزیشکییەکان بە وردی باسیان دەکەن،بەڵام سەرەڕای ئەوەش بیری هەر جارەی پەلی بۆ لایەک داویشت، جانازانم ئەو قسانە بەجێن یان خۆ بە پێچەوانە. لەبەر هەزاران هۆ مێشک‌دەرەتانی نامێنێ و ئیتر تەواو، دەتگوت نەخۆشێکی درەنگ‌وەخت لەدەرگای مەتەب دەدا. چاوپزیشک تۆزێکی چێژەی ئەدەبی هەبوو وەدەیتوانی جێ‌جێ بەهرەی لێ‌وەرگرێ.

ئەو شەوە دوای شێو کردن بە خێزانی گوت ئەورۆ تووشی‌هەڵکەوتێکی سەیر هاتم، رەنگە شێوەیەک کوێری رەوانی یان‌ئامۆرۆزیس بێ، بەڵام هۆگەلێ بۆ سەلماندن و چەسپاندنی ئەو مەبەستەبەدی ناکرێ، ژنەکەی پرسی ئەو نەخۆشییانەی باست کردن چین. دوکتۆر بە شێوەیەکی ساکار و ئاساییپەسند لە سەری رۆیی و توانی‌هەستی قوژبن‌پشکنی خێزانی دامرکێنێ، پاشان بۆ لای قەفەزەی کتێبان‌چوو، هێندێکیان ئی سەردەمی زانکۆ بوون و بڕێکیان نوێتر و چەندبەرگیان تازە بڵاو کرابوونەوە و هێشتا دەرفەتی خوێندنەوەیانی پەیدانەکردبوو. چاوی بە رێنوێنی کتێبەکاندا گێڕا و ئەوەی لە بابەت ئەگنۆزیاو ئامۆرۆزیسەوە نووسرابوون بە سەریاندا هاتەوە و تووشی ئەوهەستە ئازاردەرە بوو کە پێی ناوەتە بەستێنێکی دوورەدەستی بێ‌بوار کەرێی تێنابا، یانی بەستێنی پڕ پێچ و قەمچی برینکاری مێشک و دەمار کەتەنیا شتێکی

لێ‌دەزانی و نەدەزانی. بەتڵێکی شەو چوو، ئەو کتێبانـەی‌دەیخوێندنـەوە وەلای دەنـان، چـاوی ماندووی ڕێک‌گوشین و پاڵی‌وەپشـتیی سەندەڵـییەکەی دا. لـەو کاتـەدا ڕێ چارەیـەکی تـەواو ڕووناک بەمێشکیدا هات. ئەگەر ئەو نەخۆشییە ئـەگنۆزیا بوایـە نـەخۆش وەک‌هەمیشـە هـەموو شتێکی دەبـینی، یـانی بڕشـتی چـاوی تووشـی کەمایەسـی‌نـەدەبوو، بـۆ وێنـە تـەنیا مێشـکی لـە ناسینەوەی سەندەڵیدا یاریدەی‌نەدەکرد، بە واتەیەکی تر لـە بەرامبـەر وەجوولـێنەری نـوور کـە دەگاتەدەماری بینایی وەک هەمیشە کردەوەیەکی دروستی نیشان نەدەدا، بەڵام‌بێتوو بمانهـەوێ بەو راوێژە بدوێین کە خەڵکی ئاسایی تێی بگا، دەتوانین‌بڵێین لێرەدا تەواو بـێ دەسـەڵات بـوو. بەڵام لە بابەت ئامۆرۆزیسەوە نابێ‌گومانێ هەبێ. ئەگەر نەخۆشییەکە هەر ئەوە بێ دەبێ هـەموو شتێک‌تاریک ببینـێ، هەڵـبەت دەبـێ ببـوورن کـە وشـەی دیـتن دەکـار دەکـەین، چونکەئـەو نەخۆشییە ساماڵ تاریکییە. کوێرەپیاو بـە ڕوونی گوتبـووی کـەرەنگێکی خەسـتی یـەک‌سـوامە سپی دەبینێ، دیسانیش دەبێ سەبارەت بەدەکار کردنی وشەی دیتن ببوورن. دەڵـێی بـە چـاوی ئاوەڵە لە نێو دەریای‌شیردا مەلە دەکا. ئامۆرۆزیسی سپی جگە لەوەی لە ڕوانگـەی‌وشەناسـییەوە دژایەتی مانایی هەیە، بە لایەنی دەمارناسیشەوە هەرنەگونجاوە، چونکە مێشک ناتوانێ بـیچم و وێنە و ڕەنگە ڕاستەقینەکان‌بێنێتە بەر زەینی، بە واتەیەکی تر هەر بەم شێوەیە ناتوانێ لـە سـپاییدا باڵبگرێ، سپیایەکی بێ سنوور وەک تابلۆیەکی ساماڵ سـپی بـە بـێ نیسـێ وڕوونـاکی، بـە بـێ ڕەنگ و وێنە و ڕووکارێ کە دیمەنی ڕاستەقینەرادەگوێزن بۆ چاوی ساغ، هـەر چەنـدە لێـرەدا باسی چاوی ساغ دژوار ودوور لـە ڕاسـتیش بـێ. دوکتـۆر بـەو ئاکامـە گەیشـت کـە کەوتۆتـە دالانێکی‌کلک پەڕیوی حەبەساو، بە ناهومێدی سـەرێکی لەقانـد و ڕوانییەدەوروبـەری. دەمێکـە خێزانی لە جێگایە خزیوە، زیاتر وەک خەون وەبـیری‌دەهـات کـە خێـزانی بـۆ لای هـاتووە و سـەری ڕامووسـیوە و شەوباشـی‌لـێ‌کـردووە و جێـی هێشـتووە، وڵات بـێ‌دەنـگ بـوو، هێشـتا کتێبەکان بەپرش‌وبڵاوی لە سەر مێزی موتاڵا خۆیان دەنواند، بە خۆی گـوت ئـەوە چیـەو لەپـڕ ترس هەڵیگرت، هەر دەم دەتگوت خەریکە کوێر بـێ، پشـووی‌بـردەوە بـەرخۆی و چـاوەڕێ مایەوە. چ ڕووداوێک نەقەوما. ماوەیەک‌دواتر کـە کتێبـەکانی کـۆ دەکـردەوە هـەتا بیانباتـەوە جێـی خۆیـان، قـەوما. لەپێشـدا زانی کـە ناتوانـێ دەسـتەکانی ببینـێ، ئـەو دەم تێگەیشـت کـە کوێربووە.

نەخۆشیی ئەو کچەی چاویلکـەی ڕەشـی لـە چـاودا بـوو، شـتێکی سـووک‌و سـاکار بـوو، پێلووی بە حاڵ ماسی‌بوون و سوور هەڵگەڕابوون کـە لەماوەیـەکی کەمـدا بـە قـەترە چارەیـان

دەهات و چاک دەبوونەوە. دوکتۆر گوتبووی هەتا چەند ڕۆژان دەبێ تەنیا کاتی خەو چاویلکە دابنێ. لەمێژساڵ بوو ئەو شۆخییەی چەندپات دەکردەوە، تەنانەت دەتوانین وای دابنێین کە ئەم گاڵتەیە پشتاوپشت لە چاوپزیشکێکەوە گوێزەگوێزی پێکرابوو، بەڵام هەر چی بێ قسەیەکی بە تام و خوێ بوو، هەر کەدوکتۆر وای دەگوت بزەی دەنیشتە سەر لێوی و نەخۆشیش بە دمییەوەپێدەکەنی، جا ئەم جارەیان هەر بەڕاستی جێی خۆی بوو، چونکە کچەددانی دەتگوت مروارین و دەشێزانی بیاننوێنێ. هەر مرۆڤێکی گوماندارێ‌ئاسایی کە زانیاری لە بابەت کەلێن و قوژبنی ژیانی ئەو ژنەوە هەبێ، بەهۆی دوورەپەرێزی یان بە بۆنەی تێشکانی لە ئەژماربەدەری، بەتەوسەوە بزەی شیرینی دەباتەوە سەر فێڵ و فرتی ئاکاری، بەڵام ئەوەهەڵۆیستێکی نابەهەق و نەفامانەیە، چونکە هەر لەو کاتەوە کەمێرمناڵێکی جوانکیلە بوو، ئەو واژەیەی ئێستا بێجێیە، یانی لەوزەمانیڕا کە داهاتووی پرێسکەی کتێبێکی نەکراوە بوو و هێشتاسەرنجی کەسی بۆ کردنەوەی رانەکێشابوو، ئەو بزەییەی هەر لە سەرلێو بوو. بە واتەیەکی ساکار دەکرێ ئەو ژنە بە خۆفرۆش بزانین، بەڵامپێچوگەوەی رایەڵەی پەیوەندی کۆمەڵایەتیی سەردەمی باس کراو، چشەو بێ و چ ڕۆژ، چ ئەستوونی بێ و چ ئاسۆیی، ئێمە لە داوەرییەکی بەپەلە و شێلگیر، یانی شێتییەک کە بە هۆی بڕوا بە خۆ بوونێکی لە رادەبەدەر ڕەنگە هەرگیز لە چنگی رزگاریمان نەبێ، دەگێڕێتەوە. ڕەنگە رادەو بارستایی پەڵە هەوری ژونوومان لەبەر چاو بێ، بەڵام زۆر بێجێیەبێتوو درەوشانەوەی پریشک و دڵۆپی سەرگەردانی ئاومان لە حەوادالەگەڵ خوایەکی یۆنانی لێ تێک بچێ و لە سەر نەزانیمان سوور بین. بێشک ئەو ژنە بە پووڵ خۆ دەفرۆشێ، ئەو مەبەستەی کە ڕێگا دەدا ئێمەبە بێ هەڵسەنگاندنی لایەنەکانی تر بە جندەی بزانین، بەڵام وا باشە ئەوراستەقینەش بزانین کە ئەو تەنیا لەگەڵ کەسێ جووت دەبێ کە کەیفی لێی‌بێ و بە بڕوای ئێمە ئەو جیاوازییە بنەڕەتییە دەبێ ئەم لەو تاقمەهەڵاوێرێ. ئەویش چەشنی هەر ئادەمیزادێکی ئاسایی ئیش و کارێکی‌هەیە و وەک هەموان لە ماوەی حەسانەوەی خۆی چێژ و بەهرەوەردەگرێ و پێداویستییەکانی دابین دەکا. بێتوو نەمانهەوێ کەمترلەوەی کە هەیە باسی بکەین لە ئاخریدا بە مانایەکی بەربڵاو دەڵێین ئەوجۆرەی دڵی دەیهەوێ رایدەبوێرێ و تەواو بە مەیلی خۆی تام لە ژیانی‌دەچێژێ.

تاریکان بوو کە لە مەتەب وەدەرکەوت. چاویلکەکەی دانەنا، چراکانی‌شەقام بە تایبەت ئەوانی پڕشۆق ئازاریان دەدا. چوویە دەواخانەیەک‌هەتا ئەو قەترەیەی دوکتۆر بۆی نووسیبوو بیکڕێ، تەمای گرت گوێنەداتە قسەی شاگردی دەوافرۆشەکە کە گوتی چەندە حەیفە

چاوی‌جوانت لێ ون بکا چاویلکه، ئەو قسەیە لە زمـان شـاگرد دەوافرۆشـێکەوەنەک تـەنیا زۆر بێ‌شەرمانە بوو، بەڵکوو بە خۆیدا شـکاندەوە، چونکەوەیـدەزانی چاویلکـەی رەش جـەغزێکی کێشەری پڕ لە نەهێنی لە سەرروخساری دەرەخسێنێ و بۆی هەیە سرنجی ئەو پیاوانـە راکێشـێ کەبـەلایا تێدەپـەڕن و ئـەویش دەتوانـێ ولامێکـی بـەجێیان بداتـەوە، بـەڵامئـەورۆ پیاوێـک چاوەڕوانی بـوو، دەیەویسـت سـەروبەری ئـەو دیـدارەئاکامی باشـی هـەبێ. ئـەو پیـاوەی بـۆی دەچووە کەلێنێ، کۆنە دۆستی بـووو کاتـێ دەیگـوت چاویلکـەی دانانـێ دڵـی نەدێشـا، جگـە لەوەش خۆ هێشتادوکتۆر ئیزنی دانانی نەدابوو، وێدەچوو ئەو پیاوەش دڵی پێی خۆش بێ‌و بەو ئاکارە لە ژنانی تری بە زیاتر دەهاتە بەرچاو. کچـە لـە دەواخانەهاتـە دەر و تاکسـییەکی بانـگ هێشت و نیشانی هۆتێلەکەی دایە. لەسەندەڵیدا پاڵی دایەوە و هەر لە ئێسـتاوە زاری پـڕ بـوو لـە ئاو، هەستی‌گەرمی ماچ و بە خۆوە گوشین و لە کۆتاییدا بەجێ‌مانی بە مانـدوویی وخۆشحاڵـی لە دەماری گەڕا، پەنا بە خـودا دەڵـێی دەیانهـەوێ لەئاوربازییـەکی سـەیر و سەرسـوڕهێنەرا لـە داری خاچی دەن. کـە وایەهۆگـەلێکی زۆرمـان بـە دەسـتەوەیە کـە بـەم ئاکامـە بگـەین بێتـوو پیاوەکەئەرکی خۆی بێ ئەملا و ئەولا بەڕێوەبـەرێ، هەمیشـە لـە پێشـدا دووبەرامبـەری ئـەوەی وەگیری دەکەوێ، وەدەستی دێنێ، تەواو لەو بیرانەراچوو بوو، بێ‌گومـان چونکـە تـازە مـزەی دوکتۆری دابوو. بە خۆی گـوتفکرێکـی خـراپ نیـە هـەر لـەورۆ بـەولاوە بـۆ تێهەڵـێنانەوە و پاداشی‌زەحمەتەکانم مزەی خۆم بەرمە سەرێ.

بەر لەوەی بگاتە شوێنی ژوان بە شـۆفیر تاکسـییەکەی گـوت رایگرە،دابـەزی و تێکـەڵاوی شەپۆلی ئەو خەڵکە بوو کە دەپەڕینەوە. دەتگوتدەیەویست ئەوان بێ هیچ ناسـیاوییەک و بـێ هیچ نیشانەیەک لە شەرم وگوناە لەتەک خۆیانا ببەن. زۆر ئاسـایی لـە هۆتێـل وەژوور کـەوت وبەرەو شۆینی رابواردن بزووت. ئیستێک زووتر هاتبوو، بۆیە دەبووچاوەڕێ بێ، زەمانی دیدار بە وردی دیاری کرابوو. داوای خواردنەوەی‌کرد و دەسـتەوبەجێ پێیـداکرد، چـاوی لـە کـەس نەدەکرد، چونکە پێی‌خۆش نەبوو ئەویان لەگەڵ خۆفرۆشـێکی جڵـفی داوبـاز لـێ تێـک بچـێ. پاش‌ماوەیەک وەکوو جیهانگەردێکی کە لە دیداری مووزەخانـان گەڕابێتـەوە وبـۆ حەسـانەوە بەرەو هۆدەکەی ببـزوێ، بـەرەو ئاسانسـۆر هـەنگاوی نـا. تۆبڵـێی هێشـتاش کەسـێ هـەبێ ئـەو مەبەستە پاش دەوەن بکا و نەزانێ کەرەسـەنایەتی لـە رێگـای پـڕ تەنگـەژەی هەڵـدان و گەشـە کردنا هەمیشەتووشی تەنگ و چەڵەمە دێت. بەڵام بـەخت هـەموو کـات وەهـا لەگـەڵ گونـاەو لاڕێی جووتە کە بـەر لـەوەی بگاتـە ئاسانسـۆر دەرگـای کرایـەوە. دوومیـوان، جـووتێکی پـیر

وەدەرکـەوتن، ئـەو سـوار بـوو، دوگمـەی نهـۆمی سـێیلـێدا، ژومـارەی سێسـەت و دوازدە چاوەنوارِی بوو، بەڵێ خۆیەتی، بەپارێزەوە لە دەرگای دا، چارەگێک دواتر دەینالاند، سـەری هـەژدە دەقیقـانچەنـد وشـەیەکی دەدرکانـد کـە لـە کانیـاوی روحـی هەڵدەقوڵـین، دوای بیستدەقیقان لە خۆ بۆوە، پاشی بیست و یەک دەقیقە خۆشییەک لەشیتەنییـەوە، دوای بیسـت و دوو دەقیقە شاد و شەکەت گوتی هەموو شتێ بەسپی دەبینم.

کوێری

پۆلیسێک دزەی گۆرینی بردەوە مـاڵ. هـەرگیز بـە بـیری نوێنـەریمێهرەبـان و پارێزگـاری یاسادا نەدەهات کە بنپیلی تاوانبارێکی دڵرِەقیگرتووە، نەک بۆ ئەوەی نەهێڵێ دەرباز بێ، کە رەنگـە لـە هـەلومـەرجێکیدیکـەدا وا بوایـە، بەڵـکوو بـە مەبەسـتی بـەرگری لـە خلیسـکان و تلاسابوونیپیاوەی بێنوا. لە بەرامبەردا زۆر بە سانی دەکرێ بڵێین خێزانی دزەکاتێک دەرگای کردەوە و مێردەکەی بە دەست پۆلیسێکەوە دیت تووشیچ حاڵێک هات، بە تایبەت کـە دیـار بوو ئـەو جارەیـان گرفتـاری بەڵایـەکیزۆر گـەورەتر هـاتووە و لـە جـەغزی گیرانێکـی سـادە بەولاوەترە. هەوەڵینمەبەستێ کـە بـە بـیری ژنـەدا هـات ئـەوە بـوو کـە رەنگـە مێردەکـەی لـە کاتیدزیدا دەردەست کرابێ و پۆلیس هاتبێ ماڵەکەیان بپشکنێ، لە لایەکیدیکەوە هەر چەنـد ئەو بیرە پرِدژایەتی بێتـە بـەرچاو بـەڵام ورەی وەبـەردەنا، چونکـە مێردەکـەی تـەنیا ئوتـۆمبیلی دەدزی و بە قـەبارەیرِا خۆنـەدەکرا لـە ژێـر تـەختی خـەو حەشـار بـدرێ. بـەڵام گومانەکـەی هێندەینەبرد و پۆلیس گوتی ئەو پیاوە کـوێرە، ئاگـات لێـی بـێ. ژنـە لـە جیـاتیئـەوەی دڵـی

داسەکنێ کە پۆلیس شووەکەی هێناوەتەوە ماڵ، کاتێک کابرابە گریان خۆی خستە ئامێزی و ئەوەی ئاگامان لێیە بۆی گێڕایەوە، تازەزانی تووشی چ بەڵایەک هاتووە.

پۆلیس کیژی چاویلکە لە چاویشی بردەوە ماڵی دایک و باوکی، بەڵامسەیری خۆش ئەو حاڵ و دیمەنە بوو کە تێیدا کوێر ببوو، ژنێکی رووتو قووت کە لە هۆتێلدا دەیقیژاند و جەرگ و دڵی میوانەکانی بەردەداوە وپیاوەکەش بە پەلە دوولینگەکەی هەڵدەکێشاوە کە خێرا دەرباز بێ، بەکورتی ئەم دیمەنە لە رادەی تاڵی و ناخۆشی کارەساتەکەی کەمدەکردەوە. کیژی کوێر کە لەبەر پرتەوبۆڵەی ویشکە سۆفییە ریاباز و بەرواڵەت داوێن پاکەکان شەرمی پێدادەهات، هەستێکی کە لەگەڵ ئەوینێکیفرۆشیی یەکتری دەخوێندەوە، کاتێک تێگەیشت کوێرییەکەی ئاکامیتازە سەرهەڵداو و چاوەڕوان نەکراوی جووت بوون و کاو وەرگرتن نیەپڕ بە گەرووی قیژاندی، بەڵام نەوێرا لە چنگ چەرخی چەپگەرد و زوڵم وزۆری زەمان بێتە سکاڵا، چونکە زۆر بێشەرمانە و بە بێئەوەی رێگایبدەن جلەکانی بە جوانی بکاتەوە بەری پیلیان گرت و بە پاڵەپەستۆ لەهۆتێلیان وەدەرنا. پۆلیس بە راوێژێکی ئەگەر بێئەدەبانە نەهاتباحیسابێ، دەکرا بە تەوسمان زانیبا، پاش ئەوەی نیشانیی لێوەرگرتدەیهەویست بزانێ داخوا کرێی تاکسی پێیە یان نا و لێی روون کردەوەکە دەوڵەت بۆ هەڵکەوت و بابەتی ئاوا پووڵ نادا، هەڵبەت قسەی خۆمانبێ دابێکی خراپ و دوورە مەنتیق نیە، چونکە ئەو ژنانە لەو تاقمەبەرچاوەن کە ماڵیاتی داهاتی کردەوەی دزێویان نادەن. بە مانای حاڵیبوون سەرێکی لەقاند، بەڵام چونکە کوێر بوو، بیهێننە بەرچاو، بە خۆیگوت رەنگە پۆلیس تێنەگەیشتبێ و زۆر بە نەرمی گوتی بەڵێ پووڵم پێیەو پاشان لەبەر خۆیەوە گوتی خۆزگە پێمنەبوایە، ئەو وشانە رەنگە لەروانگەی ئێمەوە بە سەیر خۆ بنوێنن، بەڵام بێتوو هەزاران پێچ و گەوەیزەینی ئادەمیزاد کە رێگایەکی راستی تێدا بەدی ناکرێ بێننە بەرچاو، لەمانای ئەو واژانە حاڵی دەبین، مەبەستی ئەوە بوو کە ئاخر و ئاقیبەتیداوێن پیسی و بێناموسی ئەوەیە. بە دایکی گوتبوو بۆ شێوی شەوناچێتەوە ماڵ و کەچێ ئێستا تەنانەت لە باوکیشی زووتر گەیشتبۆوە.

حاڵی دوکتۆر جیاواز بوو، نەک تەنیا بەو هۆیە کە کاتی کوێر بوون لەماڵەوە بوو، بەڵکوو چونکە پزیشک بوو نەیدەویست چەشنی ئەوکەسانەی تەنیا کاتی ژان و ئێش دەکەونە بیری لەشیان، بە داماویسەری بۆ ناهومێدی نەوی کا. تەنانەت لەم لێقەوماوی وپەرێشانحاڵییەدا، لەو شەوڕەش و ناخۆشییەدا، هێستاش دەیتوانیئەوەی هۆمێر لە ئیلیادا نووسیویەتی بێنێتەوە یاد، بەرزترین شێعرێ کەتا ئێستا سەبارەت بە مەرگ و کوێرەوەری هۆنراوەتەوە،

دوکتۆرێک‌سەدان پیاو دینێ، هەڵبەت جارێ نابێ زۆر لە سەر ئـەو کوتەیـە و ژومـارەو رادەی باس کراو بڕۆین، ئەوەمان لە دوایەدا بۆ روون دەبێتەوە کەئێمە تـەنیا چۆنیـەتیمان لەبـەر چـاوە. دڵخۆشی خـۆی داوە و بـە ئەسـپایی لـەجێگاوبان خـزا و خێـزانی دووخـەو نـەکرد، لەوکاتـەدا ژنەکەی لە نێوان‌خەو و بێداریدا چەند جارێـک دمـی تەقانـد و لـە باوەشـیدا ماتـەی هەڵـگرت. چەند سەعاتێک نەخەوت و جارجارە کە وێژینگی دەدا لەبەر شەکەتییان‌بوو. ئارەزووی دەکرد هەرگیز رۆژ نەبێتەوە، هەتا ئەو کەسەی کاری‌چارەسەری چاوی خەڵک بـوو ناچـار نـەبێ بڵـێ من کوێر بووم، بەڵام لەسەر ئەو حاڵەش‌ڕا تامەزرۆی ئەنگووتنی خـۆر بـوو، بەڵـێ ئـەوە تـەواو ئەم‌رستەیەیە کە لە مێشکیدا خولی دەخوارد، ئەنگووتنی خـۆر و دەزانـێ کـەئیتر نایبینـێ. هـەر بەڕاستی چاوپزیشکی کوێر بەکەلکی کەس نەدەهات،بەڵام ئەو ئەرکەی لـە سەرشـان بـوو کـە بەرپرسانی وەزارەتی تەندروستی‌ئاگادار و وریا بکاتەوە و بە ئاشکرایی بڵێ رەنگە ئـەو وەزعـە بێ ئەملا وئەولا ببێتـە کارەسـاتێکی گشـتیی، جۆرێـک کـوێری نەناسـراو سـەری‌هەڵـداوە و وا وێدەچێ خەڵک لە یەکتری دەگرنەوە و بـە رواڵـەتیش هـیچ‌نیشـانەیەک بـەدی نـاکرێ، هـەر وەک ئەم مەبەستە لە بابەت کابراکوێرەکەی چوو بوو بۆ مەتەب بە ئاشـکرایی سـەلمابوو، یـان هــەر وەک لەســەر خۆیشــی ســووربۆوە. لــە چــاوی ئــەو دوو کەســەدا نــە نیزیــک‌بــینی و نەرەشکەوپێشکە بەدی نەدەکرا، هەر بۆیە تەنانەت پێویستیان بەچاویلکەش نەبوو. ئـەو چاوانـەی تازە نەیاندەبینی، ئەو چاوانەی تەواوکوێر ببوون، بە رواڵەت ساغ دەهاتنە بـەرچاو و هـیچ زەدە و نوقسانێکیان‌نەبوو. ئەو موعایەنە دوور و درێژەی کوێرەپیاوی هێنایەوە بیر و هاتەوەبەر زەیـنی کە تەواوی بەشەکانی چاوی بەحاڵودووبەلاش تەغەورنەبوون و ئەوە نـەک تـەنیا بـۆ پیـاوێکی سی و هشت ساڵانە، بەڵکوتەنانەت بۆ هی لاوتریش بێ‌وێنە بوو. بە خۆی گوت بە پێچەوانـەی ئاقڵەکە ئەو پیاوە کوێر بێ و بۆ تاوێـک فەرامۆشـی کـرد کـە خۆشـی کـوێر بووە،سـەیرە کـە هێندێ کەس خێرا خۆیان لە بیر دەچێتەوە، بەڵام ئەوەمەبەستێکی تازە نیـە بـە مـەرجێ کـەلامی هۆمێر بە هێندێ ئێروئەوێوەبێنینەوە یاد.

کە خێزانی لە خەو هەستا ئەو خۆی کردە خـەو. هەسـتی بەراموسـانی ئـارامی نێوچـاوانی کرد، دەتگوت نایهەوێ مێردەکەی لە خەوکا، رەنگە لە دڵی خۆیدا گـوتبێتی بەسـتەزمانە هـەتا قووقــەی کەڵــەبابی‌بــەیانی دانیشــتووە و لــە بــارەی نەخۆشــیی ســەیر و ســەمەرەی ئــەو کوێرەبێ‌ئەنوایەدا موتالای کردووە. دوکتۆر کە تەنیا مایەوە دەتگوت دۆڵپایەک‌خۆی خستۆتە سەرسینگی و چنگی خستۆتە کونەتفنکی و چاوی دەکۆڵێ‌و دەیخنکێنێ، هەناسەیەکی ساردی

کێشا و لێ گەڕا دوو دڵۆپ فرمێسک‌لە چاوی هەڵقوڵن و بەلاجانگیدا سەرە و خوار بن، بە خۆی گوت رەنگەسپی بێ، لێرەدا کەوتەوە یادی قسەی هێندێ لە نەخۆشەکانی کە پێیان‌دەگوت دوکتۆر لام وایە خەریکە کوێر بم، تازە ترسی قورس و گرانی‌ئەوانی هەست پێ‌دەکرد. لە ئاشپەزخانەوە دەنگی قاپ‌وقاچاغان دەهات،هەربینا خێزانی سەرانسوێی بکا و بزانێ هەستاوە یان نا، وەختی وەی‌هاتبوو بڕۆنە نەخۆشخانە. بە پارێزەوە هەستا و بە دەستەکوتە جلەکانی‌دۆزییەوە و خێرا لە بەری کردن، پاشان چووە پێشاو. رووی لە لایەکی‌کرد کە دەیزانی ئاوێنە لەوێیە، ئەم جارەیان نەیپرسی چ قەماوە، نەیگوت‌بازگە و دەرووی مێشک بە هەزار و یەک هۆ تووشی رێ لێ‌گیران دەبێ،تەنیا دەستی کێشا هەتا پەنجەی بگاتە ئاوێنەکە، دەیزانی کە وێنەکەی لەئاوێنەوە تێی هەڵدەڕوانێ، وێنەکەی ئەوی دەدیت و ئەو ئەمی نەدەدیت. هەستی کرد خێزانی وە ژوور کەوت، ئێ، هەستاوی، ولامی داوە بەڵێ، لەپەنای راوەستا، بەیانیت باش خۆشەویستەکەم، گەلێ ساڵ دوای‌زەماوەند هێشتاش وشەی پڕمیهر و خۆشەویستییان لە زاری‌نەدەکەوت، پاشان وەکوو ئەوەی هەردووکیان خەریکی شانۆگێڕانێک‌بن و ئێستا نۆرەی پیاوەکە بێ گوتی، من لام وا نیە هێندەش بە خێر بێ،چاوم تووشی نوقسانی هاتووە. ژنە تەنیا سرنجی کەوتە سەر ئاخرین‌قسەی، گوتی دا با بزانم، بە وردی لە چاوەکانی راما، من کە هیچ شتێک‌نابینم، زۆر بە روونی ئەو وتەیە هی ئەو نەبوو و لە دەقی شانۆنامەکەداقەرار وا بوو مێردەکەی بیڵێ نەک ئەو، بەڵام پیاوەکە تەنیا وتی نابینم ودرێژەی دا رەنگە لە نەخۆشەکەی دوێنێم گرتبێتەوە. ژنی پزیشکانیش بەتێپەڕبوونی زەمان و پەیدا بوونی گەرم و گوڕی هێندێک لە کاری‌مێردەکانیان حاڵی دەبن و ئەو ژنەش کە لەتەک شووەکەیا هاودڵ وهاوزمان بوو ئەوەندەی لێ‌دەزانی کە کوێری نەخۆشییەک نیە کەس‌بیگرێتەوە، شتێک نیە لە چاوی کوێرەوە بپەڕێ و نوقسانی بداتە چاوی‌ساغ، بەڵکوو گیروگرفتێکە لە نێوان مرۆڤ و ئەو چاوانەی پێیانەوە لەدایک بووە. هەر چۆنێک بێ دوکتۆر دەبێ تەواو ئاگای لە چۆنیەتی‌دەربڕینی را و بۆچوونەکانی بێ، هەر بۆیە لە زانکۆش سەبارەت بەم‌مەبەستانە بە وردی رایدێنن، بەڵام ئەم پزیشکە جگە لەوەی کە پێی‌لێ‌دەنێ کوێر بووە، بە ئاشکراش دەڵێ کە ئەو نەخۆشییەی گرتۆتەوە،جا خێزانی هەر چەندەشی لێ‌بزانێ کوا دەتوانێ گومان بەرێتە بەروتەکانی. کە وایە زۆر بە هاسانی دەردەکەوێ کە ئەو ژنە بێچارەیە لەبەرامبەر ئەو بەڵگە حاشا هەڵنەگرەدا وەکوو هەموو ژنێکی ئاسایی تر کەهەڵبەت هەتا ئێرە دوانیان دەناسین، دەجووڵێتەوە و مێردەکەی دەگرێتەئامێزی و بە خۆیەوە دەکوشێ و دەیلاوێنێتەوە، بە

گریانەوە پرسی ئێستا چ بکەین، دەبێ خەبەر بدەین بە کاربەدەستانی بەرپرسیار، ئەوە لەهەموو شتێ پێویستترە، ئەگەر ئەو نەخۆشییە مەترسیی گرتنەوەی گشتیی لە دوا بێ دەبێ خێرا دەس بە کار بن، خێزانی پەنای بردە بەر دواتیشکی هیوا و شێلگیرانە گوتی هەتا ئێستا کەس نەیبیستووە خەڵکێ نەخۆشیی کوێری بگرێتەوە، بۆ چما کەس تا ئێستا پێی شک دێت کەسێ لە خۆوە کوێر بووبێ، بەڵام تا ئێستا خۆ لانی کەم دووکەس تووش بوون. تازە ئەو قسەیەی لە زاری دەرپەڕیبوو کە حاڵی گۆڕا. بڕێک بەتووڕەیی پاڵی بە خێزانییەوە نا و خۆشی کشایەوە، دوور کەوە، لێم نیزیک مەبەوە، رەنگە لێم بگرییەوە، پاشان مستێکی لە نێوچاوانی خۆیدا، هەی لەو کەرە، هەی لەو کەرە، چەند دوکتۆرێکی نەفامم، تازەم وەبیرم دێتەوە، بە درێژایی ئەوشۆ لە پەنات بووم، باشتر وا بوو لەژوورێکی دیکەدا خەوتبام و دەرگاشم پێوەدابا، تکایە دەس هەڵگرە،ئەوەی دەبێ ببێ دەبێ، وەرە، دانیشە با بەرچاییت بۆ بێنم، دەتهەوێ بەکوێرە کوێرە بە دوای رێنوێنی تەلەیفووندا بگەڕێی و تلاسکە ببەستی وسەرەنگرێ بی. دەتهەوێ منیش هەر وا دانیشم و چاوم لێت بێ یان خۆم لە حەوت کوناندا حەشاردەم بۆ ئەوەی نەگرمەوە. گەرم و توند دەستی مێردەکەی گرت و گوتی وەرە خۆشەویستەکەم.

هێشتا بەری بەیانی بوو کە دوکتۆر بە پێداگری خێزانی قاوەیەک ونانێکی برشتەی خوارد، دەتوانین بیهێنینە بەرچاو کە چەندە بەتام وخۆی خواردی، ماوە زۆر بوو بۆ ئەوەی پەیوەندی بکەن بەکاربەدەستانی دەق نەشکاوی بێ خەیاڵی پشتی مێزان، بە هەموولێکدانەوەیەکی مەنتیقی دەبوو هەر چی زوورتر راستەوخۆ راپۆرتی ئەم گەیشتبایە دەستی یەکێک لە بەرپرسانی وەزارەتی تەندروستی، بەڵامهەر خێرا پەشیمان بۆوە، چونکە تێگەیشت بێتوو خۆی وەکوودوکتۆرێک بناسێنێ کە دەیهەوێ مەبەستێکی گرینگ بە بەرپرسانیسەرەوە رابگەیەنێت، ناتوانێ کارمەندێکی ئاسایی کە تەلەیفوونچی بەهەزار پاڕانەوە و لالانەوە پەیوەندی لە نێواندا گرێ داون حاڵی بکا،مونشی دەبوو زۆر بە وردی مەبەستەکەی وەربگرتایە هەتا سەرۆکی لەچۆنیەتی رووداوەکە ئاگادار کردبا، زۆر روونە کە هیچ دوکتۆرێکی دەروەست ئامادە نیە ئەو جۆرە هەواڵانە بڵاو کاتەوە و تۆوی ترسێکی لەپڕ بچێنێ. مونشییەکە لەو بەری هێڵی تەلەیفوون وڵامی دایەوە ئێوەدەڵێن دوکتۆرن، ئەگەر پێت خۆشە بڕوا بکەم قەی ناکا، بەڵام منیش ملکەچی رێ و شوێنێکم و هەتا مەبەستەکە نەدرکێنن کارێکم لە دەس نایە، نەهێنییە، خۆ مەبەستی نەهێنی بە تەلەیفوون باس ناکرێ، باشتروایە خۆتان بێنە ئێرە، ناتوانم لە ماڵ دەرکەوم، مەبەستت ئەوەیەنەخۆشی، کوێرە تاوێکی راما و گوتی بەڵێ

نەخۆشم. مونشییەکەجەفەنگێکی لێدا، جا کە وایە باشترە خەبەر بدەی دوکتۆرێک بێتە لات،دوکتۆرێکی راستی، کەیفی بەو قسە بێتامەی خۆی ساز بوو و گۆشی‌تەلەیفوونەکەی دانایەوە. کردەوەی دزێوی ئەو خوێڕییەپیاوە وەکمستێک لە دمی دوکتۆر بدرێ وا بوو. تاوێک پێچوو تا هێندێک هاتەوەسەرخۆ و ئەو ئاکارە ناحەزەی بۆ ژنەکەی گێڕاوە. پاشان وەک ئەوەی‌مەبەستێکی نوێی دۆزیبێتەوە کە دەبوو زۆر پێشتر زانیبای، بە خەمەوەلەبەر خۆیەوە گوتی ئەوەش تۆرەمەی بنیادەم. خەریک بوو ناهومێدانەبپرسێ ئێستا چ کەردەن، کە تێگەیشت تا ئێستا هەلی بە فیڕۆ داوە وباشترین رێگا بۆ راگەیاندنی ئەو مەبەستە دواندنی سەرۆکی ئەو بەشەی‌نەخۆشخانەیە کە خۆی کاری تێدا دەکا، وتوویژی دوو پزیشک بە بێبەرگر و لەمپەر، لێی‌گەڕێ با ئەو بەرپرسایەتی وەگەڕ خستنی رێ وشوێنی ئیداری وەئەستۆ بگرێ. خێزانی ژومارەی نەخۆشخانەی بۆگرت. هەر کە ولامیان دایەوە خۆی ناساند و خێراخێرا گوتی باشم،سپاس، بێشک بەرپرسی نەخۆش وەرگرتن پرسیبووی دوکتۆر چۆنی،تەنانەت لە ئەلکەی مردنیشا هەر دەڵێین باشین، بەوەی دەڵێن خۆ لە خۆنەکردنەوە، بەدیهاتێکی کە تەنیا تایبەتی ئینسانە. کاتێک سەرۆک گۆشی‌دەس‌دایە گوتی دەی، فەرموو، چ خەبەرە، چاوپزیشک پرسی تەنیای،کەس قسەکانمان نابیستێ، لە بەرپرسی نەخۆش وەرگرتن دڵنیا بە، ئەوخاتوونە کاری گرینگتری لە گوێدانە وتوویژی چاوپزیشکیی هەیە وسەرەڕای ئەوانەش تەنیا هۆگریی بە نەخۆشیی ژنانەوەیە. راپۆرتی‌دوکتۆر زۆر کورت بوو، بە بێ کۆبە و پەڕاوێز، بە راوێژێکی زانستی ودوور لە ئیحساس، کە لە مرۆڤێکی خاوەنی ئەم دەردە نەدەکالایەوە وسەرۆکی خستە سەرسوڕمان، پرسی بەڕاستی کوێری، هەر کوێرکوێر،بە هەر حاڵ رەنگە هەڵکەوتێک بووبێ و بە مانای تەواو لێگرتنەوەیەکلە مابەینا نەبووبێ، راستە، ئەوە نابێتە هۆی ئەوە کە من گرتوومەتەوە،بەلام خۆ مەبەستەکە ئاوا نیە کە هەر کامێکمان لە ماڵی خۆمان کوێربووبین و یەکترمان نەدیتبێ، ئەو پیاوە کوێر بوو کە هاتە لام و من دوای‌چەند سەعاتێک کوێر بووم، چۆن ئەو پیاوە بدۆزینەوە، لە مەتەب ناو ونیشانیم هەیە، هەر ئێستا یەکێک دەنێرمە ئەوێندەرێ دوکتۆر، بەڵێ باشە،هەڵبەت هاوکارێک، بە بڕوای ئێوە ئەو مەبەستە بە وەزارەتخانەرانەگەیەنین، جارێ بڕێ زوویە، بیر لەو ترسە بکەوە کە وەها هەواڵێکدەیخاتە دڵی خەڵک، ئینسان باڵی لێدەڕوێ، کوێری و لێگرتنەوە، خۆمردنیش لێگرتنەوەی نیە بەلام هەموومان دەمرین، زۆر باشە تۆ هەر لەماڵ دانیشە تا من بزانم چ دەکەم، پاشان بە دواتا دەنێرم، دەمهەوێ‌موعایەنەت بکەم، ئەوەت لە بیر بێ کە کوێر بوونی من

ئاکامی‌موعایەنەی کوێریکی دیکەیە، ناکرێ دڵنیا بین، لانی کەم نیشانەکانی هۆو هۆکار بە دەستەوەن، بێ‌گومان، بەڵام ئێستا بۆ سەلماندنی ئەومەبەستە زوویە، دوو هەڵکەوتی جیاجیا پەیوەندییەکی ئەوتۆیان نیە،مەگین تا ئێستا چەند کەسی دیکە بە دەردی ئێمە چووبن، لێت حاڵیم،بەڵام دەبێ خۆمان لە پێش‌بینی و گومانی نابەجێ و هیوابڕانە بپارێزین،زۆرسپاس، خێرا ئاگادارت دەکەمەوە، خواحافیز.

نیوسەعات دواتر کە بە یارمەتی خێزانی زۆر ناشیانە ریشی تاشی،تەلەیفوون زەنگی لێدا. دیسانیش سەرۆک بوو، بەڵام ئەمجارەیان‌راوێژی گۆڕابوو، کوڕێکی مێرمناڵ لێرەیە کە دەڵێ لە پڕێ کوێر بووم،هەموو شتێک بە سپی دەبینێ، دایکی دەڵێ دوێنێ هاتۆتە مەتەبی ئێوە،کوڕە چاوی چەپی خێلە، بەڵێ، جا کە وایە خۆیەتی، وردە وردە خەریکەنیگەران دەبم، بەڕاستی بارودۆخەکە بەرەو تاڵییە، چۆنە وەزارەتخانەئاگادار کەین، بەڵێ، هەڵبەت، هەر ئێستا تەلەیفوون دەکەم بۆ سەرۆکی‌نەخۆشخانە. سێ سەعات دواتر کە دوکتۆر و خێزانی لە بێ‌دەنگیداخەریکی نیوەڕۆ کردن بوون و لە راستیدا ئەو لەو پلە گۆشتانەنووسابوو کە ژنەکەی بۆی بڕیبوو، دیسانەوە تەلەیفوون زەنگی لێدا،خێزانی چوو گۆشییەکەی هەڵگرت و خێرا گەڕاوە و گوتی لەوەزارتخانەوە تۆیان دەوێ. یارمەتی دا هەستێ و بچێتە ژووری کار وولامی تەلەیفوونەکە بداتەوە، وت‌وویژەکە کورت بوو. وەزارەتخانەناوی ئەو نەخۆشانەی دەویست کە دوێنێ چووبوونە مەتەبەکەی،چاوپزیشک گوتی کە تەواوی زانیارییەکی پێویستی لە پەروەندەی‌نەخۆشەکاندا نووسیوە، ناو، تەمەن، چۆنیەتی زەماوەند، شۆڵ، نیشانیی‌ماڵ، لە کۆتاییدا پێشنیاری کرد وێڕای کاربەدەستە باوەڕپێکراوەکانبچێ بۆ کۆ کردنەوەیان، لەوبەری تەلەوە ولامەکە کورت و پتەو بوو،پێویست ناکا، تەلەیفوون گوێزرایەوە بۆ هێڵێکی دیکە و دەنگێکی تر وتی‌ئێوارە باش، وەزیر قسە دەکا، پێم‌خۆشە لە لایەن خۆم و دەوڵەتەوەئافەرین بنێرم بۆ غیرەت و شەڕافەتت، زۆر تکا دەکەم لە ماڵدەرمەکەون چونکە بەپێی هەڵوێستی خێرای ئێوە دەتوانین بەری ئەم‌قەیرانە بگرین و جەغزی لە دەور بکێشین. هەر چەند ئەم رستانەرەسمی و بە ئەدەبانە بوون، بەڵام بێ‌گومان دەیزانی کە دەستوورن. گوتی بە چاوان جەنابی وەزیر، بەڵام لەوبەرەوە گۆشی تەلەیفوونەکەداندرابۆوە. چەند دەقیقە دواتر دیسانیش تەلەیفوون زیڕاندی. سەرۆکی‌بەشی چاوپزیشکی بوو، بە هەناسەبڕکە و شێواوی گوتی ئێستاهەواڵیان پێدام کە راپۆرتی کوێر بوونی دوو کەسی دیکەش دراوەتەپۆلیس، ئەو دووە پۆلیس بوون، نا، پیاوێک و ژنێک، پیاوە لە شەقامهاواری دەکرد کوێر بووە و ژنەش لە

هۆتێلێک، گۆیا لەگەڵ پیاوێکا بووە،دەبێ بزانم ئەوانیش نەخۆشی من بوون یان نا، ناویان نازانی، باسی‌ناوێک نەهاتۆتە گۆڕ، لە وەزارەتخانەوە هەواڵیان پێ‌دام، دەیانهەوێ‌بچنە سەر پەروەندەکانی مەتەب، بۆتە سەیر تێکەولێکەیەک، تازە دەزانی. دوکتۆر گۆشییەکەی دانا و دەستی برد بۆ چاوی، هەر وەک بیهەوێ لەبەلای گەورەتریان بپارێزێ، پاشان زۆر بە وەڕەزی گوتی ماندووم،خێزانی گوتی هەوڵ بدە تۆزێک بخەوی، دەتبەمە سەر جێگاوبانەکەت،بێ فایدەیە، خەوم لێ‌ناکەوێ، خۆ ئێستا رۆژیش ئاوا نەبووە، بەڵکووهەواڵێکی تازە پەیدا بوو.

دەوروبەری سەعاتی شەش بۆ دوایین جار تەلەیفوون هاواری‌لێ‌هەستا. چاوپزیشک کە لە پەنای دانیشتبوو لەڕێوە گۆشییەکەی دەس‌دایە، بەڵێ فەرموون، زۆر بە وردی گوێی دایە وتەکان و چەند جارێک بەئارامی سەری لەقاند و گۆشییەکەی دانایەوە، خێزانی پرسی کێ بوو،وەزارەتخانە، تا نیوسەعاتی دیکە ئامبولانسێک بە دووما دێت، هەرچاوەڕیی ئەوە بووی، ئەرێ کەم‌وزۆر، دەتبەنە کوێ، نازانم، رەنگە بۆنەخۆشخانەیەک، چەمەدانەکەت بۆ ئامادە دەکەم و چەند کوتێکت جلک وخرت‌وپرتی بەردەستان بۆ دەپێچمەوە، جا خۆ ناچم بۆ سەفەر، خۆئێمەش نازانین چ خەبەرە. ژنە بە لەسەرەخۆیی شووەکەی بردە وەتاغی‌خەو و داینیشاندە سەر جێگاکەی، تۆ بە ئارامی هەر لێرە دانیشە وکارەکانی تر لە ئەستۆی من. دەنگی هات و چۆ و هەڵسووڕانی ژنەکەی‌دەبیست کە دۆلابی و دۆلابچەکانی دەکردە و دایدەخستنەوە، جلکەکانی‌دەر دێنا و لە چەمەدانەکەی دەخستن، بەلام ئەوەی نەیدەدیت بریتی‌بوون لە چەند بلووز و دامێن، دوولینگەیەکی فش، کراسێک و چەندجووت پێڵاو کە دەکرا تەنیا هی ژنان بن. دەنگی هەستێکی نەهێنی بەدوکتۆری دەگوت باشە ئەو هەمووە حەلەم قەلەمەی بۆچیە، بەلام هیچی‌نەگوت، چونکە دەرفەتی کۆڵینەوە لەم مەبەستە وردانەی نەبوو. گوێی لەچرکە چرکی قفڵ و قەڕازەی چەمەدانەکە بوو کە داخرا، پاشان خێزانی‌وتی تەواو بوو، ئێستا ئامادەین بە ئوتۆمبیلی نەخۆش‌بەر بڕۆین.

چەمەدانەکەی هەتا بەر دەرگا برد و پێشنیاری یارمەتی شووەکەی‌کە دەیگوت لێی گەڕێ من هەڵیدەگرم بردەوە پاش، خۆ من شەل و گێڕنیم و دەتوانم ئەو کارە بکەم. پاشان چوونە دیوی دانیشتن و چاوەڕێ‌مانەوە. دەستی یەکتریان گرتبوو و پیاوەکە گوتی نازانین تا بە کەی لەیەکتر دوور دەبین، ژنە گوتی خۆت بەو فکرانەوە سەخڵەت مەکە.

کاتەژمێرێک چاوەڕی بوون. کە لە زەنگی دەرگایان دا، ژنە هەستا وچوو کردییەوە، بەلام کەسێ لە پشت دەرگا نەبوو. گۆشی زەنگی ماڵێی‌دەس‌دایە و گوتی زۆر باشە، ئێستا دێینە

خوار. رووی له مێرده‌كه‌ی كردو گوتی له خـوارێ چـاوه‌ڕێن، ده‌سـتووریان پـێ‌داون بـه هـیچ كلۆجـێ نه‌یه‌نـه‌ژووره‌وه، وا دیـاره وه‌زارتخانـه هه‌سـتی بـه مه‌ترسـیی كـردووه. بـا بـڕۆین. بـه ئاسانسـۆر چوونـه خـواره‌وه، ژنـه یارمـه‌تی مێرده‌كـه‌ی دا هـه‌تا لـه چه‌ندپێپیلكـه‌ی ئـاخری بـه سلامه‌تی تێپه‌ڕ بێ و سواری ئوتۆمبیله‌كـه بێت،پاشـان گه‌ڕایـه‌وه بـۆ چه‌مه‌دانه‌كـه و بـه تـه‌نیایی هه‌ڵـیگرت و پاڵـی دایـه نێونـه‌خۆش‌به‌ره‌كـه. ئاخرییه‌كـه‌ی خۆیشـی سـوار بـوو و لـه ته‌نیشت‌مێرده‌كه‌ی دانیشت. لێخوڕه‌كه سه‌ری وه‌رسووڕاند و ده‌نگی دا، به منیـان‌گوتـووه تـه‌نیا ئه‌م به‌رم، ئێوه ده‌بێ دابه‌زن. ژنه له‌سه‌ره‌خۆ گوتی ده‌بێ‌منیش به‌رن. چونكـه منـیش هـه‌ر ئێسـتا كوێر بووم.

پێشنیاری خودی وەزیر بوو. نامانهەوێ بڵێین فکرێکی تەواودروست بوو، بەڵام لە زۆر بارانەوە بیرێکی باش بوو، چ لە روانگەی‌تەندروستی و کۆمەڵایەتی و چ لە بواری سیاسی. هەتا دۆزرانەوەی‌هۆیەکانی ئەو نەخۆشییە یان بە واتەیەکی باریکتر دیترانەوەی ماکەی‌دێوی سپی، ئەو ناوەی بیری باریکی کارناسێک لە سەر ئەم کوێرییەی‌دانابوو، یان هەتا دیاری کرانی ماوە و مەودای دەرمان کردن وسازکردنی واکسێنێک کە بتوانێ بەرگری لە پەل و پۆ هاویشتنی بکا،پێویست بوو تەواوی ئەو کەسانەی کوێر بوون یان بە شێوەیەک‌تێکەڵاوییان لە تەکیانا بووە، کۆ بکرێنەوە و بخرێنە ژێر چاوەدێری وجەغزیان لە دەور بدرێ، چونکە ئەم مەبەستە تەواو ئاشکرایە کە بە پێی‌یاسای ریازی وەها بابەت گەلێ کەم و زۆر بە شێوەی ئەندازەیی‌هەڵدەکشێن و پەرە دەگرن. جەنابی وەزیر لە کۆتاییدا رستەیەکی لاتینی‌ئاوای بە زاردا هاتبوو، مەبەست ئەوەیە. بە پێی داب و نەریتێکی کۆنی‌سەردەمی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی چاوقوڵکە و زەردەیاو، ئەوپاپۆڕانەی گیرۆدە یان گومانلێ‌کراوی نەخۆشیی چڵک و کێم بوون،دەبوو چل رۆژان لە دەریادا بمێننەوە و بە زمانێکی ساکارتر تەواوی ئەوکەسانە تا راگەیەندراوی دوایی قەرەنتینە دەکران. خودی وەزیر رستەی‌هەتا راگەیەندراوی دوایی بە ئانقەست، بەڵام بە شێوەیەکی تەوساوی بەزارادا هات، چونکە شتێکی دیکەی بە بیرا نەهات و دواتر مەبەستی خۆی‌شی کردەوە. فەرقی نەدەکرد کە چل رۆژ، چل حەوتوو، چل مانگ یان‌چل ساڵ بێ، نێوکی قسەکە ئەوە بوو کە دەبێ قەرەنتینە بن. سەرۆکی‌دەستەی پێ‌ڕاگەیشتن و هێمنایەتی کە لەڕێوە بە مەبەستی راگواستن وقەرەنتینە و چاوەدێری نەخۆشان هەڵبژێرابوو گوتی ئێستە دەبێ‌شوێنێک بدۆزینەوە بۆ راگرتن و نیگادارییان جەنابی وەزیر، وەزیرپرسی کوێمان بە دەستەوەیە، شێتخانەیەکی بەتاڵ کە تەمای لە سەرنەگیراوە، چەند بنکەی سەربازی کە بە هۆی نوێ کرانەوەی‌رێکخستنەوەی ریزەکانی سپا هەر وا ماونەوە، ساختومانێکی روو لەتەواو بوون کە بۆ نوێنگەی کەل‌وپەل دانراوە و تەنانەت فرۆشگەیەکی‌گەورە کە کەس نازانێ بۆچی خەریکە کۆ کرێتەوە، بە بڕوای ئێوە کامیان‌لە هەموان بە کەلک‌ترە، بنکە سەربازییەکان بۆ پاراستن باشترن، بەڵێ‌وایە، بەڵام بێ ئیرادیش نین، بەربڵاوی ئەو شوێنانە هەم ئاگاداریی لەقەرەنتینە کراوەکان ئەستەمتر دەکەن و هەمیش پڕ خەرجن، بەڵێ‌دەزانم، بەڵام رەنگە بۆ فرۆشگەکە تووشی گیرە و کێشەی حقووقی بین،خۆ ناکرێ یاسا وەلا بندرێ، نوێنگەی کەل‌وپەل چۆنە، جەنابی وەزیر لام‌وایە دەبێ دەستی لێ‌هەڵگرین، بۆ، خاوەنانی

پیشەسازی پێیان خۆش نیە،چەند میلیۆنیان تێدا خەرج کردووە، کە وایە هەر دەمێنێتەوە شێتخانەکە،بەڵێ جەنابی وەزیر، شێتخانەکە زۆر باشە، کە وایە هەر ئەو شێتخانەیەدیاری بکەین باشە، سەرەڕای ئەوەش وادیارە باشترین پێداویستیشی هەیە، چونکە نە تەنیا دیواریان لە دەور کێشاوە، بەڵکوو کراوەتە دووبەش، دەکرێ کوێرەکان لە بەشێکا دابین بکەین و ئەوانەی مەترسیی ئالوودە بوونیان هەیە لە بەشەکەی ترا، هەروەها بەشێکی ناوەندیی بەبەتاڵی دەمێنێتەوە و دەکرێ لەوێوە ئەو کەسانەی کوێر دەبن بەرێ کەینەلای ئەوانی تر، بەڵام ڕەنگە گرفتێکیش پەیدا بێ، چ گرفتێک جەنابی وەزیر،ئێمە ناچارین کەسانێک بۆ هێنان و بردنیان دیاری بکەین و گومانم هەیەکەس خوازیاری ئەو کارە بێت، لام وا نیە پێویست بێ جەنابی وەزیر،چۆن، دڵنیا بن کەسێک گومانی ئەو نەخۆشییەی لێ بکرێ درەنگ یا زووکوێر دەبێ و ئەوانەی ساغن ڕەپاڵی دەنێن، بەڵێ ڕاست دەکەی، کە وا بووڕێگا نادەن هەر کوێرێک بە مەیلی خۆی شوێن بگوێزێتەوە، وا دیارەبیرتان لە هەموو شتێک کردۆتەوە، سپاس، کە وایە جەنابی وەزیر ئیزن‌دەفەرموون دەس بەکاربین، بەڵێ بە دەسەڵاتی تەواوەوە.

دەستەی هەڵبژێراو زۆر بە باشی و خێرایی کەوتە کار. بەر لە ڕۆژئاوا بوون تەواوی کوێرە ناسراوەکان و ئەو کەسانەی مەترسیی ئالوودە بوونیان لێ‌دەکرا کۆ کرانەوە، یەکەم کەسانێک کە ڕاگوێزرانەشێتخانە چۆلەکە دوکتۆر و خێزانی بوون. سەرباز لەوێ ئێشکیان‌دەکێشا. دەروازەکە هەر ئەوەندە کرایەوە کە ئەم دووە تێوە بچن و پێیدارابرن، پاشان خێرا داخرایەوە. لە دەروازەوە هەتا دەرگای‌ساختومانەکە پەتێکی ئەستووریان لە جیاتی دەسگیرە ڕایەڵ کردبوو،گرووبانەکە گوتی بڕێک بە لای دەستە ڕاستا بڕۆن تا دەگەنە پەتێک،بیگرن و یەکڕاست بچنە پێش هەتا دەگەنە پلیکانەکان تەنیا شەش پلیکانە. لە ژوورەوە پەتەکە دەبوو بە دوو لۆ، یەکیان دەچوو بۆ لای چەپ وئەوی تر بۆ لای ڕاست، گرووبانەکە هەرای کرد بڕۆن بۆ لای ڕاست. ژنەکە چەمەدانەکەی بە دوای خۆیا ڕەکێش دەکرد، شووەکەی بردەنیزیکترین ژوورێ کە لە دەرگاوە دوور نەبێ. هۆدەکە تەسک ودرێژووکە بوو، چەشنی بەشێکی کۆنە نەخۆشخانەیەک و دوو ریزتەختی بۆری ڕەنگ پەڕیو پاڵیان وێک‌دابوو. ڕووتەختیی و پەتوو ومەلافەکانیش ڕەنگیان بە ڕوانەوە نەمابوو. ژنە دەستی مێردەکەی کێشاو بردییە بنەبان و لە سەر تەختێکی دانا و گوتی لێرە دانیشە، دەڕۆم‌چاوێک بەو دەوروبەرانەدا بگێڕم. ساختومانەکە چەند بەشی دیکەی پڕلە ڕێڕەوی باریک و درێژ، هۆدە گەلێ کە ڕەنگە هی دوکتۆران بووبن وئاودەستی تاریک و پشووبڕی هەبوو، چێشتخانەیەک کە هێشتاش بۆنی‌بەرماوی برشاوی

لیٚدەهات، ژوورێکی شێو خواردنی پڕ لە مێزیناقۆلای کانزایی، سێ هۆدەی بچووک کـە لـە دامێنــەوە بــە بڵــیندایی دووگــەزان رووکێشــی نــەرمیان لــێدرابــوو و بــۆ ســەرتریش بــە چێوپەمۆداپۆشرابوون خۆیان دەنواند. لە پشتی ساختومانەکە حەوشـەیەکیوێـرانی پـڕ لـە داری رووتەکەی بێ خزمەتی تێکوڵکراو دەهاتنە بەرچاو. پڕ بـوو لـە زبڵـوزاڵ، دەتگـوت کەلاوەیـە. ژنەکەی گەڕایەوە ژوور، لەدۆلابییەکی نیوەتاکـا قۆڵبەسـتی تایبـەتی شـێتانی بـەچاو ئـەنگاوت. کەهاتەوە لای مێردەکەی گوتی دەزانی ئێمەیان هێناوەتە کوێ، نـا، ژنەویسـتی بڵـێ شـێتخانە، بەڵام شووەکەی دەستی خۆی رەپێش خست وقسەکەی گـۆڕی، تـۆ کـە کـوێر نیـت، نـاتوانم ئیزنی مانەوەت پێبدەم، بەڵێتـۆ راسـت دەکـەی، مـن کـوێر نـیم، جـا کـە وایـە پێیـان دەڵـێم بتنێرنەوە بۆ ماڵ،پێیان دەڵێم درۆت کردووە هەتا بەجێم نەهێڵی، بێ فایدەیە، لـەوێوەگوێیان لـە دەنگت نابێ، ئەگەر گوێشیان لـێبێـت ولامـت نادەنـەوە، بـەلام خۆتـۆ دەبـینی، بەڵـێ جـارێ، بــێونــەبێ منــیش لــە داهاتوویــەکی دوور و نیزیکـداکوێر دەبم، تکـا دەکـەم بـڕۆوە بـۆ مـاڵ، پێدامەگرە، مەرج دەکەمسەربازەکان ناهێڵن لە پلیکانەکانیش نیزیک ببمەوە، نـاتوانم ناچـارت کـەم،نا خۆشەویسـتەکەم، نـاتوانی، مـن دەمێنمـەوە تـا یارمـەتی تـۆ و ئـەو کەسـانەبدەم رێیـان دەکەوێتە ئێرە. بێگومان وا بیر دەکەیەوە کە ئێمە لێرە بەتەنیا نابین، ئەوە شێتییە، دەیجا پێت وا بوو چۆنە، خۆ ئێمە لەشێتخانەین.

کوێرەکانی تر وێکڕا هاتن. یەک بە دوای یەکا هەموویان لە ماڵەوەدەردەسـت کردبـوون، پێش هەموان ئەو کابرایەی ئوتـۆمبیلی لـێدەخوڕی،پاشـان دزەی گـۆڕین، دواتـر ئـەو کچـەی چاویلکەی رەشی دەکردە چاوی‌و ئەو کوڕە خێلەی لەگەڵ دایکی چووبـوو بـۆ نەخوشـخانە و لەوێوەشوێنیان هەڵگرتبوو. دایکی لە تەکیا نـەهاتبوو، بـە رادەی ژنی دوکتـۆریچـاوان وریـا و زیرەک نەبوو کە بە ساغی خۆی بە کوێر نواندبوو،ئینسانێکی ئەوەندە رەپوراسـت و بـێفێڵـە تەنانــەت بــە زەرەریشــی بــێدرۆی بــۆ نــاکرێ. شــل و کــوت و تلاســکە بەسـتوو وەژوور کەوتن،دەستیان لە حەوادا هەڵدەسووڕاند، ئیتر لێرە پـەتێک نـەبوو هـەتاریێنوێنیان بێـت، دەبـوو خەم و کوێرەوەری خوو گرتن بەم شوێنەوە لەنێوچاوانی خۆیان بنووسن، منداڵـەکە دەگریـا و داوای دایکی دەکرد وکچەی چاویلکە رەش هەوڵی دەدا بیلاوێنێتەوە، دەیگوت دێت، دێـت. لەبەرئەوەی کیژەکە چاویلکەی رەشی لە چاوا بوو دەکرا هەم بە کوێر و هەمبە سـاغ بزانـدرێ، ئەوانی تر چاویان بۆ هەموو لایەک دەسووڕاند وهیچیـان نـەدەدیت، کـەچی کچـە لەبـەر ئـەو چاویلکە رەشانە یەکبیندەیگـوت دێـت، دێـت دەتگـوت هـەر بەڕاسـتی دایکـی هیوابـڕاوی

کوڕەی‌دەبینی کە لە دەرگا وەژوور دەکەوت. ژنی دوکتـۆر داهاتـەوە و بـە گـوێی‌شـووەکەیا چرپاند، چوار کەسی دیکەشیان هێناوە، ژنێک و دوو پیاو وکوڕێکی تەمەن کاڵ. چاوپزیشـک پرسی بیچم و قەڵافەتی پیاوەکان چۆنە،ژنە بۆی باس کرد و چاوپزیشک گوتی یەکیان ناناسم، بەڵام وەکووباست کرد یەکیان دەبێ هەر ئەو پیاوە بێ کە لە مەتەب هاتـە لام. کوڕەکەخێلـە و کچە چاویلکەی رەشی لە چاو دایە، جوانە، هەرکیان هاتنە مەتەب. ئەوان بەم هەرا و هەڵلایەی کە بۆ دۆزینەوەی شوێنێکی باش سازیان‌کردبوو، ئەم وت‌وویژەیان نەبیست، رەنگە وەیانزانیبـێ کـە کەسـێکی وەک‌ئـەوانی لـێ‌نیـە و هێنـدەش بـە سـەر کـوێر بوونیانـدا تێنەدەپـەڕی کـە هەستی‌بیستنیان لە رادەی ئاسایی بەهێزتر بوویێت. لە ئاخریدا بە گوێرەی ئەوپەندەی کە دەڵـێ، سـەرێ کـە خـەوی هـات، سـەرینی نـاوێ، هـەر کامێکیـان لەسـەر یەکـەم تـەختێ کـە تێـی هەڵەنگووتن، دانیشتن، بەم شێوەیە دووپیاوەکە بێ ئـەوەی خۆیـان بـزانن کەوتنـە پـاڵ دەسـتی یـەکتر. کچـە هێشـتاش‌لەسـەرەخۆ کوڕێژگـەی دڵخۆشـی دەدایـەوە، مـەگری، خاترجـەم بـە دایکت‌زوو دێت. بێ‌دەنگییەک ولاتی داگرت، پاشان خێـزانی دوکتـۆری چـاوان بـەدەنگێکی بـەرزی وا کـە هـەموو گوێیـان لـێ‌بـێ، گـوتی ئێمـە لێـرە دوو کەسـین،ئێوە چەنـدن. دەنگـی چاوەڕوان نەکراو هەموویانی هەڵبەزاندەوە، بەڵام‌دوو پیاوەکـە هـەر بـێ‌دەنـگ مانـەوە و تـەنیا کچـە ولامـی دایـەوە، لام وایـەچوار کەسـین مـن و ئـەو کـوڕە بچکۆلـە، هاوسـەری دوکتـۆر پرسـیاری کردکێـی دیکەشـە، بـۆچی ئـەوانی تـر قسـە ناکـەن، دەنگێکـی لـەرزۆکی پیاوانـە کەدەتگوت بە زۆری لە گەروو دێتە دەر هاتە گوێ، منیش لێرەم، دەنگێکی‌پیاوانەی دیکـە بـە خەمەوە گوتی، منیش. خێزانی دوکتۆر بە خـۆی گـوت‌دەڵـێی دەترسـن پێـک ناسـیاو بـن. لـە ئاڵۆزی و دڵەڕاوکە و نیگەرانیانی‌روانی، وایان مل کێشابوو دەتگوت دەیانهـەوێ بـۆن بکـەن، بەڵام‌بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە هەموویان لە وەزعێکدا بوون، ترساو وبزرکـاو، بـەڵام روخسـاری ترساو و پڕهەڕەشەیان وێک نەدەچوو. سەری سوڕما، دەبێ چییان لە مابەینا رابردبێ.

لەم کاتەدا دەنگێکی گڕ و ناخۆش و تیژ بەرز بۆوە، لە راوێـژی‌ڕادیـارە بـوو خـاوەنی ئـەم دەنگە خووی بە دەستوور دان گرتووە. دەنگەکەلە بڵیندگۆیەک‌ڕا دەهات کە لە سەر دەرگای هاتنە ژوورەوەهەڵواسرابوو. وتەی سرنج بدەن سێ جار سێ‌پـات بـۆوە، پاشـان دەنگەکـەگوتی دەوڵەت زۆر بە داخە کە لە رووی ناچارییەوە ئەرکی یاسایی‌خۆی بۆ پاریزگاری لە گەل، لـەم هەل‌ومەرجە ئاستەنگەدا بە هەمووشێوەیەک بەڕێوە دەبا، بە رواڵەت وا دیـارە کـە کوێرییـەکی لێوەگر بلاوبۆتەوە و بە شێوەیەکی کاتی پێی دەگـوترێ نەخۆشـیی سپی، ئێمـە بۆبـەرگری لـە

پەرەگرتنی ئەو نەخۆشییە پاڵمان داوە بە ویژدانی گشتیی وهاوکاری تەواوی هاووڵاتیان، گریمان ئەوەیە کە بەرەو رووی‌نەخۆشییەکی پەرەگر بووینەوە، ئەویش نەک تەنیا لە رووی ئەم چەندهەڵکەوتەی کە مەبەستی هاوکات بوونیان هێشتا قسەی لە سەرە. تەمای‌ورد و باریک گیراوە بۆ ئەوەی تەواوی ئەو کەسانەی ئالوودە بوون یابە شێوەیەک پێوەندییان لەگەڵ نەخۆشەکان بووە لە شوێنێک کۆبکرێنەوە و تێکەڵ نەکرێن. دەوڵەت ئەرکی خۆی بە تەواوی دەزانێ وهیوادارە بیسەرانی ئەم راسپاردەیەش کە بێ‌گومان هاووڵاتیانێکی‌رێزدارن ئەرکی خۆیان بزانن و تێبگەن کە ئەم دابڕانەی ئێستا لەئەستۆیان هالاوە لە سەرووی قازانجی تاکە کەسییە و نیشانەی‌یەکگرتنیانە لەگەڵ جەماوەر. بە سرنج دان بەم وتانە داوا دەکەین‌هەمووتان بە وردی گوێ بدەنە ئەم دەستووراتە، یەک، چراکان قەت‌ناکووژێنەوە، هەر هەوڵێک بۆ دەستێوەردانی کلیلەکان بێهوودەیە،هیچیان کار ناکەن، دوو، چوونە دەر لێرە بە بێ ئێزن بە مانای مردنی‌لەرێوەیە، سێ، لە هەر بەشێکا تەلەیفوونێک هەیە کە تەنیا بۆ داخوازی‌کەل‌وپەلی پاک و خاوێنی لە دەرەوەڕا دابین کراوە، چوار، قەرەنتینەکراوەکان دەبێ جلەکانیان بە دەست بشۆرن، پێنج، پێشنیار دەکرێ کەنوێنەری هەر بەشێک دیاری بکرێت، ئەمە پێشنیارە نەک دەستوور،قەرەنتینە کراوەکان چۆنیان پێ‌خۆشە وا خۆ رێک خەن، بەو مەرجەی‌رێ و شوێنی دیاری‌کراو بپارێزرێ، شەش، هەموو رۆژێ سێ جارچێشت و خواردەمەنی لە بەر دەرگای راست و چەپ دادەندرێ و دەبێ‌لە نێو نەخۆشەکان و ئەو کەسانەی وێدەچی تووشی نەخۆشیی بوون‌دابەش بکرێ، حەوت، هەر چی پاش خوان و دەوری و کەوچک و چنگاڵەدەبێ بسووتێندرێ، ئەوانە گشتیی لە کەرەسەی ئاوربەر ساز کراون،هەشت، تەنیا لە حەسارەکانی ژوورەوە یا مەیدانی وەرزشدا ئیزنی ئاورکردنەوە هەیە، نۆ، قەرەنتینە کراوەکان بەرپرسی هەموو چەشنەسووتمانێکن، دە، بێتوو ئاورەکە پەرە بگرێ راسپێراوانی ئاورکوژێنەوەخۆی تێناگەیەنن، یازدە، هەر بەم شێوەیە قەرەنتینە کراوەکان لە کاتی‌پەیدا بوونی هەر چەشنە نەخۆشیی و ئاڵۆزییەکدا نابێ چاوەڕوانی خۆتێهەڵقوتاندنی دەرەوە بن، دوازدە، بێتوو بە هەر هۆیەک کەسێ بمرێ‌دەبێ خۆتان بێ هیچ رێ و رەسمێک بینێژن، سێزدە، پەیوەندی نێوان‌ئەو بەشەی نەخۆشەکانی لێیە و ئەو بەشەی تر کە گومان‌لێ‌کراوەکانی‌تێدایە دەبێ لە سەرسەرای ناوەندیی چوونە ژوورەوە ئەنجام بدرێ،چاردە، بێتوو گومان‌لێ‌کراوەکانی ئەم نەخۆشییە کوێر بن، خێرادەگوێزرێنە بەشەکەی تر، پازدە، ئەم

ئاگادارییە هەموو ڕۆژێک لەم‌کاتەدا بۆ حاڵی بوونی تازەهاتووەکان بڵاو دەکرێتەوە. دەوڵەت و میللەت‌چاوەڕوانن تێکڕای ژن و پیاوەکان ئەرکی خۆیان بەڕێوە بەرن. شەوباش.

پاش ئەو بێ‌دەنگییەی باڵی بە سەر وڵاتا کێشا بە ئاشکرا دەنگی کوڕەبچکۆلانەکە دەبیسرا کە داوای دایکی دەکرد، بەڵام وشەکان دوور لەهەموو هەستێ چەن پات دەبوونەوە، دەتگوت ئامێرێکی خۆکاری قوڕگ‌گیراوە و لەپڕ کەوتۆتەوە گەڕ و یەک‌بین لە سەری دەڕوا. دوکتۆر گوتی‌بەو دەستوورانەڕا وا دیارە ئێمەیان جوێ کردۆتەوە، ڕەنگە تا ئێستاکەسیان ئاوا لە خەڵک جیا نەکردبێتەوە، چما دەرمانێک بدۆزرێتەوەئەگینا هیچ ئومێدی رزگار بوونمان نیە، کچەی چاویلکە لە چاو گوتی من‌دەنگتان دەناسمەوە، من دوکتۆرم، دوکتۆری چاوان، تۆ دەبێ هەر ئەودوکتۆرە بی کە دوێنێ من چوومە لای، دەنگتان دەناسمەوە، بەڵێ، ئێوەکێن، من پێلووی چاوم دەزوورانەوە و ماسی بوون و لام وایە هێشتاش‌نەنیشتوونەوە، بەڵام ئێستا کە تەواو کوێر بووم ئیدی فەرقێکی ناکا، ئەومناڵەی لەگەڵتە چۆنە، ئی من نیە، من مناڵم نیە، دوکتۆر پرسی من دوێنێ‌مناڵێکی خێلم موعایەنە کرد، تۆ هەوی، کوڕە وڵامی داوە، بەڵێ خۆمم،دەنگی وەک راوێژی رەنجاوی کەسێ دەچوو کە پێی خۆش نیە باسی‌نوقسانیی ئەندامی بکرێ و هەقیشی بوو، چونکە ئەو کەمایەسییانەش‌هەر وەک نوقسانی تر هەتا باسیان نەکرێ بەرچاو نابن، بەڵام پاشان‌تەنانەت دزێویش دەنوێنن. دوکتۆر پرسی لێرە کەسی دیکەش هەیە کەمن بیناسم، داخوا ئەو پیاوەی دوێنێ بە هەڵکەوت لەگەڵ خێزانی هاتبوەلام لەگەڵ ئێوە نیە، ئەو پیاوەی لە کاتی ماشێن لێ‌خوڕیندا لە پڕێ کوێرببوو، کوێرەپیاو وڵامی دایەوە، بەڵێ لێرەم، داخۆ کەسی دیکەشی لێیە،تکایە قسە بکەن، تەنیا خودا دەزانێ ئێمە ناچارین تا کەنگێ بە یەکەوەبین، جا هەر بۆیە پێویستە لەگەڵ یەکا ئاشنا بین، دزی ئوتۆمبیل لەبەرخۆیەوە گوتی بەڵێ، بەڵێ، لای وا بوو هەر ئەوەندە تەواوە، بەڵام‌چاوپزیشک پێداگری کرد، ئەوە دەنگی مرۆیەکی تۆزێ جەوانە، تۆ ئەوپیاوە پیرە نی کە چاوی مرواری هێنابوو، نەخێر دوکتۆر هەو نیم، چۆن‌کوێر بووی، لە شەقام بە رێدا دەڕۆیشتم، پاشان چی، ئیتر هیچ، بە رێدادەڕۆیشتم کە لەپڕ کوێر بووم. دوکتۆر خەریک بوو بپرسێ کە ئەویش‌تووشی کوێریی سپی هاتووە کە گێڕایەوە، پرسینی بۆچ بوو، چ رەش بێ‌و چ سپی لێرە وەدەر ناکەون. بە ئاسپایی دەستی بۆ لای هاوسەری درێژکرد و لە نیوەی رێدا دەستیان تێک‌هاڵقا. ژنەکەی روومەتی ماچ کرد، هیچ‌کەس لەوێ ئەو نێوچاوانە تاڵە، ئەو دمە داتەپیوە، ئەو چاوە مردووانەی‌چەشنی مەڕمەڕە شووشە و پڕ ترس بوون نەدەدیت، چونکە وێدەچوودەبینن و نەیاندەبینی، بە خۆی گوت

نۆرەی منیش دێت، رەنگە دروستھەر ئێستا بگاتە سەرم و نەھێڵێ ئەم رستەیە تەواو کەم، رەنگە ھەر کاتبگاتێیە، ھەر وەک ئەوانەی کردووە بە تووشی خۆیەوە، یان رەنگە، بەکوێری لە خەو ھەستم یا ئەو کاتەی چاو لە سەر یەک دادەنێم ھەتابنووم و بەو خەیاڵەوە وێژینگ دەدەم کوێر بم.

لە چوار کوێرەکانی روانی، ھەموویان لە سەر تەختی خەودانیشتبوون، ئەوەندە کەلوپەلەی پێیان ھاتبوو ھەر لەبەر پێیان بوو،کوڕەکە جانتای قوتابخانە و ئەوانی تر ھەر کام چەمەدانێکی بچووکیانبەلاوە بوو و دەتگوت بۆ حەسانەوەی ئاخری حەوتوو ئامادە بوون. کچەی چاویلکە لە چاو لەسەرەخۆ کوڕەی دەدواند، لە ریزی پێشەوەکوێرەپیاو و دزەی گۆرین بێ ئەوەی خۆیان بزانن بەرەو رووی یەکتردانیشتبوون و تەختێکیان نێوان بوو. ھەموومان دەستوورەکانمانبیست، دەبێ دڵنیا بین ھەر رووداوێک بقەومێ کەس وەفریامان نایا، کەوایە دەبێ ھەر چی زووتر خۆمان رێکوپێک کەین، چونکە ھێندەیپێناچێ کە ئەو بەشە و بەشەکانی دیکەش پڕ دەبن، کچە پرسی چۆندەزانی ئێرە بەشی دیکەشی ھەیە، ھاوسەری چاوپزیشک شی کردەوەئێمە بەرلەوەی تەما بگرین لەو بەشەدا کە لە دەرگاوە نیزیکە بنەگر بینتەواوی ئێرەمان بە باشی پشکنی، لێرەدا دەستی مێردەکەی راکوشیھەتا حاڵی بێ کە دەبێ لە قسە کردنیا وردوخورد و بە پارێز بێ. کچەگوتی دوکتۆر وا باشە تۆ ببی بە بەرپرسی ئەو بەشە، لای خۆی ئێوەدوکتۆرن. دوکتۆری بێ دەوا و دەرمان و چاو بە کەلکی چ دێت، بەلامئێوە ئەو کارەتان لێدەکاڵێتەوە، ژنەکەی بزەیەکی ھاتێیە، بە بڕوای منقبووڵی بکەی باشە، بەو مەرجەی ئەوانی تریش ھاودەنگ بن، لام وا نیەکارێکی دروست بێ، بۆچی، ئێمە جارێ لێرە شەش کەسین، بەلامبێونەبێ ھەتا سبەینێ زۆرتر دەبین، ھەموو رۆژێ ژومارەی میوانانبەرەو ژوورتر دەڕوا، چاوەڕوانییەکی زۆر بێجێیە بێتوو لێیان بخوازینسەرۆکایەتی کەسێ قبووڵ بکەن کە ھەڵیان نەبژاردووە، تازە جگەلەوەش گریمان تێکرا بیانھەوێ ملکەچی دەسەلاتی من بن، خۆ من لەبەرامبەر ئەو رێز و سەردانەواندنەدا ھیچم لە دەس نایە، کە وایە ژیانلێرەدا تەواو دەکەوێتە تەنگەژەوە، بێتوو ھەر ئاوامان رزگار بێ تەواوبەختەوەرین. کچەی چاویلکە لە چاو گوتی مەبەستێکی خراپم نەبوو،بەلام ھەموو شتێک رەپوراست خۆشە، دوکتۆر ھەق بە تۆیە، ھەر کەسبە ڕێی خۆی.

یەکێک لە پیاوەکان کە یان بەم وتانە ھەڵچووبوو یان ئیتر نەیدەتوانیتووڕەیی خۆی بخواتەوە، دەرھەڵبوو و گوڕاندی، ئەو خوێڕییەھەموومانی چارەڕەش کردووە، ئەگەر چاوم

دەیدیت ئێستا حەقی خۆییمدەنا بەری دەستی، ئاماژەی بە شوێنێ کرد کە لای وا بوو پیاوەکەی ترلەوێیە. ئامانجەکە هێندە دوور نەبوو، بەلاَم شێوەی راسان وجوولانەوەی سەیر و گالَتاوی بوو، چونکە ئەنگوستی تاوانی بەرەومێزی بێ گوناهی پەنا تەختەکە راداشتبوو. چاوپزیشک گوتی لەسەرەخۆبە، کەس بەرپرسی ئەو جۆرە نەخۆشییانە نیە، هەموو هەر قۆچیقوربانن، ئەگەر من پیاوێکی خێرۆمەند نەبووبام، ئەگەر یارمەتیمنەکردبا بگاتەوە مالَ، ئێستاش هەر خاوەنی دوو چاوی جوان بووم،دوکتۆر پرسی تۆ کێی، بەلاَم سکالاَکار ولاَمی نەداوە و ئێستا دەتگوتلەم خۆ ئاشکرا کردنە نارِەحەتە. پاشان پیاوەکەی دیکە وەقسە هات،بەلَێ منی بردەوە مالَ، بەلاَم پاشان هەلی قۆزتەوە و ئوتۆمبیلەکەیلێدزیم، درۆیە، من هیچ شتێکم نەدزیوە، بەلَێ بەلَێ دزیوتە، ئەو کەسەیئوتۆمبیلی تۆی دزیوە من نەبووم، جا وەرە و چاکە بکە، چاوت دەرێ،ئەوجار زۆریشم پێخوشە بزانم چۆن لەخۆوە تاوانبارم دەکەی، کواشاهیدت. هاوسەری دوکتۆر گوتی ئەو دمەقرِەیە لە خۆوەیە و ئاکامێکیلێوەرناگیرێ، ماشێنەکە لە دەرەوەیە و ئێوە لێرە، باشتر وایە لێیگەرِێن،ئەوەتان لە بیر بێت کە ئێمە ناچارین لێرە بە یەکەوە بین، کوێرەپیاو گوتیمن لەو جەغزە دەر باوێن، دەچمە بەشێکی دی، دەمهەوێ ئەوەندەیدەکرێ لەو فێلَەبازە کە دلَی هات سامانی کوێرێک بدزێ دوور بم،ئەوجار قەرزداریشم دەکا، دەلَێ من بوومە هۆی کوێر بوونی، دلَمدامرکا، لانی کەم ئەوە دەری دەخا کە لەو دنیایەش عەدالَەت هەیە. چەمەدانەکەی دەس دایە و لاقی بە دوای خۆیدا خشکاند هەتا لە شتێکنەگیرێ و بە دەستەکوتە بە باریکەرِێی نێوان دوو ریزە تەختەکانداکەوتە رێ، پرسی بەشەکانی دیکە لە کوێن، بەلاَم ئەگەر ولاَمێکیشدرایەوە نەیبیست، چونکە لە پرِێ کەوتە بەر رەهێلَەی مست و پێلاقە،ماشێن دزەکە بە باشترین شێوە هەرِەشەکەی بردە سەر و تۆلَەی لەوکابرایە ئەستاندەوە کە ئەوی بە هۆی چارەرِەشی خۆی دەزانی. لەوتەنگەبەرییەدا ئاوقای یەک بوون و جارێک لە سەر و جارێک لە ژێریەکتریان سوویەوە و خۆیان بە پێچکەی تەختەکاندا دا و بەم شەرِ وهەلَلایە کورِە خێلە کە دیسانەوە ترسابوو، زۆرِ زۆرِ دەستی کردەوە بەگریان و هاواری دایکی دەکرد. هاوسەری چاوپزیشک قۆلَی مێردەکەیگرت، دەیزانی بە تەنیایی ناتوانێ لێکیان کاتەوە، بە باریکەرِێی نێوانتەختەکاندا ئەوی بردە شوێنێک کە دوو دوژمنی غەزریو لە سەر عەرزدەبەریەک راچووبوون و دەهانکان. دەستەکانی مێردەکەی بردە پێشهەتا یەکیان بگرێ و خۆشی ئەوی تری گرت کە ئارامتر دەهاتە بەرچاوو بە هەر کوێرەوەرییەک بوو توانیان یەکالاَیان کەنەوە.

دوکتۆر گوتی کردەوەی ئێوە نەفامانەیە، ئەگەر دەتانهەوێ ئێرە بکەنە جەهەننەم، هازاگۆ و هازا مەیدان، بەڵام ئەوەندەتان لە بیر بێ ئێمەیان لێرە بەرەڵڵاکردووە و ناتوانین چاوەڕوانی هیچ یارمەتییەکی دەرەوە بین، گوێتانلێیە، کوێرەپیاو کە لەم شەڕەدا پتری لێدرابوو، بە ناڵینەوە گوتی ئاخرماشێنەکەی دزیوم، هاوسەری دوکتۆر گوتی لەبیر خۆتی بەرەوە، باشەچ کەلکێکی هەیە، کاتێک ئوتۆمبیلەکەی برد کە تۆ نەتدەتوانی سواری بیو لێی بخوڕی، رەنگە وا بێ، بەڵام ئوتۆمبیلەکە هی من بوو، ئەو بەرەڵڵایەبردی و کەس نازانێ لە کوێی جێ‌هێشتووە، چاوپزیشک گوتی زۆروێدەچێ هەر لەو شوێنە بێ کە ئەو کابرایەی لێ‌کوێر بووە، دزە لە نەکاوگوڕاندی، زۆر فێڵەزان و وریای دوکتۆر، بەڵێ قوربان لەو بابەتەوەبێ‌گومان بە. کوێرەپیاو خۆی راپسکاند، وەکوو ئەوەی بیهەوێ خۆیرزگار کا لەچنگ ئەو دەستانەی گرتوویانە، بەڵام زۆری بەڕاست نەبوو،دەتگوت دەیزانی با حەقیشی بە دەست بێ، بەڵام دەرهەڵبوون ناتوانێ‌ئوتۆمبیلەکەی بۆ وەگێرێ و ئوتۆمبیلەکەشی چاوی. بەڵام دزەهەڕەشەی کرد، ئەگەر پێت‌وایە هەر وای دەخۆی خراپی لێ‌حاڵی بووی،بەڵێ من ماشێنی تۆم دزیوە، بەڵام تۆ سۆمای چاوت دزیوم، دەی کێ پتردزە، دوکتۆر ناڕزامەندی دەربڕی، بەس کەن، لێرە هەمووومان کوێرین،نە کەس تاوانبار دەکەین و نە قامک لە سەر کەس دادەنێین، دزە بەگاڵتەجاڕی گوتی چارەڕەشی خەڵک بە من چی، چاوپزیشک بە کوێرەی‌ئەوەڵێی گوت ئەگەر دەتهەوێ بچی بۆ بەشەکەی دیکە خێزانم دەتبا، ئەورێگا لە من باشتر پێ‌دەزانێ، نا، سپاس، تەمام گۆڕا، پێم باشترە هەر لێرەبم. دزە گەپی پێدا و گوتی، وەی لۆ فەقیرە دەترسێ بەتەنێ‌خووخووکەرە بیخوا، دوکتۆر هەڵچوو، هاواری کرد بێ‌دەنگ بە، دزە بەناحەزی تێی راخوڕی، چاکت گوێ لێ‌بێ دوکتۆر، ئێمە هەمووومان لێرەبەرابەرین و تۆ حەقت نیە دەستوور بدەی، کەسێ دەستوور نادا، تەنیادەمهەوێ دەس لە کۆڵ ئەو پیاوە چارەڕەشە کەیەوە، باشە، باشە، بەڵام‌کاتێ بەرەو رووی من دەبی وریای قسە و ئاکارت بە، بێتوو پێ لە کلکم‌بنێن وەردەسووڕێم و دەگەزم، هەم لە دۆستایەتیدا لەخۆبووردووم وهەم لە دوژمنایەتیدا. دزە بە هەڵپە و زرم و کوت تەختەکەی خۆی بەدەستەکوتە دیتەوە و چەمەدانەکەی رادا ژێری، پاشان وەک ئەوەی‌بیهەوێ هەڕەشە بکا رایگەیاند من دەمهەوێ بخەوم، چاوتان بە خەیانەت‌مەگێرین، دەمهەوێ خۆم رووت کەمەوە. کچەی چاویلکە لە چاو بە کوڕەخێلەی گوت وا باشە تۆ بنووی، لەو لایە بخەوە و ئەگەر شەوێ شتێکت‌ویست بانگم کە، مناڵە گوتی میزم دێ. بە بیستنی ئەو قسەیە هەموو لەپڕمیزیان هات و کەم و زۆر فکریان کردەوە باشە

لەگەڵ ئەو گرفتە چبکەین، کوێرەپیاو بە دەستە کوتە ژێر تەختەکەی بۆ دۆزینەوەی ئاوەخانە پشکنی، بەڵام پێی خۆش نەبوو شتێکی وەبەر دەست بێ، چونکەئەگەر لە لای خەڵک میزی کردبا سەری لێدەشێوا. هەڵبەت نەک لەبەرئەوەی دەیانبینی، بەڵام خوشەی میزەکەی بە خۆیا دەشکاندەوە،لانی کەم پیاوەکان دەتوانن فێڵێک بدۆزنەوە کە ژنان ناتوانن، لەو بارەوەشانس زیاتر رووی تێکردوون. دزە ئێستا لە سەر تەختەکەی دانیشتبوو دەیگوت هەی بە گوو گیرێ، بۆ میز کردن روو بکەینە کوێ، کچەیچاویلکە لە چاو گوتی ئاگات لە دمت بێ، ئێرە مناڵێکی لێیە، بە سەر چاوگیانەکەم، بەڵام بێتوو ئاودەست نەدۆزییەوە، هەربینا میزی کوڕەبچکۆلەکەت بە دەلینگی دوولینگەکەیدا هاتە خوار. خێزانی دوکتۆر هاتەنێو قسان، رەنگە من بتوانم ئاوەدەستەکان بدۆزمەوە، بۆنیان دێتەوەیادم، کچە گوتی منیش دێم و دەستی کوڕەی گرت، دوکتۆر هەڵیدایە واباشە وێکڕا بچین، چونکە ئاوا بەڵەد دەبین و هەر کات پێویست بێخۆمان دەچین، دزەی گۆرین بێ ئەوەی بوێرێ بە زمانیدا بێت لە دڵیخۆیا گوتی دەزانم چیت لە مێشکایە، ناتهەوێ هەر جارەی میزم هاتخێزانی جوانکیلەت لەگەڵم بێت. مانای شاراوە لە پشت ئەو فکرەوەتۆزێکی دنە دا و ئیشتیای بزاوت و بوو بە هۆی سەرسوڕمانی، دەتگوتچاوەڕێی ئەوە بووە کە کوێر بوون ببێتە هۆی رۆمرکان و کەمبوونەوەی مەیلی پیاوانەی. بە خۆی گوت زۆر زۆر باشە، کە وا بێهەموو شتێ تێدا نەچووە، لە نێو کوژراو و بریندارانیشدا یەکێک دەتوانێرزگاری بێ، خۆی لە وتوویژەکان کەنار دا و چووە نێو دنیایخەیاڵەوە. بەڵام زۆر دوور نەفڕی، چاوپزیشک دەیگوت ریزێکدەبەستین، خێزانم لە پێشەوە دەڕوا و ئەوانی دیکەش دەست لە سەرشانی یەکتر دابنێن، ئیدی ئاوا کەس ون نابێ. کوێرەپیاو گوتی من لەگەڵئەو کابرایە ناچمە هیچ شوێنێک، راستەوخۆ رووی قسەی لە دزەیگۆرین بوو. چ بۆ دۆزینەوەی یەکتر و چ بۆ پاراستن لە تێکگیران وخۆلێکدان زۆر بە ناخۆشی دەیانتوانی لە رێڕەوە تەسکەکەدا ببزوونو ریز بگرن، چونکە خێزانی دوکتۆر ناچار بوو خۆی بە کوێر دابنێ. سەرەنجام هەموویان ریز بوون، کچەی چاویلکە لە چاو دەستی کوڕەخێلەی گرت، دزە بە ژێرکراس و دەرپێوە کەوتە دوای ئەوان، پاشانچاوپزیشک و لە ئاخری هەموانەوە کوێرەپیاو، کە جارێ پارێزرابوو لەشەڕ و تێهەڵدران. لەسەرەخۆ چوونە پێش، دەتگوت لەو کەسەیرێنوێنیان دەکا دڵنیا نین، لەخۆوە بە دەستە ئازادەکەیان دەستیان دەکوتاو بە دوای شتێکی قایمی وەکوو لاشیپان و دەرگا و دیوارەوە بوون. دزەکە لە پشت سەری کچە دڕۆیشت، بە هۆی هەڵمژینی ئەو بۆن وبەرامەیەی

لییەوە دەپژا و بەیادی مەیلی دەمێک لێرەوبەری، ویستیباشتر کەلک لە دەستەکانی وەربگـرێ و بەدەستێکی نێوشان و ژێر پرچیلاواندەوە و بە دەستەکەی تری بێشـەرم و شـکۆ و دوور لـە ئەدەب،سینەی، کچە خۆی راپسکاند هەتا کلا بێ، بەڵام دزە زۆر توند گرتبووی. کچـە ناچـار بوو بە تـەواوی هێـزەوە لەقەیـەک بـاوێ. ناڵـچەی کەوشـەکەی کـە دەتگـوت درێشـەیە، رانی رووتی دزەی دادڕی و ئەو کە خافڵابوو لەپڕهاواری کرد. هاوسەری دوکتۆر ئـاوڕێکی داوە و پرسـی چیـە، کچـەیچاویلکـە لـە چـاو وڵامـی دایـەوە، لاقـم هەڵخلیسـکا و لام وایـە ئـەوەی پشتسەری خۆم ئەنگاوت. ئێستا خوێن بە نێوان پەنجـەی پـای دزەداشـۆڕاوگەی بەسـتبوو، بـە ناڵین و جنێو دانەوە دەیهەویست بزانێبرینەکەی چۆنە، من بریندار بووم، ئەو سەڵـیتەیە ناڕوانـێ بزانێ لاقی لەکوێ دادەنێ، کچە لەڕێوە وڵامی داوە تۆش ناڕوانی بـزانی دەسـتەکانت لـەکوێ دادەنێی. خێزانی چاوپزیشک تێگەیشت چ رووی داوە، لەپێشدابزەی هاتێیە، بـەڵام دوایـە زانی برینەکە قووڵە، پای پیاوی چارەڕەشخـوێنی پێـدا دەهاتـە خـوار، هـیچ کـەل و پـەلێکی بـرین پێچانیان بە لاوەنەبوو. ریزەکە تێکچووبوو، دوکتۆر پرسی برینەکەت لە کوێیە، لێرەمـە،ئێرەت کوێیە، سەر رانم، نابینی، ئەو فرتۆڵە لەقەی لێدام، کچە دووپاتیکردەوە هەڵخلیسکام، خـۆ بـە خۆم نەبوو، پاشان دەرهەڵبوو و لە زاریدەرپەڕی، ئەو حەرامزادەیـە هەڵیدەپشـاوتم، پێـی وایـە من لەو ژنانـەم. هاوسـەری چاوپزیشـک هەڵـیدایە ئـەو برینـە دەبـێ خێـرا بشـۆرێتەوە ودەرمـان بکرێت، دزە پرسی لە کـوێ ئـاو بێـنین، لـە چێشـتخانە، لـە وێ ئاوهەیـە، بـەڵام پێویسـت ناکـا هەمووومان بچین، من و مێردەکەم دەیبەین، ئێوەهەر لێرە بـن، زوو دەگەڕێینـەوە، مناڵـۆچکەکە گوتی میزم دێ، بڕێکی دیکەخۆت راگرە، خێرا دەگەڕێینەوە. خێزانی دوکتۆر دەیزانی دەبـێ جارێکبۆ لای راست و جارێکیش بۆ چەپ باداتەوە، پاشـان بـە رێڕەوێکـیباریکـدا بـۆ لای راست پێچ کاتەوە، چێشتخانە لە بنەبان بوو. دوای چەندهەنگاوێک وای نواند کە رێگاکەی لێ تێکچووە، راوەسـتا، چـەن هەنگاوگەڕایـەوە و گـوتی ئـەها، ئێسـتە وەبـیرم هاتـەوە و لـەوێوە یەکسەر چوونەچێشتخانە، ماوەیان کەم بوو و برینەکە خوێنی پێدا دەهاتە خـوار. ئـاویشـێرەکە لە پێشدا زۆر لێڵ بوو، ماوەیەکی برد هـەتا روون بۆوە،شـیلەوتین و قـەتیس مـاو، دەتگـوت لـە لوولەکاندا گەنی بوو، بەڵام کەئاویان بـە برینەکـە داکـرد، پیـاوە پشـوویەکی هاتـەوە بـەر. زۆر سەیربریندار ببوو. خێزانی دوکتۆر گوتی ئێستا چۆنی بپێچین. چەند کوتەپـەڕۆی کـۆن لـە ژێـر مێزێکەوە دیار بوون، رەنگە بۆ شۆردن و خاوێنکردنەوەی بـەرپێیان کـەلکیان لـێوەرگیرابـێ، بەڵام وا باش نەبووبرینەکەی پێ ببەستن، ژنە وای نواند کە بە شـوێن شـتێکا دەگـەڕێ وگـوتی

وادیارە هیچی لێنیە، دزە بە نالاندەوە گوتی بەڵام خۆ ناکرێ هەروا بەڕەڵڵا بکرێ دوکتۆر، خوێنم راناوەستێ، تکایە یارمەتیم بدە،سەبارەت بەو بێ ئەدەبییەی ماوەیەک لەمەوبەر بمبوورە، دوکتۆر گوتیدەمانهەوێ یارمەتیت بدەین ئەگینا بۆ لێرە دەبووین، پاشان دەستووریدا هەتا ژێرکراسەکەی داکەنێ، رێ چارەیەکی دیکەمان نیە. پیاوە لەبەرخۆیەوە گوتی ژێرکراسەکەم پێویستە، بەڵام هەر داینا. ژنی دوکتۆر بۆساز کردنی پەڕۆی برینپێچان هەڵی لە دەست نەدا و کردی بە چەندکوت و توند لە دەوری رانی بەست. مرۆڤی کوێر ناتوانێ بە هاسانیهێندێک حەرەکەتی ساکاریش ئەنجام بدا، بەڵام ئەو لە هەلومەرجێکدانەبوو خۆی رابنێ، هەر ئەوەندەی وای نواندبوو رێی لێ گۆڕاوە بەسبوو. دزە هەستی بە شتێکی نائاسایی کرد، ئەگەرچی دوکتۆرچاوپزیشک بوو بەڵام هەر بە شێوەیەکی مەنتیقیش با دەبوو ئەوبرینەکەی پێچابا، بەڵام ئەو کارەی بوێ کرا ئاهێکی هێنایەوە بەر ودوودڵی و گومانی لە مێشکی تاراند. ئەو گومانە لێڵ و تیژتێپەڕانەی لەبیریدا راوێچکەیان دەکرد. وێڕای کابرای زامار کە دەشەلی گەڕانەوەلای ئەوانی تر و کاتێک گەیشتنەوە خێزانی چاوپزیشک لەڕێوە دیتی کەکوڕە خێلەکە خۆی بۆ رانەگیراوە و میزەکەی بە خۆیا کردووە. نەکوێرەپیاو زانیبووی و نە کچەی چاویلکە لە چاو. میز بە دەوری پێیکوڕەدا گەڕی دابوو و هێشتاش دوولینگەکەی دەچۆڕایەوە. ژنی دوکتۆروەک ئەوەی هەر هیچ نەبووبێت، گوتی با بڕوین ئاودەستەکانبدۆزینەوە. کوێرەکان دەستیان بۆ دۆزینەوەی یەکتر کوتا، بەڵام کچەیچاویلکە لە چاو خۆی پاراست و بێ ئەملا و ئەولا گوتی ئامادە نیەوەپێش پیاوێکی بێ شەرم بکەوێ کە دەستی پێداکێشاوە، سەرەنجامریزەکە ساز بۆوە و دزە و کوێرەپیاو جێ گۆڕکێیان کرد و دوکتۆرکەوتە نێوانیان. دزە زیاتر دەشەلی و لاقی بە دووی خۆیا دەکێشا. ئەوبرین پێچانە سفتە ئازاری دەدا و برینەکە بلقەبلقێکی بوو دەتگوت دڵی لەسینەیا هەڵکەندراوە و کەوتۆتە قولکەیەکەوە. کچە دیسانیش دەستیکوڕەی گرتبوو و دەڕۆیشت، بەڵام تا ئەو جێیەی دەکرا کوڕە خۆیدەبوارد نەکا یەکێک پێبزانێ، وەکوو چاوپزیشک کە لەبەرخۆیەوە گوتیلێرە بۆمیزێکی سەیر دێ و خێزانی هەستی کرد دەبێ بۆی بسەلمێنێ،بەڵێ، بۆن دێت، نەیدەتوانی بڵێ لە ئاودەستانەوە دێ، چونکە هێشتا لێیاندوور بوون و چونکە ناچار بوو خۆی بە کوێر بنوێنێ، نەیدەتوانی بڵێئەوە بۆنی دوولینگەی تەڕی کوڕەیە.

تێکڕای ژن و پیاوەکان لە سەر ئەوە پێکهاتبوون هەر کە گەیشتنەئاودەستەکان کوڕە بچکۆلانەکە بەر لە هەموویان بچێتە سەر پێشاو،بەڵام پیاوەکان بە بێ لەبەرچاوگرتنی تەمەن و

پاڵەوپەستۆ وێکرا چوونەژوور، جێی هەڵمیزتنی پیاوان هاوبەش بوو، لەو جۆرە شوێنانە پێویستبوو ئاودەستەکانیش هەر وا بن. ژنەکان لە بەر دەرگا مانەوە، دەڵێن ئەوان خۆڕاگرترن، بەڵام هەر شتێک رادەیەکی هەیە و هێندەی پێنەچووکە خێزانی دوکتۆر گوتی رەنگە ئاودەستی دیکەش هەبن، بەڵام کچەی چاویلکە لە چاو گوتی من کە دەتوانم خۆم راگرم، ژنەش وتی منیش هەرواتر، پاشان بێدەنگی ولاتی داگرت، دواتر سەری قسانیان کرایەوە،چۆن کوێر بووی، هەر وەک هەموان لەپڕ هەستم کرد ئیدی نابینم، لەماڵەوە بووی، نا، کە وا بێ کاتێک لە مەتەبی مێردەکەم دەرکەوتووی تووش بووی، هەر وا زۆروکەم، مەبەستت لە زۆروکەم چیە، یانی هەرپاش وەدەرکەوتن تووش نەبووم، ژانت هەبوو، نا، نەمبوو، بەڵام کاتێک چاوم هەڵێنا کوێر بووم، هی من ئاوای روو نەدا، ئەدی چۆن بوو، من چاوم نەقووچاندبوو، کە مێردەکەم سواری نەخۆش بەرەکە بوو منیش هەستم کرد کوێر بووم، لە بەختانە، لە بەختی کێ، ئی مێردەکەت، ئاوادەتوانن بە یەکەوە بن، کە وا بێ بەختەوەرم، بەڵێ بەختەوەری، تۆمێردت کردووە، نا نەمکردووە و گومانیش ناکەم تازە کەسیش دڵودەماخی زەماوەندی هەبێ، بەڵام خۆ ئەو کوێرییە ئەوەندە نائاساییو لە جەغزی زانست بە دوورە کە ناتوانێ هەتاهەتایی بێ. گریمان هەتامردن هەر وا بووین، ئێمە، بەڵێ هەموو کەس، زۆر ناخۆش دەبێت،دنیایەک پڕلە ئادەمیزادی کوێر، بیر لێکردنەوەشی بڕستبڕە.

کوڕە خێلەکە یەکەم کەس بوو لە ئاودەستان هاتە دەر، هەر پێویستنەبوو بچێ. دەلینگی دوولینگەکەی هەتا ئەژنۆی هەڵکردبوو وگۆرەویەکانیشی دانابوو. گوتی من هاتمەوە، کچەی چاویلکە لە چاوبەرەو دەنگەکەی رۆیشت، جاری یەکەم و دووهەم نەیتوانی، بەڵام کەرەتی سێهەم دەستی لەرزۆکی کوڕەی گرت. برێک دواتر چاوپزیشکپەیدا بۆوە و پاشان کوێرەپیاو، یەکێک پرسی ئەوانی دیکە چییان لێهات،خێزانی دوکتۆر ئێستا دەستی مێردەکەی گرتبوو، کچەش دەستی گێڕا وقۆڵەکەی دیکەی گرت. کوێرەپیاو ماوەیەک کەسی نەدۆزییەوە ونەیتوانی سرنجی کەس رابکێشێ، بەڵام هێندەی پێنەچوو کە یەکێکدەستی لە سەر شانی دانا. ژنی دوکتۆر پرسی هەموو هاتوونەوە،مێردەکەی وڵامی داوە پیاوە برینداره‌کە ماوە هەتا ئەوەکەی دیکەشیبکا. پاشان کچەی چاویلکە لە چاو گوتی رەنگە ئاودەستی تریش هەبن،من چی دیکەم خۆ پێڕاناگیرێ، ببوورن، هاوسەری چاوپزیشک گوتی بابڕۆین بزانین و دەست لە دەستی یەکا رۆیشتن. دوای دە دەقیقانگەڕانەوە، ژوورێکی موعایەنەیان دۆزیبۆوە کە ئاودەستی تایبەتیهەبوو. هەر بەم شێوەیەی کە هاتبوون ریزیان

بەست و بەکوێرەوەرییەکی کەمتر گەڕانەوە شوێنی خۆیان. ژنی دوکتۆر زۆرزیرەکانە و بە بێ شلوێ بوون یارمەتی هەموویانی دا بچنەوە سەرتەختی خۆیان. بەر لە گەیشتنەوەی ژوورەکە، وەکوو ئەوەی بۆهەمووان کارێکی هاسان و ئاسایی بێ پێشنیاری کرد وا باشە بۆدۆزینەوەی جێگاکانمان لە هەوەڵڕا تەختەکان بژمێرین، هەڵبەت تەختیئێمە کەوتۆتە بنەبانی لای ڕاست، تەختی نۆزدە و بیست. یەکەم کەس کەبە باریکەڕێی نێوان تەختەکاندا هەنگاوی نا، دزەی گۆرین بوو. نیمچەرووت وەک مێژۆکە دەلەرزی و دەیهەویست هەر چۆنێک دەکرێهێندێک لە ژانەکەی کەم کاتەوە و هەر ئەو بەڵگەیەش بەس بوو بۆئەوەی بکەوێتە پێش هەموان. تەختا و تەخت ڕۆیی و بە دەستەکوتە لەچەمەدانەکەی گەڕا و کاتێک دۆزییەوە بە دەنگێکی بەرز گوتی ئێرەیە ودرێژەی دا ژومارەی چاردە، ژنی دوکتۆر پرسیاری کرد لە کامە لا، ئەوولامی دایەوە لای چەپ، جارێکی دیکەش تۆزێکی سەرسوڕما، دەتگوتدەبێ ژنە بێ پرسین بزانێ. دوای ئەو کوێرەپیاو هەنگاوی نا. دەیزانیتەختەکەی لەگەڵ هی دزە تەختێکیان نێوانە. ئیتر نەدەترسا بەلایدەستێوە بخەوێ، وەزعی لاقی زۆر شپرێو بوو، بە هاوار وناڵەیڕاجوولانەوەی لا ئەستەم بوو. پاش گەیشتنە تەختەکەی گوتی ژومارەیشازدە، دەستی چەپ و بە جلەوە لێی تخێڵ بوو. پاشان کچەی چاویلکەلە چاو بە دەنگێکی نەرم پاڕایەوە، دەکرێ ئێمەش لە بەری ئێوە بخەوین،ئاوا خەیاڵمان ئاسوودەترە. بە چوار قۆڵی وەڕێ کەوتن و خێرادامەزران. دوای ماوەیەکی کورت کوڕێژگە گوتی برسیمە، کچەکە بەنەرمەسرتە گوتی سبەینێ، سبەینێ شتێکی پەیدا دەکەین بیخۆین،ئێستاکە بخەوە. لە دوایە جانتاکەی کردەوە، لەو شووشە بچووکەدەگەڕا کە لە دەواخانە کڕیبووی. چاویلکەکەی دانا، سەری بە پشتەوەداخست و چاوی داپچڕی و بە دوو دەستان چەند دڵۆپی قەترە تێکردن. هەموو دڵۆپەکان نەڕژانە چاوی، بەلام ئەو سووکەڵە نەخۆشییەی ئاوادەرمان بکرێت، زوو چاک دەبێتەوە.

## کوێری

ژنی دوکتۆر گوتی دەبێ چاوم هەڵێنم. بە درێژایی شەو هەر جارێکوەخەبەر دەهات لە پشت پەردەی پێلووی قووچاویڕا شۆقی کزی ئەمگلۆپانەی دەدیت کە ئەو بەشەیان بەحاڵ

رووناک دەکرد، بەڵام ئێستاگۆڕانێکی دیکەی هەست پێدەکرد، نوورێکی دیکە بەرەو درەوشانەوەدەهات، وێدەچوو شوێن‌پێی یەکەم گزینگی هەتاو بێت یان ڕەنگ بووهەر شەپۆلی ئەو دەریا شیرە بوایە کە وردە وردە چاوەکانی لە خۆیانوقم دەکرد. بە خۆی گوت تا دە ژوماران دەژمێرێ و پاشان چاوی‌هەڵدێنێ، سەر لە نوێ وای گوت و دیسانەوە دەستی کردەوە بە ژماردنو چاوەکانی هەڵنەهێنا. گوێی لێبوو کە شووەکەی لە سەر تەختی پەنادەستی هەناسە هەڵدەکێشێ و یەکێکی تر پرخەی دێت، بە خۆی گوت‌دەبێ برینی پێی ئەو کابرایە چۆن بێ، بەڵام هەر لەو کاتەدا تێگەیشت کەزۆریشی خەم نیە، دەیهەویست وا نیشان بدا کە دڵنیگەرانی مەبەستێکی‌دیکەیە، پێی خۆش نەبوو چاوان هەڵێنێ، ماوەیەکی دی بێ ئەوەی بخوازێ، بە شێوەیەکی سروشتی چاوی کردەوە، بوومەلێڵی بەیانی لەوپەنجەرانەوە کە لە نێوقەدی دیواری‌ڕا دەستیان پێدەکرد و هەتا بستێک‌خوار میچ هەڵکشابوون، خۆی دەنواند، بە ورتە گوتی من کوێر نیم و بەسەرلێ‌شێواوی لە سەر جێوبانەکەی ئاخێزێکی کرد، نەکا کچەی‌چاویلکە لە چاو لە تەختەکەی ئەو بەرەوە دەنگی بیستبێ. بەڵام ئەوخەوتبوو. لە سەر تەختەکەی ئەولاتر، تەختەکەی پەنا دیوار، کوڕەبچکۆلەکەش نوستبوو، هاوسەری چاوپزیشک بیری کردەوە، ئەویش‌هەر وەک منی کردووە، کامە شوێن باش و پەنایە بۆ کوڕەی دابین‌کردووە، چ دیوارێکی ناسک و رووخەک ساز دەکەین، تەنیا بەردێک بەبێ هیچ هیوایەک جگە لەوەی دوژمن تێی هەڵەنگوێ دەخەینە سەر رێگا،دوژمن، کامە دوژمن، هیچ کەس لێرە پەلامارمان نادا، تەنانەت ئەگەر لەدەرەوەش شتێکمان دزی‌بێ یا کەسێکمان کوشتبێ، دیسانیش کەس نایەبمانگرێ، دزەی گۆرین لە هیچ شوێنێک وەک ئێرە نەیدەتوانی بە ئازادی‌سەرهەڵبڕێ، ئەوەندە لە ئادەمیزادان دووریـن هەربینا لەو رۆژانەداخۆمان نەناسینەوە یان تەنانەت ناویشمان لە یاد بەرینەوە، تازە ناو بەکەلکی چ دێت، هیچ سەگێک سەگێکی تر بە ناو ناناسێ، سەگ لە رووی‌بۆنەوە یەکتر دەناسنەوە، ئێستاش ئێمە بووینە تۆرەمەیەکی دیکەی‌سەگان، یەکتر لە رووی وەڕین یا قسە کردنەوە دەناسینەوە و رەنگی‌روخسار و چاو و موو بێ کەلکن، هەر دەڵێی نیشن، ئێستاش هەردەبینم، بەڵام تا کەی، رووناکی کەمێ گۆڕاوە، خۆ ئێستا شەوناگەڕێتەوە، هەڵبەت هەوری رەش گرتوویە بەری ئاسمان و بەیانەی‌وەدوا داوە. ناڵەیەک لە تەختی کابرای دز بەرز بۆوە، ژنەی دوکتۆر بەخۆی گوت بێتوو برینەکە چڵکی هێنابێ خۆ هیچمان نیە پێی دەرمان‌کەین، چارمان ناچارە، لەو هەل و مەرجەدا بچووکترین رووداو دەتوانێ‌ببێ بە کارەساتێک، رەنگە هەر چاوەنواڕی ئەوەش بن کە ئێمە لێرە یەک‌بە

دوای یەکا تێدا بچین، کێوی کە مردن ژاریان نامێنێ. لە جێگاکـەی هاتـەخوار، داهاتـەوە سـەر مێردەکەی، دەیهەویست هەڵیبستێنێ، بەڵام نەیوێراخەوی لە چاوان بگرێتەوە و دیسـانیش ببینـێ هەر وا کوێرە. بە پای پەتی‌و بـە پـێ‌دزە چـوو بـۆ لای تـەختی کـابرای دز. چـاوی بـە مۆڵـەق وەستابوون. هاوسەری دوکتۆر بە سرتە گوتی چۆنی. دزە بەرەو دەنگەکە سەری‌وەرسووڕاند و گوتی خراپ، لاقم زۆر دێشێ، خێـزانی دوکتـۆر خـەریک‌بـوو بلـێ دا بـا ببیـنم، بـەڵام خێـرا قسەکەی قووت دایەوە، هەڵەیەکی چەندەگەورە، بەڵام دزە لە بیری چووبۆوە کە هەموو لەوێ کوێرن و بێ‌راوەستان کردەوەیەکی نواند کـە ئەگـەر چەنـد سـەعات لێرەوبـەردوکتۆرێک لـە دەرەوەی ئێرە پێی‌گوتبا دا با چاوێک لە برینەکەت بکەم،هەر ئەو کارەی دەکرد، پەتووەکەی لادا. تەنانەت لەو تاریک و رووونەشـدائەگەر یـەکێک چـاوی بوایـە دەیـدیت کـە دۆشـەگەکە شەلاڵی خوێنە ودەوران دەوری قوڵکەی رەش داگیراوی برینەکە هەڵماسیوە. برین‌پێچانەکـەی کرابوویەوە. هاوسەری چاوپزیشک بە پارێزوە پەتووەی‌وەرگێڕا، پاشان بە جووڵانـەوەی ورد و خێرا دەستی لە سەر نێوچـاوانی‌پیـاوە دانـا. گـەرم گـەرم دایسـا. روونـاکی ئـەوجاریش گـۆڕا، هەورەکان‌رەوی‌بوون. گەڕایەوە شوێنی خـۆی، بـەڵام ئـەمجارەیان رانەکشـا. روانییەمێردەکـەی کە لە خەودا بە مڵچەملَچ قسەی دەکرد، تەماشای کردە تاپۆی‌ئەوانی دی کە لـە ژێـر پـەتووی بۆردا خۆیان مەڵاس دابـوو، دیوارەکـان‌خەفـەخانی دڵ بـوون و تەختـە بەتاڵـەکان چاوەڕوانی کەسـانی تـر، لێرەدا،لـە قـووڵایی دڵـەوە ئـاواتی دەخواسـت خۆزگـە ئـەویش کـوێر بوایـە هەتاتوانیبای لە نـاخی شـتەکان رۆبچـێ و رێ بەرێتـە ژوورەوی راستەقینەی‌کـوێرایی ماریجـە نەکراو و سرنج راکێشیان.

لەپڕ، لە دەرەوەی ئەو بەشە، رەنگـە لـەو سەرسـەرایەی کەساختومانەکەی دەکـرد بـە دوو قۆڵەوە، دەنگ و هەرایەکی تووڕوتۆسن‌دەهاتە گوێ، بۆ دەرەوە، بۆ دەرەوە، بڕۆنە دەر، لەبەر چاوان ون بن،ناکرێ لێرە بمێننەوە، دەبێ مل‌کەچی رێ و شوێنی ئێرە بن. هەڵڵا وقریوە زیـاتر بـوو، پاشـان دامرکـا، دەرکەیـەک پێـک‌دادرا، ئێسـتا تـەنیادەنگێکی دەبیسـرا هەنیسـک دان و لووشمە لووشمی خەماوی و گرمەی‌وەحەرز کەوتنی کەسێ بوو کە تازە شڵپەی لـێ‌هەسـتابوو و نەدەکرادەگەڵ دەنگێکی دیکە بە هەڵە بگیرێ. هەموو وەخەبەر هاتبوون. تێکڕاسەریان بەرەو لای دەرگای چوونە ژوورەوە وەرسووڕاند، بۆ ئەوەی‌بزاندرێ کوێری دیکـە گەیشـتوونە جـێ پێویست بە چاوی ساغ نەبوو. خێزانی چاوپزیشک هەستایە پێ، چەندەی پێ‌خۆش بوو یارمەتی تازەهاتووەکـان بـدا، بـە دڵـۆوانی بیانـدوێنێ و رێنوێنییـان بکاتـە سـەرتەختەکانیان، پێیـان بڵـێ

لەبیرتان بێت، ئەوە تەختی ژومارە حەوتە و لەدەستی چەپە، ئەوە ژومارە چوارە و لە لای راستە، ئاوا لێتان تێک‌ناچێ،بەڵێ، ئێمە شەش کەسین، دوێنێ هاتووین، بەڵێ ئێمە لە پێش هەمواندااهاتووین، ناومان، ناو چ کەلکێکی هەیە، گۆیا یەکێک لەو پیاوانەئوتۆمبیلێکی دزیوە، یەکیان ئوتۆمبیلی لێ‌دزراوە، کچێکی لێیە کەپەردەیەکی رازی بە سەر خۆیدا کێشاوە و چاویلکەی رەش دەکاتەچاوی و بۆ نیشتنەوەی ئاماسی پێلووی قەترە دەکار دێنێ، چۆن من کوێرم و ئەوەی دەزانم، جا دیارە، شووەکەی من دوکتۆری چاوە و ئەوکیژە بۆ چاک بوونەوە چۆتە مەتبەکەی، بەڵێ مێردەکەشم لێرەیە. هەمووومان لە پڕ کوێر بووین، بەڵێ بەڵێ کوڕە خێلەکەش لێرەیە. بەڵام لەجێی خۆی جووڵەی نەکرد، تەنیا بە شووەکەی گوت ئەوە دێن. چاوپزیشک لە تەختەکەی هاتە خوار، ژنەکەی یارمەتی دا هەتادوولینگەکەی بکاتە پای، گرینگ نەبوو، کەسێ نەیدەبینی، دروست لەم‌کاتەدا کوێرە تازە هاتووەکان هاتنە ئەو بەشە، پێنج کەس بوون، سێ‌پیاو و دوو ژن. دوکتۆر دەنگی هەڵێنا و گوتی ئارام بن، پێویست بەسمرسمر ناکا، ئێمە لێرە شەش کەسین، ئێوە چەند کەسن، جێ بۆهەمووان هەیە. نەیاندەزانی چەند کەسن، کاتێک لە قۆڵی چەپی‌ساختومانەکەوە رایاندابوونە ئێرە زۆر تێک‌گیرابوون، بەڵام نەیاندەزانی‌چەند کەسن. بارگە و بنەیەکیان پێ‌نەبوو. وەختێک لە بەشەکەی خۆیان‌لە خەو هەستان و دیتیان کوێر بوون و لە دەستی بەختی بەد ناڵین،هاوبەندەکانیان تەنانەت رێگایان نەدان مالاوایی لە خزم و ئاشناکانیان‌بکەن و لەرێوە بە زۆرەملی وەدەریان نان. هاوسەری دوکتۆر گوتی‌باشتر وایە بتانژمێرین و هەر کەس ناوی خۆی بڵێ. کوێرە تازەهاتووەکان دڵنیگەران رەق راوەستان، بەڵام دەبوو یەکێک دەستی‌پێ‌کردبایە، لە نەکاو دوویان وەقسە هاتن، زۆر جاران ئاوای لێ‌دێت،پاشان هەردووکیان بێ‌دەنگ بوون و پیاوی سێهەم دەستی پێ‌کرد،ژومارەی یەک، تۆزێک راما، دەتگوت دەیهەوێ ناوی خۆی بڵێ، بەڵام‌ئەوەی گوتی ئەمە بوو، من پۆلیسم، خێزانی چاوپزیشک لێی حاڵی بووکە ناوی خۆی نەگوت، هەر دەڵێی ئەو کابرایەش دەزانێ لێرە ناو کەلکی‌نیە. پیاوەکەی دی خۆی ناساند، ژومارەی دوو، بە گوێرەی کابرای‌پێشوو درێژەی دا، من شۆفیر تاکسیم، سێهەم پیاو گوتی ژومارەی سێ،شاگردی دەواخانەم، پاشان ژنێک وەقسە هات، ژومارەی چوار،کارەکەری هۆتێلم و دوای هەموان ژومارەی پێنج، کارمەندم. ئەوە ژنی‌منە، ئافرەت لە کوێی، دابزانم لە کوێی، ژنە گوتی لێرەم، لێرەم و لەپڕمەی گریانی دا و بە هەنگاوی شل و بە پارێز و چاوی زەقەوە لەرێ‌ڕەوەکەدا بەرەو پێش رۆیی و دەستەکانی لەو دەریا شیرەدا کەمەلەباسکەیان

دەکرد کەوتبوونە ملە. پیاوەکە بە بڕوا بەخۆبوونێکی‌زیاترەوە بەرەو رووی هەنگاوی نا و بە ورتەورت، وەکوو ئەوەی نزابکا دەیگوت لە کوێی، لە کوێی. دەستێک دەستێکی تری دۆزییەوە،چرکەیەک دواتر لە باوەشی یەکا بوون، بوونە ئەندامێک و شەقەی‌ماچان دەگەییە ئاسمان، جاری وا بوو بە هەڵە دەچوون، چونکە نەرووەمەتی یەکتریان دەدیت، نە چاو و لێو. خێزانی چاوپزیشک بەگریانەوە پەنجەی داویشتە قۆڵی مێردەکەی، دەتگوت ئەویش تازەشووەکەی دۆزیوەتەوە، بەڵام ئەوەی دەیگوت ئەمە بوو، چ بەڵایەکی گەورە، چ کارەساتێک. پاشان دەنگی کوڕە بچکۆلە خێلەکە هاتە گوێ،دایکی منیش لێرەیە. کچەی چاویلکە لە چاو کە لە سەر تەختەکەی‌دانیشتبوو، ورتاندی دێت، خەم مەخۆ دێت.

لێرە ماڵی راستەقینەی هەر کەس ئەو شوێنەیە کە لێی دەخەوێ، هەربۆیە جێی سەرسوڕمان نیە کە یەکەم دڵەخورتەی تازە هاتووەکانهەڵبژاردنی تەختێک بێ، لە بەشەکەی دیکەش هەر وا بوو، ئەو کاتەی‌هێشتا چاومان دەیدیت. لە بابەت خێزانی کوێرەپیاوەوە دڵاودڵ پێویستنەبوو، شوێنی سروشتی و یاسایی ئەو لە پەنا مێردەکەی و لە تەختی‌حەڤدە بوو، تەختی هەژدە دەکەوتە نێوانیان و چەشنی بەتاڵاییەک ئەوی‌لە کچەی چاویلکە لە چاو جیا دەکردەوە. هەروەها سەیر نیە هەوڵ بدەنتا ئەو جێیەی دەشێ لە یەکتر نیزیک بن، زۆرن ئەو پەیوەندییانەی لێرەهێندێکیان ئاشکران و بڕێکیش خەریکن ئاشکرا بن، بۆ وێنە ئەوەشاگردی ئەو دەواخانەیە بوو کە قەترەی بە کچەی چاویلکە لە چاوفرۆشتبوو، ئەمە هەر ئەو شۆفیر تاکسییە بوو کە کوێرەپیاوی بردە لای‌دوکتۆر، ئەو کابرایەی گوتی پۆلیسە هەر ئەو کەسەیە دزەی گۆرینی‌دیتبوو کە چەشنی منداڵی ون بوو دەگریا، بەڵام با بزانین کارەکەری‌هۆتێل کێیە، ئەو یەکەم کەسێ بوو کە کاتی قیژاندن و زیقاندنی‌بێبڕانەوەی کچەی چاویلکە لە چاو لێی وەژوور کەتبوو. سەرەڕای‌ئەوانەش دیارە کە تەواوی ئەم پەیوەندییانە ئاشکرا نابن و دەبنە بەردی‌بن گۆم، چونکە یان هەلی باش نارەخسێ یا کەسێ ئەوەندە وردبین نیەکە بتوانی هەبوونی وەها رایەڵەیەک بەرێتەوە سەر یەک، بە زمانێکی‌زۆر سادەتر شەرم و شکۆ و باریک و ناسک بوونی هەوداکان ئینسانەدەپرینگێنێتەوە. خزمەتکارەکەی هۆتێل هەرگیز بە فکریدا نایە ئەو ژنەی‌بە رووتی دیویەتی لێرەیە، ئەوەش دەزانین کە شاگرد دەوافرۆشێکقەترەی چاوی بە زۆران فرۆشتووە کە چاویلکەی رەشیان کردۆتە چاو،هیچ کەس ئەوەندە ناپارێزی و بێ پەروایی ناکا کە هەواڵی لێرە بوونی‌دزەی ئوتۆمبیل بدا بە پۆلیس، شۆفیر تاکسیش کە سوێند دەخوا لە چەندرۆژی رابردوودا کەسی کوێری سوار نەکردووە. بێگومان کوێرەپیاوبە

سرتەسرت بە خێزانی گوت یەکێک لەو قەرەنتینە کراوانە هەر ئەوکابرا خوێڕییەیە کە ماشێنەکەیانی دزیوە، سەیر هەڵکەوتێک، بەڵێ، بەڵامچونکە دەیزانی لاقی کابرای قوڕ بە سەر زۆر پیس بریندار بووەجوامێرانە درێژەی دا، تۆڵەی لێکراوەتەوە. خەم و شادی بە پێچەوانەیئاو و رۆن تێکەڵ دەبن و دەبنە خەمشادی و ئێستا ئەو بە بۆنەیپەژارەی قورس و قووڵی کوێر بوون و شادی بێ سنووری دیتنەوەیمێردەکەی ئیتر وەبیری نەدەهات کە دوو رۆژ پێشتر گوتبووی ئامادەیەساڵێک لە تەمەنی ببەخشێ هەتا ئەو دزە نامەردەش، راست قسەکەیخۆی، کوێر بێ. بەڵام ئەگەر دوایین سێبەرە کاڵەوە بووەکانی رق وتووڕەیی هێشتاش روحیان ئازار دەدا، بە بیستنی ناڵە ناڵیبەزەییبزێوی کابرای زامدار تێدا چوون، تکایە وەرە فریام دوکتۆر. چاوپزیشک بە یارمەتی خێزانی لەسەرخۆ برینەکەی موعایەنە کرد،کارێکی دیکەی لە دەست نەدەهات، شۆردنەوەشی بێ فایدە بوو،وێدەچوو لەبەر ئەوە چڵکی کردبێ کە ناڵچەی کەوشەکە بە هۆی هات وچۆوە زۆر پیس بووبێ و قووڵ لە رانی راچووبوویێت یان ئاویقەتیسماوی نێو لوولەکان تووشی ئەو بەڵایەیان کردبوو. کچە کە بە ناڵەناڵی ئەو وەخەبەر هاتبوو، بە بژاردنی تەختەکان لێی نیزیک بۆوە. داهاتەوە، دەستی درێژ کرد، پەنجەی بە ئارامی بە سەر رووومەتیخێزانی دوکتۆردا کێشا و تێپەڕی، پاشان کێ دەزانێ چلۆن، پەنجەیگەیشتە دەستی کابرای بریندار کە لە گەرمەیاودا دەسووتا، بە خەمەوەگوتی تکایە بمبوورە، تەواوی تاوانی من بوو، پێویست نەبوو ئاوامکردبایە. پیاوە وڵامی داوە لە بیر خۆتی بەرەوە، ژیان هەوراز و لێژیزۆرە، منیش نەدەبوو وام بکردایە.

دەنگی بۆڕی بڵیندگۆ کەم و زۆر بە سەر وشەکانی ئاخری کشا،سرنج بدەن، سرنج بدەن، خواردەمەنی و شێو و کەل و پەلی پاک وخاوێنی لەبەر دەرگای چوونە ژوورەوە داندراوە، دەبێ لە پێشداکوێرەکان بچن و بەشی خۆیان بێننەوە، کاتێک نۆرەی ئەو کەسانە هاتکە لە بەشی گومانلێکراوەکانن پێیان رادەگەیەندرێ، سرنج بدەن،سرنج بدەن، خورادەمەنی و شێو لە بەر دەرگاوەیە، لە پێشدا کوێرەکانبچن، کوێرەکان لە پێشدا. پیاوەی بریندار کە لەبەر گەرمەیاوی لەرادەبەدەر گێژ ببوو، چاک حاڵی نەبوو و وەیزانی دەڵێن دەتوانن لەوێبچنە دەر و ماوەی دەسبەسەر بوونیان تەواو بووە، تەکانێکی لە خۆیدا وەک ئەوەی بیهەوێ هەستێ، بەڵام ژنی دوکتۆر لە شوێنی خۆیئەهۆنی کردەوە، بۆ کوێ دەچی، ئەو پرسی چما گوێت لێنەبوو کەگوتیان کوێرەکان بڕۆن، بەڵێ بەڵام تەنیا بۆ وەرگرتنی نان و پێخۆر. پیاوەی بریندار هەناسەیەکی ساردی کێشا و دیسانیش ئەو ژانەی لەشیدەکێلا کەوتەوە گیانی. دوکتۆر

گوتی من دەچم ئێوە هەر لێرە بن،ژنەکەی گوتی منیش دێم، دروست لەو کاتەدا کە دەیانهەویست لە بەشیخۆیان دەرکەون، ئەو پیاوەی لە قۆڵەکەی دیکەڕا هاتبوو پرسی ئەوئاغایە کێیە، کوێرەپیاو گوتی، دوکتۆر، دوکتۆری چاو، شۆفیر تاکسیگوتی ئەی لەم بەختەوەرییە، بڕوانە شانس و بەختی ئێمە کە دوکتۆرێکیکوێری کار لە دەس نەهاتوومان هەیە، کچەی چاویلکە لە چاو بەتەوسەوە گوتی هەروەها شۆفیر تاکسییەکمان هەیە کە ناتوانێ بمانباتەهیچ شوێنێک.

بارخانەی گەورەی نان و خوان لە سەرسەرا داندرابوو. دوکتۆرداوای لە خێزانی کرد بیباتە بەر دەرگای سەرسەرا، بۆچی، دەمهەوێ‌پێیان بڵێم لێرە کەسێک برینەکەی چڵکی هێناوە و ئێمە دەوا و دەرمانمانانیە، باشە لە بیرتە چییان گوت، بەڵێ بەڵام رەنگە بۆ ئەو بابەتە تایبەتییەفەرق بکا، من گومانم هەیە، منیش هەرواتر، بەڵام دەبێ هەوڵی خۆمانبدەین. رووناکایی رۆژ لە سەر پلیکانان چاوی ژنەی بە شەوارە خست،هەڵبەت نەوەک لەبەر درەوشانەوەی نووری بێ‌سنوور، چونکە هەوری‌رەش گرتبوویان بەری ئاسمان و دەتگوت دەیهەوێ هەڵکاتە باران، بەخۆی گوت لەو ماوە کەمەدا لەگەڵ نوور و رووناکی نامۆ و دڕدۆنگ‌کەوتوومەوە. دروست لەم کاتەدا سەربازێک لەبەر دەرگای حەوشەوەگوڕاندی راوەستە، بگەڕێنەوە، دەستووری تەقە کردنم پێ‌دراوە، پاشان‌رووی تفەنگەکەی تێکردن و هەر وا بە دەنگی بەرز هەرای کردگرووبان، چەند کەس دەیانهەوی لێرە دەرکەون، چاوپزیشک بەناڕەزامەندی هاواری کرد نامانهەوێ لێرە بڕۆینە دەر، کە گرووبانەکەنیزیک بۆوە گوتی لام وایە مەبەستێکی دیکەیان هەیە، پاشان لە نێوانچاوەچاوەکانی دەروازەوە روانی و گوتی چیە، کەسێک لاقی برینداربووە و چڵکی کردووە، ئێمە خێرا دەرمانی دژی چڵک و کێم و دەوای‌دیکەمان دەوێ، ئەو دەستوورانەی بە منیان داون وەکوو رۆژ روونن،کەس ئیزنی چوونە دەرەوەی نیە و تەنیا شتێکی کە دەتوانین بەڕێی‌کەینەژوور نان و پێخۆرە، بێتوو چڵک و کێمی زیاتر بێ، کە بێ‌گومان دەبێ،بریندارەکە دەمرێ، بە من چی، جا کە وایە پەیوەندی بکە بە سەرۆکی‌خۆتەوە، گوێ بگرە کابرای کوێر، چاکت گوێ لێ‌بێ، یان هەردووکتان‌دەچنەوە جێی خۆتان یان تەقە دەکەین، خێزانی گوتی وەرە با بڕۆین، چناکرێ تاوانی ئەوانە نیە، تۆقیون و گوێ لە مستی فەرمانن، من کە بڕواناکەم، بە پێچەوانەی مافی مرۆڤە، باشتر وایە باوەڕ بکەی، چونکەمەبەستەکە وەکوو رۆژ روونە، ئای ئای ئەوە هەر نەگەڕاونەوە، هەتاسێ دەبژێرم و بێتوو لە بەر چاوم گوم نەبن دڵنیا بن کە تازە ناگەڕێنەوەبۆ شوێنی خۆتان، یەەەەک،

دوووو، س س، تەواو، دەنا ناچار بووقسەکەی بەرێتە سەر، پاشان رووی کردە سەربازەکان و گوتی تەنانەت ئەگەر براکەشم بێ، زیاتری لە سەر نەڕۆیی کە مەبەستی کێیە، داخۆمەبەستی ئەو کابرایە بوو کە دەرمانی دەویست یان ئەوەی پای چڵکی هێنابوو. لە ژووریَ کابرای بریندار دەیەویست بزانێ داخوا دەرمانی دەدەنێیە یان نا، چاوپزیشک پرسی لە کوێوە زانیت کە چووین دەرمانوەربگرین، وام بە دڵدا هات، هەر چی بێ ئێوە دوکتۆرن، زۆر بەداخەوەم،یانی دەوا و دەرمان هیچ، بەڵێ، دەی ئاوا، زۆر باشە، ئەوەش لە وەی.

زۆر بە وردی بەرچاییان تەنیا بۆ شەش کەس ئامادە کردبوو. چەندشووشە شیر و بیسکویت، بەڵام هەر کەس بەشەخواردنی بۆ دانابوونلە یادی چووبوو ئاوخۆرییان بۆ دابنێ، دەوری و کەوچک و چنگاڵیش سۆراغیان نەبوو، رەنگ بوو ئەوانە لەگەڵ خواردنی نیوەڕۆ بنێرن. ژنی دوکتۆر شیری برد بۆ پیاوە زامارەکە، بەڵام کە خواردی رشایەوە وهێنایەوە. شۆفیر تاکسییەکە دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵ کە شیری پێ خۆش نیە و مەیلی لە قاوەیە. هێندێکیان پاش خواردنی نانی بەیانی چوونەوەسەر تەختەکەی خۆیان، کوێرەپیاو خێزانی برد لە ساختومانەکەدابیگێڕێ، تەنیا ئەو دوو کەسە وەدەر کەوتن. شاگرد دەواخانەکە ویستی لەگەڵ دوکتۆری چاوان بدوێ، دەیەویست سەبارەت بەو نەخۆشییە لەبڕوای ئاگادار بێت، دوکتۆر دەستی کرد بە شی کردنەوە، ناتوانمبیسەلمێنم کە وشەی نەخۆشیی پڕ بە پێستی ئەو دەردەی ئێمە بێت،پاشان بە زمانێکی ساکار تەواوی ئەو مەبەستانەی بەر لە نابینایی لەکتێب و سەرچاوەکاندا دیتبووی بە کورتی باسی کردن. چەند تەخت لەولاتر شۆفیر تاکسی بە وردی گوێی دابوویە و کاتێک چاوپزیشکقسەکەی تەواو کرد، ئەو لە لای خوارەوەڕا هەرای کرد مەرج دەکەم کەئەو باریکەرێیانەی لە چاوڕا بەرەو مێشک دەڕۆن گیراون، شاگرددەواخانەکە بە تووڕەیی تێیڕاخوڕی، گێژی نەفام، دوکتۆر بزەیەکیهاتێیە، کێ دەزانێ، لە راستیدا گلێنە تەنیا عەدەسییەکە و ئەوە مێشکە کەئەرکی دیتن بەڕێوە دەبا، چەشنی وێنەیەک کە دەکەوێتە سەر فیلم وئەگەر بە واتەی ئەو ئاغایە ئەم رێیانە بگیرێن، وەکوو ماتۆڕیئوتۆمبیلێک وایە کە سووتەمەنی پێناگا و هەڵنابێ و ناکەوێتە رێ، هەروەک دەزانی و دەیبینی، رووی قسەکەی ئاخری لە شاگرد دەواخانەکەبوو، پێشخزمەتی هۆتێل پرسی دوکتۆر بە بڕوای ئێوە ئێمە چ ماوەیەکلێرە رادەگرن، رەنگە تا ئەو زەمانەی کە هەر وا نابینین، یانی چەند،بەڕاستی کەس نازانێ، رەنگە تیژتێپەڕ بێ و رەنگیشە هەتا هەتایی بێ،چەندە پێمخۆش بوو زانیبام. کارەکەری هۆتێل هەناسەیەکی هەڵکێشا ودوای چەند چرکەیەک درێژەی دا، خۆزەگە زانیباشم کچەی

گۆرین چیبه سەر هاتووە، شاگرد دەواخانەکە پرسی کامە کچ، ئـەو کچـەی هۆتێل،چەنـدەم پێ سەیر بوو، بە کـار و کـردەوەی هەڵـبەزیمەوە، لـە نێوەڕاستیژوورەکـە بـە رووتوقـووتی راوەستابوو و تەنیا چاویلکەیەکی رەشی لەچاودابوو و هاواری دەکرد کـە کـوێر بـووە، دەڵـێن ئـەو مـنی تووشـی ئـەودەردە کـردووە. خێـزانی دوکتـۆر کـە روانی دیـتی کیژەکـە بـە ئاسپاییچاویلکە رەشەکەی دانا و بێچرپە خستییە ژێر باڵنجەکەی و لەم کاتەدالە کوڕە خێلـەی پرسی دیسانیش بیسـکویتت دەوێ. ژنی دوکتـۆر بۆیەکـەم جـار لـەو زەمانـەیڕا کـە هـاتبوون دەتگوت لە پشت میکرۆسکۆپێکدانیشتووە و لە ئاکاری هێندێک ئینسان دەڕوانێ کـە خۆیـان نازانن و لەپڕ ئەو کارەی بەلاوە نزم و دزێو هاتـە بـەر چـاو. بـە خـۆی گـوت ئەگەرئـەوان مـن نابینن، منیش حەقم نیە چاویان لێبکەم. کچە بە لەرزەلەرزچەند دڵۆپێکی قـەترە کـردە چـاوی. بەو کارەی هەمیشە دەیتوانی بڵێ ئەوەئەسرین نیە کە لە چاویڕا دێتەخوار.

چەند سەعات دواتر بڵێندگۆ رایگەیاند بۆ هێنانی خۆراکی نیوەڕۆبچنە شوێنی دیاری کراو، کوێرەپیاو و شۆفیر تاکسی پێشنیاران کردئەوان بچن. بارخانەی نان و پێخۆرەکە هێنـدێک لـەو دەرگایـەوە دووربـوو کـە سەرسـەرا و رێڕەوەکـانی لێـک گـرێ دەدا، ئـەوان ناچـار بـوون بۆدۆزینـەوەی لـە سـەر چنگـان بـڕۆن و دەسـتێکیان بگێـڕن و چەشـنی گەسـکبـە تـەرکی حەرزەکەدا بیخشـکێنن و دەستەکەی دیکـەیان بـۆ ببێتـە لاقیسێهەم، بـەلام لـە گەڕانـەوە بـۆ ژوورەوەدا تووشی گرفت نەدەبوون،چونکە خێزانی دوکتۆر فکرێکی باش و تـازەی کردبـۆوە و بە زۆریتوانی بیسەلمێنێ کە ئەوە ئەزموونی خۆیەتی، ئـەویش ئـەوە بووپەتوویـەک دادڕداڕ کەن و پاشان بە درێژی تێکیکەنەوە و بیکەنەگوریسێک و سەرێکی لە دەسگیرەی دەرەوەی دەرگای ئەو شوێنەبەستن و سەرەکەی تری لە گوێزینگی ئـەو کەسـەی نـان و خـوان دێنێـت. دوو پیاوەکە چوون، دەوری و کێردۆکە و چنگاڵیش هاتبوو، بەلامخواردن دیسانیش تەنیا هـەر بەشی شەش کەس پێچرابوویەوە، بەبێگومان گرووبانی بەرپرسی یەساوڵەکان نەیدەزانی پێـنج کوێریدیکەش چوونەتە لای ئەوان، چونکە ئەگەر کەسێک لە پشت دەروازەوەبوایە، تەنانـەت ئەگـەر لـە رووداوەکـانی پشـت دەرگـاوە ورد ببایـەوە، لـەتاریک و لێڵـی سەرسـەرادا تـەنیا ئەوەندەی بۆ دەچۆوە سەر یەک کە بەهەڵکەوت یەکێک لە قۆڵێکەوە دەچێتـە قۆڵـەکەی تـر. شۆفیری تاکسیپێشنیاری کرد بچێ و بەشی ئەمانیش وەربگرێ و بە تـەنیایی چوو،نەیدەویسـت کەسی لەگەڵ بێت، روو لە سەربازەکان هەرای کـرد ئێمەشـەش کـەس نـین، یـازدە کەسـین و هەر ئـەو گرووبانـە لـەولاوە ولامـی داوە،مەقیڕێنـە، هێشـتا تـاقمێکی زۆر لـە رێ دان، راوێـژی

گرووبانەکە لە زەینیشۆفیر تاکسیدا بە گاڵتەجاڕی رەنگی دایەوە، هەڵبەت بە سرنج دان بەمقسانەی ئاخری کە پاش گەڕانەوە گێڕایەوە ئەوەمان بۆ دەرکەوت. شەش بەشەکەیان کردە دە بەش چونکە کابرای زامار هەر وا چی بۆنەدەخورا، تەنیا ئاوی دەویست و داوای دەکرد لێوی تەڕ کەن. لەشی لەیاوی توندا دەگڕا و چونکە هێزی راگرتنی پەتوەکەی لە سەر برینەکەینەبوو پەستاپەستا لای دەدا، بەڵام هەوای ساردی ژوورەکان ناچاریدەکردەوە سەرلەنوێ بە خۆیدا داتەوە و دیسان هەمان هەمان. بێبڕانەوە نیوە نوزەی دەهات و دەناڵی، دەتگوت دەرد و ژانەکەی هەرتاوناتاوێک زیاتر دەبوو.

لای ئێوارە سێ کوێری دی کە لە قۆڵەکەی ترا رەپاڵ نرابوون هاتنەئەوێندەرێ. یەکیان بەردەستەکەی دوکتۆر بوو کە لەڕێوە ژنیچاوپزیشک ناسییەوە و دووەکەی تر بە گوێرەی چارەنووس، یەکیانپیاوەی حەریفی کچەی چاویلکە لە چاوی هۆتێل بوو و ئەوی تر پۆلیسەدمشڕەکەی کە کچەی بردەوەماڵ. تازە گەیشتبوونە سەر تەختەکانیانکە بەردەستەکەی دوکتۆر بە بانگ و سەڵا گریا، دوو پیاوەکە چییاننەگوت، دەتگوت تاساون و هێشتا نەیانزانیوە تووشی چ بەڵایەک بوون. لە ناکاو هەڵڵا و گرمەی تاقمێک لە شەقامەوە بەرز بۆوە، دەنگێکی گڕ وناخۆش پەیتاپەیتا دەستووری دەدا، قریوەقریوێکی سەیر وسەرسوڕهێنەر بوو. قەرنتینەکراوەکان تێکرا سەریان بۆ لای دەرگاوەرسووڕاند و چاوەڕوان مانەوە. هیچیان نەدەدیت، بەڵام هەتا ئیستێکیدی هەموو شتێکیان لێروون دەبوویەوە. خێزانی دوکتۆر لە سەر تەختیمێردەکەی بە پاڵ دەستییەوە دانیشتبوو، بە سەبرا گوتی لە هەوەڵەوەدیار بوو، خەریکە جەهەندەمی گۆڕین ساز دەبێ، دوکتۆر دەستی کوشیو بە سرتە گوتی لێیگەڕێ، ئیدی لێرە بەولاوە چیت بۆ ناکرێ. گوڕە وقیژە و هەرا دامرکا، ئێستا دەنگەدەنگ و غەڵدەغەڵدێک لە سەرسەراوەدەبیسرا، ئەوانە ئەم کوێرانە بوون کە چەشنی کەرکە مەڕێکی تۆقیودەڕەوینەوە و خۆیان تێکدەکوتا، لە گەروولەی نێو دەرگاکانداپاڵەوپەستۆ دەدران و تاقمێک رییان لێ ون بوو و چوونە بەشەکانی تر. بەڵام زۆربەیان بە تلاسکە بەستن، دەستەدەستە یان تاق تاق چەشنی ئەوکەسانەی بەرەو خنکان بن دەستیان داویشتە هەودای هەوا و وەکووگێژەڵووکەیەک خۆیان بە ژوورا دەکرد، دەتگوت بە بۆلدزێر رایاندەدەنەژوور. هێندێک کەوتن و لەژێر دەست وپێیاندا پێخوست کران. تازەهاتووەکان کە لە رێڕەوی تەنگ و تەسکا جووڵەیان لێبڕابوو، وردەوردە تەختە بەتاڵەکانیان پڕکردەوە و لەوێ چەشنی پاپۆڕێکی بەلالێدراو کە گەیشتبێتە لێوار ئارام بوونەوە و هاواریان دەکرد ئیتر جێ بۆکەسی دیکە نەماوە و درەنگ هاتووەکان

دەبێ شوێنێکی دی بۆ خۆیانبدۆزنەوە. دوکتۆر لە بنەبانەوە هەرای کرد ژووری دیکەش هەیە، بەڵامئەو کەسانەی تەختیان گیر نەکەوتبوو دەترسان لە نێو هەزارە و دوولای وەتاغ و ڕێڕەو و دەرکەی داخراو و ئەو پلیکانانەی ڕەنگ بوو لەئاخردا بیاندۆزنەوە ون بن. لە ئاخریدا کە زانیان ناتوانن لەوێ بمێننەوە،کەوتنە پەلەقاژ هەتا ئەو دەرکەی پێیدا هاتبوون بدۆزنەوە، ملیان پێوەناو بەرەو نادیار ئاژوان. پێنج کوێرەکەی تاقمی دووهەم بۆ دۆزینەوەیجێگای باش و ئەمین کەوتنە خۆ و ئەو تەختانەیان هەڵبژارد کە لە نێوانئەوان و تاقمی یەکەمدا بە بەتاڵی مابوونەوە. تەنیا پیاوەی زامداری سەرتەختی چاردەی لای دەستی چەپ بە جیا و بێ پەنا مایەوە.

چارەگێک دواتر، جگە لە گریانی تاوناتاو و هەستی پێی ئەو مرۆڤانەیبە پارێزەوە دەبزووتن، ئارامییەک، نەک خەیاڵ و دڵ دامرکان، گەڕایەوەئەم بەشە. تێکڕای تەختەکان پڕ بوون. خەریک بوو شەو بە سەردەستاندا دەهات و گڵۆپە کەم شۆقەکان ڕوحیان وەبەر دەهات. پاشانگوێیان بە دەنگی گڕ و ناخۆشی بڵیندگۆ زرینگایەوە. دەستوورەکانوەک ڕۆژی هەوەڵ دووپات بوونەوە کە دەبێ چۆن بەشەکانپارێزگارییان لێبکرێ و هەروەها دەبێ تەواوی قەرەنتینە کراوەکانملکەچی ڕێ و شوێنی دیاریکراو بن، دەوڵەت زۆر بەداخە کە لە ڕوویناچارییەوە دەبێ ئەرکی یاسایی خۆی بۆ پارێزگاری لە گەل، لەمقەیرانەی ئێستادا بە هەموو شێوەیەک بەڕێوە بەرێ و چی و چی و چی. کە دەنگەکە بڕایەوە، هاواری پڕ تووڕەیی و نارەزامەندی تاقمێک بەرزبۆوە، ئێمەیان لێرە زیندانی کردووە، هەموومان لێرە دەمرین، ئەوەزوڵمە، ئەدی کوان ئەو دوکتۆرانەی بەڵێنی هاتنیانمان پێ درابوو، ئەوەهەواڵێکی تازە بوو، بەرپرسان و کاربەدەستانی دەوڵەت بەڵێنی دوکتۆرو دەوا و تەنانەت چارەسەر کردنی نەخۆشییەکەیان دابوو. چاوپزیشکنەیگوت ئەگەر دوکتۆریان دەوێ ئەو وا لە خزمەتیان دایە. تازە قەتشتی وا ناڵێ. دەستەکانی بە تەنیایی وڵامدەرەوەی کارەکەی نین،دوکتۆر بە یارمەتی زانستی پزیشکی و دەوا و دەرمان دەتوانێنەخۆشیی ماریجە بکا. لێرەش نە ئەوانەی لەبەر دەس دایە و نە ئومێدیوەدەس کەوتنیانی هەیە. ئەو تەنانەت چاوی نەخۆشی نەدەدیت کە لەروخساری بزرکاوی ئامالنەخۆشی یان چاوی خوێنتێزاوی بڕوانێ،زۆر جاران بە بێ موعایەنەی ورد و باریک ئەو نیشانانە بە قەدرایەدنیایەک بە کەلک بوون. لەبەر ئەوەی دەوروبەریان پڕ ببۆوە، ئیدیژنەکەی نەیدەتوانی تەواوی ڕووداوەکانی بە وردی بۆ بگێڕێتەوە، بەڵامهەستی بە شڵەژاوی کەش و هەواکە دەکرد و دەیزانی بە پەیدا بوونیتاقمی ئاخری

هەموو سەریان لە گێرە و کێشە دەخوریێ. دەتگوت هەوای‌ئەو بەشە قورستر بووە و بۆنی قەتیس‌ماو دەروونی ئازار دەدا و جاری‌وابوو وێڕای شەپۆلی باوەشێک بۆگەن ئینسان هێڵنجی دەهاتێیە. لەخۆی پرسی باشە ئێرە دوای حەوتوویەک چی بە سەر دێت، بەدوای ئەوبیرەدا ترس هەڵیگرت، وامان دانا کە لە بابەت نان و پێخۆرەوە هیچ‌گرفتێکمان نەبێ و کێ دەتوانێ دڵنیا بێ کە هەر ئێستا لەگەڵ کەم بوونی‌دەستەویەخە نین، بۆ وێنە من گومانم هەیە ئەو کەسانەی لە دەرەوەن‌روحیشیان خەبەردار بێ کە چەند کەس لێرە زیندانین، مەسەلە ئەوەیەئەوجار چلۆن کێشەی پاک و خاوێنی چارەسەر دەکەن، ئاماژە بەوەناکەم چۆن خۆمان خاوێن کەینەوە، چەند رۆژ پێشتر کوێر بووین وئێستا کەس وەفریامان نایا، کارم نیە بە سەر ئەوەشەوە کە ئاوپژێنی‌حەمامەکان تا کەی بە ساخی دەمێننەوە، مەبەستم شتەکانی دیکەیە،رووداوی چاوەڕوان نەکراوی دی، بۆ وێنە بێتوو ئاودەستەکان بگیرێن،تەنانەت چاوەیەکیشان، ئێرە دەبێتە گۆلاوی گواو. دەستی بە ڕوومەتی‌داکێشا، زوورایی ریشی سێ رۆژ نەتاشراوی هەست پێ‌کرد، ئاواباشترە، هیوادارم ئەو فکرە بەرژەوند نەکراوە وە زەینیان نەکەوێ کەتیغ و مقەستمان بدەنێیە، چەمەدانەکەی تەواوی پێداویستییەکی‌ریش‌تاشین و تیف‌تیفەدانی تێدابوو، بەڵام دەیزانی ردێن تاشین کارێکی‌هەڵەیە، ئاخر لە کوێی تاشیبا، لە کوێ، یانی لەم بەشەدا، لە نێو ئەو گشتەئادەمیزادەدا، هەڵبەت خێزانم دەتوانێ ردێنم بتاشێ، بەڵام هێندەی‌پێ‌ناچێ کە خەڵک بزانن و سەریان سوڕ بمێنێ کە یەکێک دەتوانێ وەهاخزمەتێکیش بە وان بکا، جا وەرە بڕوانە لەوێ بزانە لە ژووری‌حەمامەکان دەبێتە چ قیامەتێک، ئەی خوایە، ئەوە دڵمان دەتۆقێ بۆ دیتن،بۆ توانایی دیتن، دیتن، تەنانەت ئەگەر سێبەرێکی کاڵەوە بووش بێ،راوەستان لەبەر ئاوێنە، دیتنی پەڵەیەکی لێڵ و تەماوی و هەتەر کردنی‌چاو بە رادەیەک کە بتوانی بڵێی ئەوە دم و چاوی منە، بەڵام هەر شتێکی‌ڕووناکایی هەیە تازە هی من نیە.

گلە و گازندە وردە وردە رۆمرکا، کەسێک لە بەشێکی دیکەوە هاتبووهەتا بزانێ هیچ نان و پێخۆرێک ماوە یان نا، کەچی لەڕێوە شۆفیرتاکسی دم هەراش خۆزگەی بۆ پاروویەک خواستبوو، شاگرددەواخانەکە بە مەبەستی نواندنی ئامانجی باش، بڕێکی قسە تاڵەکەی‌شۆفیری خۆش کردەوە و گوتی رەنگە دیسانیش بێنن. بەڵام هیچیان‌نەهێنا. وڵات تاریک داهات. لە دەرەوەڕا نە خۆراک و شێو هات و نەوڵامی ویستی کەس درایەوە. لە بەشەکەی پەنا دەستەوە دەنگی گریان‌هات و پاشان بێ‌دەنگ بوو، ئەگەر کەسێک دەگریا زۆر ئارام ولەسەرەخۆ

دەگریا، لەو دیوی دیوارەکانەوە دەنگی گریان نەدەبیسرا. خێزانی چاوپزیشک چوو هەتا چۆنیەتی حاڵی پیاوی زامار بپرسێ، گوتیمنم و بە پارێزەوە پەتووەکەی لادا. برینەکەی ئینسانی لێدەتۆقی، لەرانی بەرەو خوار هەڵمسابوو، برینەکە ببوو بە بازنەیەکی رەش و پڕ لەپەڵەی ئەرخەوانی، زۆر گەورەتر ببوو، دەتگوت لە ژوورەوی لەشیڕاگوشتەکەی دەکێشن. بۆنی ناخۆشی برینەکە هاوکات بۆنێکیشیرنچکیشی لێوەدەهات، ژنی دوکتۆر گوتی حاڵت چۆنە، سپاستدەکەم کە هاتی. دەی چۆنی، خراپ، ژانت هەیە، بەڵێ و نەخێر، مەبەستتچیە، دەردەکە لە جێی خۆی بەڵام دەڵێی ئیدی لاقی من نیە، دەڵێی لەلەشم جیا بۆتەوە، نازانم چۆنی بڵێم، هەستێکی سەیرە، هەر دەڵێی بۆیەلێرە راکشاوم هەتا ئاگاداری لە لاقێک بکەم کە ئازارم دەدا، هەر تاوتوێیئەوەتە، رەنگە، ئێستا هەوڵ بدە تۆزێک بخەوی. هاوسەری چاوپزیشکدەستی لە سەر نێوچاوانی دانا، پاشان ویستی بڕوا، بەڵام بەر لەوەیشەوباش بکا، کابرای زەلیل دەستی گرت و بۆ لای خۆی کێشا و ناچاریکرد بەرەو رووی دابێتەوە و بە دەنگێکی نزم گوتی دەزانم دەتوانیببینی. خێزانی دوکتۆر بە سەرسوڕمانەوە لەرزی و بە سرتە گوتیتووشی هەڵە هاتووی، باشە چ شتێک بوو بە هۆی ئەوە کە ئەو بیرە بەمێشکتدا رابرێ، منیش وەک هەموانم، هەوڵ مەدە هەڵمفریوێنی، باشدەزانم دەتوانی ببینی، بەڵام نیگەران مەبە، بە کەس ناڵێم، بخەوە، بخەوە،باوەڕم پێناکەی، هەڵبەت کە دەیکەم، بڕوا بە بەڵێنی دزێک ناکەی، گوتمکە دەیکەم، کە وایە بۆچی راستەقینەم پێناڵێی، سبەینێ قسەیلێدەکەین، ئێستا بگرە بنوو، بەڵێ سبەینێ، هەڵبەت ئەگەر تا سبەیبمێنم، نابێ بیری ناخۆش بکەینەوە، دیکەمەوە، رەنگە تاویاو لە جێی منبیر بکاتەوە. ژنی دوکتۆر گەڕایەوە لای شووەکەی و بە گوێیا چرپاند کەبرینەکە زاری کردوتەوە و تەواو دافەتاوە، نەکا نەخۆشییرەشهەڵگەڕان بێ، لەو ماوە کورتەدا وێناچێ، هەر چی بێت حاڵی باشنیە، حاڵی هەمووومان کە لێرە زیندانین هەر شپڕێوە، دوکتۆر بە ئانقەستدەنگی هەڵێنا و گوتی، دەڵێی کوێری بە تەنیایی بەس نەبوو کە بووینەدیلی دەست و پێ بەستراوی نێو رکەی زیندانی تەنگ. لە تەختی ژمارەچاردەی لای چەپەوە پیاوەی زەلیل وڵامی داوە، هیچ کەس ناتوانێدەست و پێم بخاتە نێو زنجیرەوە دوکتۆر.

کاتەژمێرەکان سەریان دەبەریەک نا و تێپەڕین، دیلە کوێرەکاننوستن، هێندێکیان بە سەر خۆیان کێشابوو، دەتگوت تامەزرۆی ئەوەبوون کە تاریکایی شەوەرەنگ، تاریکایی راستەقینە، چاوەکانیان کە ببووبە خۆری تولْخ و مات، تەواو بکووژێنێتەوە. ئەو سێ گڵۆپەی لە

میچی‌بڵینده‌وه هه‌ڵاوه‌سرابوون، نوورێکی زه‌ردی کاڵیان ده‌خسته سه‌رته‌خته‌کان، نوورێکی که ته‌نانه‌ت نه‌یده‌توانی سێبه‌رێکیش ساز کا. چل که‌س خه‌وتبوون یان به‌ تێماوی هه‌وڵیان ده‌دا خه‌ویان لێ بکه‌وێ،ده‌سته‌یه‌ک له‌ خه‌وا هه‌ناسه‌یان هه‌ڵده‌کێشا و ورته‌یان ده‌هات، وێده‌چووئه‌وه‌ی دڵیان ده‌یهه‌ویست له‌ خه‌ودا ده‌یانبینی، وێده‌چوو به‌ خۆیان بێژن ئه‌گه‌ر ئه‌وه خه‌وه نامهه‌وێ هه‌ستم. ته‌واوی کات‌ژمێره‌ ده‌ستییه‌کان له‌کار که‌وتبوون یان له‌بیریان چووبوو قورمیشیان بکه‌ن یان به‌م ئاکامه‌گه‌یشتبوون که‌ بێ‌فایده‌یه‌. ته‌نیا کات‌ژمێری ده‌ستی ژنی چاوپزیشک‌هێشتا کاری ده‌کرد.

سه‌عات له‌ سنووری سێی به‌یانی تێپه‌ڕی‌بوو. بڕێک دوورتر دزه‌ زۆربه‌ ئارامی ئانیشکی چه‌قاند و له‌ جێگاکه‌یدا دانیشت. بێجگه‌ له‌ ژان و ئێش‌هیچ شتێکی دیکه‌ی له‌ لاقیدا هه‌ست پێ‌نه‌ده‌کرد، هه‌ر ئه‌و به‌شه‌ له‌ پای ئی‌خۆی بوو که‌ دێشا، ئه‌ژنۆی ته‌واو قرچ هه‌ڵاتبوو. قورسایی له‌شی خسته‌سه‌ر لاقه‌ ساخه‌که‌ی که‌ به‌ری دابۆوه‌، پاشان به‌ هه‌رتک ده‌ستان تێکۆشالاقه زاماره‌که‌ی بکێشێ. ژان وه‌کوو پۆله‌ گورگێک له‌ ناکاو هێرشی هێناو خزایه‌ نێو ته‌واوی له‌شی و بێ وه‌ستان گه‌ڕایه‌وه‌ ئه‌و که‌نده‌ڵانه‌ره‌شه‌ی لێی هه‌ستابوو. به‌ یارمه‌تی کۆڵه‌که‌ی ده‌ستی ورده‌ ورده‌ له‌دۆشه‌گه‌که‌ جوێ بۆوه‌ و به‌ نێوان ته‌خته‌کاندا بزووت. کاتێک گه‌یشته‌پێینی ته‌خته‌که‌ی ناچار بوو پشوویه‌ک تازه‌ کاته‌وه‌. پشووی وه‌ها سواربوو ده‌تگوت نه‌خۆشیی هه‌ناسه‌بڕکه‌یه‌تی، ملی به‌لادا ده‌هات و به‌زه‌حمه‌ت سه‌ری بۆ راده‌گیرا. پاش ماوه‌یه‌کی کورت پشووی هاته‌وه‌ به‌رو به‌ هێمنی راست بۆوه‌ و قورسایی خسته‌ سه‌ر لاقه‌ ساخه‌که‌ی. ده‌یزانی‌لاقه‌که‌ی دیکه‌ی به‌ که‌لکی نایا و ناچاره‌ بۆ هه‌ر کوێ بچێ به‌ دوای خۆیاره‌کێشی بکا. له‌ پڕ سه‌ری له‌ گێژه‌وه‌ هات، سه‌رتاپای له‌رزی، نۆبه‌تێی‌بوو، ددانی ددانی نه‌ده‌گرت. ده‌ستی به‌ لاتاری ئاسنینی ته‌خته‌کان گرت،ده‌تگوت زنجیرێکی گرتووه‌ و قه‌ف‌قه‌ف ده‌چێته پێش و به‌ ئارامی به‌ نێوخه‌وتووه‌کاندا تێپه‌ڕی. پا زاماره‌که‌ی وه‌کوو تووره‌که‌یه‌ک به‌ دووی‌خۆیا ده‌کێشا. که‌س خۆی تێنه‌گه‌یاند، هیچ‌که‌س لێی نه‌پرسی له‌ سێباری‌شه‌وا بۆ کوێ ده‌چێ. بێتوو که‌سێک پرسیبای، ده‌یزانی چ وڵامێکی‌بداته‌وه‌، ده‌یگوت ده‌چم میز بکه‌م، پێی خۆش نه‌بوو هاوسه‌ری دوکتۆرهه‌رای لێ‌بکا، نه‌ ده‌یتوانی فریوی بدا و نه‌ درۆی له‌گه‌ڵ بکا، راستییه‌که‌ی‌ده‌گوت، ناتوانم هه‌ر وا له‌و کونه‌دا بڕزم، ده‌زانم مێرده‌که‌ت هه‌ر چی له‌ده‌ستی هاتووه‌ بۆی ئه‌نجام داوم، به‌ڵام کاتێک ئوتۆمبیلم ده‌دزی‌چاوه‌ڕوانی یارمه‌تی که‌س نه‌بووم، ئێستاش هه‌ر وایه‌، خۆم ده‌بێ بڕۆم،کاتێک وه‌زعم ببینن خێرا ده‌زانن حاڵم چه‌نده‌ په‌رێشانه‌، به‌

نەخۆش‌بەردەمبەنە نەخۆشخانە، بێ‌شک نەخۆشخانەی تایبەتی کوێرانیش هەیە،کەسێک کـەمتر و زیاتر جیاوازییەکی نیـە، بـە برینەکـەم رادەگـەن و چـاک‌دەبێتـەوە، بیستوومە ئـەو کەسانەی حـوکمی مەرگیشیان بـۆ دەبڕێتەوەئـەو کارەیـان لەگـەڵ دەکـەن، تەنانـەت ئەگـەر نەخۆشـیی ریخۆڵەکوێرەبگرن لە پێشدا برینکاریان دەکەن پاشان لە داریان دەدەن، ئاوا بە ساغی‌دەمرن، لە روانگەی منەوە ئەگەر بمگێڕنەوە بۆ ئێرە بێ‌قەیدیە. بەرەوپێشتر رۆیـی و ددانی دەچیـڕەوە بـرد هەتا نەناڵێنێ، بەلام هەر کـە گەیشتەئاخری ریزەکـە خـۆی پـێڕانـەگیرا و لـە بـەر نیگـەرانییان فرمێسکی‌سەرەولێژ بوون. تەختەکانی نـەبژاردبوو، وایـدەزانی یـەکی دیکـەش مـاوەو لـە پـڕێ رووبەرووی بەتالایی ببۆوە. لە سەر تەرکی ژووڕێ تخێڵ بووو جووڵـەی لـە خـۆی بـڕی هـەتا دڵنیا بوو کەسێ شڵپەی کەوتنی‌نەبیستووە. پاشان تێگەیشت ئەم هەل‌ومەرجـە بـۆ مرۆڤـی کـوێر زۆر باشەو بێتوو لە سەر چنگان بڕوا، رێگا باشتر دەدۆزێتەوە. بە هەرکوێرەوەرییەکی بوو خۆی گەیاندە سەرسەرا، لەوێ ئیستێکی راوەستاهەتا بزانێ بەرەو کام لا بڕوا، داخوا باشتر وایـە لەبـەر دەرگای‌سەرسەراوە هەرای سەربازەکان بکا یا بچێتە بەر دەروازە و لەو پەتەکـەلک وەربگـرێ کە ئێستاش لە جێی دەستگیرە کاری دەکرد. باش‌دەیزانی ئەگەر لـەوێوە یارمـەتی بـوێ، خێـرا تێی‌رادەخورن کـە بگەڕێتەوە،بـەلام لـە لایـەکی دیکـەڕا وەبـیری کەوتـەوە سـەرەڕای ئـەوەی تەختەکان جێ‌دەستی زۆرقایم و رەختەیان هەبوو دیسانیش تووشی چ بەلایەک هات،بە خـۆی گوت بە رایەڵێکی شەلەپەتە هەر هیچم بۆ ناکرێ و هێندێ کەوتەگومانەوە. پاش چەند دەقیقـە بە بیریدا هات کە رێ چارەیەکی‌دۆزیوەتەوە. بـە خـۆی گـوت بـە گاگۆڵـە بـە ژێـر پەتەکـەدا دەڕۆم و جارجاردەسـتم هەڵـدێنم و رایەڵـەکە دەنگێـوم هـەتا دڵـنیا بم لـە رێگـا تلاسـا نەبووم،چەشنی ماشێن دزین هەمیشـە رێ و شـوێن و ئـامرازی پێویسـت پەیـدادەبن. لـە ناکـاو، لەوپەڕی سەرسوڕماندا ویژدانی وەخەبەر هات و زۆر بەتوندی سەرکۆنەی کرد کـە ئوتـۆمبیلی پیـاوێکی کـوێری بـەخت‌وەرگـەڕاوی‌دزیـوە. بەهانـەی دێنایـەوە، خـۆ لەبـەر ماشـێن دزیـن نەکەوتوومە ئەو دۆخەنالەبارە، بەڵکوو بـە هـۆی ئـەوەی گەیاندمـەوە مـاڵ تـووش بـووم، چـاو لەمهەڵە گەورەیەی کـردم. ویـژدانی حەوسـەلە و تاقـەتی ریـس و گـوریس‌هێنانـەوەی نـەبوو، بەڵگەکانی سادە و ساکار و روون بوون، دەبێ رێز وحورمەتی کوێران راگیرێ، نابـێ دزی لـە کـوێر بکـرێ. تاوانبـار بۆبـەرەنگاری کـردن و سـڕینەوەی گونـاه بـەرەو رووی ئـەو بـیرە راوەستا،بێتوو بە پێوانەیەکی دروست هەڵیسەنگێنین من دزیم لەم نـەکردووە، خۆئوتۆمبیلەکـەی

له گیرفانی نه‌نابوو، ده‌مانچه‌شم لـه سـه‌ر سـه‌ری‌رانـه‌گرتبوو، ویـژدانی تیـی‌راخـوڕی، ریـس و گوریس مه‌هێنه‌وه، سه‌رت به‌کاری خۆته‌وه به‌ند بێ.

شنه‌ی فێنکی به‌یانی ڕوومه‌تی لاوانده‌وه. به خۆی گوت پشـوو کێشـان‌لێـره چه‌نـد خۆشـه. وه‌یده‌زانی لاقی که‌متر ژان ده‌کا، سه‌یر نه‌بوو، له‌پێشووشدا تووشی وه‌ها هه‌ستێک ببـوو. ئێسـتا له‌و دیوی ده‌رگای چوونه‌ژووره‌وه بوو، هه‌ر ئێستا ده‌گه‌یشته پلیکانه‌کان، له دڵـی خۆیـا گـوتی به‌سه‌رمه‌قولات چوونه‌خوار له‌و پێپیلکانه له هه‌موو شتێک ناخۆشتره،ده‌ستی به‌رز کرده‌وه بزانێ په‌ته‌که‌ی له سه‌ر سه‌رییه و درێژی به ڕێی‌خۆیدا. وه‌کوو داینابوو پێ گوێزتنه‌وه له پلیکانێک بۆ یه‌کی تر ئاسان‌نه‌بوو، به تایبه‌ت به‌و قاچه زاماره‌ی که لێی ببوو به بار، بارێکی خواری‌ناله‌بار، له نێوه‌ڕاستی پلیکانـان ده‌سـتێکی هه‌ڵخلیسـکا و بـه لادا هـات وتێـک‌هه‌ڵـگلا. ژانه‌کـه‌ی لـه‌ڕێوه گه‌ڕایه‌وه، ده‌تگوت که‌سێک مشـار وبرغـووی لـه برینه‌کـه‌ی نـاوه و بـه چه‌کوچ ده‌یکوتـێ، ته‌نانه‌ت خۆشی پێی‌سه‌یر بوو کـه چـۆن تـوانی هاواره‌کـه‌ی قـووت داتـه‌وه. ماوه‌یـه‌ک بـه‌ره‌و دم‌که‌وت. پشووبایه‌کی له‌پڕ له‌رزه‌ی خسته ئه‌ندامی. جگه له ژێر کراس وده‌رپێ چـی دیکـه‌ی له‌به‌ردا نه‌بوو. برینه‌که‌ی له سه‌ر حه‌رزی ده‌خشکا، به‌خۆی گوت ره‌نگه پیس بێ و بکولێتـه‌وه، بیرێکـی نه‌فامانـه، لـه یـادی‌چووبـۆوه کـه لـه که‌یـه‌وه لاقـی ده‌خشـکێنێ، پاشـان بـۆ ئـه‌وه‌ی دڵخۆشییی‌خۆی بداته‌وه گوتی ده‌ی چ نیه، به‌ر له‌وه‌ی برزێ تیماری ده‌که‌ن،وه‌رسـووڕایه سـه‌ر که‌له‌که‌ی هه‌تا باشتر ده‌ستی بگاته په‌ته‌که. رایه‌ڵـه‌که‌ی‌زۆر بـه هاسـانی نه‌دۆزییـه‌وه. لـه بـیری نه‌بوو کاتێک خلیسکاوه له‌گه‌ڵپه‌ته‌که که‌ش و تووش که‌وتوون، بـه‌ڵام بـه گـوێره‌ی سروشـتی ئاده‌میزادماوه‌یه‌ک له جێـی خـۆی رامـا. کـه‌مێک دواتـر کـه فکـری هاتـه‌وه به‌رخۆی،دانیشـته سـه‌رقوون و ورده ورده پاشـه‌وپاش کشـایه‌وه هـه‌تا سمـتی له‌سـه‌ر یه‌کـه‌م پلیکـان دانـا و سه‌رکه‌وتوانه ده‌ستی هه‌ڵێنا و په‌نجه‌ی ئاوقای‌په‌ته ئه‌ستووره‌که بوو. وێده‌چوو هه‌ر ئه‌و هه‌سـتی سـه‌رکه‌وتنه لـه‌ڕێوه‌بێ بـه هـۆی ئـه‌وه کـه رێگایـه‌ک بدۆزێتـه‌وه بـۆ ئـه‌وه‌ی برینه‌کـه‌ی نه‌خشکێ،پشتی کرده ده‌روازه و وه‌کوو شه‌ل و گیـڕان قۆڵـی کـردن بـه شـه‌قه و به‌دانیشـتنه‌وه ورده ورده بزووت. بەڵێ، پشت له ئامانج، چونکه له‌م‌بابه‌ته‌شدا وه‌کوو هه‌میشه کێشـان هاسـانتر بوو لـه پاڵـدان. بـه‌م شـێوه‌یه‌ژانی قـاچی کـه‌متر ده‌بـوو، هـه‌روه‌ها سـه‌ره‌ولێژیی حه‌سـاره‌که‌ش به‌ره‌وده‌روازه یارمه‌تییه‌کی گه‌وره بوو. له لایه‌کی دیکه‌وه مه‌ترسیی گوم‌کردنی په‌ته‌کـه‌ش لـه ئارادا نه‌بوو، چونکه بێ نێوبڕ ره‌سه‌ری ده‌خشا. نه‌یده‌زانی مه‌ودای هه‌تا ده‌روازه چه‌نده، له سه‌ر پـێ رۆیشـتن جیـاوازی‌هـه‌بوو له‌گـه‌ڵ بسـت‌بسـت کشـانه‌وه و خشـکان. بـۆ چرکه‌یـه‌ک

فەرامۆشی کرد کە کوێرە، سەری وەرسووڕاند هەتا بزانێ چەندەی مەودا ماوە،بەڵام دیسانیش بەرەو رووی دنیای سامالٔ سپی بۆوە. لە خۆی پرسی‌باشە شەوە یا رۆژ، چاکە ئەگەر رۆژ بوایە تا ئێستا منیان دیتبوو،ئەمجاریش تەنیا بەرچاییان پێ‌داین و ئەویش گەلێ لەمەوپێش. سەری‌سوڕما لەو لێکدانەوە ورد و خێرایەی، چەندەی مەنتیقی بیر دەکردەوە،خۆی لە دەوشانەوەیەکی نوێدا بەدی کرد، ببوو بە پیاوێکی دیکە وئەگەر ئەو لاقە بەلایەی نەبووبا سوێندی دەخوارد لە تەواوی ژیانیدائاوای کەیف ساز نەبووە. پاشەڵی وەتەختی داوێنی دەروازە کەوت. ئیترگەیشتبوویە. نیگابان کە لە سەرمان لە ژوورۆکەی نیگابانیداهەڵکورمابوو دەنگەدەنگێکی بیست کە بۆی نەچۆوە سەر یەک، بەڵامدەیزانی لە ژوورەوە نەهاتووە، رەنگە خشەخشی لە نەکاوی گەڵای‌داران بووبێت یان با لقە دارێکی بە پەرژینی ئاسنینی حەوشەدا دابێ. بەشوێن ئەم دەنگانەوە دەنگێکی تریش بیسترا، دەنگێکی تازە، شڵپەیەک،شڵپەیەکی کە کاری با نەبوو. نیگابانەکە بە سەرلێ‌شێواوی دەرپەڕی،قامکی لە سەر پەلاپیتکەی تفەنگەکەی بوو، چاوێکی لە لای دەروازە کرد. هیچی نەدیت. بەڵام دەنگەکە بەرزتر لە جاری پێشوو هاتە گوێ، دەتگوت کەسێک چنجڕووک بە سەر شتێکی گرنی‌گرنی‌دا دەکێشێ. بە خۆی گوت‌دامێنی دەروازەکە. دەیەویست هەڕاکاتە ئەو چادرەی گرووبانەکەی تێداخەوتبوو، بەڵام لە دڵی خۆیدا گوتی نەکا گوێی زرینگابێتەوە و بێتوو هەروا بیکاتە هەرا تووشی تێهەڵدان دەبێ، ئاخر گرووبان پێیان خۆش نیەکەس لە خەو رایانپەڕێنێ و دووخەوبن، تەنانەت ئەگەر پێویستیش بێ. چاوی بڕییە دەروازە و بە دڵەڕاوکەوە چاوەڕوان مایەوە. روخسارێکی‌سپی لە نێوان چاوەیەکی دەروازەوە چەشنی تارمایی‌یەک خۆی نواند. روخساری پیاوێکی کوێر. سەربازەکە لە ترسان خوێنی راوەستا و ترس‌وای لێ‌کرد بیداتە بەر رەهێڵەی گوللە.

تەقەی تفەنگ لەڕێوە سەربازە نیوەرووتەکانی لە چادرەکانیان‌دەرپەڕاند. ئەمانە سەربازی بنکەی نیگاداری و پاراستنی شێتخانە وقەرەنتینە کراوەکان بوون. ئێستا گرووبان خۆی گەیاندبووە شوێنی‌رووداو، چیە ئەو شریخ و هۆڕە، سەربازەکە بە پڵتەپڵت گوتی، پیاوێکی‌کوێر، پیاوێکی کوێر، لە کوێ، لە هۆوەی بوو، بە قۆنداخی تفەنگەکەی‌ئاماژەی کردە دەروازەکە، من کە هیچ لەوێ نابینم، لەوێ بوو، خۆم دیتم. گرووبان دەستووری دا، نوورهاوێژەکە هەڵ کەن. یەکێک لەسەربازەکان لە سەکۆی نوورهاوێژ سەر کەوت. چەند چریەکەک دواترنوورێکی چاوبەزێن بەر دەروازە و ساختومانەکەی روونا‌ک کرد. گرووبان گوتی کەسی لێ‌نیە، نەفام، دەیەویست چەند جنێوی سەر بەکوڵکەی دیکەشی پێ‌بدا کە لە پڕ

لووزەوی شۆڕاوگەیەکی تاریکی وەبەرچاو هات. گوتی چاوت پێ سپی کرد. پاشان کەوتەوە یادی ئەودەستووره تونـدوتیژەی پێی درابوو، نەڕانـدی بکشـێوە، لێی دەگرییەوە. تێکـڕای سەربازەکان کە بە جلەوە ئامادە وێستابوون کشانەوە، بەڵامهەر وا نیگایان بڕیبووە ئەو جۆگەلـە خوێنـەی لـە ژێـر دەروازەوەشـێلاوگەی بەسـتبوو. گرووبـان پرسـی، بـە بـڕوای تـۆ مـردووە، سەربازەکەئێستا شـانازی بـە ئـەنگێوەیی خـۆی دەکـرد، گـوتی دەبـێ مردبێ،فیشـەکەکان راستەوڕاست وە دم و چاوی کەوتن. لەو کاتەدا سەربازێکی‌تر بـە نیگەرانییـەوە هـاواری کـرد، گرووبان، گرووبان، بڕوانە. لە سەرپلیکانان کـە بـە تیشـکی نوورهـاوێژی سـوورەک روونـاک ببوون، تاقمێک‌کوێر، زیـاتر لـە دە کـەس، دەبینـدران، گرووبـان گوڕانـدی نەیەنـە پێش،بێتـوو هەنگاوێک بێنـە پـێش دابێـژ دابێژتـان دەکـەم. لـە پەنجـەرەکانی‌سـاختومانەکەی بـەرەو رووڕا دەستەیەکی زۆر کە بە تەقەی تفەنگ‌وەخەبەر هاتبوون، بە ترسەوە دەیانڕوانی. پاشان گرووبان نەڕاندی‌چوارتان وەرن و تەرمەکە بەرنەوە. چونکـە نەیانـدەبینی و نەیانـدەتوانی‌بژمێـرن، شـەش پیاوی کوێر هاتنە پێش. گرووبان بە تووڕەیی گوڕاندی،گوتم چوار کەس. کوێرەکان دەستیان لێک کوتا، دیسانەوەش دەستیان‌گیڕا، دوویان بەجێ‌مان. ئەوانی تر پەتەکـەیان گـرت و بـەرەو پێش هاتن.

کوێری

دوکتۆر گوتی دەبێ بزانین لەو دەور و بەرانـە پـاچ و پێمەڕەیـەکمانوەگـیر ناکـەوێ هـەتا قوڵکەیەکی پێ‌هەڵکەنین. بەیانە بوو، بە هەرچەرمەسـەری و کوێرەوەرییـەک بـوو مەیتەکـەیان هێنایە حەساری‌ژوورەوە و لە نێو زبڵـوزاڵ و خەزەڵـی زەردی داران رایانکێشـا. ئێسـتادەبوو لـە ناخیان رۆکردبا. تەنیا خێزانی دوکتۆر دەیزانی مەیتەکە چەندەشـپڕێوە، روخسـار و کـاژەڵاکی دابێژدابێژ و پژابوو، شوێنی جێ‌فیشەکیش لە لامل و سەرسینگی خۆیان دەنواند. هـەروەها بـاش دەیزانی‌کە لە تەواوی ئەو شێتخانەیەدا هـیچ شـتێک بـۆ گـۆڕ هەڵـکەندن پەیـدا نابـێ. تـەواوی کەلێن و قووژبنی ئەو شوێنەی تێیدا دیل کرابوون بە وردی‌گەڕابوو و جگە لە میلەیەکی ئاسنین

چی تری دەس نەکەوتبوو. میلەکە بەکار دەهات بەڵام بە تەنیا کاری پێ مەیسەل نەدەکرا. لە پشت پەنجەرەداخراوەکانی ڕێڕەوی لای چەپ کە بۆ ئالوودە بووەکان تەرخان کرابوو، روخساری بزرکاو و ترس تێزاوی ئەو کەسانەی دیتبوو کەچاوەڕوانی نۆرە بوون، نۆرەی ئەو زەمانەی کە دەبوو بڵێن کوێر بووین یان بێتوو دەردەکەیان حەشار دابایە، بزووتنەوەیەکی ناشیانە، سەروەرسووڕاندنێک بۆ دۆزینەوەی سێبەرێ و هەڵەنگوتن لە کەسێکیساخ بەس بوو هەتا رازیان ئاشکرا بێ. دوکتۆریش تەواوی ئەومەبەستانەی دەزانی، ئەوەی لە پێشدا گوتی تەنیا بە مەبەستی گەیشتن بەم ئامانجە بوو کە لەگەڵ ژنەکەی گەڵاڵەیان بۆ دانابوو. هەر لە سەرئەو پێوشوێنە خێزانی گوتی پێتچۆنە هەرا کەینە سەربازەکان بە سەردیواردا پێمەڕەیەکمان بۆ بهاوێنە ئەو دیوە. فکرێکی باشە، بە تاقی کردنەوەی بێ زەرەدە، تێکڕا رەزامەندییان دەربڕی، تەنیا کچەیچاویلکەیی لەم بارەوە بڕوای دەرنەبڕی، بێ پسانەوە دەگریا ودەیلووشماند، بە هەنیسک دان گوتی تاوانی من بوو، قسەکەشی راستبوو، حاشای لێنەدەکرا، بەڵام کوا بڵێی ئەو کارە بتوانێ کوڵی دڵیرۆمرکێنێ. ئەو مەبەستە ئاشکرایە بێتوو بەرژەوەندی کاران بکەین و بەوردی بیری لێبکەینەوە و لە پێشدا ئاکامی رێوڕێ و پاشان ئەنجامیچاوەڕوان نەکراوی لێک بدەینەوە، هەرگیز هەنگاوێک لەو جەغزە بەولاوەتر نانێین کە بیر کردنەوە بۆمان دیاری دەکا. ئاکامی چاکە و خراپەیوتار و ئاکاری ئێمە دەخرێنە سەر دوو تای تەرازوویەک و گریمانئەوەیە کە لە تەواوی رۆژەکانی داهاتوودا بە شێوەیەکی دادپەروەرانە وباش و رێکوپێک بن، جا با لە داهاتووی بێبڕانەوەدا ئێمە تەمەنمانبەسەر چووبێ و تازە نەزانین پیرۆزبایی لە خۆمان بکەین یا داوایلێبوردن. لە راستیدا کەسانێک لە سەر ئەو باوەڕەن ئەوە هەر ئەمهەرمانە قالۆرەیە کە باسی دەکرێ. رەنگە، بەڵام ئەو پیاوە مردووە ودەبێ ژێر گڵ بکرێ. لە سەر ئەو پێوشوێنە دوکتۆر و خێزانی بۆوتوویژ دوور کەوتنەوە، کچەی پەژارەدار گوتی لە تەکیانا دەچێت. ویژدانی ئازاری دەدا. هەر کە لە بەر دەرگای چوونە ژوورەوە هەڵقوڵینسەربازێک هاواری کرد راوەستن، دەتگوت دەترسێ وڵامی نەدەنەوە،هەر بۆیە چەند فیشەکی بە ئاسمانەوە نا. کوێرەکان ترسان و خۆیانوەپەنا دەرگا قورس و ئاوەڵەکەی سەرسەرا دا. هاوسەری چاوپزیشکبە تەنیایی رۆیشتە پێش، لەم شوێنەوە کە راوەستابوو هاتوچۆ وبزووتنەوەی سەربازەکەی دەبینی و ئەگەر پێویست بوایە پەنای دەگرت. گوتی هیچمان نیە مردۆکەی پێ بنێژین، پێمەڕەمان دەوێ. لەو دیویدەروازەوە، لەوبەری، ئەم شوێنەی کە کابرای لێکوژرابوو، سەر وسەمەنەی کەسێکی

دیکە پەیدا بوو. ئەوە گرووبان بوو، بەڵام نەک ئەوەی پێشوو، هەرای کرد چیت دەوێ، پێمەڕەیەک، شتێک. نیمانە، بڕۆوە ژوور. دەبێ مەیتەکە بنێژین، زەحمەتی شاردنەوە وەبەرخۆتان مەدەن،لێی گەڕێن هەر وا بڕزێ، بێتوو هەر وا لێی گەڕێین وڵات بۆگەن و پیس دەکا، دەیجا با بیکا، گۆڕی گیانتان بێ، بەڵام هەوا دەبزوێ و نەخۆشی تەواوی وڵات دەتەنێتەوە. ئەو قسەیە گرووبانەکەی خستە فکرەوە. ژنەراستی دەکرد. ئەم کەسە لە جێی گرووبانەکەی پێشوو بوو کە هەرموقرایی داهات لەڕێوە راگوێزرا بۆ نێو قەرەنتینە کراوەکانی سپا. پێویست بە گوتن ناکا کە هێزی ئاسمانی و دەریاییش رێکخراوی تایبەتبە خۆیان هەبوو، بەڵام نەک بە رادەی هێزی زەوینی زۆر و بەربڵاو،چونکە هەر دوو هێز تاقمی کەمتریان هەبوو. گرووبان بە خۆی گوت ئەوژنە راست دەکا، بێگومان لە وەها هەلومەرجێکا مرۆڤ هەر چەندی خۆبپارێزێ هەر کەمە. بۆ بەرگری کردن لە بڵاو بوونەوەی نەخۆشیی دووسەرباز بە ماسکی دژی گازەوە دوو شووشەی گەورەیان ئامووناک بەسەر جۆگەلە خۆینەکەدا کردبوو و بۆنی تیژ و قەتیسماوی هێشتاش فرمێسکی لە چاوی سەربازەکان دەباراند و گەروو و کەپۆیانیدەکزاندەوە. سەرەنجام گرووبان گوتی بزانم چۆن دەبێ، خێزانیدوکتۆر هەلی قۆزتەوە و گوتی ئەدی نان و پێخۆر چی، هێشتا نان وخوانیان نەهێناوە، تەنیا ئەو قۆڵەی ئێمەی تێدا دەژین پەنجا کەسی پترلێیە. ئێمە برسیمانە، ئەو برە شێوەی دەینێرن بەش ناکا. دابین کردنی نانو خواردەمەنی ئەرکی سپا نیە، خۆ دەبێ کەسێک ئەو گرفتە رەها کا،دەوڵەت ئەرکی ئەوەیە نان و پێخۆرمان بۆ بەڕێ کا، بڕۆوە ژوور، پێمخۆش نیە کەس لەبەر دەرگاوە ببینم، هاوسەری چاوپزیشک گوتی دەیباشە ئەدی پێمەڕە چی لێهاتەوە، بەڵام گرووبانەکە رۆیشتبوو. تازەبەری بەیانی بوو کە نەڕەی بڵیندگۆ ژوورەکانی تەنییەوە، سرنج بدەن،سرنج بدەن، قەرەنتینە کراوەکان خۆشحاڵ بوون، وایانزانی نان وخواردەمەنیان بۆ هێناون، بەڵام نا، باس باسی پێمەڕە بوو، کەسێ بێت وبیبا، بە کۆمەڵ مەیەن، تەنیا کەسێک بێ، ژنی دوکتۆر گوتی من دەچم،چونکە خۆم قسەم لەگەڵ کردوون. کە لە دەرگا وەدەرکەوت پێمەڕەکەیدیت. لە نیزیک دەروازە و دوور لە پلیکانەکان فڕێ درابوو، وێدەچوو بەسەر پەرژینی ئاسنیدا حەوا درابێتە ئەم دیوە، ژنە گوتی نابێ لە یادمبچێتەوە کە منیش بە کوێر دەزانن، پرسی لە کوێیە، گرووبان گوتی لەپلیکانان وەرە خوار جا پێت دەڵێم چ بکەی، ئافەریم باشە، ئێستا هەر بۆئەولا بڕۆ، هەر وا دەی، هەر وا دەی، راوەستە تۆزێک بۆ دەستە راستوەرسووڕێ، نا، بۆ چەپ، کەم، کەمتر، ئێستا بۆ پێشەوە، بێتوو هەر واراست بڕۆی پێی

دەگەی، ئاخ، بۆ کویێ ئاخر نەمگوت هەر وا بڕۆ،دوورەوە بووی، دوور، ئـاوا باشـتر بـوو، زۆر باشە، دەی ئێستانیوخولێکی بـدە تـا پێـت بڵـێم، نامهـەویێ هـەر بـە دەوری خۆتـا بسـووڕێیەوەتا دەگەیـە دەروازە، ژنـە لەبـەر خۆیـەوە گـوتی خاترجـەم بـە، لێرەوەیەکڕاسـت دەچـم بـۆ لای دەروازە، باشە چ دەبێ، تەنانەت ئەگەر گومانیشبکەی کە کوێر نیم هەر بە بای خەیاڵمدا نایە، خۆ تۆ نایەی لێرەوە بمگریو بمبەی. پێمەڕەکەی وەکوو گۆڕهەڵکەنێکی کە دەچتە سەر کـار هاویشتەسەرشانی و بە بێ هیچ دڵاودڵێک بەرەو دەرگای چوونەوە ژوورگەڕایەوە، یەکێک لە سەربازەکان بە سەرسوڕمانەوە گوتی دیوتەگرووبان، هەر دەڵێی دەبینێ، گرووبان بە راوێژێکی قورس و متمانەدارگوتی کوێرەکان زۆر خێرا خوارەکە و پێچەکەی رێگایان فێر دەبن.

گۆڕهەڵکەندن کارێکی ناخۆش و ئەستەم بوو. حەرزەکە رەق و سفتو پڕ بوو لـە رەگ و ریشەی داران. شۆفیر تاکسی، دوو پۆلیسەکە وکوێرەپیاو بە نۆرە کاریان کرد. کاتێـک لەگـەڵ مەرگ دەستەویەخەین واچاوەڕوان دەکرێ کـە سروشـت لـە زوڵـم و زۆر و تـووڕەیی خـۆی کەمکاتەوە، ئەو مەبەستەی کە خەڵک دەڵێن دوژمنایەتی کۆن بە ئاسانینابڕێتـەوە راسـتە و بـۆ سەلماندنی دەتوانین بڕوانینـە ژیـان و ئەدەبیات،بـەڵام وەکـوو دیـار بـوو ئـەو هەسـتە لێـرە، لـە قـووڵایی زەویـدا، کۆنـە رق نـەبوو، چونکـە ماشـێن دزیـن و نرخـی گیـانی ئـەو کەسـەی ماشێنیدزیبوو، پێکەوە بەراورد نەدەکران، بە تایبەتی ئەگەر سرنجێکمان دابایەلاشـەی شـپرێو و بەزەیی بزوێنی، چونکوو چاو پێویست نەبوو کە مرۆڤبزانێ ئەم روخسارە کەپۆ و دمی نیـە. تەنانەت نەیانتوانی گەزێکیشهەڵکەنن. بێتوو مردۆکە قەڵەو بوایە، زگی نەدەشاراوە، بـەڵام دزە کزبوو، دەتگوت رەگە گیایە، بە تایبەت ئەو چەند رۆژەی کە هیچـی بۆنـەخورابوو ئەوەنـدەی تر کـز ببـوو، قـەبرە کـە جێـی دوو کـەلاکی وەک ئـەوی‌دەبـۆوە. نـە رێورەسمێـک بـوو نـە دوعایەک. کچەی چاویلکەیی وەبیریهێنایەوە کە دەکرا خاچێکی لە سەر گڵکۆکەی چـەقیبا، ئەو قسەیەی لەرووی پەشـیمانییەوە دەکـرد، بـەڵام ئـەویش وەکـوو هـەمووان دەیـزانی کەئـەو مردووە هەرگیز یادی خودا و دینی نەدەکرد، وا باشە خۆ لەومەبەستە هەڵنەقوتێنین و بە بارێک پینەی کەین، پاش مردوان رەحمەتچاکە، هەروەها دەبێ ئەوەش بزانین کە خاچ سـاز کـردن زۆر لەوەی کەپێمانوایە هاسانە، گرانترە و لە نێو ئەم هەمووە ئینسانە کوێرەی کـەنازانن پـێ لـە کوێ دادەنێن خێرا پێخوست دەکرا. هەموو گەڕانەوە ژوور. کوێرەکـان لـە شـوێنی قەرەباڵـغتر بەومەرجەی دەوروبەریان ئاوەڵە نەبێرێیان لـێ ون نابـێ، ئـەوان، بـە کوێرەکـوێرە و بـاوەش و ئەنگوستیئاوەڵاوە کە دەڵێی شاخۆکی زیندەوارانن دەیجووڵێننەوە هـەموو جێیـەکدەبیننـەوە،

تەنانەت کوێری وریاتر بێتوو پەروەردە بکرێن دەتوانن کاریدیکەش بەڕێوە بەرن. بۆ وێنە خێزانی دوکتۆر بێننە بەرچاو، مرۆڤێکی گەلێ گەلێ وریایە و بڕوانن بزانن چلۆن ڕێگای خۆی لە نێو ئەوهەزاربەهەزارەدا دەدۆزێتەوە و کەلێن و قوژبنان دەپشکنێ، زۆربەوردی دەزانێ لە کوێ پێچ کاتەوە و بێ ژوماردن دەتوانێ تەختەکەیببینێتەوە. هەر ئێستا لە سەر تەختی مێردەکەی پاڵ بە پاڵییەوەدانیشتووە و بە گوێرەی عادەتی پێشووی بە ئارامی دەیدوێنێ، دیارەکەسانێکی خوێندەوارن و هەمیشە قسەیان بۆ یەکتر پێیە، وەکوو ئەوجووتەی دیکە نین، کوێرەپیاو و ژنەکەی دوای شۆڕوشۆقی دیدار نوێ کردنەوە ئیدی قسەیەکی وایان پێ نەمابوو، وا ویدەچێ چارەڕشیئێستایان ڕەسەر ئەوینی پێشوویانی داوە، بەڵام بە تێپەڕبوونی زەمانلەگەڵ ئەو بارودۆخە رادێن. تەنیا کەسێکی بێپسانەوە لە برساندەکڕووزێتەوە کوڕە خێلەکەیە، ئەگەرچی کچەی چاویلکەیی تەنانەتلەدمی خۆشی دەگرێتەوە و دەرخواردی ئەوی دەدا. چەند سەعاتێکەبیانووی دایکی نەگرتووە، بەڵام بێ گومان کە شێوی خوارد دیسانیشداوای دەکا، یانی کاتێک لە چنگ نیازی سادە بەڵام پێویست وخۆخوازانەی زیندوو بوون رزگاری هات. ڕاستەقینەی تاڵ ئەوەیە کە چبە بۆنەی ڕووداوی ئەو ڕۆژە و چ بە هۆگەلێکی دوور لە فامی ئێمە،بەرچاییان بۆ نەهێنان. ئێستا وەختی ژەمی نیوەڕۆیە، دەوروبەریسەعاتی یەکە بە گوێرەی سەعاتەکەی خێزانی دوکتۆر کە بە دزیچاوێکی لێدەکا، جا کە وایە سەیرنیە قووڕەقووڕی زگی کوێران لەوبەرەوبەری ساختومانەکە دەنگ بداتەوە و تێکڕا لە سەرسەرا چاوەڕێیهاتنی خواردن بن، ئەویش بە دوو هۆی ڕوون و بەجێ، یەکەم هۆی گشتیی بە بڕوای هێندێکیان لە دەس نەدانی هەل و بەڵگەی تایبەتیبڕێکان، هەر وەکوو هەموو دەزانن، ئەوە بوو کە هەر کەس ئازایە کوڕە. لە سەر یەک دە کوێری دەسبەسەر کراو گوێیان دەدایە جیڕەی دەرگا وهەستی پێی ئەو سەربازانەی بارگە پڕ شێوە پیرۆزەکانیان دێنا. ئەوقەرەنتینە کراوانەی گومانی کوێر بوونیان لێدەکرا، لە ترسی گرتنەوەینەخۆشیی کوێری نەیاندەوێرا بێنە سەرسەرا و لە نابیناکان نیزیکببنەوە، بەڵام هێندێک لە کەلێنی دەرگاوە دەڕوانن و چاوەنواڕی نۆرەیخۆیانن. زەمان تێپەڕی. تاقمێک لە کوێرەکان ئەوەندە چاوەڕوان مانەوەماندوو بوون و دانیشتن، پاشان دوو سێیەک گەڕانەوە شوێنی خۆیان. دوایە جیڕەجیڕی دەرگای ئاسن بیسترا. کوێرەکان بە پەلەپەل یەکتریانپاڵ پێوە دەنا و بەرەو لایەک دەچوون کە لە بەر دەنگەدەنگی دەرەوەلایان وا بوو بەرەو دەرگا دەڕۆن، بەڵام لەپڕ تووشی هەستێکینەناسراوی بێقەرار بوون کە دەرفەتی شی کردنەوەیان

نەبوو،راوەستان و سەر لیّ‌شێواو پاشەکشەیان کرد، ئێستا هەستی پێی ئەوسەربازانەی نان و خواردنیان بۆ دێنان و چەکدارەکانی هاوڕێیان بەئاشکرایی دەبیسترا. سەربازەکان هێشتاش لە دیتنی کارەساتی خەمبارێنی دویّ‌شەو نارەحەت بوون، هەر بۆیە تەمایان گرتبوو بەپێچەوانەی رابردوو خواردن و شێوەکە لە پشت ئەو دەرگایە دانەنێن کەدوو قۆڵی ساختومانەکەی لێک گریّ دەدا، بەڵکوو ببیەن لە سەرسەرافرێی بدەن و بگەڕێنەوە. بلا خۆیان بێن و بەشی خۆیان بەرن. لەبەرنووری درەوشاوەی دەرەوە و تاریکایی نێو سەرسەرا لە پێشدانەیانتوانی تاقمی کوێرەکان ببینن. بەلام هێندەی نەبرد کە دیتیانن. لەترسان هاواریان کرد، بارخانەکانیان بە حەرز دادا و بە پڕتاووەرسووڕانەوە و شێتانە هەلاتن. دوو سەربازەی پارێزەر کە لە دەرەوەچاوەڕیّ بوون، لە بەرابەر ئەو مەترسییەدا کردەوەیەکی خێرایان نواند. تەنیا خودا دەزانیّ کە چۆن و لەبەر چی بە سەر ترسی ئاقلانەیان زالبوون، لە نێودەرانە نیزیک بوونەوە و دەستیان کرد بە تەقە و تفەنگیانبەتال کرد. کوێرە دەس‌بەسەر کراوەکان تێک‌هەلەنگووتن و بە سەریەکدا کەوتن و گیانیان دابێژدابێژ بوو، دیارە ئەوەش بە فیرۆدانیفیشەک بوو، ئەو دیمەنە وەها سەیر و لەسەرەخۆ دەخولقا و کەلاک بەسەر یەکدا دەکەوتن کە دەتگوت بنەی نایە، چەشنی ئەو دیمەنانەی کەجارجارە لە سینەما و تلەویزیۆندا دەیبینین. ئەگەر هێستاش لەسەردەمێکا بژین کە سەربازەکان دەبیّ پووکەی گوللەی هاویژراویانبدەنەوە، ئەوان بە ئالا سوێند دەخۆن کە تەنیا بۆ پارێزگاری بیّ ئەملا وئەولا لە خۆیان و ئاوالە بیّ چەکەکانیان کە خەریکی ئەنجامی کاریمرۆڤ‌دۆستانە بوون تەقەیان کردووە و لە ناکاو بەرەو رووی‌هەرەشەی تاقمێکی گەورەی کوێری دەس‌بەسەر کراو بوون. سەربازەکان بە پەلە و شێتانە بەرەو دەروازە پاشەکشەیان کرد،سەربازەکانی دەرەوە بە نێو دەلانەی دەروازەدا سێرەیان گرتبوو و بەدەستی لەرزۆک ئامادەی پاراستنی هاوڕێیانی خۆیان بوون، دەتگوت‌ئەو نابینایانەی مابوون دەیانهەویّ پەلاماریان بدەن و تۆڵەیان لیّ‌بکەنەوە. یەکێک لەم سەربازانەی کە تەقەی کردبوو بە شێواوی وبزرکاوی گوتی تازە قۆرەشم بدەنێیە حازر نیم بگەڕێمەوە ئەوێندەریّ. دروست هەر ئەو رۆژە، بەرەبەری ئێواریّ، کاتێک کێشکیان دەگۆڕی، لەچرکەیەدا ئەویش کوێرێک بوو لە ریزەی کوێرەکانی تر، لێرەداسەربازیی دەفریای هات، ئەگینا دەبوو بچێتە لای ئەو قەرەنتینەکراوانەی کە ئاوالەکانی دابوونە بەر گوللە و خودا دەزانیّ ئەوان چیان بەسەر دێنا. پاش کارەساتەکە گرووبان ئاوای بڕوا دەربڕی، باشتر وا بوولێیانگەڕێین لە برسان بمرن، کاتێک جانەوەر بمریّ ژاریشی نامێنیّ. هەروەک دەزانین

زۆران ئەمەیان گوتووە و وایان بیر کردۆتەوە،بەختەوەرانە پاشماوەی بەنرخی عاتیفەی ئینسانیی هانی دا کە بلێ‌لەوەی بەولاوە بارخانەیان بۆ لە بەر دەرگای سەرسەرا دادەنێین، باخۆیان بێن و ببیەن، دەیانخەینە ژێر چاوەدێری و هەر بە جۆرێک‌جوولانەوە تەقیان لێ‌دەکەین. گەڕاوە بنکەی سەرکردایەتی، بلێندگۆکەی‌هەڵکرد، هەوڵی دا بە باشترین شێوە فکری جەم کاتەوە، لێرەداوشەگەلێکی هاتەوە بیر کە لە کاتی رووداوی ئاوادا بیستبووی ورایگەیاند جێی داخە بۆ سپا کە بە زۆری چەک بەری بە جووڵانەوەیەکی‌فیتنەگێڕانە گرت و لەڕێوە سەرکوتی کرد، لەم بابەتەوە ناکرێ‌راستەوخۆ یان بە پێچەوانە سپا بە گوناهبار بێتە حیسابێ، وا باشەلەوەی بەولاوە قەرەنتینە کراوەکان نان و پێخۆری خۆیان لە دەرەوەی‌ساختومان هەڵبگرن، ئاشکرایە دووپات کردنەوەی مەسەلەی دۆی‌شەوو ئەمڕۆ داوێنی خۆتان دەگرێتەوە. راوەستا، نەیدەزانی قسەکەی چۆن‌تەواو کا، وتەکانی لەبیر چووبۆوە، تەنیا دووپاتی کردەوە تاوانی ئێمەنەبوو، تاوانی ئێمە نەبوو.

تەقەی تفەنگ لە ژووری پشووبڕاوی سەرسەرا بە شێوەیەکی وەهالە نەکاو دەنگی دایەوە کە ببوو بە هۆی خەجڵان و زراو تۆقین. لە پێشداوایانزانی کە سەربازەکان پەلاماریان داوەتە ئەو بەشە هەتا هەموویان‌قەلاچۆ کەن و دەوڵەت بیر و بۆچوونی گۆڕاوە و هاتۆتە سەر ئەو بڕوایەکە تۆوبڕیان کا، هێندێک لە ژێر تەختی خۆیان ماتەیان هەڵگرت، چەندکەس لە ترسان ویشک هەلاتن، رەنگە هێندێک وایان بیر کردبێتەوە کەئاوا باشترە، بە جارێک مردن چاکترە لە توانەوەی وردە وردە، بێتووقەرار بێ کەسێ بمرێ، هەتا زوو بێ درەنگە. یەکەم تاقمی کە خێراخۆیان کۆ کردەوە دەس‌بەسەر کراوە نیمچەساغەکان بوون، ئەوکەسانەی وێدچوو درەنگ یان زوو کوێر ببن. هەر کە تەقە دەستی‌پێ‌کرد تێکڕا هەلاتن و خۆیان لە کون و کاژێڕاندا حەشار دا، بەڵام پاشان‌بێ‌دەنگی دنەی دان کە بگەڕێنەوە و روو بکەنە ئەو دەرگایەی سەرسەراو حەساری لێک گرێ دابوو. لیژەی مەیتەکانیان دیت، خوێن لە تەختی‌بنی ژوورەکەدا شێلاوگەی بەستبوو و دەتگوت گیانلەبەرێکی زیندووە،بە خوارەکە و پێچەکە رێگای دەکردەوە و بەرەو پێش دەیئاژوا، پاشان‌نیگایان کەوتە سەر بارخانەی نان و خوان و پێخۆر. برسیەتی بەرەوپێشی پاڵ پێوەنان، ئەو خواردنەی لە مێژ بوو تامەزرۆی بوون لەوێ‌کەوتبوو، لە راستیدا ئەوە بەشی کوێرەکان بوو، بە پێی رێ و شوێنی‌دیاری کراو دەیانزانی شێو و خواردەمەنی ئەوان هێشتا بەرێوەیە، بەڵام‌کێ گوێ دەداتە رێ و شوێن و دەڵێ کڵاوت بە چەندی، خۆ کەس ئێمەنابینێ، هەر وەک پێشینیانی ئێمە بە درێژایی مێژوو

وەبیریـان هێناوینەوەهـەتا مـاڵ بیهـەوێ، لـە کلیسـایە حەرامـە و دەبـێ بـزانین بـاپیرانی ئێمـە لەوبوارانەدا مامۆستان. بەڵام مەیلی برسییەتی سێ هەنگاو پتری بەرەوپێش نەبردن، مەنتیق خـۆی تێهەڵقوتاند و هـاواری کـرد کـە هـەر کـەس بـێپـارێز بڕواتـە پـێش مەترسـیی شـاراوەی لـەم کەلاکانەدا و بە تایبەتی لەشێلاوگەی خوێنا بە گیان کرِیوە، کێ دەیتوانی بڵـێ کـە لـە زارکـی بـرینیچەنـد قۆزاخـەی جـەنازەکانڕا چ هەڵـمێکی ژاراوی یـان نەخۆشـییگـەلێ بـەولاتا بـڵاو دەبوونـەوە. یـەکێ گـوتی ئەوانـە مـردوون، مـردوو بـێئازارن،مەبەسـتی ئـەوە بـوو خـۆی و هاوڕێیەکانی دڵنیا کاتەوە، بەڵام گوتەکانیدۆخەکەی پتر شێواند، راست بوو کـە ئـەو کوێرانـە مردبوون ونەیاندەتوانی بڕۆن و ببینن و بجووڵێنەوە و پشوو بکێشن، بـەڵام بـە کوێـدادیارە کـە کـوێریی سـپی جۆرێـک نەخۆشـیی رووحیـی نیـە، کـە وا بـێرووحـی ئـەو قوربـانی کراوانـە سەرەنجام ئازاد و رزگار و دوور لە لەشیگڵـین هـەر کـارێکی بیانهـەوێ دەتـوانن بیکـەن، بـە تایبـەتی خراپـە، کـە هـەمووەزانین هاسـانترین کـردەوەی بـێ نێوبـرە بـۆ مـرۆڤ. بـەڵام دیسانەوەخواردن سرنجی راکێشانەوە، زگی برسـی دیـن و ئیمـانی نیـە. لەدەفرێکـەوە شـتێکی ئاوەکی سپی رەنگ دەچۆڕاوە و بە نەرمی بەرەوجۆگەلەی خوێن دەخوشی، لە رەنگیڕا دیـار بوو کە شیرە. دوو کەس لەدەسبەسەر کـراوە گومـانلـێکراوەکـان کـە نـازانین ئـازاتر بـوون یانخۆیان دابوویە دەستی چارەنووس، لێک هـەڵاواردنی ئـەم دوو مەبەستەهەمیشـە ئاسـان نیـە، هەنگاویان نا بەرەو پێش و تازە دەستی چنۆکیان بـۆلای خواردەمەنییـەکان درێـژ کردبـوو کـە سەر و سەمەنەی دەستەیەک لەکوێرەکان لەبەر دەرگای قۆڵەکەی دیکەوە پەیـدا بـوو، خـەیاڵ بە تایبەتی لەوەها هەڵومەرجێکی بناوبێردا دەتوانێ فێڵ و تەڵەکەی وا بنێتەوە هەرووەرە سەیرێ، ئەو دوو پیاوەی بۆ دەسدرێژی ملیان پێوەنابوووەیانزانی کـە مردۆکـان لەپـڕ راسـت بوونـەوە و هەر وەکوو پێشووکوێرن، بەڵام گەلێ پڕ مەترسیتر، چونکە بێگومان هاتوون تۆڵە بکەنەوە. لـە ئاکامدا بێدەنگ و بە پارێزە بەرەو دەرگای بەشەکەی خۆیـانپاشەکشـەیان کـرد، رەنـگبـوو قەرەنتینە کراوە کوێرەکان بیانهەوێ بەگوێرەی مرۆڤدۆستی و رێز گرتنی مەیتەکان بیـاننێژن، یان ئەگەر بۆئەوە نەهاتبوون، رەنگبوو بە بێ سرنج دان بڕێکیان خواردەمـەنی لـە بیرچووبایـە، لە راسـتیدا تـاقمی قەرەنتینـە کـراوە ئالوودەکـان زۆر نەبوون،رەنگـە باشـترین رێچـارە داوای خواردن لە کوێرەکان بێ، تکایەبـەزەییتان پێمـان دابێـت، لانی کـەم دەفرێکـی چکۆلـەمان بـۆ بـەجێهێڵـن، زۆروێـدەچێ دوای ئـەم کارەسـاتەی قـەوما ئـەورۆ نـان و پێخۆرمـان نەدەنێیـە. کوێرەکان هـەر بـەو شـێوەیە بـە رێـدا دەڕۆیشـتن کـە چـاوەڕوان دەکرێ،دەسـتیان دەکوتـا و

دەگیرا، هەڵدەنگووتن، لاقیان دەخشکاند، سەرەڕایئەوەش دەتگوت تەواویک ڕیکوپێکیان لە نێودا ساز کراوە و دەیانزانیئەرکی خۆیان بە باشترین شێوە دابەش کەن، چەند کەسیان کە لە نێودەڵەمەی خوێن و شیردا شڵپەشڵپیان دەهات، هاتبوونە سەر ئەو بڕوایەکە مەیتەکان هەڵگرن و بیانبەنە حەوشە و ئەوانی تر هەشت دەفرەکەیسەربازەکان بۆیان تووڕ دابوون، یەک یەک بردیانن. لە نێو دەسبەسەرکراوە کوێرەکاندا ژنێ هەبوو کە ڕواڵەتی نیشانی دەدا لە هەمووشوێنێک حازرە، لە بار بردنا یارمەتی دەدا، وای دەنواند کە دەتگوتپیاوەکانی ڕێنوێنی دەکرد، ئەو کارەی بە ئاشکرا قەت لە چنگ ژنێکی کوێر نایە، جا چ بە هەڵکەوت و چ بە قەستی چەند جارێک سەری بۆ لایبەشی ئالوودەکان وەرسووڕاند، دەتگوت دەیدیتن یا هەستی بەراوەستانیان دەکرد لەوێ. لە ماوەیەکی کورتا سەرسەرا چۆل بوو وهیچ نیشانەیەکی دیکەی جگە لە چەند پەڵەی گەورەی خوێن و چەندپەڵەی سپی بچووکی شیر و شوێنی پێی کەش و تووشی سوور یا تەڕیتێدا بەدی نەدەکرا. قەرەنتینە گومانلێکراوەکان ملیان بۆ برسییەتیڕاکێشا و دەرگایان گاڵە دا و بە شوێن ورکەناندا گەڕان، ئەوەندەیان دڵپڕ بوو، وایان دڵ شکابوو کە خەریک بوو یەکێک لەوان بێتە زمانیناهومێدی هەموویان و بڵێ، ئەگەر ئاخر و ئاقیبەتی هەمووومان ئەوبەرە،لانی کەم لەوێ شتێک هەیە بیخۆین، یەکێک گوتی ڕەنگە سەربازەکانبەشی ئێمەش بێنن، ئەوی تر پرسی تۆ سەربازیت کردووە، نا، کە وا بێبۆچوونەکەم دروست بوو.

چونکە بەشی یەک و دوو وێکڕا کوژراویان دابوو، دانیشتوانیهەرتک بەشەکە کۆ بوونەوە هەتا تەما بگرن داخۆ لە پێشدا شێو بخۆن وپاشان کەلاکەکان بنێژن یان بە پێچەوانە. کەس نەیدەکۆڵییەوە بزانێ کێمردووە. پێنچ کەسیان ئی بەشی دوو بوون، زۆر ئەستەمە بتوانی بلێیێیەکتریان دەناسی، یان نەیاندەناسی یا وەخت و مەیلیان نەبوو پێکەوەئاشنا بن و پرێسکەی دڵیان بۆ یەکتر هەڵڕێژن. خێزانی چاوپزیشکنەیدەزانی کەی هاتوون. بەڵام دیارە چوار کەسەکەی دیکەی دەناسی، بەواتایەکی تر لەگەڵیان لە ژێر میچێکا نووستبوو، هەر چەندە تەنیائەوەندەی لە بارەی یەکیاندا دەزانی و چلۆن دەکرا پتری بزانێ، کامەپیاوی مەند و قووڵ بیر و بەوێدا دەخولێتەوە و نەهێنییەکانی ژیانیتایبەتی خۆی لە لای ئەم و ئەو دەدرکێنێ و بۆ وێنە باسی عیشقبازی ورابواردنی خۆی و کیژێکی چاویلکە ڕەش دەکا لە ژووری هۆتێلێک،خودی کچەش بێتوو هەر ئەو کەسە بێ کە ئێمە باسی دەکەین، خەبەرینیە کە ئەم پیاوەشیان هێناوەتە ئێرە و هێشتا لە نیزیک پیاوێکە کە بۆتەهۆی ئەوەی هەموو شتێک بە سپی

ببینیٚ. شۆفیر تاکسی و دووپۆلیسەکەش لە نێو کوژراوەکاندا بوون، سیٚ پیاوی خاوەن توانا کەدەیانتوانی بەڕەی خۆیان لە قوڕاو دەرکێشن و کاری هەمووشیان بەجۆرێک ئاگاداری و خزمەتی خەڵک بوو، کەچی ئاخرییەکەی زۆر بیٚروحمانە لە پۆپەی ئارەزوودا کەوتبوونە بەر گەوزی داسی نەمان وچاوەڕوانی ماڵی ئاخیرەتی بوون. ناچار بوون چاوەڕوان بن هەتائەوانەی ماون شێو بخۆن، ئەویش نەک تەنیا بە هۆی خۆخوازی باوی‌زیندووەکان، بەڵکوو چونکە هەموو دەیانزانی ناشتنی نۆ کەلاک لەوحەرزە رەق و تەقەدا ئەویش تەنیا بە پێمەڕەیەک کارێکە بەلانی کەمەوەتا شەو دەکێشیٚ. جا چونکە ناکریٚ داخوازەران بە دڵەوە کار بکەن وبرێکانیش زگیان تێر کەن، تەمایان گرت کاری کەلاکان بخەنە دوای نان‌خواردن. لە بنەڕەتەوە بەشە خواردنی هەموویان دیاری کرابوو، هەربۆیە دابەش کردنی کارێکی نەبوو، ئەوە ئی تۆ و ئەوەش ئی تۆ، هەتاتەواو دەبیٚ. بەڵام رادەی نیگەرانی هێندێک لەو کوێرانەی کەمتریان‌ئینساف هەبوو ئەو مەبەستەی کە لە هەل‌ومەرجی ئاساییدا کارێکی زۆرسادە و ساکار بوو، ئاڵۆزتر کرد، هەر چەند کە داوەرییەکی باش وبیٚلایانانە سرنجمان بۆ سەلماندنی ئەم مەبەستە رادەکێشیٚ کە پیٚلیٚهەڵێنان و زێدەڕەوییەکان برێکیش بیٚجیٚ نەبوون، بۆ وێنە دەبیٚ لەبیرمان بێت کە کەس لە هەوەڵەوە نەیدەزانی خواردن بەشی هەمواندەکا. لە راستیدا کەم و زۆر ئاشکرایە بژاردنی کوێرەکان و بەش‌دابەشین بە بیٚچاوانیٚ کە بتوانن ئینسانەکان و بەشەکان ببینن کارێکی‌سادە نیە. سەرەڕای ئەوەش تاقمێک لە هاوبەندەکانی بەشی دوو بە فێڵ‌و تەڵەکەی بیٚ شەرمانە هەوڵیان دەدا وا بنوێنن کە رادەیان زیاترە. هەروەک هەمیشە لە وەها بارودۆخێکا چاوەدێریی هاوسەری چاوپزیشک بەقازانج بوو. هەمیشە چەند قسەی بەجیٚوڕیٚ زیاتر رێگای چارەسەرکردنی کێشەکانی باشتر تەخت کردووە هەتا وتاردانی دوور و درێژ کەکارەکەش خراپتر دەکا. ئەو کەسانەش کە توانیان دوو بەرامبەری بەشی‌خۆیان خواردن وەرگرن لە بابەت ناڕاستی و خوار و خێچییەوە هیچیان‌کەم نەبوو. خێزانی دوکتۆر بەم هەلپەرەستییەی زانی، بەڵام وای بە باش‌زانی لیٚی‌گەڕیٚ و سەر نەفسی هەڵناویٚ. تەنانەت نەیدەتوانی قورسایی‌ئەو فکرەش لە سەر شانی راگریٚ کە ئەوانی تر تێبگەن کوێر نیە، چونکەلە باشترین حاڵدا دەبوو بیٚپسانەوە گویٚ بداتە وردەفرمایشتی ئەم وئەو و لە بارودۆخێکی تاڵ و ناخۆشیشدا دەبوو ببیٚ بە کەنیزی دەس بەسینەی هەموان. کیٚ دەزانیٚ، رەنگە ئەو پێشنیارەی هەوەڵی کار کە هەربەشێک بەرپرسێکی هەبیٚ، ئەو تەنگەژە و دژوارییەی ئێستا و داهاتووی کە بەداخەوە گەلیٚ قووڵتر و زیاترە، چارەسەر کردبایە، بەڵام بەو

مەرجەکـە دەسـەڵاتی مرۆڤـی راسـپێراو سـەرەڕای سسـت و لـەرزۆک و بەرپرسـیاربوونی، بـە روونی بە قازانجی هەمووان کەوتبا گەڕ و تێکڕا سەریان بۆنەوی کردبا. ژنە گوتی مەگین لـەو بوارەدا سەرکەوین، ئەگینائاخرییەکەی لێرە یەکتر لەت و کوت دەکەین. لە دڵـی خۆیـدا هاتـە سەر ئەوبڕوایە کە لە بارەی ئەومەبەستە گرینگ و ورد و باریکانەدا لەگەڵشووەکەی راوێژ بکـا و درێژەی بە دابەشینی خواردنەکە دا.

چەند کەس لەبەر تەوەزەلی و تاقمێک چونکە گەدەیان دەکەوتـە ژان،پێیـان خـۆش نـەبوو راستەوڕاست پاش خواردن بچنە گۆڕ هەڵکەندن. دوکتۆری چاوان بە بۆنـەی کارەکەیـەوە پتـر لەوانی دیکە هەستی بەبەرپرسایەتی دەکرد و کاتێک بە بێوازی گوتی بـڕۆیین مەیتـەکان ژێـر گڵکەین تەنانـەت کەسـێکیش نـەبوو بـە داخـواز. قەرەنتینـە کراوەکـان کـە تەنیادەیانهەویسـت لێیان‌گەڕێن هەتا خواردنەکەیان هەزم کەن، لـە سـەرتەختەکانیان تخـێڵ بـوون و سـەیر نیـە کـە هێندێکیان پاش ئەو ئەزموونەتاڵەی بازی بە سەر دادابوون خێرا خەویان لـێ‌کـەوت، ئەگـەرچی لەشیان‌خواردنێکی کەمیشی پێ‌گەیشتبوو بەڵام دیسانیش خۆی بۆ هەزمی ئارامو ئـەهوەنی شـل کرد. دواتر، ئەو دەمانەی کە وا خەریک بوو شەودادەهات، ئەو زەمانەی کە رووناکـایی خـۆر لە کزی دەدا دەتگوت گڵۆپەکەم شۆق و ترووسکەکان جوانتر دەدرەوشـێنەوە، بـەڵام چونکـە پڕشۆق نەبوون هـەر بـە کـەلکی هـیچ کارێـک نـەدەهاتن، دوکتـۆر و خێـزانی دووپیاویـان لـە بەشەکەی خۆیان رازی کرد لەگەڵیان بچنە حەوشە، بەڵکووبتوانن بەراوەردی ئەو کـارە بکـەن کە وەئەستۆیان گرتبوو و ئەوکەلاکانەش جوێ بکەنەوە کە تا ئێستا ویشک هەڵاتبوون، چونکە واقەرار کرابوو هەر بەشێک مردووەکانی خۆی بنێژێ. چاکییـەکی ئەوکوێرانـە لێـی بـەهرەوەر بوون دەکرا پێی بگوترێ خەیاڵاتی نوور. لەراسـتیدا فـەرقی بـۆ نـەدەکردن کـە شـەوە یـا رۆژ، کازیوەیـە یـان بوولێڵـیئێـوارە، ئـەهوەنیی بـەری بەیانییـە یـان قریوەقریـوی نێـوەڕۆ، ئـەم کوێرانەبێ‌پسانەوە کەوتبوونە گەمارۆی سپیایەکی روون، چەشنی هەتاوێ کەلـە پشـتی تەمـەوە بدرەوشێ. مانای کوێری بۆ ئەوانە خولانەوە لە نێوخرمانەیەکی رووندا بوو. کاتێک دوکتۆر لـە زاری دەرپـــەڕی کـــە دەچـــن بۆهـــەڵاواردن و ناســـینەوەی مەیتـــەکان، کوێرەپیـــاو بـــە سەرسوڕمانەوەدەیەویست بزانێ چۆنیان دەناسنەوە، پرسیارێکی زۆر بەجێ لە لایـەن‌کابرایـەکی کوێرەوە کە چاوپزیشکی خستە تەنگەژە و سەر لێ‌شێوان. ئـەمجارەیان ژنەکـەی لەبـەر ئـەوەی نەکا رازیان ئاشکرا بێ هیچ‌یارمەتییـەکی نـەدا و قـەراغی بـۆ تێنـەکردەوە. دوکتـۆر بـە شـێوەی بنەڕەتیی‌پـاک بوونـەوە لـە گونـاە، یـانی دان بـە هەڵـەی خـۆ داهێنـان لـەم کێشەیەسـەربەرزانە

رزگاری هات، به راوێژێکی که دەتگوت گاڵتە بـە خـۆی دەکـاگوتی مـرۆڤ وەهـا خـوو بـە بوونی چاو دەگرێ کە تەنانەت لـە نەبوونیشـداوادەزانێ دەکـرێ کـەلکیان لـێوەر بگـرێ، لـە راستیدا دەزانین کە تەنیاچوار کەسیان هی بەشەکەی لای ئێمەن، شۆفیر تاکسی، دوو پۆلیسەکە ویەکی تر کە لەگەڵمان بوو، جا کە وایە وا باشە دەس دەینە چوار مەیتان وبەرێزەوە تەسلیم بە خاکیان بکەین، بەو جۆرە ئەرکی خۆمان ئەنجامداوە. کوێرەپیاو قبووڵی کرد، ئـەوی دیکـەش هەرواتر و جارێکی تر بـەنۆرە دەسـتیان کـرد بـە گۆڕهەڵـکەندن و چونکـە کـوێر بـوون قـەت نەیانزانی ئەو تەرمانەی ناشتیانن داخۆ هەر ئەمانە بوون کە باسیان لێوە کرا یـاننـا، پێویسـت ناکـا بڵێین دوکتۆر ئەو کارە بە رواڵەت ئەڵڵابەختەکییەی بەرێنوێنی دەستی خێـزانی بـەڕێوە دەبـرد، ژنە دەستێک یا لاقێکی دەگرت وچاوپزیشک تەنیا کـارێکی دەیکـرد ئـەوە بـوو کـە بڵـێ هـا ئەوەتا. پاش ناشتنی دوو تەرم سێ پیاو لـە بەشـەکەی دیکـەوە هاتنـە یاریـدەیان، زۆروێـدەچوو بێتوو کەسێک پێـی گوتبـان بەتلـێکی لـە شـەو رابـردووە مـەیلێکیوایـان نەنوانـدبا. دەبـێ ئـەو مەبەسـتە لـە روانگـەی دەروونناسییەوەبسـەلمێنین کـە جیاوازییـەکی زۆر هەیـە لـە نێـوان قـەبر هەڵقەندن لەرووناکایی رۆژ و تاریکایی شەودا. کاتێک شـەتلانی ئـارەق ، تـۆزاوی ولـووت و گەروو پڕ لە بۆگەنی هێڵـنجهـێنی کـەلاکان گەڕانـەوە شـوێنیخۆیـان، قیـڕەی بڵـیندگۆ وەک جاران ولاتی تەنییەوە. هیچ ئاماژەیەک بۆرووداوەکە نەکرا، هیچ قسـەیەک لـە بابـەت تەقـە لـە تاریکی و کوژراوەکاننەهاتە گۆڕ. ئەو هەڕەشانەی لەگوێن چوونە دەر لە ساختومان بەبێئیـزن بە مانای مەرگی لەڕێوەیە یان قەرەنتینە کراوەکان دەبێ بێ هیچڕێورەسمێک مەیتەکان بنێـژن چەند پات کرایەوە، ئێستا بە پێیئـەزموونی تاڵـی ژیـان، ئـەو مامۆسـتا مەزنـەی راهێنـان، مانـای راستەقینەیئەو هەڕەشە و رێ و شوێنانە وەدەر دەکەوت، کـەچی راگەیانـدنی رۆژێسـێ ژەم شێو کردن پتر وەکوو مەبەستێکی جەفەنگ و گاڵتاوی خۆینواند. کاتێک دەنگەکـە بڕایـەوە، چونکە دوکتۆر تەواوی کەلێن و قوژبنیئەو شوێنەی وەکوو بەری دەستی پێدەزانی بە تەنیایی بەرەو دەرگایبەشەکەی دیکە کەوتە رێ هەتا بە هاوبەندەکانی رابگەیەنێ کـە ئێمـەمردۆکانی خۆمان شاردەوە، دەنگی پیاوێک لە ژوورەوەڕا وڵامی دایەوە،دەیباشە ئەگەر چەند کەلاکتان ناشتووە، ئەوانی تریش ژێر گڵ کەن،بەڵام ئێمە لە سەر ئەوە رێـک کـەوتبووین هـەر بەشـێک خـۆی مردۆکـانیبنێـژێ، ئێمـە چوارمـان ژمـاردن و ناشـتمانن، دەنگـی پیـاوێکی تـر گـوتی گەلێباشە، سبەی بەشە کەلاکی ئەو بەشە جێبەجێ دەکەین، پاشان بـەراوێژێکی دیکـە گـوتی چ نان و پێخۆرێکیان نەهێناوە، چاوپزیشک وڵامیدایەوە نـا، بـەڵام خـۆ بڵـیندگۆ گـوتی رۆژێ

سێ ژەم، گومانم هەیە کەهەمیشە بەڵێنی خۆیان بەرنە سەر، دەنگی ژنێ گوتی کە وایە دەبێ ئەوخواردنەی دەیدەن بیکەینە جیرەبەندی، پێشنیارێکی جوانە ئەگەر پێتانخۆشە سبەی قسەی لێدەکەین، ژنە گوتی باشە رازیم. دوکتۆر وەڕێکەوت کە بڕوا، بەڵام دروست لەو کاتەدا دەنگی یەکەم پیاوەکە هاتەوەگوێ، لێرە کێ دەستووران دەدا، تاوێک گوێی هەڵخست، چاوەڕوانی وڵامبوو، ژنە وڵامی دایەوە، ئەگەر بە راست و دروستی کارەکانمانرێکوپێک نەکەین، برسێتی و ترس زاڵ دەبێ، زۆر جێی شەرمە کە لەگەڵئەوانی ترا ناچین مەیتەکان بنێژین، تۆ کە هێندە وریای و متمانەت بەخۆتە بۆچی ناچی جەنازەکان ژێر گڵ کەی، خۆ بە تەنیا ناتوانم بچم،بەڵام بۆ یاریدە ئامادەم، دەنگێکی پیاوانەی تر هاتە نێو قسان، ئەمدمەقڕەیە بێ ئاکامە، سبەینێ بەیانی ئەو کارە رادەپەڕێنین و تەواویدەکەین. دوکتۆر هەناسەیەکی هەڵکێشا، ژیانی تێکڕایی رۆژ بە رۆژدژوارتر دەبوو. لە گەڕانەوەدا لە پڕ هەستی کرد کە دەبێ سـ ـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــەراوێکی بکا، بەڵام تەمای گرت تاقی کردنەوەیەک بکا. هیوادار بوو کەسێ لە یادیمابێ و کاغەزی ئاودەستی دانابێ، چونکە لەگەڵ نان و خوان بۆیاندەناردن. دوو جاری رێ لێتێکچوو و دڵی گیرا چونکە خەریک بووناهومێد دەبوو و کاتێک ئیتر خۆی بۆ رانەدەگیرا هەر چۆنێک بووئاودەستێکی دیتەوە و دوولینگەکەی داکێشا و لە سەری هەڵترووشکا. خەریک بوو بە بۆگەن قڕ بێ. تێگەیشت پێی لە سەر شتێکی نەرمی لیچقدانـاوە، سلی کەسێک بوو کە نەیدەزانی لە کوێ هەڵتروشکێ یا هەر وابێ لەبەر چاو گرتنی خەڵک تەنیا خۆی ئاسوودە کردبوو. هەوڵی داوەزعی ئەوێ بێنێتە بەر زەینی، بۆ ئەو وڵات ساماڵ سپی و رووناک وتروسکەدار بوو، بۆی نەچۆوە سەر یەک هەتا بزانێ داخوا دیوارەکانو تەختی عەرزی سپین یا نا و لێرەدا بەم ئاکامە گێلانەیە گەیشت کە ئەوبۆگەنە هی نوور و سپیایی ئەوێندەرێیە. بە خۆی گوت ئاخرییەکەی لێرەلە ترسان شێت دەبین. پاشان ویستی خۆی خاوێن کاتەوە، بەڵامکاغەزی لێنەبوو. دەستی بە سەر دیواری پشتەوەیا کێشا، چاوەڕوانیدۆزینەوەی پاشماوەی کوتێک کاغەز بوو، کە نەبوو. پەژارە دایگرت ودڵی شکا، چارەڕەشیی بێدەرەتان بوو، تێک رووخا، دوولینگەکەی کەرەعەرزی پیس دەخشا هەڵکێشایەوە، کوێر، کوێر، کوێر، خۆیپێرانەگیرا و بە ئارامی گریا. بە کوێرەکوێرە چەند هەنگاوێکی هاویشتو خۆی لە دیوارەکەی بەرەو روو کوتا. لە پێشدا دەستێک و پاشانئەوەکەی تری درێژ کرد و هەر چۆنێک بوو دەرگای دیتەوە. خشکەخشکی پێی کەسێکی بیست کە گۆیا لە ئاودەستان

دەگەڕا،بێ‌نێوبڕ هەڵدەنگووت و تلاسکەی دەبەست و بە راوێژێکی ویشک ودوور لە هەر هەستێک لەبەر خۆیەوە دەیگوت باشە لە کامەبەقوڕگیراوە، دەتگوت هێندەش مەیلی لە دۆزینەوەیان نەبوو. بەلای‌ئاودەستەکانا تێپەڕی. نەیزانی کەسی لێیە، بەڵام گرینگ نەبوو، چونکەکارەکە زۆر پیس نەبوو، هەڵبەت ئەگەر بکرێ وا بڵێین، چاوپزیشکوەکوو کەسێکی خەجلاو و بە شەرم داکەوتوو خێرا دوولینگەکەی‌هەڵکێشایەوە. پاشان کە زانی تەنیایە دایکێشایەوە. بەڵام نەک بەجێ و لەوەختی خۆیدا، دەیزانی گیانی پیسە، پیستر لەوەی کە لە ژیانیدا وەبیری‌نەدەهات. بە خۆی گوت رێگا زۆرن بۆ بوون بە جانەوەر، ئەوە یەکیانە. هەر چونێک بێ بەڕاستی نەیدەتوانی گلە و گازندە بکا، چونکە هێشتاش کەسێکی هەبوو کە پاک و خاوێنی بکاتەوە و رووی لێ‌وەرنەسووڕێنێ.

دەس‌بەسەر کراوەکان لە تەختەکانیاندا راکشابوون و چاوەڕوانی‌خەو بوون هەتا بەدبەختیی و چارەڕەشییان دیزە بە دەرخۆنە کا. خێزانی دوکتۆر زۆر بە پارێزەوە، دەتگوت مەترسیی دیتنی ئەو دیمەنەناخۆشەی لە لایەن خەڵکەوە هەست پێ‌دەکرد، بە باشترین شێوەیەک کەدەیتوانی مێردەکەی خاوێن کردەوە. هەر ئەو بێ‌دەنگییە خەماوییەی کەتایبەتی نەخۆشخانەکانە باڵی بە سەر وڵات کێشا، بێ‌دەنگی ئەوزەمانەی کە نەخۆشەکان خەوتوون و تەنانەت لە خەویشا شانیان‌داوەتە بەر تەزووی دەرد و ژان. ژنەکەی دوکتۆر دانیشتبوو و چاوی بەسەر تەختەکاندا دەگێڕا، تاپۆی کەلاکی نوستوو، رەنگێکی بزرکاو ودەستێک کە لە خەوا دەجووڵایەوە سرنجی راکێشابوو. لە خۆی پرسی‌داخوا ئەمیش چەشنی ئەوانی تر کوێر دەبێ، باشە بە پێی کام بەڵگەی‌روون و بەجێ هەتا ئێستا کوێر نەبووە. شەکەت و وەڕەز دەستەکانی‌بەرز کردەوە تا قژ و ئەگریجەی لا بدا و بە خۆی گوت هەمووەمان سەیربۆگەن بووین. لەو کاتەدا ئاه و ناڵە و نیوەنووزە دەهاتە گوێ، ئەودەنگانەی لە گوێن وشە بوون یا ئەوەی دەبوو وشە بن، بەڵام مانایانلەگەڵ پرخ و هۆڕێکی توند و پەت‌پساو دەبوو بە غەڵدەغەڵدێک ودەفەوتا. یەکێک لە بنەبانی ئەم بەشەڕا تووڕەیی و ناڕەزامەندیی‌دەردەبڕی، هەی سەگلاو، ئەوانە وەکوو سەگلاون. نا، سەگلاو نەبوون،ئەوانە تەنیا ژنێ یا پیاوێکی کوێر بوون کە بێ‌گومان شتێکیان پتر لەوەی‌لە بارەی یەکتردا نەدەزانی.

کوێری

زگی برسی ئینسان خێرا خەبەر دەکاتەوە. چەند کەس لە دەسبەسەرکراوە نابیناکـان هێشـتا زۆری مابوو بۆ بەیانی چاویان هەڵێنا، هەڵبەتبابەتی ئەوانـە کێشـەی برسـییەتی نـەبوو، بەڵـکوو سەعاتی لەشیان یا ناویهەر شتێک بـێ ئیتـر دروسـتی کـار نـەدەکرد، بـە خەیاڵـی خۆیـان رۆژ ببۆوە،بە خۆیان گوت زۆر نوستین و هەر لەڕێوەش پێیان بە هەڵـەی خۆیـانبـرد، پـرخوهـۆڕی هاوبەندەکانیان مێشکی سەری دەبردن و ئەوەیاننەدەکرا هەڵەی تێدا بکرێ. بەڵام هەم کتێب و هەم ئەزموونی خۆمانپێمان دەڵـێن کـە هـەر کەسـێک خـووی بـە زوو هەسـتان گرتـووە یـان لەرووی ناچارییەوە وەخەبەر دێت، گەلێکی پێناخۆشـە کـە دەبینـێ خەڵـکیدەور و بـەری لـە خەوی خۆش دان، دیارە لەو بابەتەوە ئەوانە هەقیانە،چونکە جیاوازی زۆرە لە نێـوان کـوێرێکی کـە خـەوتووە و کـوێرێ کـە لـەخۆوە چـاوی هەڵـێناوە. بـە رواڵـەت وا دیـارە وردبوونـەوە و تێڕوانین لەسرشتی دەروون ناسینی ئادەمیزاد بێجێیە، ئەویش لە پێک گـرتنی لەگەڵـلایەنەکانی ئەو کارەساتە گەورەیەدا کە گێڕانەوەی ئێمە بە زەحمەتدەیهەوێ باسـی لێوەبکـا و تـەنیا ئـەو مەبەستە شی دەکاتەوە کە قەرنتینەکراوەکان بۆچی بەیانی زوو لە خەو هەستاون، هەر وەک لـە سەرەتاداگوتمان هێندێک بە هۆی قووڕەقووڕی ورگی پووچاوە و گـەدەی بـەتاڵ وبرسـییەتی هەستان و تاقمێکی تر بە هۆی خۆڕانەگری دەستەی یەکەم،ئەو دەنگەدەنگە بۆ شـوێنی وەکـوو سەربازخانە و ئەم جۆرە جێگایە کەهەمیشە جمەی دێت زۆر ئاسایییە و گوێی نادرێتێیە، بـەڵام دەنگەدەنگو شیڕوهۆڕی ئـەورۆ تاقـەتبـەزێن بـوو. لێـرەش تـەنیا مرۆڤـی ئـاقڵ وبەئـەدەب و بەرزەئاکار ناژین، بەڵکوو تاقمێک رەجاڵەی هیچەکە وپووچەکەشی لێیە کە هەموو بەیانان بـێ ئـەوەی گـوێ بدەنـە خەڵـک دەسدەکـەن بـە تـڕین و تـف و بەڵـغەم فـڕێ دان و ئەگـەر راستییەکەی بڵێین لەبەیانیڕا تا شەو ئاکاریان دزێوە، دیارە لێکداڵێکدا هەوای ژوورەوەقورسـتر دەکەن و هیچ کارێکیش نـاکرێ، تـەنیا دەرگاکـان دەکرێنـەوە وپەنجـەرەکان بـەرز و دوورە دەستن.

هاوسەری چاوپزیشک بە مەیلی خۆی لە پەنا شـووەکەی راکشـاوە وچونکـە جێگـا تەنگـە تەواو خۆی لێشەتەک داوە، بەڵام دیسانیش زۆریانهـەوڵ دابـوو کـردەوەی وا نـەنوێنن هـەتا یەکێک لە نیوەشەوا پێیان بڵێسەگلاو، دروست لەو کاتەدا ژنی دوکتۆر چاوی لە سـەعاتەکەی کرد. بیست و سێ دەقیقەی لە دوو لادابوو. چاکتر خورد بۆوە و تەماشایکرد دەقیقە ژمێرەکـە راوستاوە. لە بیری چووبوو سەعاتە قوڕوەسەرەکەی قورمیش کا، یان قوڕی بە سەری، قورم بـە سەری، چونکەتەنیا پاش سێ رۆژ هەڵبڕان لە ژیانی ئاسایی ئەو کارە ساکارەی لە بیرچووبـۆوە.

ئیتر خۆی پێ‌ڕانەگیرا و لە پڕمەی گریانی دا، دەتگوت لە پڕکەوتۆتە ژێر هەرەسی گەورەترین دەرد و بەڵای جیهان، چاوپزیشکەوەیزانی ژنەکەی کوێر بووە، ئەو بەڵایەی کە دەترسا رۆژێک بگاتەسەری و خەریک بوو بپرسێ کوێر بووی، کە لە دوایین دەما دەنگی‌خێزانی بیست، نا، نا، مەسەلەکە ئەوە نیە، مەسەلەکە ئەوە نیە و پاشان بەسرتەسرتێکی کە لەژێر پەتووڕا بە زەحمەت دەبیسرا گوتی، چەندەگێلەکەم، خۆ لەبیرم چووە سەعاتەکەم قورمیش کەم، دڵخۆشیی دانەوەچی پێ‌نەدەکرا و دەستی کردەوە بە هەنیسک دان. کچەی چاویلکەیی کەلە دەستی ئەوبەری وەخەبەر هاتبوو بەو دەستانەی بەرەو پێش درێژکرابوون بەرەو گریانەکە بزووت، هەر وا کە دەهاتە پێش گوتی‌نارەحەت بووی، شتێکت دەوێ بۆت بێنم و دەستی بە سەر لەشی ژن ومێردەکەدا کێشا کە پێکەوە راکشابوون. ئەدەب حوکمی دەکرد کە خێرابکشێتەوە و بێ‌گومان فەرمانی مێشکیشی هەر ئەوە بوو، بەڵام‌دەستەکانی بە گوێیان نەدەکرد، تەنیا دەست پێ‌داهێنانەکەی نەرمترکردەوە و بە هێمنی پەتووی ئەستووری لاواندەوە. کیژەکە جارێکی ترپرسی شتێکت دەوێ بۆت بێنم، وا ئێستا دەستەکانی کێشایەوە، بەرزی‌کردنەوە هەتا لەم سامان سپییە نەزۆکەدا لێی گوم بوون. خێزانی‌دوکتۆر کە هەر وا هەنیسکی دەدا لە تەختەکە هاتە خوار، کیژەکەی گرتەئامێز و گوتی چ نیە، لەپڕ دڵم گیرا، کچە بە سەری‌دا هات، ئەگەر ئێوە کەهێندە ئازان ناهومێد بن، ئیدی ئێمە دەبێ قوڕی کوێ بە سەردا کەین،ژنی دوکتۆر کە ئێستا ئەهوەنتر ببۆوە، راستەوراست لە روخساری‌کچەی روانی و بە خۆی گوت وا دیارە چاوی خەریکە تەواو چادەبێتەوە، مخابن کە ناتوانم پێی بڵێم، بێ‌گومان زۆری کەیف ساز دەبوو. بەڵێ بێ‌گومان پێی خۆش دەبوو، هەر چەند ئەو شادییە نەفامانەی‌دەنواند، نەک تەنیا لەبەر ئەوەی کە کچە کوێر بوو، بەڵکوو چونکەتەواوی دەس‌بەسەر کراوەکان کوێر بوون، بێتوو کەسێ نەبێ ببینێ،بوونی جووتێ چاوی کەژاڵی دڵڕفێن بە کەلکی چ دێت. هاوسەری‌چاوپزیشک گوتی هەر کەسێک خاڵێکی لاوازی هەیە، زۆر باشە کەهێشتاش دەتوانین فرمێسک هەڵوەرێنین، زۆر جاران گریان تەنیا رێگای‌دەرباز بوون و رزگارییە، جاری وایە بێتوو نەگرین دڵمان دەتۆقێ،کچەی چاویلکەیی گوتی ئێمە رێی رزگار بوونمان نیە، بە چی‌ڕا دەزانی،ئەو کوێرییە وەکوو کوێرییەکانی دیکە ناچێ، رەنگە هەر وەک لەپڕ هات،لەپڕیش بڕوا. بۆ ئەو کەسانەی کە مردن زۆر درەنگە، هەمووماندەمرین، بەڵام نەک ئەوەی بمانکووژن و من یەکێکم کوشت، لە خۆت‌توورە مەبە، تاوانی بارودۆخ بوو، لێرە هەموومان تاوانبارین و بێ‌تاوان،ئاکار و کردەوەی ئەو سەربازانەی بۆ پاراستنی ئێمە

لێرە داندراون لەهەمووان خراپتر بوو، بەڵام ئەوانیش دەتوانن باشترین بیانوو داتاشن،ئەویش ترسە، باشە چ دەبوو ئەگەر لێ گەڕابام ئەو چارەڕەشە دەستیپێداکێشابام، ئێستا ئەویش زیندوو بوو منیش چم لێ کەم نەدەبۆوە،باشە ئیدی بیری لێمەکەوە، ئەهوەن بە، هەوڵ بدە بخەوی. کچەیبردەوە سەر تەختی خەوەکەی، دەی ئێستا بڕۆوە سەر جێگاکەت وتێخزێ، کچە گوتی تۆ زۆر مێهرەوانی، پاشان دەنگی پتر هێنایە خوار،نازانم چ بکەم، خەریکە بکەومە حەیزەوە و هیچ پەڕو و پاڵی خاوێنمپێنیە، نیگەران مەبە، من پێمە. دەستەکانی کچەی چاویلکەیی لە شوێنێکدەگەڕا پێیەوە بەند بێ، بەڵام خێزانی دوکتۆر بە ئارامی ئەهۆنیکردنەوە، راکشێ، بحەسێوە، کچە چاوەکانی لە سەر یەک دانا، ماوەیەکهەر وا مایەوە، بێتوو ئەم شەڕەی لە پڕ هەڵاییسا نەبوایە رەنگ بوو خێراخەوی لێکەوتبایەوە، یەکێک چووبوو بۆ ئاودەست و کاتێک گەڕابۆوەدیتبووی ئەوە یەکێک تەختەکەی داگیر کردووە، کەس نییەتێکی خراپینەبوو، یەکی دیکەش هەر بەرەو ئاودەستان چووبوو، ئەو دوانەتێکهەڵەنگوتبوون و دیارە بە بیری هیچیاندا نەهات کە بڵێ وریا بەدوای گەڕانەوە تەختەکەت لێنەگۆڕێ. ژنی دوکتۆر کە لەوێراوەستابوو و دەیدیت ئەو دوو پیاوە دمەقرەیانە، کە خورد بۆوەتەماشای کرد هیچیان بە دەست و سەر ئاماژە ناکەن و کەمتر ئەندامیاندەبزێون، چەندە زوو فێر بوون کە ئێستا تەنیا دەنگ و گوێیان بە کاردێت، بەڵێ، دەستیان هەبوو، دەیانتوانی ئاوقای یەکتر بن و تێکهەڵدەن وبە گوێرەی قسە و پەندی پێشینیان، پیاوێکم دەوێ بۆم بێتە مەیدان، بەڵامتەخت گۆڕان ئەو هەمووە چرەگوڕەی ناوێ، خۆزیا هەموو فریوەکانیژیان وەکوو ئەوە بان، لێرەدا تەنیا پێویست بوو پێک بێن، ژومارەی دووئی منە، ژومارەی سێ ئی تۆ، وەرە با کێشە بۆ هەمیشە بنەبڕ کەینئەگەر ئێمە کوێر نەبووباین هیچ کات شتەکان ئاوا تێکەڵوپێکەڵنەدەبوون، تۆ راست دەکەی دەردی ئێمە ئەوەیە کە کوێرین. ژنیدوکتۆر بە مێردەکەی گوت دەڵێی تەواوی دنیا لێرەیە.

نەک تەواوی دنیا. بۆ وێنە شێو لە دەرەوە بوو و زۆری دەکێشا هەتابگاتە ئێرە. لە هەر دوو بەشەکەوە چەند پیاو چووبوونە سەرسەرا وگوێبیست و چاوەڕوانی ئەو دەستوورانە بوون کە لە بڵیندگۆڕا بڵاودەکرانەوە. وەڕەز و سەر لێشێواو پێیان دەخشکاند. دەیانزانی دەبێبچنە حەوشەکەی پێشەوە هەتا ئەو بارخانە شێو و خواردەمەنییەی کەسەربازەکان بەڵێنییان دابوو هەڵیگرن، گوتبوویان دەفرەکان لە نێواندەروازە و پلیکانان دادەنێن، بەڵام ئەوان لەوەی دەترسان نەکا داوێکیانبۆ تەنبن، لە کوێوە بزانین تەقە ناکەن، دوای ئەو

کارەساتەی‌خولقاندیان هەر چی بلێی لە دەستیان دێ، نابێ بڕوایان پێ‌بکرێ. من کەناچم، منیش هەرواتر، ئەگەر دەمانهەوێ شتێک بخۆین دەبێ یەکێک‌بچێ، نازانم لە برسان مردن چاکترە یان کەوتنە بەر رهێڵەی تفەنگ، من‌کە دەچم، منیش دێم، خۆ ناچار نین هەموومان بچین، سەربازەکان پێیان‌ناخۆشە، دەترسێن و لایان وایە دەمانهەوێ دەرباز بین، پێم وایە هەربۆیەش کابرای پا زاماریان کوشت، دەبێ تەمای خۆمان بگرین، ئەوهەموە ترس و لەرز و پارێزەش لەخۆوەیە، لە بیرتان بێ دوێنێ چ‌کارەساتێک قەوما، نۆ کووژراو، نە کەمتر نە زیاتر، سەربازەکان لێمان‌ترسابوون، منیش لەوان دەترسێم، زۆرم پێ‌خۆشە بزانم داخوا ئەوانیش‌کوێر دەبن یا نا، کامانە، سەربازەکان، بە بڕوای من دەبێ ئەوان لەهەمووان زووتر کوێر بن، لەو بابەتەشدا تێکڕا هاودەنگ بوون، بەلام لەیەکتریان نەپرسی بۆچی و کەسێکیش نەبوو بەڵگەیەکی ویچوو نیشان‌بدا، ئەگەر وا بوایە خۆ سەربازەکان نەیاندەتوانی سێرە بگرن. زەمان‌هەر وا ئاژاوتی و بلێندگۆ بێ‌دەنگ مایەوە. پیاوێکی کوێر لە بەشی یەکەم‌بۆ ئەوەی شتێکی بلێ گوتی مردۆکانتان ناشت، نەخێر هێشتا، خەریکەبۆگەن بن و تەواوی ولات تێوەدەن، دەیجا با هەموو شتێک تێوەدەن وبۆنیان هەرد و بۆ هەلگرێ، ئەمن هەتا شتێک نەخۆم دەس لە رەش وسپی نادەم، هەر وەک دەڵێن هەتا زگت نەبێ تێر، قەت مەچۆ بۆ کاری‌خێر، خۆ وا نابێ، ئەو پەندەی ئێوە هەڵەیە، چونکە وا باوە تازیەداران‌پاش ناشتنی مردوو دەخۆن و دەخۆنەوە، دەنا من بە پێچەوانەی ئەوەرازیم. دوای چەند چرکەیەک یەکێک لە پیاوە نابیناکان گوتی من شتێک‌ئازارم دەدا، چ شتێک، خواردنەکە چلۆن دابەش کەین، وەک پێشوو،دەزانین چەند کەسین، بەشەکانیشمان ژماردووە، هەر کەس بەشی‌خۆی وەردەگرێ، ئەوە لە هەمووان هاسانتر و دادپەروەرانەترە، بەلام‌خۆ بە کردەوە وا نەبووە چەند کەس شێویان بەر نەکەوت و چەندکەسیش دووهێندی بەشی خۆیان وەرگرت، بێ‌گومان دابەش کردنەکەدروست نەبووە، هەمیشە هەر وایە، مەگین ئینسانەکان خۆیان رێز بۆرێک‌وپێکی دابنێن دەنا چ ناکرێ، ئای خۆزگە یەکمان تۆزێکی دیبایە،دەیجا ئەو دەم هەزار فرت و فێڵی ساز دەکرد، هەتا وەک شای‌بگوزەرێنێ، بە پێی پەندێکی کۆن لە ولاتی کوێران یەک چاو سوڵتانە،کوڕە لێی گەڕێ لەو پەند و مەندە، بەلام لێرەدا فەرقی هەیە، لێرە تەنانەت‌خێلێکیش قوتار نەبووە، بە بڕوای من باشترین رێ‌چارە ئەوەیەخواردنەکە بە شێوەیەکی یەکسان لە نێو بەشەکاندا دابەش بکەین،پاشان هەر کەس دەتوانێ بەشی خۆی هەلبگرێ، کێ بوو قسەی کرد،منم، من کێیە، من، تۆ هی کام بەشی، بەشی دوو، زۆر فێڵەزانی، بەشی‌دوو خەلکێکی

کەمتری لێیە و ئاوا بە قازانجی ئەوان تەواو دەبێ وبەشێکی زیاتریان وەبەر دەکەوێ، چونکە لای ئێمە پڕە، ویستمیاریدەیەکم دابن، پەندێک هەیە دەڵێ کابان یا روو رەشە یا بێ بەش،پەک، تۆش مێشکی ئێمەت برد بەم پەندانەت، ئەو قسە زلزل و زانایانەمێشکی دەکۆڵێ، وا باشترە خواردنەکە بەرینە هۆدەی شێو خواردن،هەر بەشەی سێ کەسان هەڵبژێرێ بۆ دابەشینی نان و پێخۆر، بێتووشەش کەس خەریکی دابەشین بن کەمتر فێڵ دەکرێ، دەی وەختێکدەڵێن بەشەکەیان خەڵکێکی زۆری لێیە لە کوێوە بزانین کە راست دەکەن،چونکە لەگەڵ ئاکار پاکان تێوەچووین، داخوا ئەوەش هەر پەندە، نەخیرقسەی خۆمە، دۆستی بەڕێز ئاکار و ماکاری پاکم بە گوێیدا ناچێ، بەڵامبێگومان دەزانم کە برسیمانە.

دەتگوت لەم ماوە دوور و درێژەدا بڵیندگۆ چاوەڕوانی وشەی رەمزو ناوی شەو یان ودمی جادوویی بووە، ئاخرییەکەی وەدەنگ هات،سرنج بدەن، سرنج بدەن، قەرەنتینە کراوەکان دەتوانن بێن و شێو وخواردەمەنی بەرن، بەڵام دەبێ وریا بن، ئەگەر کەسێک زۆر لەدەروازەوە نیزیک بێتەوە لە پێشدا هاواری لێدەکەین و بێتوو لەڕێوەنەگەڕێتەوە دووهەم جار بە گوللە وریای دەکەینەوە. دەسبەسەر کراوەکوێرەکان لەسەرەخۆ بەرەو لای راست کە لایان وا بوو دەرگا لەوێیەهەنگاویان نا، هێندێک زۆرتریان بڕوا بە خۆ بوو و تاقمێکیش کەبڕوایەکی وایان بە خۆیان نەبوو بە باشیان زانی خۆ وەپەنا دیوار بدەن،ئاوا رێ هەتڵە کردن کەمتر دەبوو، کاتێک گەیشتنە سووچی دیوار دەبووبۆ لای راست بادەنەوە تا بگەنە دەرگا. نەڕە و گوڕەی ترسێنەریبڵیندگۆ برێشکەی دەکرد و یەکبین چەندپات دەبۆوە. تامی زاری وێژەرووەها بە ئاشکرا گۆڕابوو کە تەنانەت دەسبەسەرە خۆش نییەتەکانیشیخستە گومانەوە و کوێرەکان وێکرا زەندەقیان چوو. یەکیان گوتی ئەمنلە جێی خۆم نابزووم، دەیانهەوێ هەموومان بکێشنە دەر و پاشانتێکڕامان بکوژن، یەکی دیکەش گوتی منیش نابزووم، سێیەم کەسیشگوتی منیش. بە دڵنیگەرانی لە شوێنی خۆیان ویشک بوون، هێندێکیاندەیانهەویست بڕۆن بەڵام ترس بە سەر هەموویاندا زاڵ ببوو. دەنگەکەدیسان گوێی ئاو دانەوە، بێتوو هەتا سێ دەقیقەی دیکە کەسێ نەیا نان وخوانەکە بەرێ دەیانبەینەوە. ئەو هەڕەشەیەش بە سەر ترسیاندا زاڵنەبوو، تەنیا ترسەکەی رایدایە قووڵایی کەلێن و قوژبنی زەینیان، وەکووکێویی لە داو کەوتوو چاوەڕوانی پەلامار مانەوە. دەسبەسەر کراوەکانکە هەر کام لە ترسان خۆیان لە پشت ئەوی تر حەشار دەدا پێیان نایەپێگۆڕکە. نەیاندەبینی کە دەفرەکان بە شانی پەتکی رێنوێنەوە ریزنەکراون، چونکە نەیاندەزانی کە سەربازەکان لە ترسی نەخۆش کەوتنو گرتنەوە ئامادە نەبوون هەتا لەو

رایەڵە نیزیک ببنەوە کە قەرەنتینەکراوەکان دەستیان پێ گرتووە. بارخانەی خواردەمەنی کـەم و زۆر لەم‌شوێنە بـوو کـە جـاری پێشـوو خێـزانی دوکتـۆر پیمەڕەکـەی لـێ‌وەرگـرت. گرووبـان دەستووری دا وەرنە پێش، وەرنە پێش. کوێرەکان بەسەرلێ‌شێواوی هەوڵیان دا ریز بگرن هـەتا بە جوانی بڕۆنە پێش. بەڵام گرووبانەکە نەهرەتەی کێشـا نـان و پێخـور و دەفرەکـان لـە شـوێنی جاران‌نین، ئەو پەتە بەردەن، بەری‌دەن، بڕۆن بۆ لای راست، لای راستی‌خۆتان، گێژی نەفامینە، چما دەستی راستیش چاوی دەوێ. ئەو ورياکردنەوەیە بەجێ بوو، کوێرەکان کە لەو بابەتانـەدا زۆر وردوخوردبـوون، سـرنجیان دایـە رواڵـەتی فەرمانەکـە، ئەگـەر کەسـێک گـوتی راسـت بەشێوەی مەنتیقی مانای وایە کە لای راستی خۆی بلێ، هەر بۆیە ویستیان‌بە ژێر پەتەکەدا رابرن و بە دوای ئەو دەفرانەدا بگەڕێن کە خودا دەیزانی‌لە کوێیە. لە هـەل و مـەرجێکی دیکـەدا ئـەو دیمەنـە گاڵـتاوییە سـەنگینترین‌تەماشاوانیشـی دەخسـتە پێکـەنین، سـەیرتر لـەوە بـوو کـە باسـی بکرێ،هێندێک لە کوێرەکان بـە گاگۆڵـە دەڕۆیشـتن و ئەوەنـدەیان سـەر نـەوی‌کردبـوو دم و چاویان رە زەوی دەخشا، دەتگوت سەگلاون، دەستێکیان‌لە پێش خۆیان لە حەودا دەسووڕاند، کەچی تاقمێکی تر دەتگوت‌دەترسـان کـە ئـەو کـەش‌وهـەوا سـاماڵ سـپییە قووتیـان بـدا، هـەر بۆیەناهومێدانە بە رایەڵەکەوە نووسابوون و بە وردی گوێیان دەدایە و هەردەم چـاوەڕوان بـوون دەنگی ئەو سەرکەوتنە ببیستن کـە نـان و خـوان‌دۆزرانـەوە. سـەربازەکان پێیـان نـاخۆش نـەبوو رووی تفەنگیان تێبکەن وسێرەیان لێ‌بگرن و بێ ئەوەی هەسـت بـە گونـاه و تـاوان بکـەن ئـەو کوێرەنەفامانەی کە دەتگوت قرژاڵی خوار و گێڕن بدەنە بەر دەسـڕێژ. سـەربازەکان دەیـانزانی کە بەیانی ئەو رۆژە فەرماندەری هەنگ لەسـەربازخانە چـی گوتـووە، بـە بـڕوای ئـەو کێشـەی قەرەنتینـە کراوەکوێرەکـان تـەنیا بـە تێـدا بردنیـان، بـە بـێ لەبـەر چـاو گـرتنی مەسـەلەی قۆڕی‌مرۆڤ‌دۆستانە دەکرا چارەسەر بکرێ، یـان تـەواو بـە واتـەی ئـەو،ئادەمیزاد بۆیـە حـازرە ئەندامی رەش هەڵگەڕاوی ببڕێتەوە هەتاپاشماوەی لەشی بە ساغی بمێنێتـەوە، ئـەو لـە درێـژەی روونکردنەوەکەیدا زیادی کرد، نەخۆشیی سەگی هاری تۆپیوو سروشت‌ماریجەی دەکـا. بـۆ تاقمێک لە سەربازەکان کە هێندەیان ئاشنایەتی لەگەڵزمانی جوان و شـیرنی ئیسـتعارەدا نـەبوو، نەخۆشیی سەگی هار وکوێرەکانیان بۆ نەدەچۆوە سەر یەک، بەڵام ئەگەر بێتـوو هـەر لـە سـەر ئەوپێ‌وشوێنە بڕۆیین و زمانی ئیستعارە بێنینە کایەوە، دەبوو قسەکانی‌سەرکردەیان بە ئاوی زێـڕ بنووسیبا، هیچ کەس لە سپادا ناگاتە ئەو پلەبەرزە، مەگین بیر و وتار و ئاکـاری بدرەوشـێتەوە و قسـەی لـە سـەر نـەبێ. ئاخرییەکـەی یـەکێک لـە کوێرەکـان لـە دەفرەکـان هەڵـەنگووت و

هاواری‌ئەوانی تری کرد، لێرەن، لێرەن، تەنانەت ئەگەر ئەو پیاوە رۆژێک‌سۆمایی گەڕابایەوە چاوەکانی بە رادەی راگەیاندنی ئەو هەواڵە پیرۆزەخۆشحاڵ نەدەبوو. لە مەودای چەند پشوویەکدا کوێرەکان کردیانەفڕانفڕان، بێنەوبەرەیەک بوو کەس دەس و پێی خۆشی نەدەناسییەوە،هەر کەس بۆ لای خۆی دەکێشا و خۆی بە یەکەم بەشدار دەزانی، مندەیبەم، نا من دەیبەم. ئەوانەی هەر وا خۆیان بە پەتەکەوە راگرتبووکەوتنە خوت‌خوتە، ئەو جار شتێکی دیکە زەندەقی بردبوون، نەکا لەبەرتەوەزەلی یان ترسەنۆکیان لە کاتی دابەشینی شێودا قرتیان کەن،دەی‌دەی، ئێوە لە ترسی ئەنگوان نەتانویست بگەوزێن و قوون لە حەواکەن، کە وا بوو خواردن بێ خواردن، دەبێ هەمیشە ئەو پەندەتان لە بیربێ کە دەڵێ، برسی دەس لە زاری گورگ رادەکا. ئەو قسە زل وپووت‌پووتانە وایان کرد یەکێک لە کوێرەکان رایەڵەکە بەر بدا و بەکوێرەکوێرە بەرەو قریوەقریوەکە بڕوا، نابێ من قرت کەن، بەڵام لەپڕێک زەنازەناکە رۆمرکا و تەنیا دەنگێکی کە دەبیسرا دەنگی خشکان وورتەورت و غەڵدەغەڵدێک بوو کە لێرولەوێ دەهات و نەدەهات. بەدوودڵی راوەستا، هەوڵی دا بگەڕێتەوە پەنا پەتەکە، بەڵام ڕێی لێ‌شێوا،هیچ ئەستێرەیەک لە ئاسمانی سپی‌واشی ئەوا تروسکەی نەدەهات وئێستا تەنیا گوێی لە دەنگی گرووبانەکە دەبوو کە تێیانی رادەخوڕی‌بگەڕێنەوە لای پلیکانەکان، ئەو دەستوور و توورە بوونە دەکرا تەنیارووی لەوان بێ، بۆ گەیشتن بە شوێنی دڵخواز هەموو شتێک گرێ دراوەبەم شوێنەوە کە لێی راوەستاوی. ئیتر هیچ کوێرێک بە پەتەکەوەنەنووسابوو، دەبوو بەم ڕێیەدا کە هاتبوون بگەڕێنەوە و ئێستا لە سەرپلیکانان وێستابوون هەتا ئەوانی تر بگەنێیە. ئەو کوێرەی ڕێی‌لێ‌تێک‌چووبوو نەوێرا لە جێی خۆی جووڵە بکا. پڕ نیگەران هاواری کردتکا دەکەم یارمەتیم دەن، نەیدەزانی کە سەربازەکان سێرەیان لێ‌گرتووەو چاوەڕوانن هەتا لە خەتی نەدیاری مرد و ژین بترازێ. گرووبان بەراوێژێکی تاڵ و هەراسانەوە پرسی دەتهەوێ بە درێژایی ئەمڕۆ لەوێ‌راوەستی، هەی شەمشەمە کوێرە، لە راستیدا هاوبیروڕای سەرکردەکەبوو، کێ دەستەبەرایەتی ئەوە دەکا کە منیش سبەینێ تووشی ئەوچارەنووسە نەبم، هەموو دەزانن کە سەربازەکان تەنیا چاوەڕوانی‌فەرمانن هەتا ئینسان بکوژن و بە فەرمانێکی دیکە خۆیان بکووژرێن،گرووبان گوڕاندی تەنیا بە دەستووری من تەقە بکەن. ئەو قسانە لەکابرای کوێریان حاڵی کرد کە ژیانی کەوتۆتە مەترسیی. بە چۆک داهاتو پاڕایەوە، تکایە یارمەتیم بکەن، بڵێن بە کوێدا بڕۆم، سەربازێک بەئانقەست گوتی بڕۆ پێش کوێرە، بەم لایەدا بڕۆ پێش، کابرای کوێرهەستا پێ، سێ هەنگاو بەرەو پێش چوو، پاشان لەپڕ راوەستایەوە،راوێژی کابرای

ڕێنوێن خوت‌خوتەی خستە دەروونی، بەم لایەدا بڕۆپێش، ئەو ڕاویژە لەگەڵ ڕێی خۆت بگرە و بڕۆ، وەکوو یەک ناچن، بەم‌لایەدا بڕۆ پێش یانی بەو دەستەدا بڕۆ هەتا دەگەییە ئەو شوێنەی لێیەوەبانگ کراوی، ئەو دەم دەکەویە بەر ڕەهێڵەی گوللە کە جۆرێک کوێری‌تازە لە جێی ئەوی تر دادەنێ. ئەو شێوە فریودانە پیاوکوژانەیە کە لەمێشکی سەربازێکی چەپەڵ هەڵقوڵیبوو بە هەڵوێستی توند و تیژی‌گرووبان بوو بە بڵقی سەر ئاو، ڕاوەستن، وەرسووڕین بۆ دواوە، پاشان‌زۆر بە توندی لە سەربازەی سەربزێوی ڕاخوڕی، سەربازەکە بەرواڵەت لەو تاقمە کەسانە بوو کە نەدەکرا بە خەیاڵی ئاسوودەوە تفەنگی‌بدرێتە دەست. دەس‌بەسەر کراوەکان کە گەیشتبوونەوە سەر پلیکانان،بەم هەڵوێستە مێهرەبانانەی گرووبانەکە غیرەتیان هاتەوە بەر و لەپڕدەستیان کرد بە هەراهەرا، ئەو دەنگەدەنگ و زەنازەنایە چەشنی‌قوتب‌نما کابرای سەرگەردانی کوێری ڕێنوێنیی کرد. ئێستا کە زیاتربڕوای بە خۆی هێنابوو ڕاستەوراست بەرەو پێش هەنگاوی دەنا ودەپاڕایەوە، هاوار کەن، هاوار کەن، کوێرەکانی دیکە چەپڵەیان لێ‌دەدا،دەتگوت تەماشای کەسێک دەکەن کە خەریکی هەلاتن و نەبەزین وسەرکەوتنە. بەخێر هێنانەوەیەکی گەرمیان کرد، هەڵبەت ئەوەبچووکترین کارێ بوو کە بۆیان دەکرا، لەوەختی لێ‌قەوماندا پیاو دۆست‌و دوژمنی خۆی باشتر دەناسێ.

ئەم دۆستایەتییە هێندەی نەکێشا. بڕێک لە کوێرەکان دەرفەتیان لەوگرمە و هەرایە هێنا و ئەوەندە شێو و خواردەمەنییەی بۆیان دەچوودەستیان دایە و دەرباز بوون، بە ئاشکرا دەکرا ئەو مەبەستە بەتێکۆشانێکی خائینانە بۆ بەش نەفەوتان بێتە ژومار. مرۆڤی ساکار وخۆش‌باوەڕ کە بێ گوێ‌دانە قسەی خەڵک لە هەموو شوێنێک خۆ ئاشکرادەکەن بە تووڕەیی هاواریان کرد ئەوە پیاوەتی نیە، بێتوو بڕوامان بەیەکتر نەبێت حاڵمان شڕە. هێندێکیان بە هەڕەشە و گوڕشە گوتیان دەبێ‌ئەم فێڵبازانە تەمێ بکرێن و چەخسێکیان تێهەڵدرێ، کەچی گزیکارەکان‌بەرەو ڕووی ئەم هەڵوێستە بوونەوە، دیارە هەموو لە مانای ئەو گوتانەحاڵی دەبوون و ئەو شێوە دوانە چەوتە تەنیا بە هۆی ڕاست و دروست‌بوونی بابەتەکە چاوپۆشی لێ‌دەکرێ. دەس‌بەسەر کراوەکان کە لەسەرسەرا کۆ ببوونەوە، پێک‌هاتن، ئەو پێک‌هاتنە یەکەم هەنگاوی‌بەکردەوەی ئەم هەل‌ومەرجە ئاستەنگە بوو کە تێیدا بوون، تەمایان گرت‌ئەوەی ماوە نیوە و نیوە لە نێوان دوو بەشەکەدا بەش بکرێ، هەڵبەت‌بەختەوەرانە دوو قۆڵەکە بە یەک ڕادەیان دەس‌بەسەر کراو تێدا بوو. دیسانیش دەستەیەکی هاوبەشی یەکسانیان بۆ لێ‌کۆڵینەوە ودۆزینەوەی نان و پێخۆرە دزراوەکان هەڵبژارد. هەر وەک هەمیشەماوەیەک لە سەر پاش و پێشی کارەکە بوو بە دەمەقرە،

هێنـدێک دەیـانگوتلـە پێشـدا شـێو بخـۆن پاشـان دەسـت بکـەن بـە لێکۆڵـینەوە و بـڕێکیش بەپێچەوانە بیریان دەکردەوە، زۆربەیان لە سەر ئەو بڕوایە بوون چونکەوێکـڕا تووشـی ڕۆژووی بە زۆرەملی هاتوون وا باشترە لە پێشدا خۆیـانتێـر کـەن و پاشـان دەس بکـەن بـە لێکۆڵـینەوە، کەسێک لە بەشی یەک گوتیلەبیرتان نەچێ کە تەرمەکان بنێژن، یەکی قسەخۆش ولامی داوە هێشتانەمانکوشتوون کە دەفەرمووی بیاننێژین، دیارە خۆی بەم قسانە زیاترلە هەموان کەیفی ساز بوو. تێکڕا لە قاقای پێکەنینیان دا. بەڵام هەر خێرابۆیان دەرکەوت کە ئەم دوو بەشە تاوانبارێکی لێنیە. کوێرەدەسبەسـەر کراوەکـان کـە لـە بـەردەرگای هـەردووک بەشـەکان بـۆوەرگرتنی جیرەی خۆیان راوەستابوون دەیانگوت گوێیان لە هەستیپێی کەسـانێک بـووە کـە بـە پەلـە بـە ڕێڕەوەکاندا تێپەڕیون، بەڵام خـۆ کـەسنەهاتۆتـە نێـو بەشـەکان چ بگـا بـەوەی شـتی دزێـتی هێنابـێ، لـەم بابەتـەوەدەیانتوانی سـوێند بخـۆن. یـەکێک بـە بـیریدا هـات باشـترین ڕێگـا بۆدۆزینەوەی ئەو کەسانە ئەوەیە هەر کەس خێرا بگەڕێتەوە سەر تەختیخۆی، ئـەوکات دیـارە تەختە بەتاڵەکان دەبێ هی دزەکان بێ، کە وایە تەنیاکارێکی دەکرێ ئەوەیە چاوەڕێ بن هـەتا لەو حاشارگەیەی چوونشێوی تێدا بخۆن بێنە دەر و بگەڕێنەوە، جا ئەوکات بە سەریان وەربـن ودەس بکەن بە تێهەڵدانیان و فێریان کەن کە ڕێز بۆ یاسای پـیرۆزی مـافیخاوەنییـەتی دابنـێن. بەڕێوەبردنی ئەو نەخشەیە گەرچی زۆر بـە جـێ ورێ و دادپەروەرانـە بـوو بـەڵام دژوارییـەکی گەورەی لە سەر ڕێ هەبوو،چونکە خواردنی ئەو سوبحانە دڵخوازەی کە هەر ئێستاش ببوو بـە دمیمردوو بۆ ماوەیەکی نادیار دەخستە دواوە. یەکێک لە کوێرەکـانپێشـنیاری کـرد وەرن لـە پێشدا بخۆین و زۆربەیان پێی رازی بوون. مخابن دوای ئەو تالانە حەیابـەرە خـواردنێکی کـەم مابوو. لەم کاتەدارەنگە دزەکان لـە قـوژبنێکی ئـەو سـاختومانە کۆنـە شـڕ و شـپڕێوەدا هـەرکام خەریک بن بەشـی دوو سـێ کەسـان بـە تـام و خـوێ بخۆن و هـەتا زگـدەیبـا تێـی ئـاخنن، خواردنەکە بریتی بوو لە شیر و قاوەی سارد،بیسکویت و کولێرەچەورە، هەڵبەت روونە مرۆڤـی بەشەڕف دەبوو بەنیوەی ئەوە یان تەنانەت کەمتریش قەناعەت بکا. لـە دەرەوە دەنگـیبڵـیندگۆ دەبیسـرا کـە بـانگی دەسبەسـەرە نیمچـەکوێرەکانی دەکـرد بـۆبردنی خـواردن. ئـەو دەنگـە دەگەیشـتە گـوێی هێنـدێک لەقەرنتینـەکراوەکانی بەشـی یـەک کـە خەمبارانـە نـان و بیسکویتیاندەخوارد. یەکێک لە پیاوە کوێرەکان کە بێگومان ئەو بارودۆخـە دزێوەشـوێنی لـە سەر بیری دانابوو گوتی بێتوو لە سەرسەرا چاوەڕوان بینئەو کەسانەی هەتا ئێستا کـوێر نـەبوون بە دیـتنی ئێمـە وەهـا تـرسهەڵـیاندەگرێ ڕەنگـە تەنانـەت بارخانـە گـەورەکانی خواردەمـەنی

فـڕێبـدەن و دەربـاز بـن، بـەڵام چاوپزیشـک گـوتی ئـەوە کـارێکی هەڵـەیە و بەپێچەوانـەی دادپەروەرییە کـە ئـادەمیزادی بـێ‌تـاوان سـزا بـدەین. وەختێـک لـەخواردن بوونـەوە، خێـزانی دوکتۆر و کچەی چاویلکەیی ئەوشڕوشالاتەی خواردنی تێدا هاتبوو کۆیان کردنەوە و بردیانن بۆحەوشە. پاشان ژنی چاوپزیشک پێشنیاری کرد دەبێ ئـەو زبـل و زاڵەبسـوتێنین و خۆمـان لـە چنگ ئەو مێش و مەگەزانە رزگار کەین.

قەرنتینە کراوەکان لە سەر تەختەکانیان دانیشتن و چاوەڕوانی پۆلی‌دزان مانـەوە، دەنگێکـی گڕ گوتی هەی سەگی زیانی خورۆی خوێڕی،ئەوانە هەر ئەم ناوەیان لێ دەوەشێتەوە، هەڵبەت نەیـدەزانی لـەجێوەبرینی کەسـێک دەکولێنێتـەوە، بۆیـە نـەدەکرا سـەرکۆنە بکـرێ. بـەڵام ئەوخوێڕییانە نەگەڕانەوە، بێشـک بۆنیـان کردبـوو، وەکـوو ئـەو کەسـەی‌گـوتی چەخسـێکیان تێهەڵدەن رەنگە یەکی ورياش پێی‌زانیبێت. ماوەیەک‌پێ‌چـوو، بـڕێک لـە نابیناکـان راکشـان و هێنـدێکیان نوسـتن، چونکـە کـاری‌هاوڕێیـان خـواردن و خەوتنـە. دیـارە ژیـان بـە خواردنـەوە راوەستاوە وهەتا خورد و خۆراکمان هەبێ وەک ئەوەیە لە هۆتێل بین. بێتـوو لـە شـارابە وردی بڕوانینە ژیانی مرۆڤێکی کوێر بێ‌گومان چەرمەسەری و پەند وگۆلمەزیمان لێ روون دەبێتـەوە. لـە شـەقامان دەکـەوی و هەڵدەسـتییەوە وسـەرەنگرێ دەبی، هـەر کـەس دەتبینـێ فیزماڵـکی دەداتێیە و دەرباز دەبێ،بنەماڵـەت دەکەونـە خۆفـەوە، دەترسـیی لێـت نیزیـک ببنـەوە، ئـەوینی نێوان‌دایک و منالٚ دەچێتە ریزی ئەفسانان، رەنگە هەموو هەر ئاوا لەگەڵـتبزوونـەوە کـە لێـرە دەیکـەن، لـە ژوورێکـا دەرگـات لـە سـەر گاڵـە دەدەن وئەگـەریش زۆر بەختـەوەر بی قاپـە چێشتێکت لە بن دەرگاوە بۆ دادەنێن. ئەگەر هەل‌ومەرجەکـە بـە شـێوەیەکی بـێ‌لایەنانـە بێنینـە بەرچاو وپێش‌داوەری و دلٚێشان چاوی بیرمان کوێر نـەکا، زۆر جێـی سپاس وشـوکرانەیە کـە کارەبەدەسـتان وەخـتی تـەما گـرتن بـۆ کـۆ کردنـەوەی‌تێکـڕای کوێرەکـان لـە شـوێنێک بەرژەوەندی هەموو شتێکیان کردبوو،بزن بەپێی خۆی و مەڕ بەپێی خۆی، رەوشـتێکی ئاقلانەیـە بۆ ئەوانەی‌وەکوو گولان پێکەوە دەژین و بێ‌گومان دوکتۆر هـەقی بـە دەسـتە کەدەڵـێ دەبـێ خۆمان رێک‌خەین، لە راستیدا ئەوە یەکێک لە خاڵەبەرچاوەکانی ژیانە کە دەڵێ ئـەوەڵ زگ، دوایە تەکووز، هەر دوو بۆ ژیان‌پێویستن، هەڵبژاردنی تاقمێک ژن و پیاوی بـاوەڕ پـێ‌کـراو بـۆ وەئەستۆگرتنی رێک‌وپێکی و دانانی رێ و شوێنی باش بۆ ژیانی بە کۆمەڵدەرووەیەکی روونـە لەم ئەنگوستەچاوییەدا. بـۆ وێنـە گەسـک لـێ‌دان وشـۆردن و پـاک و خـاوێنی کـارێکی زۆر ساکارە و هیچ بیانوویەکیشمان‌نیە بـۆ ئـەنجام نـەدانی، چونکـە فـاف و سـابوون و کـەل‌وپـەلی

پێویستمان‌دەدەنێیە، دەبێ تەختەکانمان هەمیشە ڕێک‌وپێک بن، گرینگ ئەوەیەبڕێکمان لەخۆبوردوویی هەبێ، دەبێ خۆمان لە تێک‌هەڵچوون لەگەڵ ئەوسەربازانە بپارێزین کە ئەرکی پاراستنی ئێمەیان پێ‌سپێراوە، ئیترکوژرانمان ناوێ، دەبێ بگەڕیین و بپرسین داخوا کەسێ نیە کە شەوانەبە چیرۆک و نەقڵ و نەزیلە و حیکایەت و قسەی خۆش بمانخافڵێنێ، ئێوەبڕوانن بزانن چەندە باش دەبوو ئەگەر کەسێک ئینجیلی پیرۆزی‌لەبەربایە، ئەو کات دەمانتوانی لە ڕۆژی بناوانەوە بە سەر هەمووشتێکدا بێینەوە، گرینگ ئەوەیە گوێ بۆ یەکتر شل کەین، حەیف کەرادیۆمان نیە، مووسیقی هەمیشە رووحی مرۆڤ ئاوپرژێن دەکا، هەردەمانتوانی گوێ بدەینە هەواڵەکان، بۆ وێنە بێتوو لە شوێنێ دەرمانێک بۆدەردی ئێمە بدۆزنەوە چەندەمان کەیف ساز دەبێ و چۆنی دەکەینەچەپڵەڕێزان.

پاشان رووداوی تاڵ قەوما. لە شەقامەوە دەنگی تەقەیان بیست،یەکێک هاواری کرد ئەوە دێن بمانکووژن، چاوپزیشک گوتی ئارام بگرە،تۆزێک مەنتیقی بیر بکەوە، بێتوو خوازتبایان ئێمە بکووژن لێمان‌وەژوور دەکەوتن و پێویست بە تەقەی دەرێ نەبوو. دوکتۆر راستی‌دەکرد، گرووبان دەستووری تەقەی هەوایی دابوو، نەوەک ئەوەی‌سەربازێک قامک لە سەر پەلاپیتکە لەپڕ کوێر بووبێ، دیارە ئەوە تەنیارێگای تۆقاندن و دەس‌بەسەر کردنی تازە هاتووەکان بوو کە بە هەزارکوێرەوەری و چارەڕەشی لە ماشێنەکان دادەبەزین. وەزارەتی‌تەندروستی بە وەزارەتی بەرگری ڕاگەیاندبوو کە ئەوا چوار لۆری پڕدەنێرین، چەند کەسن، نیزیکەی دووسەت، ئەو هەمووە خەڵکە لە کوێ‌دابین کەین، ئەو سێ بەشەی لە لای ڕاستەوە کوێرەکانی تێدا نیشتەجێ‌کراوە وەکوو بە ئێمەیان ڕاگەیاندووە سەت و بیست کەس زیاتر نابا وەهەر ئێستا شێست حەفتا کەسی لێیە، بێجگە لەو دە دوازدێکەی ناچاربووین بیانکووژین، تەنیا ڕێ‌چارەیەک هەیە، هەموو بەشەکان بکەنەوە،ئەو کارە یانی وێک کەوتن و تێکەڵ بوونی ڕاستەوخۆی گومان‌لێ‌کراوەکان، درەنگ یا زوو ئەوانیش کوێر دەبن، بە کورتی‌بارودۆخەکە ئەوەیە کە دەیبینین، لام وایە ڕۆژێکی هەمووماندەیگرینەوە، کەست پێ‌شک نایە کە بە بەرچاوی مرۆڤێکی کوێراتێنەپەڕی‌بێ، لە خۆم دەپرسم باشە بێتوو ئادەمیزادێکی کوێر نەبینێ‌چۆن لە ڕێگای نیگایەوە دەتوانێ ئەو نەخۆشییە بۆ یەکی تر بەرێ بکا،خۆ هیچ مەبەستێک ئەوەندە سادە و ساکار نیە، یەکێک لەسەرهەنگەکانی ئێمە بڕوای وایە هەر کەس کوێر بوو دەبێ لەڕێوەبیکووژی، ئەگەر کوێرەکان ئاواش قەلاچۆ کەین دیسانیش وەزعمان‌تووشی ئاڵوگۆڕ نابێ، کوێر بوون و مردن یەک چەشن نین، بەڵێ بەلام‌مردن کوێر

بوونیشه، که وایه دووسەت کەسن، بەڵێ، چ لە شۆفیرەکانبکەین، ئەوانیش داکەنە ژوور. ئێوارەی ئەو رۆژە وەزارەتی بەرگریپەیوەندی کرد بە وەزارەتی تەندورستییەوە، پێتان خۆشە تازەترینهەواڵ ببیستن، ئەو سەرهەنگەی باسی دەکرا کوێر بووە، پێم خۆشەبزانم ئێستا بیرورای تەنک و تەسک و نەمەیوی چۆنە، خۆی وڵامیداوەتەوە دەمانچەیەکی لەمێشکی سەری داوە، بەوەی دەڵێن قسەیپیاوان، سپا هەمیشه بۆ رێ نیشان دان پێشرەوە. دەروازە لە سەرگازەرای پشت کرابۆوە. بە پێی رێ و رسمی پادگانەکان گرووباندەستووری دا پێنجپێنج ریز بگرن، بەڵام خۆ ئەوان نەیاندەتوانی بژمێرن،جاری وا بوو لە پێنجان زیاتر دەبوون یان کەمتر و ئاخرییەکەی تێکراهەر وا لە بەر دەروازە ئاپۆرەیان بەست، تەنانەت بە بیریاندا نەهات کەلە پێشدا ژن و مناڵەکان بنێرن، هەر وەک لە کاتی هاتنی بەڵا و ماڵوێرانیداوا باوە. هەتا لە بیرمان نەچۆتەوە دەبێ بڵێین کە تەواوی ئەو فیشەکانەیتەقین هەوایی نەبوون، یەکێک لە شۆفیرەکان نەیویست لەگەڵ کوێرەکاندەسبەسەر بکرێت، هاواری کرد من دەبینم، پاش سێ دەقیقە بروایوەزیری تەندروستی کە دەیگوت مردووی کوێریش هەیە بە هەمومانسەلما. وەک پێشتریش بیستمان گرووبان دەستی پێ کردەوە، برۆنەپێش، دەگەنە شەش پلیکان، ئەگەر گەیشتنییە بە ئارامی وەسەرکەون،بێتوو کەسێک بکەوێ خوا دەزانی چی بە سەر دێت، تەنیا رێنوێنێکیخۆی لێبوارد باسی گرتنی پەتەکە بوو، بەڵام دیارە بێتوو ئەو کارەیانبکردایە زۆری دەکێشا هەتا لە ساختومانەکە بچنە ژوور، ئێستا کەهەموویان لە دەروازە چووبوونە ژوور گرووبانەکە پشوویەکی هاتەوەبەر و هەرای کرد گوێتان لێبێ، سێبەش لای راستە و سێبەش لایچەپ، هەر بەشەی چل تەختی لێیە، بنەماڵەکان لای یەکتر بمێننەوە،پەلەی مەکەن، لەبەر دەرگای چوونە ژوورەوە یارمەتی لە کوێرەکانیپێشوو وەرگرن، هەموو شتێک رێکوپێکە، داسەکنێن و لەسەرەخۆ بن،ئارامی بپارێزن و پاشان نان و خوانتان بۆ دەنێرین.

هەڵەیە بێتوو وا بیر بکەینەوە کە جەماوەری ئەم کوێرانە چەشنیکاورەگەل روو دەکەنە کوشتارگا و بە پێی راهاتنی پێشوو دەکارێن،راستە تۆزێکیان پەلە دەکرد، بەڵام ئەوە شێوەی ژیانی نوێ بوو، بەسمرسمر لە پاڵ یەکترەوە دانیشتن، بۆن و هەناسە تێکهەڵەنگووتن. هێندێک لێرە بەردەوام دەگرین، تاقمێکی تر لە ترسان یان لە توورەییانهاوار دەکەن، برێک جنێوان دەدەن، یەکێک لە خۆوە هەرەشەی کردبێتوو دەستم بتانگاتێیە، گلێنەی چاوتان لە قاپێلک دێنمە دەر، هەڵبەتوێدەچوو مەبەستی سەربازەکان بێت. ئەو تاقمە بۆ گەیشتنە بەر دەرگایساختومانەکە ناچار بوون بەرزی و پانایی پلیکانەکان بە تاقی بکەنەوە،هرووژمی

ئەوانـەی پشـتەوە دووسـێ کەسـێکی بـەرەو دم کـرد، بـەڵامبەختەوەرانـە جگـە لـە داڕوشـانی گوێزینگان چی تری بە دواوە نەبوو،وریا کردنەوەی گرووبان زۆری یاریـدە دان. دەسـتەیەک لـەتازەهاتووەکان پێیـان گەیشـتە سەرسـەرا، بـەڵام نـاکرێ چـاوەڕوان بـێندووسـەت کـەس ئادەمیزادی نابینای بێ کوێرکێش هەر وا بە هاسانیدامەزرێن و خۆیان ڕێکوپێـک کـەن. ئـەو مەسەلە کە ئێمە لە ساختومانێکی کۆنـەدا رایـدەبوێرین کـە بـۆ ئـەو مەبەسـتە دروسـت نـەکراوە هەلومەرجەکەئالۆزتر دەکا، ئەوەندە بەس نیە کە تەنیا گرووبانێک پێمان بڵێ ئێرە هەرلایـەکی سێ بەشە، مرۆڤ دەبێ بزانێ ژوورەوە چۆنە و چۆنهەڵکەوتووە، دەرگاکان ئەوەندە تـەنگ و تەسکن دەڵێی گەرووی‌شووشەی شەڕابن، رێڕەوەکان چەشنی دانیشتوانی پێشووی‌شێتخانەکە شێتن، لەخۆوە دەس‌پێ‌دەکەن و دیارە نیە لە کۆی دەبڕێنـەوەو بنـەیان دێـت و هـیچ کەسـیش هەرگیز نازانێ بۆچی. ئەو کوێرانەی‌پێش‌قەتار بوون بە شێوەیەکی سروشتی بوون بە دوو قۆڵ و بـە پەنادیوارانـدا بـە دوای دەرگایەکـدا دەگـەڕان هـەتا پێیـا وەژوور کـەون،بێ‌گومـان ئـەوە شێوەیەکی جوان و ڕێکوپێک بوو بەو مەرجـە مـۆبڵ وکـەلوپـەلیان لـە سـەر ڕێگـا دانـەنابێ. درەنگ یا زوو ئەوانەی تازە هاتوونبە لێزانین و ئەهوەنی شوێنی خۆیان دابـین دەکـەن بـەڵام تەنیا دوای‌سەرکەوتن بە سەر قەرنتینەکەراوە گومانلـێکراوەکانـدا. هەڵـبەتچـاوەڕوانی وەهـا شـەڕ و تێـکهەڵـچوونێکیش دەکـرا. پێـکهاتنێـک کرابوو،تەنانـەت وەزیـری تەندروسـتی دەستووری دابوو کە ئەو بەشە بەدەس‌ئالوودە بووەکانەوە بێ و ئەگەر راست بێ کە پـێش‌بـینی کرابوو ئەمانیش‌تیکرا کوێر دەبن، دیسانیش دروست نەبوو هـەتا چاویـان دەبینـێ تێکەڵـبکرێن. ئەو مەسەلە راست وەکوو ئەوە دەچێ کەسێک لە ماڵـە خـۆی بـەبێ خـەم و دەرد دانیشـتبێ و لانی‌کەم لە بابەت خۆیەوە دڵنیا بێ کە هیچی‌تووش نابێ، بـەڵام لەپـڕ ببینـێ کـە تاقمێـک لـەم کەسانەی لە هەموانیان زیاترلـێ‌دەترسا بـە قریوەقریـو راستەوراسـت بـەرەو رووی دەخرۆشـن. گومانلێ‌کراوەکان لە پێشدا وایانزانی ئەوانەش تاقمێکی وەک خۆیانن وتـەنیا بـڕێک زیـاترن، بەڵام فریو هێندەی تەمەن نـەکرد، ئەوانـە تـەواو کوێربـوون، ئەمانـەی پـارێزەری دەرگـا بـوون هاواریان کرد ناکرێ ئێوە بێنەئێرە، ئەم لایە هـی ئێمەیـە، هـی کـوێران نیـە، بڕۆنـە ئـەو قۆڵـەی ئەوبەری. هێنـدێک لـە کوێرەکـان هەوڵـیان دا بگەڕێنـەوە و دەرگایـەکی تـر بدۆزنـەوە،بۆیان گرینگ نەبوو بچنە لای راست یان چەپ، بـەڵام ئەوانـەی پشـتەوەیەکـبین پاڵـیان پێوەدەنـان. ئەوانەی ئێستا کوێر نەببوون بە مسـت و پێلاقەبـەرگرییان لـە خۆیـان دەکـرد، کوێرەکـانیش بـە تـەواوی هێزوتواناوەدەسـتیان دەکـردەوە و تۆڵـەیان دەسـتاندەوە، دوژمنـەکانیان نـەدەبینی

بەڵامدەیانزانی لە کوێوە وێیان دەکەوێ. نیزیکەی دووسەت کەس لەسەرسەرا جێگایان نەدەبۆوە، هەر بۆیە زۆری نەکێشا کە دەرگاگەورەکەی سەر حەوشە کیپ بوو، دەتگوت کلیل و کلۆن کراوە، نەدەیانتوانی بڕۆنە پێش و نە دەکرا بگەڕێنەوە دوا، ئەوانەی لە ژوورەوەبوون کەوتنە ژێر قاچ و قولان و تەخت کەوتن، کەوتنە پەلەقاژە وهەولیان دا بە سیخورمە و مست و پێلاقە خۆیان بپارێزن و نەهێلن بخنکێن، قیژە و هەرا ولاتی تەنیبۆوە، منالە کوێرەکان دەگریان، دایکان لەهۆشەوە دەچوون و لەم نێوەدا ئەم جەماوەرە کە نەیانتوانیبوو بچنەژوور و لە دەرەوەش‌ڕا سەربازەکان تێیان رادەخوڕین بێ‌نێوبڕیەکتریان پاڵ دەدا. کاتێک جەماوەر دەیهەویست لەم تەنگەژەیە رزگاری‌بێت، هێندێک لە ترسی پلیشانەوە و بەراودم بوون بەرەو حەوشەتەقینەوە، مەترسیی باڵی ئەنگاوت، ئێمەش لە جیاتی سەربازەکانبووباین زندەقمان دەچوو، دیمەنێکی سەیرە، تاقمێک لەو کەسانەی‌چووبوونە ژوورەوە بە پڕتاو دێنەوە دەر، لەڕێوە خراپترین فکریان بەمێشکیدا هات، وەیانزانی تازەهاتووەکان دەیانهەوێ بگەڕێنەوە، وا باشەرابردوو بێنینەوە بیر، زۆر بە هاسانی و بێ گرێ و گۆڵ دەکرا دەس‌بکرێ بە کوشتار. بەختەوەرانە گرووبان دیسانیش توانی بە سەرقەیرانەکەدا زاڵ بێ، بۆ ئەوەی سەرنجی هەموو لایەک راکێشێ چەندفیشەکی هەوایی تەقاند و لە پشت بلیندگۆوە هاواری کرد ئارام بنەوە،ئەوانەی لە سەر پلیکانەکانن تۆزێک بکشێنەوە، رێگا بەردەن، یەکتر پالمەدەن و یارمەتی یەکتر بکەن. ئەوە داوایەکی زل بوو، کێشەکێش لەژوورەوە درێژەی کێشا، بەڵام چونکە تاقمێکی زۆر لە کوێرەکان بەرەودەرگای قۆڵی راست رۆیشتن وردە وردە سەرسەرا چۆل بوو، هاوبەندەکوێرەکان بەرەو پیریان چوون و تاقمێکیان لە بەشی دوو دامەزراند وهێندێکیان بەرەو بەشی سێ رێنوێنیی کرد کە هێشتا کەسی تێوەنەچووبوو. بۆ ماوەیەکی کورت وا هەست پێ‌دەکرا شەڕەکە بە قازانجی گومانلێ‌کراوەکان دەبڕێتەوە، هەڵبەت نەک لەبەر ئەوەی بەهێزتر بوون‌یان دەیانبینی، بەڵکوو چونکە کوێرە تازەهاتووەکان لایان وا بوودەرگای ئەوبەر شەڕ و کێشە و کۆسپی کەمتر لێیە و روویان لەم بەرەوەرگێرا. بەڵام سەرکەوتنی پارێزگاران تێژتێپەڕ بوو. لە دەرگای لای‌راستەوە دەنگ و هەرایەک دەهاتە گوێ کە نیشانی دەدا ئێتر لەوێ‌جێ‌نەماوە و تەواوی بەشەکان پڕن، تەنانەت هێندێک کوێر بەرەوسەرسەرا رەپاڵ دەنران، دروست لەوکاتەدا ئەم پەرژینە پڕەی‌کوێرەکان تەنیبوویان لە ژێر میچی پەنایەک ئۆقرە بگرن و لە هەڕەشەی‌سەربازەکان بە دوور بن. ئاکامی ئەم دوو جێ‌گۆڕکەیە لەپڕ شەڕ وکێشەی قۆڵی چەپی هەڵگریساندەوە، تێک‌هەڵدان دەستی پێ‌کردەوە وهەرا و گرمە بەرز بۆوە و دەتگوت

هەر ئەو دەرگایەیان دۆزیبۆوە کە بەسەر حەساری پشتەوەدا دەکرایەوە و خۆیان تێ کوتابوو، هاواریان کردئێرە چەند کەلاکی لێیە. ترس و خۆفیان بێننە بەرچاو. بە هەزارکوێرەوەری کشانەوە، لێکدالێکدا دەیانگوت ئەوێ چەند کەلاکی لێیە،دەتگوت دوایە نۆرەی ئەوان دێت و لە ماوەی چەند پشوویەکداسەرسەرا بوویەوە ئەو گێژاوە سامناکەی پێشوو، پاشان بە دوای ویستو مەیلێکی لە پڕ و ئاژاوەخوازانەدا شەپۆلی ئینسانی بۆ لای قۆڵی چەپوەسوورڕا و هەموو شتێکی رادا، بەربەرەکانی ئالوودە بووەکانی تێک شکاند، زۆربەیان ئیتر تەنیا ئالوودە نەبوون و وەک شێتان شاڵاویانبۆ هەر لایەک دەبرد هەتا لە دەس چارەنووسی رەشی خۆیان، دەربازبن. هەڵاتنیان لە خۆوە بوو. یەک بە دوای یەکا کوێر دەبوون، چاویان لەنێو شەپۆلێکی سپی دزێودا کە تەواوی وڵاتی دادەگرت نوقم دەبوو. لەسەرسەرا و حەوشە، دەس بەسەر کراوە کوێرەکان شەکەت و لێ قەوماو،تێهەڵدراو و کوتراو و شین و رەش هەڵگەڕاو بڕێکیان خۆ کۆ کردەوە وپشوویان دا. زۆربەیان پیر و ژن و مناڵ بوون و پتر وەک مۆجیزە دەهاتەبەرچاو کە ئەم بێ دەسەڵات و بێ هێزانە کەلاکیان نەداوە و تەرمی تر بۆناشتن بەجێ نەماوە. جگە لە پێڵاوێکی زۆری بێ خاوەن، کیسە خەو،چەمەدان، قەرتاڵە و شڕ و شاڵاتێکی دیکەش بەجێ مابوون و ون ببوون،هەر کەس دەستی دەگەیشتە شتێک پێداگر بوو کە هی خۆیەتی.

ئەو پیرەپیاوەی چاوبێنی رەشی لە سەر چاوێک بوو لە حەوشەوەهات. ئەویش یان بارگە و بنەی ون کردبوو یا شتێکی لەگەڵ خۆیانەهێنابوو. ئەو یەکەم کەس بوو لاقی لە تەرمەکان گیرا، بەڵام هاواری نەکرد. لە پەنایان راوەستا و چاوەڕوان بوو هەتا ئەهوەنیی و ئارامییباڵی بە سەر وڵات کێشا. نیزیکەی سەعاتێک راوەستا. ئێستا نۆرەیەتی کە پەسیوێک وەدۆزێ. بە کوێرەکوێرە کەوتە رێ. دەرگای بەشی یەکەمی لای راستی دیتەوە، گوێی لەم دەنگانە بوو کە لە ژوورەوەدەهاتن، پاشان پرسی داخوا ئێرە تەختی بەتاڵی لێ نیە.

## کوێری

سەرەوخوار بوون و هرووژم و تێخزانی ئەو هەمووە ئینسانە کوێرەلانی کەم بە رواڵەت لایەنێکی باش یان رەنگە دوو لایەنی چاکی هەبووبێ،لە قەراری قسان یەکیان نیشانە و سرشتی دەروونناسی هەبوو، چونکەجیاوازی زۆرە لە مابەینی چاوەڕوانیی بەردەوام بۆ هاتنی هاوبەندیتازە یا گەیشتن بەم راستەقینەیە کە ئاخرییەکەی ژوورەکان پڕ بوون ولە ئێستە بەدواوە پێکهێنان و پاراستنی دۆستایەتی قایم و پتەو لەگەڵهاوبەندەکان بە روونی دەشیا و دابڕانی تێنەدەکەوت. دووهەمین نیشانەی چاک و بەرچاو کە بە کردەوە راستەوخۆ و بنەڕەتی، خۆیدەنواند ئەوە بوو کە تەواوی بەرپرسانی سپایی و لێپرسراوانی ترتێگەیشتبوون بەخێو کردنی سیچل کەسان سەرەڕای ئەو هەمووەکەموکووڕییە شتێکە و بەرەو روو بوون لەگەڵ بەرپرسایەتی پڕ پێچ وگەورە و لەنەکاوی تێر کردنی زگی دووسەتوچل کەس، لە هەر چین وتوێژ و رەگەزێک، بە ویست و ئاکار و خووی جۆراوجۆرەوە شتێکیدیکەیە. سرنج بدەن، دووسەتوچل کەس جارێ هەر بە سەری قامکانە،چونکە لانی کەم بیست نابینا تەختیان وەگیر نەکەوتووە و ناچارن لەسەر ئەردی بخەون. وەهەر حاڵ دەبێ ئەوەی بزانین کە تێرکردنیسیزگ بە بەشە نانی دە کەسان فەرقی هەیە لەگەڵ ئەوەی بەشیدووسەتوچل کەس لە نێو دووسەتوشێست کەسا دابەش بکرێ. جیاوازی ئەو مەبەستەمان بۆ پێشبینی ناکرێ. لە ئاکامدا هەست بەبەرپرسایەتی زیاتر و ترس لە هەلایسانی ئاوری سەربزێوی، بوو بەهۆی گۆڕانی رەوشتی کاربەدەستانی بەرپرسیار و دەستووریان دا کە لەوەختی خۆیدا نان و خوان و خواردەمەنی تەواو دابین بکرێ. ئاشکرایەپاش ئەو کێشەکێشە ناخۆشەی دیتمان، جێگۆڕکەی ئەم هەمووەدەسبەسەر کراوە کارێکی ساکار و بێدەردەسەر نەبوو، تەنیائەوەندەمان وەیاد بێتەوە تەواوە کە ئەو بەستەزمانە لێقەوماوەئالوودانەی پێشتر دەیانبینی ئێستا کوێرن، ئەو ژن و مێردانەی لێکهەڵبڕان و منداڵەکانیان ون کرد هەر وا سەرگەردانن، ئەو کەسانەیچەندین جار کەوتنە ژێر قاچ و قولان تووشی ژان و ئێش و نەهامەتیگران هاتن و

ئەوانەی بە دوای شڕوشالاتی گوم بوویاندا دەگەڕێن هەرچی دەیکەن نایاندۆزنەوە، ئینسان دەبێ زۆر بێڕوحم و دەمار بێ کە لەئاست بێئەنوایی ئەو جەماوەرە چاو بقووچێنێ هەر وەک هیچی نەدیتبێ. سەرەڕای ئەوانەش نابێ ئەو مەبەستە لە بیر کەین کە ئامادە بوونیخواردنی نیوەڕۆ چەشنی مەلحەمێک وا بوو بۆ سەر برینی هەموان. هەروەها نابێ لە بیرمان بچێ کە بە هۆی کەمدەسەلاتی و نەبوونیبەرپرسێک کە بتوانێ ڕێکوپێکی دابمەزرێنێ، ساز کردنی وەها زۆر وزەوەند و دابەشینی بۆ تێر کردنی ئەو گشتە زگە ناکۆکییەکانی پتر پەرەپێ دا. هەڵبەت دەبێ بیسەلمێنین کاتێک لە سەرسەرای شێتخانە کۆنەکەوەتەنیا ملچەملچ و بزووتنی شەویلکەی دووسەت و شێست کەساندەبیسرا، بارودۆخەکە بە شێوەیەکی بەرچاو لە جاران ئەهوەنتر بوو. بەڵام کێ دوایە ئەو زبڵوزاڵە زۆرە کۆ دەکاتەوە هەتا ئێرە پرسیارێکی بێوڵامە، تەنیا بوولێڵی ئێوارێ دەنگی بڵیندگۆ دێتە گوێ کە باسی ڕێ وشوێنی دامەزراو دەکا، ئەو ڕێکوپێکییەی بە قازانجی هەموان بوو، کە وابوو پاشان روون دەبێتەوە کە تازە هاتووەکان چەندە ڕێز بۆ ڕێ وشوێنی دامەزراو دادەنێن. تەمای ناشتنی مردۆکان لە لایەن هاوبەندانیبەشی دووی قۆڵی راست کارێکی گەورە بوو، لانی کەم لەم بۆگەنەی قڕیکردووین رزگاریمان دەبێت، خوو گرتن بە بۆنی زیندوان هەر چەندەخراپیش بێ، هاسانترە.

بەڵام لە بەشی یەکا، وادیارە چونکە لە هەموان پێشینەدارتر بوون ورێ و شوێنی باشتریان بۆ سازان لەگەڵ کوێری پەیدا کردبوو، چارەگێکپاش ئەوەی هەموو شێویان کرد، نە کوتە کاغەزێکی پیس لە سەر هەردفڕێدرابوو، نە قاپ و دەورییەک لە بیر چووبوو کە کۆ نەکرابێتەوە وبەرماوی لەبەر بڕوا. هەموو شتێک کۆ کرابوویەوە، زۆر بە جوانی و لەسەر رەوشتی پاک و خاوێنی دەفرە بچووکەکانیان لە نێو گەورەکاندەنا و ئەوی پیستر بوون لە پاڵ خاوێنەکان دەخزان و بۆ ئەوەی کارەکەرێکوپێکتر بێ زۆر بە وردی بەرماوەکانیان کۆ دەکردەوە. ئەو شێوەفکرەی بێگومان دەگەڕێتەوە سەر ئاکاری ژیانی کۆمەڵایەتی بە شەوێکو هەوێک پێکنایە. لەم بابەتە تایبەتەدا کە مەبەستی ئێمەیە، دەوری فێرکردن و راهێنانی ژنە کوێرەی بنەبانی ئەو بەشە بەرچاوە، ئەو ژنەیخێزانی چاوپزیشکە و هەرگیز لە چەندپات کردنەوەی ئەم مەبەستەماندوو نابێ. ئەگەر ناکرێ وەکوو ئینسانان بژین، خۆ دەکرێ هەوڵبدەین وەک جانەوەران نەبین، ئەو قسەیەی ئەوەندە چەندپات کردەوەکە لێرە بۆتە پەند و ڕێ و شوێنی ژیانی لە سەر دیاری دەکرێ، ئەگەرخورد بینەوە دەزانین کە ئەو رستەیە لە

بناغـەوە هـەر زۆر سـادە و سـاکاربوو، رەنگـە هـەر ئـەم شـێوە بـیر کردنـەوە توانـای ناسـینی هەمووهەڵومەرج و داخوازێکی بوویێت کە دەیتوانی دەوری خـۆی کـەم و زۆربگێـڕێ. هـەر ئەو فکرە بوو کە بە گەرمی بەخێرهێنانی ئەو پیرەپیاوەچاوبێن لە چاوەی کرد کـە سـەرێکی دە سوێیە نا و پرسی داخوا ئێرەتـەختی بەتاڵـی لـێ‌نیـە. بـە هەڵـکەوتێکی بـاش کـە مـزگێنی‌دەری ئاکامی‌داهاتوو بوو، تەختێکی لێ‌بوو، تەنیا تەختێکی بەتاڵ، لە قسان دزەی‌گـۆرین لـەم تەختـەدا ژان و ئێشێکی لە رادە بەدەری کێشابوو، رەنگە هەرئەو مەبەستە تەپ و مژێکـی لـە ژان و دەرد جێ هێشتبێ کە خەڵکی لـەخۆی دەپرینگانـدەوە. ئـەم کایـەی چارەنووسـە، ئـەم رەمـز و رازە شاراوانەو ئەم هەڵکەوتە دەسپێک و دوایی رووداوەکان نەبوون، خودا بە دووری‌کا. ئەگـەر لـە بیرتان بێ تەواوی ئەو کەسـانەی راسـت ئـەوێ رۆژێ لەگەڵـکوێرەپیاو لـە مەتـەبی دوکتـۆری چاوان تووشی یەکتر هاتن وێکرا رێیان‌کەوتە ئەم بەشە، ئەوکات هـەرگیز شـتێکی وەهایـان بـە مێشکیدارانەدەبرد، هاوسەری چاوپزیشک وەکوو هەمیشە بە دەنگێکی نەوی، بەشـێوەیەک کـە لێی وەشک نەکەون بە گوێی مێردەکـەیا چرپانـد، لام وایەئـەوەش یـەکێک لـە نەخۆشـەکانت بوو، پیرەپیاوێکە کە تووکی تۆقی‌سەری وەریوە و چاوبێنێکی رەشی لە سەر چاوییە، لـە یادمـە بۆت باس‌کردووم، کامە چاوی، چاوی چەپ، دەبێ خـۆی بـێ. دوکتـۆر بـە باریکـەرێی‌نێـوان تەختەکاندا کەوتە رێ، هێندێکی دەنگ هەڵێنا و گوتی پێم خۆشەدەسـتێک بـە سـەر و چـاو و بەژن و باڵای ئەو کەسەدا بێنم کە تازە هاتۆتەلامان، دەمهەوێ بێ بۆ لام و منیش وا دەچـم بـۆ لای. لـە نیـوەی رێیـەداتێک‌هەڵـەنگووتن و دەسـتیان وەپەنجـەی یـەکتر کـەوت، چەشـنی دوومێروولە کە بە پێکداسـوونی شـاخۆکیان یـەکتر دەناسـنەوە، بـەڵام لێرەدامەسـەلەکە هـەر وا تەواو نەبوو، چاوپزیشک ئیزنی خواست دەستێک بەدەم و چاویشی‌دا بێنـێ، دەسـتی پێداسـوو و لەڕێوە، چاوبێنەکەی دیتەوە. بە دەنگێکی بەرز گوتی گومانی تێدا نیە کە ئـەوە تـەنیا کەسـێک بوو کەجێ لێرە بەتاڵ بوو، یانی ئەو نەخۆشەی چاوبێنی رەشی لە سەر چاوبوو، پیرەپیاو پرسـی مەبەستت چیە، تۆ کێی، من چاوپزیشکی ئێوەم، یا بەواتەیەکی باشتر بووم، لە بیرتە بـۆ لابـردنی ئاومرواری چاوت قەول وقەرارمان دانـا، منـت لـە کـوێ ناسـییەوە، ئـەوەڵ لـە رووی دەنگـت، دەنگ بۆکەسێکی نابینێ سۆمایی چاوە، بەڵێ دەنگ، تازە دەنگی ئێوە دەناسمەوە،کێ فکـری ئەوەی دەکردەوە دوکتۆر، ئێتر ئـەوجار برینکـاری پێویسـت نیـە،بێتوو بـۆ چـارەی ئـەو دەردە دەرمانێک پەیدا بێ، ئێمە هەردووکمان‌پێویستمانە، دوکتۆر لە یادمە پێت گـوتم پـاش لابـردنی ئاومرواری، چاوت‌وەها روون دەبێتەوە کە ئەو دنیایەی تێیدا دەژی نایناسییەوە، ئێستادەرکەوت

بەڕاستی ئەوەی دەتگوت وایە، کەی کوێر بووی، دوێ شەو،هەر لەڕێوە هێنایانی بۆ ئێرە، وەها ترساون هێندەی نەماوە هەر کەس کوێر بێ لەجێوە بیکوژن، دەنگێکی پیاوانە گوتی لێرەش تا ئێستا دەکەسیان کوشتووە، پیرەپیاوەی چاوبێن لە چاو تەنیا گوتی تێیانهەڵـەنگووتم، هـەر ئـەو دەنگەی دەتگوت دەیهەوێ راپۆرتەکە تەواوکا گوتی، ئەوان ئی بەشەکەی دیکـە بـوون، ئێمـە خێرا ئـیخۆمـان ناشـتن. کچـەی چاویلکـەیی هاتـە پـێش، منـت لـە یـادە، چاویلکـەی رەشـم دەکردەچاوم، گەرچی ئاومرواری بەری چاوی لێڵ کردبووم بەڵام جـوان تـۆم لـەیاد مـاوە، لـە بیرمە تۆ زۆر جوان بووی، کچە بزەی هاتێیە و گوتی سپاسو گەڕایەوە شوێنی خـۆی. لـەوێوە بە دەنگی بـەرز گـوتی منالـەکەش لێرەیـە،دەنگی کـوڕە بیسـترا کـە دەیگـوت دایکـم دەوێ، دەتگـوت بـە گریـانیدرەنـگوەخـت و بێهـوودە هەڵـپرووکابوو. کوێرەپیـاو گـوتی منـیش یەکەمکەسم کە کوێر بووم وادیارە تەنیا من ماوم خۆم بناسێنم و گوتی کەکێیە. پاشان پیرەپیـاو وەک ئەوەی بیهەوێ وڵامی ئەو پێشوازییەیدابێتەوە گوتی من رادیۆیەکم پێیە، کچە بە چەپڵـە لێدان وسەرسوڕمانەوە هاواری کرد ئەی گیان رادیۆ، چەنـد خۆشـە مووسـیقا،پیرەپیاو وەبـیری هێنایەوە کە تەنیا رادیۆیەکی بچووکە و بە باتری کاردەکا و خۆ بـاتریش تـا سـەر نابـا و تـەواو دەبێ، کوێرەپیاو گوتی خوا نەکاهەتاهەتایە لەو قەفەزەدا بین، هەتاهەتایە نـا، بەڕاسـتی بێتـوو وا بێزەمـانێکی گـەلێک دوور و درێـژە، چاوپزیشـک گـوتی دەکـرێ گـوێ بدەینەهەواڵـەکان، کچـەی چاویلکـەیی پێـداگری کـرد، هـەروەها بـڕێکیشمووسـیقی، هـەموو یـەک جووریـان ئاهەنگ و مووسیقی پێ خۆش نیە،بەڵام بێگومـان هـەموو پێمـان خۆشـە بـزانین لـە دەرەوە چ خەبەرە، باشترەبۆ ئەو کارە دەس پێوە بگرین و باترییەکان تەواو نەکەین، پیرەپیاو گـوتیوایـە، قسـەیەکی جوانـە. بـە دوای زۆر ئیزگـەدا گـەڕا، بـەڵام هێشـتا دەسـتی بۆدۆزینـەوەی شـوێنە دڵخوازەکان رانەهاتبوو، ئەوەی لە پێشدا دەبیسرابریتی بوو لە قاڕوقووڕ و بەشێک لە هەوایـەک و گوتەیـەکی پچڕپچڕ،ئاخرییەکـەی دەسـتی پتـر راهـات و مووسـیقاکە سـافتر هاتـە گـوێ، کچەیچاویلکەیی پاڕایەوە، هەر تۆزێکی لێگەڕێ، ئینسان لە وشـەکان حاڵـیدەبـوو، خێـزانی دوکتۆر گوتی خۆ ئەوە هەواڵ نیـە، پاشـان وەک ئـەوەیفکرێکـی بـە مێشـکیدا هاتبـێ گـوتی سەعات چەندە، بەڵام زۆر چاک دەیزانی کە کەس ناتوانی وڵامی بداتەوە. پێچی رادیۆکە هـەر وا دەســـووڕا هـــەتادەنگێکی روون و ئاشـــکرا لـــەم قودوولەیـــە بـــەرز بێتـــەوە، پاشـــان راوەستا،گۆرانییەک بوو، گۆرانییەکی نەناسراو، بەڵام دەسبەسەر کراوەکانئارام و بـێ ئـەوەی یەکتر پاڵ بدەن لە دەورەی کۆ بوونەوە، وەختێـکدەیـانزانی کەسێکیان لـە پێشـە، بـێدەنـگ

رادەوەستان و گوێیانهەڵدەخست، بە چاوی ئاوەڵە گوێیان بۆ لایەک شل کرد کە دەنگەکەی لێوە دەهات، هێندێک لە پرمەی گریانیان دا، گریانێک کە تەنیا لەکوێرەکان دەوەشێتەوە، ئەسرین وەک گۆزەی سەرەوژێر کەلاوی دەکرد. گۆرانییەکە تەواو بوو و وێژەر دوای سێ چرکان گوتی سەعاتچوار. یەکێک لە ژنەکان بە پێکەنینەوە پرسی چواری پاش نیوەڕۆ یابەیانی، دەتگوت پێکەنینەکەی عەزابی دەدا. هاوسەری چاوپزیشک بەدزەدزە سەعاتەی ڕێک و قورمیش کرد، چواری پاش نیوەڕۆ بوو. هەرچەند بێتوو لە هەق بپرسین، بۆ کاتژمێر هیچ فەرقێکی ناکا، کاتژمێر لەیەکەوە تا دوازدە خول دەخوا، ئەوە ئیدی تەنیا گەڕاوەتەوە سەرلێکدانەوەی بنیادەم. کچەی چاویلکەیی پرسی ئەرێ ئەوە چرکەچرکی چیە، وەکوو دەنگی، ژنی دوکتۆر دەستی خۆی ڕەپێش خست، من بووم،وەختێک رادیۆ گوتی سەعات چوارە منیش سەعاتەکەم قورمیش کرد،یەکێک لەو کارانەی زۆر جاران لە خۆوە دەیکەین. پاشان بە مێشکیداهات کە نەدەبوو خۆی لە مەترسیی خستبایە دەیتوانی چاو لەکاتژمێری دەستی یەکێک لە تازەهاتووەکان بکا، بێ گومان یەکێک کاتژمێرێکی لە دەستا بوو کە دروست کار بکا. دروست لەو کاتەداتێگەیشت کە پیرەپیاو سەعاتی پێیە، سەعاتەکەشی دروستە. پاشاندوکتۆر گوتی دەی باسی دەرەوەمان بۆ بکە. پیرەپیاو گوتی باشە، بەڵامباشترە دانیشین، هێندە بە پێوە وێستاوم شەکەت بووم. کوێرە قەرەنتینەکراوەکان سێ سێ و چوارچوار بێدەنگ و مێهرەوان، پاڵ وەپاڵی یەک لەسەر تەختەکان ڕۆنیشتن و گوێیان شل کرد، پاشان پیرەپیاو دەستی کردبە گێڕانەوە و هەر شتێکی بەر لە کوێر بوون دیتبووی و بیستبووی یەک یەک ریزی کردن.

گوتی بێتوو ئەو دەنگۆیە ڕاست بێ هەر لە یەکەم شەو و ڕۆژا سەدان کەس کوێر ببوون، هەموویان، هەر لەپڕ و یەک چەشن، بێ هیچ ئێش وئۆف و نیشانەیەکی بەرچاو، تێکڕا لە دەریایەکی ساماڵ سپیدا کەوتبوونەپەلەقاژە. ڕۆژی دووهەم باسی کەم بوونەوە و دابەزینی رادەی نەخۆشەکان لە سەدان کەسەوە بۆ دەیان کەس بوو، هەر ئەو مەسەلەوای کرد دەوڵەت خێرا ڕابگەیەنێ بێتوو زوو بەر لەم نەخۆشییە بگیرێ ژیان جڵەوی دەکەوێتە دەس ئەقڵ و مەنتیق. لێرە بەم لاوە جگە لە چەندلێکدانەوەی بە ناچاریی، نەقڵ و نەزیلەی پیرەپیاو وەک خۆی ناگێڕینەوەو لە جێگای ئەو دەس دەکەین بە گێڕانەوەیەکی سەر لەنوێ داڕێژراو کەبە واژەی دروست و بە جێ و ڕێ رازاوەتەوە. هۆی ئەم گۆڕانەچاوەڕوان نەکراوە زیاتر ئەو زمانە باوە هەوسارکراوەیە کە حیکایەتخوان دەکاری دێنێ، ئەو زمانە دەستوپێی پیرەپیاو دەخاتە

نێـو کـۆت وزنجـیرەوە و شـانازی و شـەڕەفی هاوکـاریی راپـۆرت نووسـێکیڕەپوراسـت و یەکڕووی لێوەردەگرێتەوە، کاریشمان بە سەر ئەممەبەستەوە نیە کە هەبوونی ئەو ئـادەمیزادە چەندە گرینگە و بە بێ ئەوهیچ دەرووەیەکی دیکە نیە هەتا بزانین لە دنیای دەرەوە چ قـەوماوە. جاهـەر وەگوتمـان خۆمـان دەبـین بـە بگێـڕەوە و تەواوکـەری رووداوەسەرسـوڕهێنەرەکان و ئەوەش دەزانین کە گێڕانەوەی وەها رووداو گەلو کارەساتێک بە کەلک وەرگرتن لە وشەی باش و بە جێ پوخـت وپـاراوتر دەبـێ. ئێستا دەگەڕێینـەوە سـەر باسـەکەی خۆمـان، دەولـەت یەکەمبۆچوونی خۆی لـەو بـارەدا کـە وڵات تووشـی نەخۆشـییەک هـاتووە خێرادەتەنێتـەوە و خەڵک دەیگرنەوە بردەوە پاش. دەوڵەت هۆکاریەنەخۆشیی هێن و نەناسراو و شوێن‌دانەری لە نەکاو کە هیچ نیشانەیەکیسەردەمی شـاراوەی نەخۆشـیی تێـدا بـەدی نـەکرێ بـە بۆچـوونێکی چەوتهێنایە ژمار. ئەوجار گوتیان بە پێی دوایـین بۆچـوونی زانسـتیی ولێکدانـەوەی نـوێ لـەم چوارچێوەیــەدا، تووشــی هەڵـکەوتێکی تـاڵ و کـاتی وتیژتێپـەڕ هـاتوون کـە جـارێ هـیچ مەبەسـتێکیان بـۆ روون نەبۆتەوە،راگەیانـدراوی دەوڵـەت سـوور بـوو لـە سـەر ئـەوەی کـە بـە هەڵسەنگاندن ولێکدانەوەی ژومارەی کوێرەکان رەنگە ئاڵوگۆڕ و بادانەوەیەکی بەرچاولە سەر دابەزینی پلەی ئەم نەخۆشییە دەس کـەوێ. راڤـەگەرێکیتلـەویزیۆنی ئیسـتیعارەیەکی شـیرینی دەکار هێنا و ئەو نەخۆشییەی بەتیرێک شوبهاند کـە بـەرەو حـەوا دەهـاوێژرێ و پـاش ئـەوەی دەگاتەپەرپەرۆچکە ماوەیەک رادەوەستێ، وەک ئـەوەی لەنگـەری گرتبـێ، پاشـانبـە ویسـتی خودا بادەداتەوە، بەم جۆرە راڤەگەر سەرلەنوێ کەوتەوە نێـوداوی بـاس و خواسـی هیچەکـە و پووچەکەی ئەم نەخۆشییە لێوەگرەیتیژتر باڵی دەگرت و کەس نەیـدەزانی کـەی لـە چنـگ ئەم کامووسەسەرودڵگرە رزگاریمان دەبێـت. بـێوچـان ئـەم قسـانە بـڵاو دەکرانـەوە وهەمیشـە دوایین ئاواتی خێرخوازانە چاک بوونەوەی خێـرای نابیناچارەڕەشـەکان بـوو، هـەر لـەم کاتـەدا دڵنیایان دەکردنەوە کە تەواوی کۆمـەڵ بـە گشـتیی پشـت و پەنایانـە و نابـێ دڵـمەندی دەسـتی چارەنووسبن. پێشـینیان لـە رابـردووی زۆر دوورا خـاوەنی رووحێکـی سـاف و سـاکاربوون و هەزار پەند و زاراوەیان بـۆ لـێقـەومان و رۆژگـاری ئاواتاڵـوتوون سـاز کـردەوە و دڵخۆشـیی خەڵکی ئاسایی و رەشۆکییانپێداوەتـەوە، وەک گوتوویانـە ئـەوەش دەڕوا و کـێ هـەتا سـەر ژیاوە، ئەوەپەندی زانایانەی ئەو کەسانەیە دەرفەتیان بووە هەوراز و لێژی ژیان وبـەخت بـەتاقی بکەنەوە و کاتێک بمانهەوێ ئـەوەی لـە وڵاتی کـوێران بکەینـەباو دەبـێ ئـاوا بخوێندرێتـەوە، دوێنێ دەمانبینی، ئەورۆ نابینین، سبەینێ،دیسـان دەبیـنین، هەڵـبەت رسـتەی سـێهەم بـا تۆزێـک

بکەوێتە سەر ڕێچکەی‌پرسیار، دەڵێی مـەرجی پـارێز کـردن لـە دوایـین چرکـەدا هاتۆتـە سـەر ئەوبڕوایە ئەم ئاکامە روون و هیوادەرە بە گومان تاماو داتەوە.

بەداخەوە هێندەی نەکێشا کە ئەم ئومێدانە بوونە بڵقی سەر ئاو،چاوەڕوانییەکانی دەوڵـەت و پێش‌بینییەکانی کۆمەڵی زانستیی تەواوی بابردی. کوێری هەر نەک وەک شەپۆلێکی لە نـەکاو کە هەموو شتێک لەخۆیدا نوقم دەکا و دەیبا، بەڵـکوو چەشـنی خـورپنی وردە وردەی هـەزار ویەک جۆگەلەی خوڕێن کە نەرمنەرم زەوی تەڕ دەکـا و لەپـڕ دایدەپۆشـی،پەرەی دەگـرت. کاربەدەسـتانی پایەبـەرزی وڵات کـە لەگـەڵ ئـەم کارەسـاتەکۆمەڵایەتییە بـەرەو روو ببـوون لێکدالێکدا شێلگیر و پتەو کۆبوونەوەیان‌پێـک‌دێنـا و بـە تایبـەت پسـپۆڕانی مێشـک و دەمـار و چاوپزیشـکانیان لـەدەوری یـەکتر کـۆ دەکـردەوە. ئـەو کۆنگرەیـەی قـەرار وا بـوو پێـک‌بـێ لەبەرنەبوونی دەرفەت هەرگیز رووی راستی بە خۆیەوە نەدیت. بەڵام لەبەرامبەرا بـاس و راوێـژ و کۆبوونەوەی گشتیی و تایبەتیی لێرولەوێ بەئاشکرا و نـەهێنی کـران و بـەڕێوە چـوون. بـەڵام وەک رۆژ روون بوو کەئەم باس و راوێژ و لێک گردبوونەوانە کـەلکیان بـڕاوە، کـوێر بـوونی لەنەکاوی هێندێک لە بەشدار بووان یا ئەم وتاردەرەی کە هـاواری کـرد مـن‌کـوێر بـووم، مـن کوێر بووم، کەم و زۆر بوو بە هۆی روو وەرگێڕانی‌رۆژنامەکان و رادیۆ و تلەویزیۆن، هەڵبەت کردەوەی ورد و بەپارێزی‌هێندێک لە راگەیەنەرە گشـتیی‌یـەکان جێگـای رێـز و سـپاس بـوو، چونکەئەوانە پتر بە دوای هەواڵـی جۆراوجـۆری پـڕ جـۆش‌وخرۆشـی بـەختیاری‌و چارەڕەشـی خەڵکەوە بوون و هەمیشە ئامادە بوون هەتا هەڵکەوتێکی‌سـەیری وەکـوو کـوێر بـوونی لەپـڕی مامۆستایەکی زانکۆی چاوپزیشکی‌راستەوخۆ بڵاو بکەنەوە.

دەوڵەت لە ماوەی شەش رۆژدا دووجار شێوەی بۆچوون وبەرەنگاری درێژخایـەنی خـۆی گۆڕی و بوو بە هۆی تێک‌شکانی‌بەرەبەرەی ورەی جەماوەر. دەوڵەت لە پێشدا دڵـنیا بـوو کـە بە راگیرکردنی کوێر و ئالوودەکـان لـە شـوێنە تایبەتییـەکانی چەشـنی ئەوشـێتخانەیەی ئێمـەی تێدابن، دەتوانـێ بـەر لـە تەنینـەوە و پـەرەگرتنی‌نەخۆشـییەکە بگـرێ. پـەل هاویشـتنی کـوێری هێندێک لە کاربەدەستەخاوەن دەسەڵاتەکانی دەوڵەتی خستە ئەو بیرە کـە خـودی بنەماڵـەکان بەرلـە تێکـەڵاوی ئەنـدامانی کوێریـان بگـرن و رێگایـان نـەدەن بێنـە نێوجـەماوەر، هەڵـبەت سەرچاوەی ئەم فکرە دەگەڕاوە سەر کەم دەسـەڵاتی‌دەوڵـەت لـە بەرامبـەر ئـەو کارەسـاتەدا و رەنـگ بـوو لـە بـاری سیاسییەوەتووشـی تەنگـەژەی گـەورەی کردبـا. کاربەدەسـتان لایـان وا بووبەرگێـڕەوەی کوێرەکـان بـۆ نەهاتنـە دەر لانی کـەم هێنـدێک لـە بـاری قـورس‌و گـرانی

ڕێگیرانەکان کەم دەکاتەوە یان دەبێتە هۆی برینـدار نـەبوونیهەسـتی ئـەو کەسـانەی هێشـتا موقراییان دانەهاتووە. چونکە ئەو خەڵکەبێ گوێ دان بە بیروڕای پسپۆڕان لە سـەر ئـەو بـاوەڕە بوون کەنەخۆشیی سپی وەکوو چاوزار بە روانین شوێنی خۆی دادەنێ. بەڕاسـتی نـەدەکرا لـەو کەسەی نوقمی بیر و خەیاڵی خۆیەتی، جا چ شاد وخـەمبار بـێ و چ هیچیـان، ئەگـەر شـتی وا هەبێ، وا چاوەڕوانی بکرێ ئەگەرکەسێک لە پڕ بـە ڕەنـگ بزرکـاوی بـۆ لای دەڕوا و هـاوار دەکا من کوێربووم، من کوێر بووم، نەخەجڵێ. مێشک و دەماری هیچ کەس خۆی لەبەرامبـەر ئەو حاڵتەدا پێڕاناگیرێ. لە هەموو شتێک خراپتر ئەوە بوو کەتـەواوی بنەماڵـەکان بـە تایبـەتی ئەوانی بچووکتر خێرا بوون بە بنەماڵەی کوێران و کەسێکی ساغ نەدەما کە دارەدەستیان بێ یان ئاگادارییان لێبکا و درواسێ ساخەکانیان لێ دوور کاتەوە. ئاشکرایە ئەو کوێرانەتەنانەت ئەگەر دایـک و بـاوک و مناڵـێکی خـەمخۆر و دڵسـۆزیش بـووبن هیچیـان لەدەسـت نـەدەهات، لـە بەرامبەردا گرفتاری چارەنووسێکیچەشنی چارەنووسـی ئـەو کوێرانـە دەبـوون کـە لـە تـابلۆی نەققاشیداپێکەوە دەڕۆن و دەکەون و دەمرن.

دەوڵەت لەم هەلومەرجەدا خێرا پاشەکشەی کرد و وازی لە پێودانو جەغزی تەنگەبـەری پێشوو هێنا و کوێی بە باش زانی خۆی لێنەبواردو لە ئاکامدا تەواوی کۆنە کارخانە و کلیسـای داخراو، وەرزیشگا وهەماری بەتاڵ خێـرا دەسـتێکیان بـە سـەر رووی داکێشـرا و ئامـادە کـران. پیرەپیاو گوتی لە دوو ڕۆژی رابردوودا باس باسی هەڵدانی خێوەتیسپایی بووە. لە پێشدا، یانی لە پێشپێشدا، چەند ڕێکخراوی خێرخوازپێشنیاری ناردنی ئەو داخوازەرانەی دا کە حـازرن بـۆ یارمەتی کوێرەکانهەتا جێوبانیان بۆ چاک بکەن، ئاودەستەکان خاوێن کەنەوە، جلەکانیانبـۆ بشۆرن و شێویان بۆ ساز کەن، یانی لانیکەمی ئەو چاوەدێرییـەی بـێئـەوان تەنانـەت ژیـان لـە ساخەکانیش سەخت و دژوار دەبێ ئەنجام بدەن. ئەو مرۆڤە روحسـووکانە خێـرا کـوێر بـوون، بەڵام ناویـان بـە بـەرزی لـەمێژوودا دەمێنێتـەوە. پیرەپیـاو پرسـی کەسـێ لـەم تاقمـە هاتـە ئێـرە، خێـزانیدوکتـۆر وڵامـی داوە نـەخێر، نـا کەسـێک نـەهات، ڕەنگـە ئـەوە هـەر دەنگۆبووبێـت، کوێرەپیاو گوتی دەی باس و هەواڵی شار و گیرانیڕێوبانەکان، بەم پرسیارە ئالێرەدا کەوتەوە یادی ئوتۆمبیلەکەی خۆی وئەو شۆفیر تاکسییەی بردبوویە لای دوکتـۆر و لـە گـۆڕ هەڵـکەندنا یارمەتیدابوو. پیرەپیاو وڵامی داوە کە هاتوچۆی ماشێنەکان سـەیر شێواوە،پاشـان بـە درێـژی باسی خۆلێکدان و ڕووداوی سەیر و سـەمەرەی لەوبابەتـەوە کـرد. جـاری یەکـەم کـە شـۆفیر ئوتووبووسێک لە کـاتی لـێخوڕینداڵەپـڕ کـوێر بـوو، سـەرەڕای کـوژراو و برینـدارێکی زۆر،

خەڵک بە پێی هۆیھەمیشەیی، یانی لە رووی عادەتەوە، سرنجێکی ئەوتۆیان نەدایەرووداوەکە و بەرپرسی پێوەندییە گشتییەکانی شەریکەی گەیاندن وگواستنەوە بە بێ عەزابی ویژدان کە هەڵبەت جێی داخ و کەسەرە، قسەیلێکرد و گوتی ئەو رووداوانە چەشنی راوەستانی دڵی کەسێ کەپێشینەی نەخۆشیی نەبووە و لەپڕ دڵی لە لێدان کەوتووە پێشبینیناکرێ. بەڕێوەبەری شەریکە شی کردەوە کە تەواوی کارگێڕانی ئێمە وئوتووبووسەکان لە وەختی دیاری کراودا بە وردی موعایەنە دەکرێن ودەستیان بە سەر و رووودا دەکێشرێتەوە و بێتوو بە شێوەی گشتیی رادەبڕین، بە سرنجدان بە پەیوەندیی نێوان هۆ و هۆکار دەبینین کە رادەیخۆلێکدان و وەرگەڕانی ئوتۆمبیلەکانی ئێمە زۆر کەم بووە. ئەم شیکردنەوە بە تام و خوێیە لە رۆژنامەکاندا چاپ کرا، بەڵام خەڵک لەوەیگرفتارتر بوون کە سرنج بدەنە خۆلێکدانێکی ئاسایی ئوتووبووس، هەرشتێک بێ خۆ لە تورمیز بڕین خراپتر نەبوو. سەرەڕای ئەوەش دوو رۆژدواتر تەواو هەر ئەو تورمیز بڕینە بوو بە هۆی وەدیهاتنی کارەساتێکیتر، بەڵام دنیا هەر ئەوەیە کە هەیە، دنیا شوێنێکە کە حەقیقەت بۆ ئەوەیبگاتە ئامانج زیاتر دێوجامە دەپۆشێ.

ئەو دەنگۆیە کەوتە سەر زمانان کە شۆفیرەکە کوێر بووە. جگەلەوەی کە ئەم راستەقینەیە بە خەڵک بسەلمێنن هیچ رێی دەرباز بوونێکنەبوو، ئاکامی ئەو کارەش خێرا خۆی نواند و لەوە بەدواوە ئیتر خەڵکسواری ئوتووبووس نەبوون، گوتیان پێیان باشترە خۆیان کوێر بنبەڵام کوێر بوونی یەکی دیکە مەرگیان بۆ نەکاتە دیاری. ماوەیەکی وایnەکێشا کە سێهەمین کارەساتیش بەم شێوەیە قەوما، بەڵام ئەوجارشۆفیر تەنیا بوو، ئەوە وای کرد ئەم قسە ئاسایی پەسندە بکەوێتە سەرزاران کە رەنگ بوو ئەو بەڵایە تووشی من هاتبا. ئەوانەی ئەو قسەیاندەکرد نەیاندەزانی هەتا کوێی وایە و چەندیان هەق بە دەستە. کاتێک دووفڕۆکەوان لە ناکاو کوێر بوون، فڕۆکەیەکی موسافیربەر سەرەوبن بووو هەر کەوتە زەوی تەقی و تێکوپێک شکا و هەر کەسی تێیدا بوو کوژرا،بەپێی ئەو زانیارییانەی پاشان لە قودووی رەش، تەنیا پاشماوەی ئەوکارەساتە وەدەست کەوتن، دەرکەوت کە فڕۆکەکە هیچ نوقسانییەکینەبووە. کارەساتێکی ئاوا گەورە ئیتر وەکوو خۆلێکدان و وەرگەڕانێکیئاسایی ئوتۆمبیل نەبوو، لە ئاکامدا تەواوی ئەو کەسانەی هێشتاسەبارەت بەم رووداوانە دڕدۆنگ بوون لە خەوی نەزانی راپەڕین ولەوەی بەولاوە دەنگی هیچ ماتۆڕێک نەبیسرا و هیچ تەگەرێکی گەورە وبچووک خولی نەخوارد. ئەوانەی لە پێشدا بە دەس تەنگەژەی ئامرازیهات و چۆ

کردنەوە جارِز ببوون، ئەو ڕێبوارانەی بە هۆی هات و چۆ وراوەستانی پەیتاپەیتای ئوتۆمبیلەکان نەیانـدەزانی چ بکـەن و چـۆن پـێلەبـەر پـێ بنـێن، ئـەو شـۆفیرانەی ناچـار بـوون چەنـد جـار دەوریساختومانێک خـول بـدەن هـەتا شـوێنێک بـۆ راوەسـتان بدۆزنـەوە و هـاوار وگلـە و گازندەیان دەگەییە تەشقی ئاسمان، بێ گۆمان ئێستا تێکرِایان رازیبوون. بەلاّم ئیتـر کـەس نـەما کە غەیرەتی لێخورِینی هەبێ، تەنانەت بۆشوێنێکی یەکجار نیزیک. ئوتۆمبیلەکان، لۆرییـەکان، ماتۆرِسکلیتەکان وتەنانەت دووچەرخـەکانیش تێکەلـّوپێکەلّ لـە سەراسـەری شـار پـرش وبـلاّو بوون. لە هەر شوێنێک ترس بە سەر هەستی خاوەنیدا زالّ ببووبەجێیان هێشتبوون، شاهیدی ئـەو قسەمان دیمەنی سەیر و سەمەرەیجەرِەسەقیلێک بوو کە ئوتۆمبیلێکی بە دمـەوە هەلّواسـیبـوو، رەنگە یەکەمکەسێ کە موقرایی داهاتبێ شۆفیری ئەم جەرِیسەقیلە بووبـێ، هەمووکـەس حالـّی پەرێشان بوو، بەلاّم وەزعی نابیناکان گەلێ تالّوتوون بوو،چونکە بە واتـەی مەنشـوور جێیـەکیان نەدەدیت هەتا پێی لێدابنێن. دیتنیخـەماوی کوێرەکـان کـە یـەک بـە دوای یـەکا لـە ماشـێنی بەرِەلّلا کراوهەلّدەنگووتن و دەکـەوتن و گوێزینـگ و زەنگـەیان رەش و شـینهەلـّدەگەرِا و هێندێکیان دەیانگوت داخوا کەسێک لێرە نیە دەستمان بگرێ،دلّتەزێن بوو. بەلاّم کەسـانێکیش هەبوون کە سرشتیان رەق وتەق بوو یـانلەبـەر ناهومێـدی وایـان لـێدەهـات و هـەر دەسـتێکی یارمەتی بۆ لایان درێژکرابا بـە تـوورِەیی خۆیـان لـێرادەپسـکاند و بـە تـووک و جنێـو بـەرەو پاشیاندەبردەوە. بەرم دە، هەر بەم زوانە نۆرەی تۆش دێت، پاشان ئەو کەسـەیدلّسـۆزی کـرد بوو سام دەیگرتو خێرا فیزمالّکی دەدایە و لە مژە کوێرەیسـپیدا ون دەبـوو، لێـرەدا شـەپۆلی ترسێک لە پـرِ هەلـّیدەگرت، ئەومەترسـییەی مێهرەبـانی تووشـی دەکـرد و رەنـگ بـوو چەنـد هەنگاو ئەولاترموقرایی داهاتبا.

پیرەپیاو ئاوای نەقلّ و نەزیلەکە داکووژاند، ئەوە بـارودۆخیدەرەوەیـە و تـازە مـن بـە زۆر شتانم نەزانیوە، تەنیا دەتوانم باسی ئەمرووداوانە بکەم کە بە چاوان دیتـوومن، لێـرەدا قسـەکەی بـرِی و تۆزێـکبـێدەنـگ بـوو و ئـاوای تێهەلـّیناوە، بـە چاوەکـانم کـە نـا، چونکـە تـەنیا چاوێکمهەبوو، ئیستا کە ئەویشم نیە، دەی ئێستاش هەمە، بەلاّم بۆ حالّی منفەرق ناکا، من قەت نەمپرسی تۆ بۆ لەجێی چاوبێنی رەش لە چاویشووشـە کـەلک وەرنـاگری، پـیرە گـوتی باشـە بۆچی، دیارە چونکە جوانترو خاوێنترە، دەکرێ وەک ددانی دەسکرد دەربێنی و بیشۆی و لە جێیخۆی بخەیەوە، بەلێ ئاغا، بەلاّم بفەرموو بزانم ئێستا کە هـەموو کوێربـوون جـا بـا چـاوی دەسکرد بکەنە چاویان و پێیەوە بگەرِێن چ فایدەیەکیهەیە. تۆ راست دەکەی بێ کەلکە. ئێسـتا

کە وا دیارە هەموو کوێر دەبین ئیتر کێ لەبیری جوانی و جوانی‌ناسیی و پاک و خاوێنی‌دایە، ئا بێژەبزانم دوکتۆر چ جۆرە پاک و خاوێنیکت بۆ ئێرە دەوێ، چاوپزیشک گوتی وێدەچێ تەنیا لە دنیای کوێرەکاندا هەموو شت وای بە سەر دێت کە بەڕاستی دەبێ وا بێ، کچەی چاویلکەیی پرسی دەی بەڵام خەڵک چی،خەڵکیش هەرواتر، کەس نامێنێ کە بیانبینێ، پیرەپیاو گوتی هەر ئێستافکرێکم بە مێشکیدا هات، وەرن کایە بکەین هەتا زەمان زوو تێپەڕێ، ژنی کوێرەپیاو گوتی وەختێک نابینین چۆن کایە بکەین، دەی کایەی راستی‌نا، هەر کام لە ئێمە ئاخرین دیمەنی بەر لە کوێر بوونی بگێڕێتەوە، یەکێک گوتی رەنگە ئینسان شەرم بیگرێ، هەر کەس نایهەوێ کایە بکا هیچ‌نەڵێ، گرینگ ئەوەیە کەس درۆ و دەلەسە تێک نەکاتەوە، دوکتۆری چاوگوتی تۆ وێنەیەک بگێڕەوە، پیرەپیاو گوتی بەڵێ باشە، من کاتێک لە چاوەکوێرەکەی خۆم دەڕوانی کوێر بووم، مەبەستت چیە، زۆر سادەیە، وامهەست کرد کە قاپێلکی چاوم هەڵماسیوە و چاوبێنەکەم دانا هەتا دڵم بحەسێتەوە و دروست لەم کاتەدا کوێر بووم، دەنگێکی نەناسیاو گوتی‌زۆرتر وەک حیکایەت دەچێ، چاوێ کە نەبوونی خۆی نەسەلماند. چاوپزیشک گوتی بەڵام من، من لەماڵەوە خەریکی خوێندنەوەی چەند کتێب و سەرچاوەی چاوپزیشکی بووم هەتا بزانم بەڕاستی چیە و چۆنە،ئاخرین شتێ کە بینیم دەستەکانم بوو. هاوسەری چاوپزیشک گوتی‌ئاخرین دیمەنێ کە من دیتم جیاوازی هەیە، خەریک بووم لە سوار بوونی‌نەخۆش‌بەردا یارمەتی مێردەکەم دەکرد، کوێرەپیاو گوتی من بۆدوکتۆرم گێڕاوەتەوە کە تووشی چ بەڵایەک هاتووم، بە ئوتۆمبیلەکەم لەپشت چرای سوور وێستابووم، پیادەکان بە بەرینایی شەقامدادەپەڕینەوە، دروست لەو کاتەدا کوێر بووم، پاشان ئەو پیاوەی پێرێمرد منی بردەوە ماڵ، هەڵبەت نەمدەتوانی روخساری ببینم، ژنی کوێرەپیاو گوتی من، من ئاخرین شتێ کە وەبیرم دێت دەسرەی دەستم‌بوو، لە ماڵ دانیشتبووم و ئەوەندە گریابووم دەتگوت دڵم خەریکەبتۆقێ، دەسرەکەم بەرەو چاوم برد و دروست لەو دەمەدا کوێر بووم،بەردەستەکەی دوکتۆر گوتی من تازە سواری ئاسانسۆر ببووم، دەستم‌درێژ کرد دوگمەکەی پاڵ پێوەنێم و لە نەکاو ئیدی هیچم نەدیت، دەتوانن‌ترسی من بێننە بەرچاو، تەک و تەنیا لە ئەسانسۆردا گیرم کردبوو،نەمدەزانێ دەبێ بچمە سەر یا خوار، ئەو دوگمەیەی دەرکەی دەکردەوەبۆم نەدۆزرایەوە، شاگرد دەواخانە گوتی هەل‌ومەرجی من ساکارتربوو، بیستبووم کە خەڵک کوێر دەبن، پاشان لە خۆم پرسی باشە ئەگەرمنیش کوێر بم تووشی چ حاڵێک دێم، چاوم نووقاند هەتا بە تاقی کەمەوەو کاتێک هەڵمهێنان کوێر بووم، هەر ئەو

دەنگە نەناسیاوە دیسانیش‌هەڵیدایە، ئەوەش هەر وەک حیکایەت دەچێ، ئەگەر بتەوێ کوێر بی،کوێر دەبی. تێکڕا بێ‌دەنگ بوون. نابیناکان ئیتر گەڕابوونەوە سەرتەختەکانیان، بەڵام ئەوەش کارێکی هێند سووک و سانا نەبوو، چونکەسەرەڕای ئەوەی ژومارەی تەختەکانی خۆیان دەزانی تەنیا دەیانتوانی‌لە سەرێکی ژوورەکەوە، لە یەک بەرەو ژوور یا لە بیست بەرەخواربژمێرن تاکوو دڵنیا بن گەیشتوونەوە تەختی خۆیان. وەختێک ورتەورتی‌ژماردنیان کە دەتگوت راز و نیاز و پاڕانەوەیە تەواو بوو، کچەی‌چاویلکەیی ئەو رووداوەی بە سەری هاتبوو گێڕایەوە، من لە وەتاغی‌هۆتێلێک وێڕای پیاوێ بووم، لێرەدا بێ‌دەنگ بوو، لە گێڕانەوەی ئەو کارەی دەیکرد شەرمەندە بوو، پاشان هەموو شتێکی بە سپی دیوە، بەڵام‌پیرەپیاو پرسی پاشان هەموو شتێکت بە سپی دیت، کچە وڵامی داوەبەڵێ، پیرەپیاو گوتی وێدەچێ کوێری تۆ و ئێمە جیاوازییان هەبێ. تەنیاکەسێکی مابوو کارەکەری هۆتێل بوو، من تەختی خەوێکم رێک‌وپێک‌دەکرد، یەکێک لەوێ کوێر ببوو، مەلافە سپییەکەم هەڵێنا و جوان لە سەرتەختەکە قەدم کرد و خەریک بووم گنجی لێ‌ببڕم کە ئیدی هیچم نەدیت،وەبیرم دێ چۆنم مەلافەکە ساف دەکرد، زۆر ئارام، ویدەچوو قسەکەی‌مانای تایبەتی هەبێ و درێژەی دا مەلافەی ژێرەوە بوو. پیرەپیاو گوتی‌داخوا هەموو بەسەرهاتی ئاخرین دیمەنێ کە دیویانە گێڕایانەتەوە،دەنگەی نەناسیاو گوتی ئەگەر ئیتر کەسێ نەماوە با منیش هی خۆم‌بگێڕمەوە، ئەگەر کەسێ مابێت دوای تۆ قسە دەکا، کە وایە دەس پێ‌بکە،ئاخرین شتێ کە دیتم دیمەنی تابلۆیەکی نەققاشی بوو، پیرەپیاوی‌چاوبێن لە چاو دووپاتی کردەوە تابلۆیەکی نەققاشی، دەی ئەم تابلۆیە لەکوێ بوو، چووبووم بۆ مووزەخانە، تابلۆکە دیمەنی مەزرایەکی‌گوڵەبەڕۆژەی پڕ لە قالاو و داری سەوڵ و هەتاوێک کە دەتگوت لە چەندکوتە هەتاوی دیکە ساز کراوە نیشان دەدا، وەکوو کاری دەس وپەنجەی نەققاشانی هولەندی دەچوو، لام وایە بۆچوونەکەم دروست‌بووبێ، بەڵام سەگێکیش خەریک بوو تێیدا دەخنکا، چارەڕەشە نیمچەخنکاو بوو، کە وایە دەبێ هی نەققاشێکی ئیسپانیایی بێ، بەر لەو هیچ‌کەس سەگێکی بەم دیمەنە نەهێناوەتە نێو تابلۆوە، دوای ئەویش هیچ‌نەققاشێکی تر غیرەتی ئەو کارەی نیە. رەنگە وا بێ، داشقەیەکی پڕ لە گیاو گۆڵ کە دوو بارگین رایاندەکێشا و لە جۆگەلەیەک دەپەڕییەوە، داخواخانووبەرەیەک لە لای دەستی چەپ دیار نەبوو، بەڵێ دیار بوو، کە وایەنەققاشێکی ئینگلیزی کێشاویەتێوە، رەنگە وا بێ، بەڵام من لە سەر ئەوباوەڕە نیم، چونکە ژنێکی مناڵ لە ئامێزیشی تێدا بوو، دایک و مناڵ لەزۆر تابلۆیاندا هەن، دروستە، منیش تیگەیشتم، بەڵام نازانم چۆن ئەم‌هەمووە وێنەیە لەم

هەمووە نەققاشانە لـە تابلۆیەکـدا کـۆ کراوەتـەوە، چەنـدپیاویش خـەریکی خـواردن بـوون، لـە مێژووی هونەرا زۆریان نەهار وعەسـرانە و شـام کردۆتـە تـابلۆ، ئـەم شـی کردنـەوە بـە تـەنیایی ناتوانیٚ لێمان‌حالّی بکا کیٚ خەریکی خواردن بووە، سێزدە پیاوە لێک گرد ببوونەوە،دەی‌دەی، ئەوجار قسەی لیٚ‌دەکریٚ، پاشان چی، ژنێکی رووتی قژزەردیش لە نێـو سـەدەفێکا لـە دەریـادا بوو، کۆمایەکیش گولّ دەوریان‌دابـوو، کـە وا بـیٚ، بـیٚ‌ونـەبیٚ ئیتالیـایی‌یـە، لـە لایـەک شـەڕ و پێک‌دادان خۆی‌دەنواند، بەڵام ئەو مەبەسـتانە تـەواو نـین بـۆ دۆزینـەوەی نەققاشـەکە،کوژراو و برینـداریش دیـار بـوون، شـتێکی زۆر ئاسـایی‌یـە، درەنـگ یـا زووهـەموو منالّـەکان دەمـرن، سەربازەکانیش هەرواتر، ئەسپێکیش‌رەویبۆوە، بیٚ‌گومان چاوی وا لـە ژیلّـلا هـاتبوون خـەریک بوون دەرپەڕن،راست وایـە، ئەسـپ هـەر وان، دەی چـی تـریش لـە نەققاشـییەکەی ئێوەدابـوو، موخابن زیاترم نەدیت، دروست کاتێک لە ئەسپەکەم دەڕوانی کوێربووم. کچـەی چاویلکـەیی گوتی ترس دەتوانیٚ ببیٚ بە هۆی کوێری، قسەلەوەی چاکتر نابیٚ، قەت چـاکتر نابـیٚ، بـەر لـەو کاتە کە کوێر بین کوێربووین، ترس کوێرمان دەکا، ترس بـە کوێریمـان رادەگـریٚ، دوکتـۆر گوتی‌ئەوە کێیە قسە دەکا، دەنگەکە وڵامی داوە پیاوێکی کوێر، تـەنیا پیـاوێکی‌کـوێر، چونکـە ئێمە لێرە لەوە زیاتر نین. پاشان پیرەپیاو پرسی چەند کوێرپێویستە هـەتا کـوێری پـەرە بگرێـت، کەس وڵامی ئەم پرسیارە نازانیٚ. کچەی چاویلکەیی داوای لـیٚ‌کـرد رادیۆکـە هەلّـبکا، رەنگـە جەنگەی‌هەوالّەکان بێت. هەوالّەکان تۆزیٚ درەنگتر بلاو کرایـەوە. هـەتا ئـەو کـات‌هێنـدێکیان گویٚ بۆ مووسیقی شل کرد. دوای تاوێک سەر و سۆراغی‌چەند کوێری دیکە لەبـەر دەرگـاوە پەیدا بوو، یەکیان گوتی زۆر حـەیف کەکـەس لـە بـیری نـەبوو گیتـاریٚ لەگـەلّ خـۆی بێنـیٚ. هەوالّــەکان هێنــدە خــۆش وهیــوادەر نــەبوون، دەنگۆیــەک بــلاو ببــۆوە کــە خەریکــە حکوومەتێکی‌یەک‌گرتووی رزگاری‌دەری گەلیی پێک بێت.

کوێری

لە سەرەتادا کە هێشتا کوێرە دەس‌بەسەر کراوەکـانی ئـەو بەشـە لـەرادەی قـامکی دەسـتان تێنەدەپەڕی، دەکرا بە دووسیٚ قسان غەریبەکانبنە شەریکی خەم و بـە سـیٚ چـوار قسـان هـەر تاوانێـک، هـەر چەنـد گـەورەو بنـەڕەتیش بووبـا، چاوپۆشـی لـیٚ‌دەکـرا، ئەگـەر لـیٚ‌بـووردنی تەواویش‌دەستی نەدابا تەنیا بە لەسەرخۆیی و تێپەڕینی زەمان گریٚ کوێرەکـان‌رەهـا دەبـوون و ئاو بە ئاگردا دەکرا، کەچی پاشان روون بۆوە کە ئەم‌بەخت وەرگەڕاوانە بۆ چوونـە ئاودەسـت

تووشی چ گیر و گرفتێکی پووچو بێمانا بوون. سەرەڕای ئـەو مەبەسـتە و ئەگـەرچی دەزانـین ئاکار وکردەوەی بێ کەم و کووڕی بە دەگمەنـە و تەنانـەت خۆپـارێز و خـۆ بـە کـەمزانتـرین مرۆڤەکانیش خاڵی کز و لاوازی خۆیان هەیە، دەبێ دان بەمەسەلەدا بێنین یەکەم کەسانێ کـە هێنایاننە ئێرە و دەس‌بەسەریان‌کـردن، کـەم و زۆر بـە وردبـینی و تێگەیشـتن و لـەخۆبوردوویی توانـایهەڵـگرتنی بـاری ئـەو خاچـەیان هـەبوو کـە سروشـتی چەپەڵـیی‌ساز لـە کۆڵـیبـەرەی ئادەمیزادی دەنا. ئێستا کە دووسەت و چل تەختەکە پڕ بۆتەوە وهێندێکیش بە ناچاری لـە سـەر هەرد دەخەون، هەر خەیاڵێ هەر چەندەورد و باریک و داهێنەریش بێ ناتوانێ رادەی پیسـی و چەپەڵی ئێرەوەسپ بکا. لێرەدا مەبەست تەنیا چۆنیـەتی وەزعـی ئاودەسـتەکان نیـە کـەزۆر زوو بوون بـە گـۆلاوی بۆگـەنیوی چەشـنی ئـاوەڕۆی دۆزەخـی پـڕ لـەرووحی تاوانبـاران، بەڵـکوو ڕێزدانەنانی تاقمێک لە هاوبەندان یان نیازیپێویستی لە نەکاوی دەستەیەکی دیکەیە کە ڕێڕەو و دالانـەکانیان کردەپێشـاو و ئـەو ئاکـارە لـە پێشـدا بـە هەڵـکەوت و نێوەنێـوە بـوو و ئێسـتا بۆتەشتێکی ئاسایی. مرۆڤی بێچاو و روو یا بێ واز لای وا بوو گرینگ نیە،خۆ کـەس نامبینـێ، کە وایە دوورتر نەدەکەوتەوە، کاتێـک تـازە بـە هـیچبارێکـدا چوونـە ئاودەسـت نـەدەگونجا، کوێرەکان بۆ ریان و هەڵڕشتنیباری ڕێخۆڵەکانیان پەنایان بردە حەوشە. ئەو کەسانەی بـەدەمار بوونیا دایک و باوکەکان بە رۆژ هەتا شەو خۆیان پێ رادەگـیرا، شـەویان بـەزەمانێک دەزانی کە زۆربەی دەس‌بەسەر کراوەکان خەوتبن، پاشانزگیان هەڵدەکوشی و لاقیان وێک دێنا و بە دوای یەک دوو بست زەویخاوێنا دەگەڕان، هەڵبەت ئەگـەر لـە سـەر مـافوورەی بـێ سـەر و بنیپیسایی پێشێل کراودا وەها شـوێنێک پەیـدا بووبـا، ئـەوەی بارودۆخەکـەیلـەوەش ئاڵـۆزتر دەکرد مەترسیی ون بـوون لـە دەشـتی بـەرینی حەوشـەدابوو، نیشـانگەی ڕێنـوێنی تـەنیا چەنـد دارێک بـوون کـە بـەژن و بالایـان لەپـەلاماری شـێتەکانی پێشـوو پـارێزرابوو، هـەر وەهـا ئـەو تەپۆڵـکانەی کەئێسـتا ڕێکـی تـەختی بـنی حەسـار بـوون و قسـەی خۆمـان بـێ تەرمەکانیاندادەپۆشی. رۆژێ جارێک، هەمیشـە بەرەبـەری تاریکـان، دەنگـی بڵێندگۆچەشـنی سەعاتێکی زەنگدار کە بۆ ئەم کاتە قورمیش کرابێ دەهاتە گوێو هـەر ئـەو وردە فرمایشـانەی پێشووی چەندپات دەکردەوە، زۆر پێداگربوو لە سەر کەلک وەرگرتن لە کەلوپـەلی پـاک و خاوێنی و وەبیریدێناوە کە هەر بەشێک تەلەیفوونێکی لێیە هەتا هەر کـات کـەلوپـەلی پـاک وخاوێنی تەواو بوو رایگەیەنن، بەلام ئەوەی بەڕاستی پێویست بوو،شیلانگێکی بـە قـەوەتی ئـاو بـوو کـە ئـەم هـەمووە گەنـد و گوویـە بشواتەوە،پاشـان پـۆلێکی لوولـەکێش دەویسـت هـەتا

سیفۆنەکان کەڵتە کەنەوە ووەکاریان خەنەوە، پاشان ئاو، ئاوێکی یەگجار زۆر تا پیسایی و چەپەڵی‌رابداتە شوێنی دیاری کراو، پاشان دەستم بە داوێنتان، چاو، جووتێک‌چاو، دەستێ کە بتوانێ رێنوێنیمان بکا، دەنگێ کە پێم بلێ بەم لایەدا برۆ،بێتوو خێرا نەگەینە فریای ئەو دەس‌بەسەر کراوە کوێرانە، هێندەی‌پێ‌ناچێ دەبن بە جانەوەر، جا لەوەش خراپتر جانەوەری کوێر. دەنگەنەناسیاوەکەی باسی دیمەن و نەققاشییەکانی ئەو دنیایەی کردبوو ئەم‌قسەیەی نەکرد، کەسێ کە لە ئاخری شەوا ئەم قسەیە دەکا بەڵام بەراوێژێکی تر خێزانی دوکتۆرە کە لە پەنا شووەکەی راکشاوە، سەریان‌لە ژێر پەتوویەک دایە، دەبێ فکرێک بۆ ئەو گەند و گوویە بکەینەوە، ئیدی‌خۆم بۆراناگیرێ و چی دیکە بە درۆ کوێرە کوێرەم بۆ ناکرێ، بیر لەداهاتووی درکاندنی ئەو رازە بکەوە، لێم سوورە دەتکەنە کەنیزی‌خۆیان، دەبی بە وەرگێڕکە و ئاڵقە بە گوێی هەمووان، دەخوازن شێو وخواردنیان بە زارەوە بکەی، بیانشۆی و حەمام‌نمیشیان کەی، بیانبەیەسەر تەخت و بەیانییان لە خەویان هەڵستێنی، وات لێ‌دەکەن بیانبەیە ئەولاو ئەم لا، کەپۆیان بگری و فرمێسکیان بۆ بسترِی، کاتێک نوستووی‌هەرات لێ‌دەکەن و ئەگەر درەنگ بچی و چاوەڕێیان کەی جنێوت‌پێ‌دەدەن، چۆن دەخوازی لە نێو ئەم گەلە کوێرە لێ‌قەوماوەدا بێم و بچم‌و بێ پسانەوە لەبەر چاوم بن و دەستی یارمەتییان بۆ درێژ نەکەم، هەتائێرە زۆرت یاریدە داون، باشە چیم بۆ کردوون، من کە هەمیشە هۆش وهەستم لە سەر ئەو مەبەستەیە کە کەسێ نەزانێ دەبینم، چونکە دەبینی‌هێندێک رقیان لێت‌دەبێتەوە، لات وا نەبێ کوێری ئێمەی کردۆتە مرۆڤی‌باشتر، خراپتریشی نەکردووین، بەڵام وردە وردە خەریکە خراپتر دەبین،تۆ وەختی دابەش کردنی شێو بێنە بەرچاو، بەڵێ وایە، بەڵام ئینسانێکی‌بینا دەبێ چاوەدێری بە سەر دابەشینی خواردندا بکا و بێ‌لایەن و ئاقڵبێ، جا ئەو کات کەس گلەیی نابێ، ئەو شەڕ و لێک‌دانە بێ براوانە مندەکێشنە جەغزی شێتی، تۆ نازانی کاتێک هەرای دوو کوێران دەبینم‌تووشی چ حاڵێک دێم، شەڕ و هەرا هەمیشە کەم و زۆر شێوەیەک کوێری‌بووە، بەڵام ئەوە جیاوازی هەیە، چیت پێ چاک و خۆشە بیکە، بەڵام لەیادت بێ ئێمە لێرە چین، کوێرین، کوێرکوێر، ئەو کوێرانەی قسەی جوان‌و دڵگر ناکەن و دڵسۆز نین، دنیای جوانی خێرخوازانەی منالانی هەتیوی‌کوێر براوەتەوە، ئێستا کەوتووینە نێو سنووری رق و بێ‌بەزەیی ودڵرەقی کوێرانەوە، ئەگەر بتزانیبا ناچارم دیمەنی چەندە تاڵ ببینم ئاواتت‌بۆ کوێری دەخواست، باوەڕت پێ دەکەم، بەڵام پێویست ناکا چونکە هەرئێستاش کوێرم، بمبوورە خۆشەویستەکەم، خۆزگە بتزانیبا، دەزانم،دەزانم، من تەمەنم بە چاو لە چاوی خەڵک بڕین

تێپەڕ کردووە، چاو تەنیائەنـدامێکی لەشـە کـە رەنگـە هێشـتاش رووحێکـی تێـدا مابـێ و بێتـوو ئەوچاوانە نەبن، سبەینێ پێیان دەڵێم کە کوێر نیم، هیـوادارم پەشـیماننەبییـەوە، سـبەی دەیڵـێم، تاوێک راما و پاشان درێژەی دا مەگین تا ئەوزەمان منیش ئاخری پێم نابێتە دنیای ئەوانەوە.

بەڵام هێشتا قەرار نەبوو وا بێـت. وەکـوو رۆژان بـەیانی کـە خەبـەری‌بوویـەوە، چاوەکـانی وەک هەمیشە دەیانبینی. تەواوی قەرەنتینەکراوەکان خـەوتبوون. سـەری لـێ‌شـێوا کـە چۆنیـان پێ‌بڵێ، داخۆ دەبێ‌هەموویان کۆ کاتەوە و هەواڵیان پێ‌بدا یا رەنگە باشتر بێ پتر پارێز بکاو بێ خۆ نواندن مەبەستەکە ئاشکرا کا، بۆ وێنە وەک ئەوەی بیهەوێ‌باسی هەڵکەوتێکی ئاسـایی بکـا بڵێ ئێوە بیهێننە بەر زەینی خۆتان، کێ‌هەر فکـری ئەوەشـی دەکـردەوە کـە لـەنێو ئـەو هـەموو ئینسانە کوێرەداکەسێک چاوی ساغ دەرچووبێ یا رەنگە وا باشتر بێ کە وا بنوێنێ هەربەڕاستی کوێر بووە و لە نـەکاو سـۆمایی چـاوی گەڕاوەتـەوە، ئەوەرێیـەکیش بـوو بـۆ هیـوادار کـردنی خەڵک. رەنگە بە یەکتر بڵێن ئەگەر ئەودەتوانێ سەرلەنوێ ببینێ، وێدەچێ ئێمەش بتـوانین، لـە لایەکی دیکەوەرەنگە پێی بڵێن ئەگەر وایە، دەی بۆ دەرەوە، دەی دەخـۆت هەڵـدە، کـەوایان گوتبا لە ولاما دەیگوت بێ مێردەکەی ناڕوا و چونکە سپا هیچ‌کـوێرێکی دەس‌بەسـەر کـراوی رەها نەدەکرد، دەبێ لێی‌گەڕێن لە جێی‌خۆی دامـەزرێ. بـڕێک لـە کوێرەکـان لـە جێگاوبانـدا دەگـەوزین و هـەر وەک‌هـەموو بـەیانییان دەتـرین. بـەڵام ئـەو کـارە کـەش و هەواکـەی بۆگەنترنەدەکرد، چونکە زۆر لەمێژ بوو ئەوێندەرێ بە بۆگەن مۆم درابوو. ئەوبۆنە ناخۆشە تـەنیا بۆگەنی نێوەنێوەی ئاودەستەکان نەبوو کـە ئینسـان‌دڵـی پێـی تێـک‌هەڵـدەهات، بەڵـکوو بـۆنی ئارەقەی لەشی دووسەت و پەنجاکەسیشی ئاوێتە کرابوو کە نە دەیانتوانی و نە دەیانزانی چۆن خۆیان‌بشۆرن، جـل و بـەرگ و سـەر و پۆتـڕاکیان رۆژ بـە رۆژ چڵـکی پترهەڵـدەگرت و لـەم تەختانـەدا دەخـەوتن کـە گـەلێ‌جـار خۆیـان تێـدا پـیس‌کردبـوو. کاتێـک شـێرە و ئاوپـڕژێنی گەرماوەکان خراپ بووبن و لە جێ‌هەڵکەندرابن، کاتێـک ئـاوەڕۆی ئاودەسـت و حەمامـەکان گیرابن و پیساوپۆنگی خواردبێتەوە و لووزەوی بەستبێتە تەختی بنی رێ‌ڕەوەکـان و بەقەڵـش و کەلێناندا رۆچووبێ، ئیتر سابوون و فاف و کەل و پەلی پـاک وخـاوێنی بەکـەلکی چـی دێـت. خێزانی دوکتۆر لە بیران راچوو، هەربەڕاستی مرۆڤ دەبێ چەندە شێت بێ کە خۆ لـەم کارانـە هەڵقوتێنێ،تەنانەت ئەگەر نەشـخوازن خزمـەتیان بکـەم، کـە بـێ‌گومـان دەخـوازن، دەبـێ‌هـەتا رووحم لەبەر دایە هەر خەریکی پاک و خاوێن کردنەوە و شۆردن‌بم و بەرگەش ناگرم، ئـەوە کاری یەک و دوان نیە. لە پێشدا کە تا ئەورادەیە سوور و پـێ‌داگـر خـۆی دەنوانـد، ئێسـتا کـە

دەبوو بازنەی قسانهەڵبڕی و بگاتە قۆناخی کردەوە، وردە وردە لە بەرامبەر ئەو راستەقینەتاڵەدا کە ئازاری دەدا سارد بۆوە. بە تووڕەیی لەبەرخۆیەوە گوتی منترسەنۆکم، باشتر وا بـوو کـوێر بم نەک ئەوەی چەشنی پڕوپاگەندەچیخوێڕی لێرولەوێ بیکەمە راوێچکە. سێ کوێر لـە خـەو هەستابوون،یەکێک لەوان شاگردی دەوافرۆش بوو، دەیانویست وێکڕا بڕۆنەسەرسەرا و شـێوی بەشی یەک وەربگرن. چونکە کـوێر بـوون نەدەکرابلـێن بـە یارمـەتی چـاوان خـواردن دابـەش دەکرێ، دەفرێک کەمتر یا زیاترو بە پێچەوانە، دیمەنی دڵازاری ژماردن و لـێتێـک چـوون و بژاردنەوە وگێژ بوون هەستی مرۆڤی دەژاکاند، یەکێ کە بەدگومانتر بوودەیهەویسـت زۆر ورد بزانێ ئەوانی تر چەندە شێو و خواردەمەنی لەگەڵخۆیان دەبەن، لە ئاخریدا دەبوو بـە دمەقاڵـێ، یەکێک پاڵی داویشت و بەناچار زللەیـەک دادەهاتـە ژنـە کوێرەکـان. ئێسـتا لـە بەشـی یەکـدا تـەواوی کوێرەکـان هەسـتابوون و ئامـادە و چـاوەڕێی بـەش وەرگـرتن بـوون، بـەتاقیکاری و ئـەزموونی ئـەم ماوەیـە رێـکوپێکێکـی تۆزێـک سـاکاریان بۆدابـەش کـردنی خـواردن دامەزراندبوو، چێشتەکەیان دەبردە بنەبانیژوورەکە، ئەو شوێنەی تەختی چاوپزیشک و خێزانی و هەروەها کچە وکوڕە خێلەکەی لـێبـوو، پاشـان هاوبەنـدەکان لـە رووی ژومـارەوە دوودوو دەچوون بۆ وەرگرتن، ژومارەی یەکی لای راست، ژومـارە یـەکیلای چـەپ، ژومـارە دووی راسـت، ژومـارەی دووی چـەپ و هـەتا دوایی،لـەو بەینـەدا نـە کـەس وێـکدەکـەوت و نـە قسەیەکی سارد و سووک دەهاتەگۆڕ، راسـتە درێـژەی دەکێشـا، بـەڵام پاراسـتنی هێمنایـەتی و ئارامیدنیایەکی دێنا، ئەوانەی پێشەوە کە خواردنەکـە لەبـەر دمیـان بـوو، دوایهـەموان بەشـیان وەردەگرت، هەڵبەت جگە لە کوڕەخێلە کە هەمیشە بەرلـە کچـەی چاویلکـەیی شـێوی خـۆی وەردەگرت و دەیخوارد، کـە وا بـوودایمودەرهـەم بەشـێک لـە چێشـتی کچەشـی لـوور دەدا. هەموو کوێرەکانسەریان بۆ لای دەرگا وەرسووڕاندبوو، بە هیوا بوون خێـرا گوێیـان بەهەسـتی پێی هاوبەندەکانیان بزرینگێتەوە، دەنگی پێـی ئـەو کەسـانەیچووبـوون بەشـە شـێو وەرگـرن و بگەڕێنەوە، بەڵام ئەوە ئەم دەنگەدڵخوازە نەبوو کە دەیانویست، بەلکوو دەنگی راکردنێکـی بـە لەز بوو،هەڵبەت بێتوو وەها شاکارێک بەم کەسانە کرابا کـە بـەرپێی خۆیـاننـەدەدیت. لەگـەڵ تەواوی ئەوانە کاتێک بە هانکەهانک لەبەر دەرگاوە پەیدابوونەوە تـازە بۆچوونەکـە قسـەی لـە سەر نەما. لە دەرەوە چ قەومابوو کـەوا سـەر لـێشـێواو گەڕابوونـەوە و هەرسـێک دەیانویسـت وێکڕا بێنـە ژوورهـەتا هەواڵـی چـاوەڕوان نـەکراو بگێڕنـەوە، یـەکیان گـوتی ناهێڵـن شـێوبێنینە ژوورەوە، دووەکەی تر ئۆباڵیان بۆ کێشا، بەڵێ ناهێڵن، چەند دەنگ‌تێکڕا پرسیان کێ رێ نادا،

سەربازەکان، نا کوێرەکان، کام کوێرەکان،ئێمە لێرە هەموو کوێرین، شاگرد دەواخانەکە گوتی ئێمە نازانین کێن،بەڵام دەبێ هی ئەو تاقمە بن کە وێکڕا گەیشتوونە ئێرە، یانی ئاخرین‌دەستە، چاوپزیشک گوتی دەی باشە بۆ نەیانهێشت خواردنەکە وەرگرن،خۆتا ئەورۆ کۆسپێکی ئاوامان لە سەر ڕێگا نەبووە، دەڵێن ئەوە تازەرابرد، ئەو بابتان مرد، لەوەی بەولاوە هەر کەس خواردنی دەوێ دەبێ‌پووڵەکەی بدا. لە هەموو شوێنی ژوورەکەڕا دەنگی نارەزامەندی بەرزبوویەوە، خۆ ئاوا نابێ، شێوی ئێمەیان فڕاندووە، دزیویانە، هەی دزانە،بەڕاستی بێ‌شەرمییە، جا وەرە کوێر بە دژی کوێر راست بێتەوە،هەرگیز بیرم نەدەکردەوە بە زیندی سەر رۆژی ئاوا تاڵ ببینم، دەبێ‌بچینە لای گرووبان بۆ سکالا. مرۆیەکی ئازا و چاونەترس پێشنیاری‌کرد تێکڕا بچن و هەقی خۆیان بخوازن، شاگرد دەواخانە گوتی کارێکی‌ئەستەمە، گەلێکن، لێم روونە دەستە و دەیارەیەکی زۆرن، بۆچارەڕشیان چەکداریشن، مەبەستت لە چەکدار چیە، یەکی تر گوتی لانی‌کەم کوتەک و چۆماغیان پێیە، هێشتاش جێی ئەو کوتەکەی لە دەستیان‌داوم دێشێ، دوکتۆر گوتی دەبێ بەتاقی بکەینەوە بزانین بەلەسەرەخۆیی چارەسەر ناکرێ، منیش وێڕای تۆ دێم تا وت‌وویژیان‌لەگەڵدا بکەم، رەنگە هەڵەیەک رووی دابێ، شاگرد دەوافرۆش گوتی بەڵێ‌راستە دوکتۆر، منیش هەر وای بۆ دەچم، بەڵام لە ئاکاریان‌ڕا وێناچێ‌قسەی حیسابی بسەلمێنن، هاوسەری چاوپزیشک گوتی ئەگەر واش بێت‌هەر دەبێ بچینە سۆراغیان، خۆ ئاوا نابێ، منیش وێڕای ئێوە دێم. ئەم‌تاقمە جگە لەو کەسەی لە ئێشی دەستی سکالای بوو کەوتنە رێ ووەدرکەوتن، ئەو هەستی دەکرد ئەرکی خۆی بەجێ‌هێناوە و دەبێ‌دانیشێ و رووداوە تاڵەکە بۆ ئەوانی تر بگێڕێتەوە، دوو هەنگاوێکمان‌مابوو بۆ نان و خوانەکە کە هەستمان کرد دیوارێکی ئینسانیی بەکوتەکان بەرگری لێ‌دەکا، ئەوان پێکەوە دەچوونە پێش و دڕیان بەوخەڵکەدا کە لە سەرسەرا ئاپۆرەیان دابوو، ژنی دوکتۆر بێ سێ‌ودووتێگەیشت کە هیچ وت‌وویژێکی لەبار و مەنتیقی بووز ناخوا و رەنگەهەرگیزیش نەکرێ و نەبێ. لە نێوەڕاستی سەرسەرا ئەو کوێرانەی‌خۆیان بە دار و کوتەک و شیش و میلەی ئاسنینی تەختان تەیار کردبوو،دەفرەکانیان دەورە دابوو و هاوبەندە نابیناکانی تریان دەخستە گێژاوی‌ناهومێدی، کوێرەکان جارجار راماڵێکیان دەبرد هەتا خەتی بەرگری‌سەربزێوەکان تێک‌شکێنن و هەرچۆنێک هەیە کەلێنی تێ‌بخەن، هێندێکیان‌بە دەست‌ومست زەبریان دەوەشاند و تاقمێکیش لە سەر چنگان دەخزین‌هەتا دەگەیشتنە پەرژینی پای دوژمنان، بەڵام بە زەبری شەپ‌پاشەکشەیان پێ‌دەکرا. بە واتای مەنشوور مست و شەپ ئەڵڵا بەختەکی‌دادەباری.

قریوەقریو و نەڕڕە و گرمە ولاتی هەڵگرتبوو، ئێمە نان وچێشتی خۆمان دەوێ، ئێمە حەقی خواردنمان هەیە، هەی بێ شەرەفینە،دابڕزن. هەر چەند رەنگە ئەو مەبەستە وەکوو شتێکی جێی باوەڕ نەیەتەبەر زەین، بەڵام ئینسانێکی فرەزان یان پەرێشانحاڵ گوتی بانگی پۆلیس بکەن، رەنگ بوو چەند پۆلیسیشیان لەگەڵ دابێ، وەک دەزانن کوێری کاری نەداوە بە سەر شوغڵ و پیشەوە، بەڵام پۆلیسێکی تووشی کوێری هاتبێ وەکوو پۆلیسێکی نابینای ئاسایی نیە و ئەو پۆلیسانەی کە ئێمەدەمانناسین مردوون و پاش کوێرەوەرییەکی زۆر گۆڕ کراون. ژنێکی کوێر بە هیوای ئەوەی رەنگە کاربەدەستان هێمنی و ئارامیی پێشووبگێڕنەوە و دادپەروەری دابین بکەن و ئۆخژنێک بێننەوە بەر خەڵکەکە، بەهەزار چەرمەسەری و راپسکان بە نێو ئاپۆرەکەدا خۆی گەیاندە بەردەرگای چوونە ژوورەوە و بە شێوەیەک کە دەنگی ببیسترێ قیژاندی بگەنە فریامان، ئەو پەست و بێ شەرەفانە دەیانهەوێ بەشە خواردنی ئێمە بە تالان بەرن. سەربازەکان خۆیان گێل کرد و وایان نواند کە هیچ نابیستن، پێشتر ئەو ئەفسەرەی بە شێوەی رەسمی سەردانی ئێرەی کردبوو بە وردی لەگوێی گرووبانی سرەواندبوو کە تەنانەت ئەگەرهاتوو یەکتریشان لەت وپەت کرد نەکەن خۆیان تێبگەیەنن، چاویان بێتەدەر. ژنەی کوێر وەکوو ئەو ژنە شێتانەی پێشتر لێرە بوون ئەوەندەی قیژە و هاوار کرد و خۆی رنییەوە کە لەبەر نائومێدییان گەیشتەسەرهەدی شێتی. سەرەنجام تێگەیشت پاڕانەوە و لالانەوەی بێهوودەیە،بێ دەنگ بوو، گەڕاوە ژوور هەتا لە گۆشەیەکی سەری بە هەنیسکانەوەهەڵقەندرێ، بەڵام چونکە رێی لێ گۆڕابوو زەبرێکی وەتۆقی سەری کەوت و یەک تەختە تخێڵ بوو. ژنی دوکتۆر دەیهەویست خێرا بگاتە فریای،بەڵام کوێر وا لێک هاڵابوون کە نەیتوانی پێ دەبەر پێی بنێ. ئەو کوێرانەی بۆ وەرگرتنی خواردن هاتبوون، نارێک وپێک خەریک بوون بڵاوەیان لێ دەکرد، هەستی رێ دۆزینەوەیان شێوابوو، یەکتریان وەبەر پێیان دەدا،دەکەوتن، هەڵدەستانەوە، دەکەوتنەوە، و تەنانەت تاقمێکیان هەوڵی هەستانەوەیان نەدەدا، ملیان دابوو، شەکەت و ماندوو، ژان تێزاو وخەماوی دم و چاویان رەحەرزی دەخشا و پاپۆکەیان دەخواردەوە. لەوکاتەدا خێزانی چاوپزیشک ترساو و بزرکاو دیتی کە یەکێک لەلاتولووتەکان دەمانچەیەکی هەڵکێشا و بە تووڕەیی رووی کردە حەوا. شریخەی گوللە لەتێکی گەورەی لە سپیکاریی میچەکە بەردایەوە سەرسەری خەڵکی خەجلاو. کابرای کەڵەگا نەڕاندی هەموو بێ دەنگ بن،بێ هەست، بێتوو کەسێک جیکەی لێوە بێ تەقە دەکەم، وەهەر کەس کەوت کەوت، پاشان ئیتر سریوەی لێوەنایا. کوێرەکان لە جێی خۆیان چەقین. کابرای چەکدار درێژەی دا، هەموو

بزانن کە تازە گووگەممەکەی برد، لەمڕۆ بەملاوە ئێمە شێو و خواردن دابەش دەکەین، ئەوەپێتان دەڵێم تازە کەس نەکا بچێ بە دوای نان و خوانا، ئێمە لەبەردەرگاوە نیگابان دادەنێین و هەر کەس لەم ڕێ و شوێنە لابدا خوێنیخۆی لە ئەستۆی خۆی، لێرە بەملاوە خواردن بە فرۆشتنە، هەر کەسمەیلی لە خواردنە دەبێ پووڵەکەی بدا. هاوسەری چاوپزیشک گوتیپووڵەکەی چۆن بدەین، کابرای کەڵەگا دەمانچەکەی لە دەستیداهەڵسووڕاند و نەڕاندی بێدەنگ. ئاخر یەکێک دەبێ قسە بکات، دەبێبزانین چ دەکەین و لە کوێ شێو وەردەگرین، داخوا هەموو وێکڕا بێین‌یان یەک یەک، یەکێک لە تاقمی دزەکان گوتی ئەو ژنە لە کێشە دەگەڕێ،بێتوو بیدەیە بەر گوللە نانخۆرێک کەم دەبێتەوە، ئەگەر دیتبام هەتا ئێستابە قوربانی گوللەیەکم کردبوو. پاشان لە هەمووانی ڕاخوڕی، خێرا وبێڕاوەستان بڕۆنە بەشەکانی خۆتان، کاتێک خواردنەکەمان هێنایەژوورەوە تەما دەگرین چ بکەین، ژنی دوکتۆر لە ولاما گوتی دەی باشەپووڵەکەی دەکا چەند، بۆ شیر و قاوە و بیسکویت دەبێ چەندە بدەین،هەر ئەو دەنگە گوتی بەڕاستی ئەو ژنەتیوە خۆی دەکا بە قوربانیفیشەکێک، ئەوی تر گوتی ڕاوەستە لێیگەڕێ، ڕاوێژی گۆڕی، هەربەشێک دوو کەسان دیاری دەکا هەتا کەلوپەلی باش و بەنرخی هەموانکۆ کەنەوە، پووڵ و خشڵ و جەواهێر، بازنە، ئەنگوستیلە، سەعات و هەرشتێکی هەیە یەکسەر بیهێنن بۆ بەشی سێی قۆڵی چەپ، ئێمە لەوێین، بائامۆژگارییەکی دۆستانەشتان بکەم، هەوڵ مەدن کڵاو بنێنە سەرمان،دەزانین لە نێو ئێوەدا کەسانێک هەن دەیانهەوێ شتە بەنرخەکانیانحەشار دەن، بەڵام دیسانیش دووپاتی دەکەمەوە، بێتوو فێڵ بکەنهەرگیز دەستتان بە نان ڕاناگا و ئەوکات ناچار دەبن ئەسکیناسەکانتان بجاون و مرواریيەکانتان قووت بدەن. پیاوێکی کوێر لە بەشی دووهەمیلای ڕاست پرسی ئێمە دەبێ چ بکەین، هەمووان وێکڕا بدەین یان هەرجارەی شتێکمان پێویست بوو بڕێکی بێنینە خزمەتتان، پیاوەی چەکداربە پێکەنینەوە گوتی وادیارە باش تێنەگەیشتوون، لە پێشدا پووڵ دەدەنپاشان شێو دەخۆن، ئەوەش هەر کات داوای خواردن بکەن و پووڵەکەیبدەن دەبێتە تێکەولێکە، باشتر وایە هەر چی لاتانە بیدەن و پاشان ئێمەشدەزانین دەبێ هەر جارەی چەندەتان خواردن بۆ دابین کەین، بەڵامدیسانیش دەیڵێمەوە نابێ هیچ شتێک بشارنەوە، دەنا خراپ دەبینن، جابۆ ئەوەی کەس گومان نەباتە بەر وتەکانی ئێمە ئەوەندە بزانن کە پاشهێنانی هەموو شتەکان تەواوی کەلێن و قوژبنان دەپشکنین، سەلالەورۆژەی پووڵێکی سووتاویشتان بەلاوە مابێ، ئێستا دەمهەوێدەستەوبەجێ ئێرە چۆل کەن. دەستی هەڵێنایەوە و فیشەکێکی تریتەقاند. بڕێکی

دیکه گێچ وەری. کابرا دزەی کەڵەگا گوتی تۆش لە یادت بێ کە هەرگیز دەنگت لە بیر ناکەم، خێزانی دوکتۆر وڵامی داوە منیش قەڵافەتت.

دەتگوت کەس سرنجی نەکەوتە سەر ئەو قسە بێ ڕێوجێیەی ژنێکی کوێر کە دەیگوت منیش قەڵافەتت فەرامۆش ناکەم. کوێرەکان لەڕێوەبڵاوەیان لێ کرد و بەرەو گەرووی دەرگای ژوورەکانی خۆیان گەڕانەوەو تاقمی بەشی یەکەم خێرا هاوبەندەکانی خۆیان لە ڕووداوەکە ئاگادارکردەوە، چاوپزیشک گوتی وا دیارە جگە لە مل داخستن وفەرمانبەرداری چارەیەکی دیکەمان نیە، گۆیا، تاقمێکی زۆرن وچەکدارن. شاگرد دەواخانە گوتی ئێمەش دەتوانین خۆمان تەیار کەین،بەڵێ بە لق وپۆپی داران بەو مەرجەی دەستمان بیانگاتییە یان چەندشیشە و میلەی ئاسنین لە تەختەکانمان بکەینەوە، هەڵبەت ئەگەر هێز وتوانامان بمێنێ، بەڵام لانی کەم ئەوان دەمانچەیەکیان پێیە، یەکێک گوتی من کە ئامادە نیم ئەوەی هەمە و نیمە بیدەم بەو دایک جندە کوێرانە،یەکی تر گوتی منیش هەرواتر، دوکتۆر گوتی هەلومەرجەکە ئەوەیە، جایان دەبێ هەر چی هەمانە لە دەستیان کەین یا کەس هیچ نەدا، خێزانی گوتی هیچ چارەیەکی دیکەمان نیە، تازە حاکم و دەسەڵاتداری ئێرە ئەوتاقمەن کە لە دەرەوەڕا بە سەرماندا سەپاون، هەر کەس نایهەوێ ماڵ وسامانی بدا مەیلی خۆیەتی، بەڵام چ خواردنی وەگیر ناکەوێ و نابێ چاوەڕوان بێ کە ئێمە بەشی بدەین، چاوپزیشک گوتی دەبێ هەر چی هەمانە کۆی کەینەوە و بۆیان بەرین، شاگرد دەواخانە گوتی باشە ئەوکەسانەی هیچیان نیە چ بکەن، دەبێ بەوەندە رازی بن کە خەڵک لە بەشی خۆیان دەیاندەنێیە، بە واتای مەنشوور هەر کەس لە قەدەر توانا و زگی خۆی. بێدەنگییەک وەشا و پاشان پیرەپیاو گوتی من بۆ ئەو کارەدوکتۆر پێشنیار دەکەم. پێویست بە دەنگ دان نەبوو، تەواوی بەشەکەرازی بوو. چاوپزیشک وەبیری هێنایەوە کە پێویستە دوو کەس بن وپرسی کێ بە دڵخواز حازرە، کوێرەپیاو گوتی بێتوو هیچ کەس نەبێ منئامادەم. زۆر باشە کە وایە دەس دەکەین بە کۆ کردنەوەی توورەکەی لایلۆن، جانتا و چەمەدان، هەر چی لەو بابەتە لاتان هەیە بە کەلک دێت،خێزانی دوکتۆر گوتی ئێستا دەتوانم ئەوەی لە کۆڵ خۆم کەمەوە و خێرادەستی کرد بە بەتاڵ کردنی ئەو جانتایەی کەلوپەل و شڕوشاڵاتی خۆجوان کردنی تێدا بوو، یانی وادیارە دەرباز بوون لەم تەنگەژەیە دەسنادا. لە نێو ئەم سووراو و سپیاو و شڕوشاڵاتانەی خۆ تیفتیفەدانی خواپێداواندا مقەستێکی درێژی نووک تیژیش دەبرووقایەوە. لەبیرینەمابوو کە هەڵیگرتبێ. بەڵام ئێستا بەلایەوە بوو. خێزانی دوکتۆر سەریهەڵێنا. کوێرەکان چاوەڕێ بوون،

مێردەکەی چووبووە لای تەختی کوێرەپیاو و قسەی لەگەڵا دەکرد. کچەی چاویلکەیی بە کوڕە خێلەی دەگوت بەو زوانە خواردن دەگاتە دەستمان، پارچەیەکی پانکەڵەی خوێناوی لەژێر پێچکەی مێزێکی پەنا دیوار حەشار درابوو، دەتگوت کچەی چاویلکەیی دەیەویست بە شەرم و شکوایەکی کیژانەی بێجێ لەبەر چاوی ئەوکەسانەی بشارێتەوە کە موقرابیان داهاتبوو. ژنی دوکتۆر لە مقەستەکە راما، لە بیران راچوو کە بۆچی ئاوها تێی راماوە،چلۆن، ئاوا، بەلام بەڵگەیەکی گیر نەکەوت، باشە مقەستێکی درێژی برووقەداری نووک تیژ چی پێ دەکرا، شووەکەی پرسی ئامادەیە، ولامی دایەوە بەڵێ فەرموو، جانتا بەتاڵەکەی بۆ لای راداشت و دەستەکەی تری بۆ شاردنەوەی مقەستەکە لە پشت خۆی گرت، مێردەکەی گوتی شتێک رووی داوە، خێزانی گوتی نەخێر، زۆر سادە دەیتوانی بڵێ شتێک نەقەوماوە کە تۆ بتوانی بیبینی، رەنگە بڕێکم دەنگ گۆڕابێ و هیچی دیکە. دوکتۆری چاوان وێڕای کوێرەپیاو بۆ لای هات، جانتاکەی بە دوو دڵی لێ وەرگرت و گوتی هەر چی هەتانە ئامادەی کەن، دەمانهەوێ کۆیان کەینەوە. خێزانی دەسبەندی سەعاتەکەی خۆی و شووەکەی کردەوە،گوارەکانی، ئەنگوستیلەیەکی جوانی نەقیمەدار و ملوانەکە زێڕەکەی دانا،کلکەوانەی زەماوەندی خۆی ومێردەکەی زۆر بە هاسانی لە قامکان داماڵی، بە خۆی گوت ئەنگوستمان باریکتر بوون و پاشان ئەوەندەپووڵەی بوویان هەمووی وێکڕا خستە جانتاکەوە و گوتی ئەوەش ئەوەی هەیە و نیە، چاوپزیشک گوتی دڵنیای، چاک بڕوانە، روانیم هەمووی هەرئەوەندە بوو. کچەی چاویلکەییش تەواوی سامانی خۆی دانابوو،فەرقێکی وای لەگەڵ سامانی خێزانی دوکتۆر نەبوو، لە جێی بازنەیەک دووی هەبوون، بەلام کلکەوانەی زەماوەندی نەبوو. ژنی چاوپزیشک راوەستا هەتا مێردەکەی و کوێرەپیاو وەرسووڕێن و کچەش دابێتەوەسەر کوڕە خێلە و بڵێ وای دابنێ کە من دایکتم، من لە جێی هەردووکمان پووڵ دەدەم، پاشان رووی کردە دیواری بنەبانی ژوورەکە. ئەوێش وەکوو دیواری تەواوی بەشەکان بزماری زلی لێ داکوترابوو، بێ گومان زەمانی خۆی شتەکان شڕوشالاتی باش و خۆشەویستیان پێداهەڵواسیبوو. سەری بەرز کردەوە و قۆڵی کێشا و ئەوەندەی دەستی دەگەیشتێیە بزمارێکی دۆزییەوە و مقەستەکەی پێداکرد. پاشان لە سەرتەختەکەی رۆنیشت. شووەکەی و کوێرەپیاو وردە وردە خەریکی کۆکردنەوەی سەروەت و سامانی کوێرەکان بوون، هێندێک رادەخوڕین کەزۆر بێ شەرمانە تالان دەکرێن، هەڵبەت ئەوە راستەقینەیەکی حاشاهەڵنەگر بوو، تاقمێک بە شێوەیەکی سارد و سڕ لە شتومەکی گرانبایی خۆیان دەبوورین، دەتگوت

ئەگەر بێتوو هەموو لایەنەکان لەبەر چاوبگرین شتێک لەم دنیایەدا نیە کە تەواو هـی ئێمـە بێـت، دیارە ئەوەش‌ڕاستەقینەیەکی زۆر روون و ئاشکرا بوو. پاش کۆ کردنەوە، هەر کەگەیشـتنە بـەر دەرگا دوکتۆر پرسی داخوا تەواوی شتە هێژاکـان دراون بەئێمـە، چەنـد دەنگـی تەسـلیم کـراو ولامیان دایەوە بەڵێ، هێندێک تەمایانگرت متەق نەکـەن، دیـارە وەخـتی خـۆی دەزانـین کـە ئـەوە بـۆ خـۆ پاراسـتن‌لـە درۆ کـردن بـووە یـان نـا. خێـزانی چاوپزیشـک لـە مقەسـتەکەی روانی،سەری سوڕما، باشە ئەوە چۆن گەیوەتە ئەو سەرە، دەتگوت خۆی‌هەڵێنەواسیبوو، پاشـان بیری کردەوە کە چەند چاکی کردووە هێناویتی،ئێستا دەیتوانی ریشی شـووەکەی هەڵـپاچێ و جوانتری کـا، چونکـە هـەروەک دەزانـین ژیـان لـە هـەل‌ومـەرجی ئـاوادا رێ لـە خـۆ خـاوێن کردنەوەی‌ئاسایی پیاوان دەگـرێ. کاتێـک سـەرلەنوێ روانی. تـاپۆی دوو پیـاوی دیـت‌کـە لـە تاریکایی رێڕەودا ون بوون و بەرەو بەشی سێ دەچوون هەتاهەقی خواردنەکـە بـدەن. هـەقی خواردنی ئەورۆ و سبەی و رەنگە هـەتائاخری حـەوتووش، پاشـان چـی، ئـەم پرسـیارە ولامـی نەبوو، هەر چی‌بوومان دامان لە خواردن.

لەوپەڕی سەرسوڕماندا و بە پێچەوانەی هەمیشە رێڕەو قەرەباڵغ‌نـەبوو، بـەلام بـا لـە بیرمـان نەچێ و وەیادی بێنینەوە کە تا هات و چـۆی‌دەس‌بەسـەر کراوەکـان زیـاتر دەبـوو، نـۆچ‌دان و تێک‌هەڵەنگووتن و کەوتن‌پتر خۆی دەنواند، ئەوانەی زۆرتریـان ئـێش پـێ‌دەگـەیی و تووشـی خەسـارو زەبـر دەبـوون جنێـوی زۆر ناحـەزیان دەدا و زەبـر وەشـێنەکان دووقـات‌تۆڵـەیان دەکردەوە، کەچی کەس سەرێکی ئاوای پێوە نەدێشاند، مرۆڤ‌دەبێ بە جۆرێـک رقـی خـۆی برێژێ، بە تایبەتی کە کوێر بێ. تۆزێک‌لەولاتر هەستی پێ و زەنا زەنـا دەهاتـە گـوێ، رەنـگ بوو کە هەڵبژێراوانی‌بەشەکانی دیکەش خەریک بووبن دەستووراتی گەندەپیاوان بەڕێوەبـەرن، کوێرەپیاو گوتی سەیر تووشی گێچەڵ بووین دوکتۆر، دەڵێی‌کوێریمان بـەس نـەبوو کـە ئێسـتا کەوتووینە تەڵەی دزانی کوێرەوە، دەڵێی‌ئەوە لە چارەی من نووسراوە، لە پێشدا دزی ماشێن و ئێستاش ئەوبێ‌دایک و باوکانە بـە کەڵـەزەرِی نـان و پێخۆرمـان دەدزن، تـەنیا فـەرقی‌لەوەدایـە ئەوانە دەمانچەیان پێیە، بەلام خۆ فیشەک هەتاهەتا بەش ناکا،هیچ شتێک هەتاهەتایی نیە، بـەلام لێرە وا باشە فیشک تەواو نەبێ، بۆچی،ئەگەر تەواو بێ مانای وایە کەسێک تەقانـدوونی و هـەر ئێستاش‌کەلاکێکی زۆرمان لە سەر دەستی ماوەتەوە، خۆراگریمان دژوارە،لەوەتی هاتوون هـەر وا بووە و پێی‌ڕاهاتووین، دوکتۆر تۆ گەش‌بینی، ناگەش بین نـیم، بـەلام جـارێ لـەوە تاڵـتر بـە زەینمدا رانابرێ، بەڵێ، بەلام من‌لام وایە شەڕ و گێچەڵ و چارەڕەشی سنووری بۆ نیە، دوکتـۆر

گوتی‌ڕەنگە هەق بە تۆ بێ و پاشان وەک ئەوەی لەگەڵ خۆی قسان بکادرێژەی دا دەبێ لێرە ڕووداوێک بقەومێ، ئاکامێکی ئەوپەڕە و پەڕ، یانباروودۆخەکە لەوە خراپتر بێ یا لێرە بەو لاوە باشتر بێ، ئەگەرچی‌ڕووداوەکان بە پێچەوانەی بۆچوونی ئاخر خۆیان دەنوێنن. باوی‌هەنگاویان خۆش و یەک‌هەوا بوو، لە چەند لابەلایان پێچیان کردەوە هەتالە بەشی سێهەم نیزیک بوونەوە. هەتا ئێستا نە چاوپزیشک و نەکوێرەپیاو نەیانوێرابوو بێنە ئێرە، بەڵام دووقۆڵی ساختومانەکە وەک‌یەک ساز کرابوون و هەر کەس خوارەکە و پێچەکەی لای ڕاستی‌پێ‌زانیبا بۆ لای چەپ تووشی زەحمەت و کوێرەوەرییەکی ئاوا نەدەهات‌و دیارە بە پێچەوانەی ئەوەش دووپات دەبوویەوە، لەم قۆڵەی دەبوو بۆلای چەپ بڕوا لە قۆڵەکەی تر دەبوو ڕوو بکاتە دەستی ڕاست. دەنگەدەنگێکیان بیست، ڕەنگ بوو دەنگی ئەو کەسانە بێت کە بەر لەوان گەیشتبنە جێ، چاوپزیشک بە سەبرا گوتی دەبێ تاوێک ڕاوەستین،بۆچی، ئەوانەی لەو بەشەدان دەیانهەوێ بە وردی بزانن کەهاوبەندەکان چیان بۆ هێناون، ئەوانە هێندەی فەرق پێ‌ناکەن، زگیان‌تێرە و ئاگایان لە برسی نیە، ڕەنگە ئێستا وەختی نێوەڕۆ کردن بێ،تەنانەت ئەگەر دیتباشیان جیاوازییەکی ئەوتۆی نەدەکرد، چونکەهیچیان سەعاتیان پێ‌نەماوە بزانن چ فەسڵی ڕۆژە. چارەگێک دواتر، بەدەقیقەیەک ئەملا و ئەولاوە، سات و سەودای سەربەسەر تەواو بوو. دوو پیاو بە بەر دمی دوکتۆر و کوێرەپیاوا ڕابردن، لە قسەکانیان‌ڕاوادیارە بوو خواردنیان پێیە، یەکیان گوتی وریا بە هیچ شتێک نەڕێژی وئەوی تر هەر بۆڵە بۆڵی بوو، پێم‌وانیە ئەوەندە خواردنە بەشی هەموانبکا. دەبێ تەنگە لە خۆمان توند کەین. دوکتۆر لە سەر دیوار دەستی‌دەکوتا و کوێرەپیاو هەنگاو بە هەنگاوی لە پشتەوە دەڕۆیشت، ڕۆیی‌ڕۆیی هەتا دەستی گەیشتە لاشیپانەی دەرگای بەشی سێهەم، پاشان‌هاواری کرد ئێمە لە بەشی یەکی قۆڵی ڕاستەوە هاتووین. وای نوانددەیهەوێ هەنگاوێک بەرەو پێش بنێ، بەڵام قاچی لە شتێک هەڵنەگووت. تێگەیشت تەختێکیان لەبەر دەرانەی دەرگاوە داناوە و کردوویانەتەشوێنی ئاڵ و وێر، لە دەروونی خۆیا گوتی ئەوانە تەکووزیان داوە بەکاروباریان، ئەو کارانە بە شەوێک و دوان ناکرێن، هەستی پێ ووت‌ووێژی بیستن، ئەوانە چەند کەسن، خێزانی گوتبووی دە پیاون، بەڵام‌دوور نیە زیاتریش بن، ڕەنگ بوو وەختی نان و پێخۆر وەرگرتن وێکڕانەهاتبن. سەرکردەکەیان هەر ئەو کەسە بوو کە دەمانچەی تەقاند، ئێستاهەر خۆی بوو کە بە ڕاوێژێکی گاڵتاوی دەیگوت، دەی وەرن بزانم بەشی‌یەکی قۆڵی ڕاست چیان بە دیاری بۆ ناردووین، پاشان بەم کەسەی‌ڕەنگ بوو لە پەنا دەستی وێستابێ بە دەنگێکی نەرمتر گوتی

بنووسە،چاوپزیشک سەری سوڕما، ئەو خوێڕییە مەبەستی لەو قسەیە چ بوو، کەوایە لێرە کەسێک هەیە کە بتوانێ بنووسێ، یەکێک کوێر نیە، کە وایە ئەوەبوو بە دوو، بە خۆی گوت دەبێ زۆر پارێز بکەین، ڕەنگە ئەو بێشەڕەفەلە نەکاو لێمان پەیدا بێ و ئێمە ئاگامان لێنەبێ، بیری کوێرەپیاویش کەمو زۆر هەر ئەوە بوو، سیخوڕێک و دەمانچەیەک لە بنەمان دێنن وکۆڵەمان دەکوتن، تازە هەر ناتوانین سەر هەڵێنین. ئەو کوێرەی لەژوورەوە بوو. یانی سەرکردەی دزەکان، جانتاکەی کردەوە و بە دەستیقوژبن پشکن و شارەزای پووڵ و کەلوپەلی بەنرخ و هێژای لێک جیادەکردەوە، دیارە بوو بە دەس لێدان دەیتوانی بلێ کامە هەو نیە،هەروەها بە دەس لێدان نرخی پووڵەکانی دەزانی، ئەو کارە بۆئادەمیزادێکی بە ئەزموون زۆر هاسانە، ماوەیەک کە رابرد چاوپزیشکدەنگێکی ئاشنای هاتە گوێ، وا دیار بوو کەسێک لەو نیزیکانە بە خەتیبرێیل دەینووسی، دەنگی قەڵەمی تایبەتی کە لە سەر کاخەزی ئەستوورشەقڵی دادەنا و کرتەی دەهات ئارام و ئاشکرا دەبیسترا. کە وایە ئەوگەندەپیاوانە کوێرێکی ئاساییشیان لەگەڵە، مرۆڤێکی کوێر کە چەشنیهەمووان پێی دەگوترا کوێر، دیار بوو ئەو چارەڕەشە بە رەش بگیردەسبەسەر کراوە و رایانداوەتە ئێرە، بەڵام ئێستا وەختی کەندەوکۆژەنەبوو کە داخوا تازە کوێر بووە یا گەلێ ساڵ لێرەوبەر. چەپەڵکاران بەختیان بەکار بوو. چونکە نەک تەنیا خاوەنی میرزایەکی کۆنەکار بوون،بەڵکوو لە کێبەرکێی ژیانا رێنوێنێکی کارامەیان بردبۆوە، کوێرێکی تاڵیو سوێری ژیانی کێشابێ یەک پارچە زێڕە، هەر بەڕاستی خاڵوارێکئاڵتوون دێنێ. هەر وا سیایی شتەکانیان هەڵدەگرتەوە، ملهوڕی چەکدارجارجارە راوێژێکی لەگەڵ کابرای سەرحیسێب دەکرد، بڕوات سەبارەتبەمە چیە، حەساودارەکە دەستی لە کار دەکێشایەوە بۆ ئەوەی بڕوایخۆی دەربڕێ، ئەوە شتێکی بەدەڵی هەرزانە، ئەگەر وایگوتبا کابرایچەکدار دەیگوت بێتوو شتی وا زۆر بێ خۆیان قووتبڕاو دەکەن وئەگەر گوتبای بەڕاستی شتێکی چاک و بێوێنەیە، کابرای ملهوڕ ئاوای لەسەر دەڕۆیی، مامەڵە لە تەک ئینسانگەلی دروستکار بێوێنەیە. لەئاخریدا سێ دەفری گەورەی شێوەیان لە سەر تەختەکە دانا،سەرکردەی چەتەکان گوتی هەڵیگرن. چاوپزیشک ئەژماردنی، ئەوە زۆرکەمە، کاتێک خۆمان خواردنمان وەردەگرت چوار دەفری گەورەیاندەدایێیە، دروست لەو کاتەدا هەستی بە لوولەی سارد دەمانچە لە سەرملی کرد، ئەو نیشانە گرتنە بۆ مرۆڤی کوێر بێ نوقسان بوو، هەر لەسەری برۆی دەفرێکیان دەگێڕمەوە، بڕۆ دەخۆت هەڵدە، ئەوانە هەڵگرەو شوکری خودا بکە کە هێشتا شتێکت بۆ خواردن گیر

کەوتووە. دوکتۆرورتانـدی، زۆر باشـە و دوو دەفـری گـەورەی دەس دایـە و کوێرەپیاوئـەوی تری هەڵگرت و چونکە ئەوجار باریان قورستر بوو بە ئـارامی وپـارێزەوە گەڕانـەوە. وەختێـک گەیشتنەوە سەرسـەرا و زانیـان کەسـیان بـەدەورەوە نیـە، دوکتـۆر گـوتی تـازە قـەت هـەلی وا هەڵناکەویٚ، کوێرەپیاوپرسی مەبەستت چیە، دەمانچەکەی لە سەر ئەستۆ راگرتم، دەمتوانیپڕی پێداکەم، ئەو کارە زۆر پڕ مەترسیی بوو، پێموانیە، من دەمزانیدەمانچەکە لە کوێیە، بـەڵام ئـەو نەیدەزانی دەستەکانی من لە کوێن،ئەگەریش بیزانیبا پێمواية لـەو دەمـەدا ئـەو لـە مـن کـوێرتر بوو، حەیف کەبیرم لیٚنەکردەوە یان بیریشم لیٚکردەوە بەڵام نەموێرا، کوێرەپیـاو پرسـیپاشـان چـی، مەبەسـتت چیـە، وای دابنـێین دەمانچەکـەت لـیٚدەسـتاند، لامواتیـە توانیبـات کـەلکی لـیٚوەرگـری، بێتـوو لـێم روون بایـە گیروگـرفتی ئێمەچارەسـەر دەکـا بـۆچی کـەلکم لیٚوەرنەدەگرت، بەڵام چما لێت روون نیە،نەخێر بەڕاستی لێم روون نیە، کـە وایـە باشـترە هـەر لای خۆیـان بێـت، یـانیبێتـوو دژی ئێمـە دەکـاری نـەهێنن. هەڕەشـە کـردن لـە کەسـیٚ بـە چەکوەکوو پەلامار بۆ بردنە، ئەگەر دەمانچەکەت فڕاندبا شەڕی بەڕاستیدەستی پیٚدەکـرد و زۆر وێدەچوو ئێمە بە زیندوویی رزگاریمان نەبووبا،چاوپزیشک گوتی تۆ راست دەکەی، مـن وای دادەنێم کـە ئـەو بـیرەم زۆرکردۆتـەوە، دوکتـۆر نابـیٚ لـە یـادت بچێتـەوە کـە ماوەیـەک لەمەوبـەر چیـتپـیٚگـوتم، چیـم گـوت، گوتـت دەبـیٚ رووداوێـک بقـەومیٚ، قـەوما، بـەڵام مندەرفەتم لیٚنەهێنا، دەبیٚ رووداوێکی دیکە بقەومیٚ نەک ئەوە.

کاتێـک گەڕانـەوە بەشـەکەی خۆیـان و نـان و پێخـۆرە کەمەکـەیان لەسـەر مێزێـک دانـا، هێندێک سەرکۆنەیان کردن کە بۆچی بۆ وەرگرتنیبەشی زیاتر نارەزامەندییان دەرنەبڕیوە، بـۆ چمـا هـەر بـۆ ئـەم مەبەسـتەنەبوونە نوێنـەر. پاشـان دوکتـۆر رووداوەکـانی گێـڕاوە و باسـی میرزایکوێر و کردەوەی دزێوی کابرای ملهوڕ و دەمانچەکـەی بـۆ کـردن. ناڕازییـەکان دوای بیستنی رووداوەکە بیٚدەنگەیان لیٚکرد و قبووڵیانکرد کـە بەرژەوەنـدی ئـەو بەشـەیان داوەتـە دەس مرۆڤی لـیٚوەشـاوە. سـەرەنجام خـواردن دابـەش کـرا، هێنـدێک خۆیـان پـیٚرانـەگیرا و وەبیرتـاقمی تـووڕە و بـیٚحەوسـەلەیان هێنایـەوە کـە خـواردنی کـەم چـاترە لـە هیچ،هـەروەها وێدەچیٚ ئێستا وەختی نیوەڕۆ کردن بێت، یەکێک گوتی خراپترلە هەموو شتێک ئەوەیە وەک ئەو ئەسپە مەنشوورەمان لـیٚبـیٚ کـە کاتێـکئیشـتای کـوێر بـۆوە تـۆپی. ئـەوانی دیکـە بـەحاڵ زەردەیان هاتێیە و یەکێکیتر گوتی ئەگەر ئەو قسە دروست بیٚ کـە ئەسـپ لـە وەخـتی مردنـا ئاگای لەمەرگی خۆی نیە، هێندەش خراپ نیە.

پیرەپیاو دەیزانی کە رادیـۆ بچکۆلانەکـەی هـەم لەبـەر ئـەوەی زۆرناسـک سـاز کـراوە و هەمیش هێندە دەوام ناکا، بۆ ئەوە نابێ بێتە ریزی کەل‌وپەلی هێژا و بدرێ بـە خـواردن، چونکـە رادیۆ کاتێک بە کار دێت کەباتری هەبێ و باتریش ئیش بکا. بەو خش و هۆڕەی لێـی‌دەهـات دیار بوونەدەکرا زۆری دڵ پێ‌خۆش بکرێ. هەر بۆیە پیرەپیاو تەمای گرت‌رادیۆکە بۆ کـەلکی گشتیی هەڵنەکا، بە تایبەت کە رەنگ بوو قەرەنتینەکراوەکانی بەشـی سـێی لای چـەپ لەپـڕێ پەیدا بن و بە شێوەیەکی دیکەی‌لێک بدەنەوە، هەڵبەت نەک بە بۆنەی قیمەتەکەی کە دەزانین لەدرێژماوەدا هەر وەبەر چاو نایە، بەڵکوو بە بۆنەی بایخی کاری ئێستای‌کە دەزانـین بـەرچاوە، جگە لەوەی کە زۆر وێدەچێ ئەو شوێنەی لانی‌کەم دەمانچەیەکی لێیە چەند باتریشـی لـێ‌بـێ. هەر بۆیە پیرەپیاو گـوتی‌لێـرە بـەولاوە بـەدزی لـە ژێـر پـەتوودا گـوێ دەداتـە رادیـۆ و ئەگـەر هەواڵێکی‌خۆشی بڵاو کردەوە خێرا مزگێنی دەدا بە هەموان. کچەی چاویلکەیی‌داوای لێ‌کـرد لێی‌گەڕێ جار جار گوێ بداتە مووسیقی هەتا هەوا وئاهەنگەکان فەرامۆش نەکا، بەڵام پیرەپیاو ملی نـەدا و لـە سـەر ئەومەبەسـتە سـوور بـوو کـە گرینگتـرین بابـەت لـەو زەمانـەدا وەدەسـت هێنانی‌هەواڵەکانی دەرەوەی ئێرەیە، هەر کەس خوازیاری مووسـیقی بێـت‌دەتوانـێ لـە زەیـنی خۆیدا چەن‌پاتیان کاتـەوە، ئـاخر بیرگـەش دەبـێ کـەلکی‌دروسـت و پێویسـتی لـێ‌وەرگـیرێ. پیرەپیاو هەقی بوو، مووسیقای‌دلازاری رادیۆ پێشبڕکەی هەزاران بیرەوەری تاڵـی دابـۆوە، هـەر بۆیەدەنگی رادیۆکەی زۆر کەم دەکردەوە و چاوەڕوانی هەواڵەکان‌دەمایەوە. پاشان هێنـدێکی دەنگ بەرز دەکـردەوە و بـە وردی گـوێی دەدایەهـەتا وشـەیەکیش لـە کـیس نـەچێ. پاشـان هەواڵەکانی بە راوێـژی خـۆی‌کـورت دەکـردەوە و بـۆ جـیران تەختـەکانی دەگێڕایـەوە. بـەم شێوەیە وردەوردە هەواڵەکان تەختاوتەخت بڵاو دەبوونەوە و هەتا زیاتردەگێڕدرانـەوە درۆیـان پتر لێ‌زیاد دەکرا و بە پێی گـەش‌بـینی ئـەوەی‌دەگێڕایـەوە کایـەک دەبـوو بـە کێوێـک. هـەتا رۆژێک داهات کە رادیۆ دەنگی‌لێ‌بڕا و پیرەپیاو ئیتر چی بۆ گوتن پێ‌نەما. بـەڵام نـە رادیۆکـە خراپ بوونەک باتری تەواو ببوو، ئـەزموونی ژیـان و زینـدوان فێرمـان دەکـەن کـەزەمان لغـاو ناکرێ و نایەتە ژێر رکێف، ئەو دەزگا بچکۆلانە هێندەی‌عومر نەدەکرد، بـەڵام سـەرەنجام بـەر لەوەی رادیۆ لە کار بکەوێ کەسێک‌متـەقی لـێ‌بـڕا. پیرەپیـاو بـە درێژایـی ئـەو رۆژەی وڵات

بەدەسلاتوپاتەکانەوە بوو گوێیدایە رادیـۆ و هەواڵـەکانی بـڵاوە کـردەوە، ئەودرۆیانـەی بـە ئاشکرا باسی داهاتوویەکی گەش و رووناکیان دەکرد ودەوڵەت لە سەری دەڕۆیـی لـەقاوی دا و هەر ئێستا لە نیوەشەوا سەریلەژێر پەتوو هێنایە دەر و بە سرنجەوە گوێی دایە ئـەو وزەوزەی لەبەرکز بوونی باتری دەبیسرا، بە وردی گوێی بۆ وێژەر شل کردبوو کە لەپـڕهاواری لـێبڵـیند بوو، من کوێر بووم، پاشـان دەنگـی خـڕوهۆڕی کـەوتنیمیکـڕۆفۆن و غەڵدەغەڵـد و هـاواری سەرسـوڕمان هاتـە گـوێ وبـێدەنگییـەکی لـە نـەکاو وەشـا. تـەنیا ئیزگەیـەکی رادیـۆیی کـە توانیبووی گوێی لێبگرێ لە کار کەوتبوو. پیرەپیاو ماوەیەک گوێی بە رادیۆی لەکار کەوتۆوە نووساند، دەتگوت چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەنگی وێژەر ودرێژەی هەواڵـەکانە. بـەڵام هەسـتی کرد یان باشتر وایە بڵێین تێگەیشت کـەئیتر ناگەڕێتـەوە. نەخۆشـیی سـپی تـەنیا وێـژەری کـوێر نـــەکردبوو. وەکووخـــەتێکی ئـــاورینی بـــاڕووت خێـــرا تـــەواوی ئیزگـــەی داگـــرت. پاشـــان پیرەپیاورادیۆکەی بە حەرز دادا. بێتوو ملهوڕەکان بۆ دۆزینەوەی جـەواهێراتیشـاراوە هاتبـان و کەلێن و قوژبنان گەڕابان دەیانزانی نەهێنانی رادیۆ بۆنێو سیایی شتە بەنرخەکان کارێکی بـەجێ بووە، هەڵبەت ئەگەر ئاقڵیانپێی شکابا. پیرەپیاو پەتوەکەی بە سەر خۆیا کێشا هـەتا بـە کـەیفی خۆیبگری. بەشەکە لە ژێـر نـووری چڵـکن و نەخۆشـی گڵـۆپی زەردەڵـەدا زۆرچـاکی خـەو لێکەوتبوو، ئەو کەسانەی بە هەڵکەوت ئەو رۆژە سـێژەمیـان خواردبـوو ئێسـتا حەسـابوونەوە. بێتوو بارودۆخەکە هـەر وادرێـژەی هـەبێ جـارێکی تـر بـەو ئاکامـە دەگـەین کـە تەنانـەت لـە تاڵترینهەلومەرج و لێقەوماندا لایەنی باشیش هەیە کە ورە وەبەر ئینسـان بنـێبـۆ خـۆڕاگری. بێتوو ئەم ئاکامە لە بابەت وەزعی ئێستادا بسەلمێنینبۆمان دەردەکـەوێ کـە نیگـەرانی لـە سـەر دابەشینی خواردن بە دەستیتاقمێکی تایبەت هەر چۆنێک بێ دیسانیش لایەنی باشی هەر هەیە، هەرچەند رەنگە هێندێک بەرزەفڕ نارەزامەنـدی دەرببـڕن و بڵـێن کـە بـۆدرێژەی بـوون و مـان خۆیان دەیانهەوێ بکەونە بەربەرەکانی، جا باهەوڵ و تێکۆشان کۆسـپ و تەگەرەشـیان بخاتـە سەر رێبازی ژیان. زۆربەی کوێرە دەسبەسەر کراوەکان بێئەوەی خەمی سبەینێ هەڵگرنیا لە بیریان بێت بێتوو لە پێشدا پووڵ بدەی مەغموون دەبی خـرپ لێـینوسـتبوون. ئـەوانی دیکـەش شـــەکەت و مانـــدوو لـــە جـــەغزەی هەوڵـــێکیبێهـــوودەدا بـــۆ دۆزینـــەوەی رێچارەیـــەکی شـەڕافەتمەندانە لـە بابـەت ئـەمسـووکایەتییەی پێیـان دەکـرا تـاق و واز خـەویان لێکـەوت و خەونیداهاتووی روونتریان دەدیت، خـەونی ئـەو رۆژانـەی ئەگـەر پـڕ خێروبێـر وبەرەکـەتیش نەبوون، لانی کەم ئازادی زیاتریان بە دیـاری دێنـا. لـە بەشـیـەکی لای راسـت تـەنیا خێـزانی

دوکتۆر هێشتا نەخەوتبوو. لە سەرجێگاکەی ڕاکشابوو و بیری لەو قسەی مێردەکەی دەکردەوە کەگوتبووی بۆ دەمێک گومان هەڵیگرتبوو کە لە نێو دزەکاندا کەسێکی بیناهەیە، ئەو کەسەی وەکوو سیخوڕ کاری پێدەکەن. سەیر ئەوە بوو کەتازە باسیان نەکردەوە، دەتگوت ئەوەندە بەلای دوکتۆرەوە ئاسایی‌یەوەبیری نەهاتبۆوە کە خێزانیشی دەتوانێ ببینێ. فکرێکی بە مێشکیدارابرد بەڵام وەسەرخۆی نەهێنا. نەیدەویست مەبەستی ڕوون و ئاشکراشی کاتەوە، ئەم کارەی ئەو پێی ناکرێ من دەتوانم بیقۆزمەوە. چاوپزیشک وێدەچوو وا دەنوێنێ کە نازانێ و دەپپرسی کامە کار. ئێستاچاوی لە مقەستی هەڵاوەسراوی سەردیوار دەکرد و لە خۆی دەپرسی‌باشە سۆمایی بە کەلکی چی دێت، لێرەدا چاوی تەنیا پەنجەرەیەک بوون‌کە لە وێوە دیمەنی تاڵ و ناخۆش و دڵتەزێنی وەها کە هەرگیز بە خەیاڵیدارانەدەبرد ببینێ، ئەو ڕووداوانە قەناعەتیان پێ‌هێنابوو کە باشتر وا بووکوێر بێ و ئیتر تەواو. بە پارێزەوە تەکانێکی لەخۆی دا و لە سەرتەختەکەی دانیشت. بەرەو ڕووی ئەو، کچە و کوڕە خێلە خەوتبوون. تێگەیشت کە دوو تەخت زۆر لێک نیزیکن، کچە تەختەکەی خۆی بۆ لای‌کوڕە کێشابوو، بێ‌گومان دەیهەویست ئەگەر منداڵەکە شتێکی ویست یا لەنەبوونی دایکیا نیازی بوو کەسێک ئەسرینەکانی بسترێتەوە خۆی لێ‌بەخاوەن کا. بۆچی پێشتر بە بیرمدا نەهات، منیش دەتوانم تەختەکانمان‌پێکەوە جووت کەم و وێکڕا بخەوین و ئیتر هەموو دەم نیگەرانی‌بەربوونەوەی مێردەکەم نەبم. چاوی لە مێردەکەی کرد کە هەمیشە زوودەخەوت. مقەستەکەی لەگەڵ خۆی هێناوە و هەر لەم ڕۆژانەدا ردێنی بۆچاک دەکا، ئەو کارەی تەنانەت لە دەس کابرایەکی کوێریش دەهات بەومەرجەی دمی مقەستەکەی زۆر لە پێستی ڕوومەتی نیزیک نەکردبایەوە،بەهانەی چاکی بەدەستەوە بوو کە بۆچی باسی مقەستەکەی نەکردوە،دەیگوت هەموو سەر و دڵم دەگرن و کارم دەبێتە چاک کردنی سەر وریش. بە ئارامی داخزی و لاقی دانایە سەر هەرد و بە دوای پێڵاوەکانیداگەڕا. هەر ویستی بیانکاتە پا، لەپڕ لاقی کێشایەوە و ماوەیەک تێیان ڕاما،پاشان سەرێکی لەقاند و بە نەرمی لەجێی خۆی دانانەوە. بە نێوان‌تەختەکاندا ڕابرد و بە ئارامی بەرەو دەرگا کەوتە ڕێ. چەند جارێک لاقی‌لە پیسایی لیچقەوە ڕۆچوو، بەڵام دەیزانی کە ڕێڕەوکانی دەرەوە زۆرخراپترن. لە دەوروبەری خۆی ڕوانی نەکا یەکێک بەخەبەر بێ، هەر چەندئەگەر زۆربەیان خەویان ڕەوی‌با بێتوو چرپەچرپی نەکردبا گرینگ‌نەبوو، ئەگەریش دەنگ و تەقەیەک هاتبا دیارە چوونە سەراوپێویستییەکە کە زەمانی دیاری کراو ناناسێ، پێی خۆش نەبووشووەکەی خەبەری بێتەوە و لەپڕ هەست بە

ڕۆیشتنی بکا و بڵێ بۆ کوێدەچی، ئەو پرسیارەی گۆیا مێردەکان زۆر جار بەرەو ڕووی ژنەکانیانیدەکەنەوە، هەڵبەت پرسیارێکی دیکەشی لەگەڵ جووتە و ئەویش ئەوەیە،لە کوێ بووی. یەکێک لە ژنەکان لە سەر تەختەکەی دانیشتووە و پاڵی وەلەمپەرەکەی پشت سەری داوە، نیگای چۆل و قاقڕی لە دیواریڕووبەڕوو بڕیبوو، بەڵام هیچی نەدەبینی. ژنی دوکتۆر تاوێک ڕاما،دەتگوت دڵنیا نەبوو، دەتگوت دەترسا ئەو داوە دەزووە ون و نەدیارەیڕایەڵ کراوە بپسێنێ. ژنە کوێرەکە دەستی بەرز کردەوە، وێدەچووجووڵانەوەیەکی نەرم و هێدی لە دەور و بەری خۆی هەست پێکردبێ،پاشان ئیتر دەستی دادایەوە و سرنجی نەدا، پرخوهۆڕی پاڵدەستەکانیبەس بوو هەتا خەو نەیباتەوە. خێزانی دوکتۆر هەتا لە دەرگا نیزیکدەبۆوە خێراتر دەڕۆیی. بەر لەوەی بچێتە سەرسەرا چاوێکی وردی بەهێندێک کەلێن و قوژبناندا گێڕا. تاقمێک لە هاوبەندە کوێرەکان لە پەنادیوار خەوتبوون، ئەوانە تەختیان بۆ خەوتن گیر نەکەوتبوو، چونکە یانلە پاڵەپەستۆ و ڕامالەکەدا بەجێ مابوون یا لە شەڕی گرتنەوەی تەختداسەرنەکەتبوون. دە گەز ئەولاتر ژن و پیاوێکی کوێر نوستبوون و تا ئەوجێیەی دەکرا خۆیان دەپاراست، دوو ئینسانی بەحەیا و بە پارێز بوون،بەلان پێویست نەبوو دووگوێی سووکت هەبێ هەتا بزانی چ دەکەن، بەتایبەتی کە وێکڕا نەتوانن هەناسە و ئاە و ناڵە و وردەوشەی ماناهەڵفڕیوی کاتی ئاسوودە بوون بخۆنەوە. هاوسەری چاوپزیشک لە سەرڕێیە ڕاوەستا هەتا تەماشایان بکا، ئەو کارەی لەبەر بەرچاو تەنگینەکرد، ئەگەر مەیلی لێبا مێردەکەی لەپاڵ دەستی بوو، بەڵکوو چین وتوێژێکی دیکەی کۆمەڵ وەها شەقڵ و شوێنێکی لە سەر روح و مێشکیدادەنا کە نەیدەتوانی ناوێکی بۆ بدۆزێتەوە، ڕەنگە هەستی هاودەردی بێ،دەتگوت لە فکری ئەوەدا بوو کە بڵێ گوێ مەدەنە بوونی من لێرە، منیشمانای ئەو کارە دەزانم، خەریک بن، وێدەچوو هەستی بەزەیی لەدەروونیدا وەخەبەر هاتبێ، تەنانەت ئەگەر ئەو دەمە خۆشە ماوەیەکیشبەرێ، هەرگیز نابن بە یەک، ژنە و پیاوەی کوێر ئێستا لێک جیا ببوونەوەو لەپەنا یەکتر درێژ ببوون و شەکەتییان دەڕەواند، بەڵام هێشتا دەستییەکتریان بەرنەدابوو، ئەم دووە جوان و جحێڵ بوون، ڕەنگە تەنانەتئاشقەوماشقەیەک بووبن کە چوونە سینەما و لەوێ کوێر بوون یانڕەنگە هەڵکەوتێکی سەیر ئەوانی لێک گرد کردبۆوە، باشە ئەگەر وابووبێ چۆنیان یەکتر ناسیبوو، ئەی خوا گیان هەڵبەت لە دەنگەوە، ئەوەتەنیا دەنگی خوێن نیە کە سۆمایی چاوی ناوێ، ئەوینیش کە دەڵێنکوێرە، دەنگی تایبەت بە خۆی هەیە. ئەگەرچی زۆر وێدەچوو ئەو دووەتازە یەکترگیر بووبن، لەو بابەتەوە ئەو دەستە لێک گرێ

دراوانه شتێکی تازه نین، دەستەکان لە ڕۆژی بنەوانەوە تێکبەزیون. ژنی دوکتۆرهەناسەیەکی هەڵکێشا و دەستی بەرەو چاوی برد، چی تری پێنەکراچونکە باشی نەدەدیت، بەڵام نیگەران نەبوو، دەیزانی ئەسرین لێڵی کردوون. پاشان درێژەی بە ڕێی خۆی دا. دوای ئەوەی گەیشتەسەرسەرا بەرەو ئەو دەرکەیە ڕۆیی کە بە سەر حەوشەدا دەکرایەوە. چاوێکی لە دەرەوە کرد. لە پشت دەروازەوە چرایەک سێبەریسەربازێکی دێنا بەر چاو. لەوبەری شەقام تەواوی خانووبەرەکان لەتاریکی ڕۆچووبوون. پاشان هەتا سەر پلیکانان هەنگاوی نا. هیچمەترسییەک لە ڕێدا نەبوو. تەنانەت ئەگەر سەربازە سێبەری دیتبایە تەنیاپاش هەڵبواردنی ئەو خەتە نادیارەی بە خەیاڵ ڕایەڵ کرابوو تێیڕادەخوڕی و تەقەی لێدەکرد. ژنی دوکتۆر کە خووی بە زەنای ئەوشوێنە گرتبوو ئەم بێدەنگییەی سەیر هاتە بەرچاو، ئەو بێدەنگییەیدەتگوت جێی بەتاڵی شتێکی پڕ کردبۆوە، دەتگوت کە مرۆڤ و تەواویمرۆڤایەتی کۆچیان کردووە و تەنیا چرایەک و سەربازێکیان بە نیگابانداناوە. بە ئارامی لە شوێنی خۆی دانیشت، پاڵی وەلاشیپانی دەرگاوە دا وچەشنی ئەو ژنە کوێرەی کە پێشتر دیتبووی لە وڵاتی ڕاما. شەوێکیسارد بوو، شەوبا باڵی گرتبوو، زۆر سەیرە کە هێشتا لەم دنیایەدا با دێتو شەوڕەش دەنوێ، لە بیری خوێدا نەبوو، بیری لەو کوێرانە دەکردەوەکە ڕۆژیان بنەی نەدەهات. لەبەر نووری چراکە سێبەرێکی تر پەیدا بوو. بێشک نیگابانەکەی دواتر بوو، ڕەنگە نیگابانی یەکەم بەر لە گەڕانەوە بۆخێوەتەکەی گوتبێتی چ ڕووداوێکی گرینگ ڕووی نەداوە. هیچیان بەزەینیاندا ڕانەدەبرد کە لەو دیوی دەروازەوە چ خەبەرە، ڕەنگە گوێشیانلە تەقەکەش نەبووبێ، دەمانچەیەکی بچووک دەنگێکی وای نیە، ژنیدوکتۆر بە خۆی گوت خۆ مقەست دەنگی نیە. ڕانەوەستا لە خۆی بپرسێ کە ئەم فکرە چون لە سەری داوە، تەنیا لە کول بوونی بیری کەوتەسەرسوڕمان، زۆری کێشابوو کە یەکەم وشە لە زەینیدا بگووڕێ وپاشان وشەکانی دیکە بە دوای یەکا ریز بگرن، پێی سەیر بوو کە ئەمبیرە چۆنی گەرا داناوە، وشەکان پرش و بڵاو لێرولەوێ خۆیان دەنواند،وەکوو ئەم لەشەی بیری خەوتن جێی لە سەر دۆشەگ بۆ خۆش کردبوو. سەربازەکە لە دەروازە نیزیک بوویەوە، ئەگەرچی لە پێش چرا وێستاوەبەڵام دیارە کە چاوی لێدەکا، ڕەنگە سرنجی کەوتبێتە سەر سێبەریچەقیوی ژنە، هەر چەندە وڵات ئەوەندەی نوور تێنەزاوە کە ببینێ ژنێکدانیشتووە و ئەژنۆی گرتۆتە ئامێزی و چەنەگەی خستۆتە سەر،سەربازەکە چراگازەکەی تێدەگرێ، ئیتر جێگای گومان نیە، ژنێکە کەوەک بیری پێشووی بە ئارامی هەڵدەستێ، بەڵام خۆ سەربازەکە لەممەبەستە

وردوباریکـه بـێخەبـەرە، تـەنیا شـتێکی دەیزانـێ ئەوەیـە کـە بـەدیتنی ئـەم قەڵافەتـە تـرس هەڵیدەگرێ، لەڕێوە لەخۆی دەپرسێ داخواپێویستە زەنگـی مەترسیی بخاتـە زیـڕوهوڕ، بـەڵام خێرا پـەژیوان دەبێتەوە،هـەر چـی بـێ ئـەوە ژنێکـە و زۆریـش دوورە، بـەڵام دیسـانیش رووی تفەنگی تێدەکا و ناچار دەبێ چراگازەکە دابنێ، بەم کـارە شـۆقی چراکەراستـەوخۆ لـە چـاوی دەچەقێ و بە شـەوارەی دەخـا. کاتێـک وەخـۆ هاتەوەژنـە لـەوێ نـەمابوو، ئێسـتا ئـەو نیگابانـە نەیدەتوانی بە کێشکچی دواتر بلێ‌چ رووداوێکی گرینگ رووی نەداوە.

هاوسەری چاوپزیشک ئێستا ئیتر گەیوەتە قۆڵی چەپ و ئـەورێڕەوەی بـەرەو بەشـی سـێ دەخوشێ. لێرەش زۆرێـک لـە هاوبەنـدان لەسـەر حـەرز لێـی تخـێڵ بـوون، ئەوانـە زیـاترن لـەم کەسانەی لە لای راستبێ دەرەتان مابوونەوە. نەرم و هێدی هەنگاو دەنێ و هەست دەکـا پێـی لەپیسایی‌یەوە دەچێ. بـە وردی دەڕوانی و هـەر ئـەو دیمەنانـە دەبینـێ کـەچاوەڕوانی دەکـرد، زۆران لە ژێر پێخەفدا خۆیـان مـەڵاس داوە، پیـاوێکی‌کـوێر دەبینـێ کـە خـەوی رەویـوە و بـە راوێژێکی ناهومێدانەوە دەناڵێ، پرخ‌و هۆڕ ژوورەکانی تەنیوەتەوە. لەم بۆنەی لـە ساختومانەکە گەڕاوەسەری سوڕنامێنێ، بۆی لەش و جلەکانی خۆشی هەر ئەوەیە. لـە بەردەرانـە راوەسـتاوە، ئەوەش نیگابانێکی تر. کوتەکێکی بە دەستەوە و بەئارامی هەڵیدەسووڕێنێ، دەڵێی رێ لـە هـەر کەسێ دەگرێ کە بیهەوێ‌نیزیک بێتەوە. لێرە کەس لە سەر هەرد نەخەوتووە و رێڕەو چۆلـە. نیگابان یەکبین ئەوبەرەوبەرکێن دەکا و هەر دەڵێی قەت‌قەت ماندوونابێ، بەڵام ئەوە رواڵەتی مەسەلەکەیە، دوای کورتیلە ماوەیەک‌کوتەکەکەی دەداتە دەستی چەپ و دیسـانەوەش وچـان نادا. خێزانی‌دوکتۆر خۆی بە دیوارەوە مەڵاس کرد و بە نەرمی بزووت، وریا بووهەتا دارەکەی وێنەکەوێ. هەڵسووڕاندنی دارەکە و ئەو بازنەیـەی سـازی‌دەکـرد تەنانـەت نەیـدەتوانی بگاتـە نیوەی دەرگـا بەرینەکـە، ئینسـان وای‌لـێ‌دێـت کـە بلـێ نیگابـان بـە تفـەنگی بـەتاڵ خـەریکی پارێزگارییـە. ژنــە ئێســتابەرەو رووی کــابرای کــوێر وێســتاوە و دەتوانــێ لــە لاتەنیشــت و پشت‌سەری‌ڕا بڕوانێتە بەشەکە. هێنـدێک لـە تەختـەکان بەتاڵـن. لـە خـۆی پرسـی‌داخـوا چەنـد کەسن. کەمێک چووە پێشتر، راسـت هـەتا ئـەو شـوێنەی‌گۆپاڵـەکەی دەگەیشـتێیە و راوەسـتا، کـابرای کـوێر سـەری بـۆ ئـەم لایەوەرسـووڕاند کـە ئـەو لێـی راوەسـتابوو، دەڵـێی چرپـە و هەناسەیەکی‌نائاسایی هەست پێ‌کردووە. پیاوێکی تەژەی دەست درێژ بوو. لە پێشـدابە دارەکـە بەتاڵایی پێش خۆی پشکنی، پاشان نیمچە هەنگاوێک بەرەوپێش ملی‌نا، ژنە لەپڕێ ترسـا، نـەکا دیتبێتی و خەریکی خۆسازدان وپەلامار بێ، بە نیگەرانی بە خۆی گوت ئەو چاوانە کـوێر نـین.

نا، کوێربوو، چەشنی تـەواوی ئـەو هاوبەندانـەی لێـرەدا بـوون مـوقرایی داهاتبوو،هـەموو کـوێر بوون، هەموو جگـە لـەو. پیـاوە بـە دەنگێکـی ئـارام و نـەوی‌پرسـی کێیـە، وەکـوو نیگابـانێکی راستەقینە هەرای نەکرد رەشایی کێی،دۆستی یا دوژمن، وڵامی باش ئەوە بوو، دۆست، کە وایە برۆ، بەڵام‌مەودای خۆت بپارێزە، سەرەڕای ئەوانە ئـەو رووداوانـە نەقـەومان، ئەوتـەنیا سـەرێکی لەقاند و دەتگوت بە خۆی گوت چ فکرێکی نەفامانە، چۆن‌کەسێک دەتوانی بێتـە ئێـرە، ئێستا تێکڕا خەوتوون، دەستە بەتاڵەکەی کوتاو بە کوێرە کوێرە کشایەوە دوا و گەیشتەوە دەرگـا و بە قسەکانی خۆی‌سوکنایی هات و دەستەکانی بەردانـەوە. خـەوی دەهـات، زۆری‌چاوەڕوانی کێشابوو کە نیگابانی دوایی بێت و نۆرە ئێشکی ببرێتەوە،بەڵام بۆ ئەم کارە پێویست بـوو ئـەوی تـر بـە هـاواری ویـژدان و ئـەرکی‌سەرشـانی خـۆی خەبـەری بێتـەوە، چونکـە نـە سـەعاتێکی زەنگداری لێ‌بوو، نە شتێکی لـەم بابەتـە. هاوسـەری چاوپزیشـک بـە پـارێزەوە خـۆی‌گەیانـدە ئەوبەری دەرگاکە و چاوێکی بە ژوورەکەدا گێڕا. ئـەو بەشـە پڕنـەبوو. خێـرا خێـرا ژمـاردنی و تێگەیشت نۆزدە یا بیست کەسن. لە بنەبانی‌ژوورەکە زۆری دەفری پڕ لە خـواردن بـەدی کـرد کە لە سەر یەک‌هەڵچندرابوون، هێندێکش لە سەر تەختە بەتاڵەکان خۆیان دەنوانـد. هاوسـەری چاوپزیشک بە خۆی گوت هەر وەک چاوەڕوانیم دەکردتەواوی ئەو خواردنـەی وەریـدەگرن دابەشی ناکـەن، پیـاوەی کوێردەتگـوت دیسـانیش دڵـە خورپەیـەتی، بـەڵام نەدەگـەڕا. زەمـان رادەبرد. یەکێک کە دیار بوو سیغارکێشە زۆر توند دەکۆخی. کـابرای کـوێر بەدڵـنیگەرانییەوە سەری وەرسـووڕاند، ئێسـتا دەکـرا ماوەیـەک بخـەوێ. هـیچ‌کـام لـە خـەوتووەکان خەبـەریان نەبوویـەوە. پاشـان کـابرا لـە ترسـی‌خەونووچکـە و تاوانبـارکران بـە شـکاندنی رێ و شـوێن لەسەرەخۆدانیشتە سەر ئەو تەختە کە لەبەر دەرگای ژوورەکە دانـداربوو. بـڕێکی‌وێژینـگ دا و پاشان خۆی دایـە دەس شـەپۆلی خـەو و بـێ‌گومـان زەمانـێ کەتێیـدا نـوقم دەبـوو وێـدەچوو مەسەلەکەی زۆر بەلاوە گرینگ نەبێ، بەخۆی دەگوت خـۆ کـەس نامبینـێ. خێـزانی دوکتـۆر سەر لە نوێ‌خەوتووەکانی بژارد، بە نیگابانەوە دەبوونە بیست کەس، لانی کەم‌بـڕێکی زانیـاری راست و دروست وەگیر کەوت، گەڕانی شەوانەی شتێکی‌لەخۆوە و بێهوودە نـەبوو، لـە خـۆی پرسی داخوا ئەوە تەنیا هۆی هاتنم بۆئێرە بوو، پاشان وای بە باش زانی بە دوای وڵاما نەگەڕێ. نیگابان‌سەری وەلاشیپانی دەرگا کردبوو و خەوتبوو، کوتەکەکەی بە ئارامی‌خزیبوو، ئێستا ئێرە پیاوێکی کوێری بێ دەسەڵاتی لێ بوو کە هیچ‌کۆڵەکەیەکی لەم بەرەوبەر نـەبوو هـەتا لـەجێوە هەڵیانکەنێ. هاوسەری‌چاوپزیشک دڵـی دەیوسـت بـەر پرسایەتی دزیـنی خـۆراک و سـامانی

خەڵک بخاتە سەر شانی ئەو پیاوە، ئـەو کەسـەی پـارووی لـە زاری منـاڵانفڕانـدبوو، بـەڵام بـە پێچەوانەی ئەو فکرانە نە رقی لێی بوو، نە بە پەست وخوێڕی دەزانی، قەڵافـەتێک رووبـەرووی لەخۆ بێزوە و سەری بە پشتەوەداکەوتبوو، رەگی ملی کێشراو و دەرپەڕیبوون ئەو دیمەنە وەهـا هەستیبزوات کە جگە لە روحم و بـەزەیی هیچـی دیکـە لـە دەروونیـدا شـەپۆلینەدایـەوە. بـۆ یەکەم جار لەو کاتەوە بەشەکەی خۆیانی جێهێشتبوومچوورکێکی ساردی بـە لەشـیدا هـات، دەتگوت کاشییەکانی تەرکیژوورەکـە لاقیـان کردبـوو بـە سـەهۆڵ، دەتگـوت لاقـی ئاوریـان گرتبوو، بەخۆی گوت هیوادارم نۆبەتیم نەگرتبێ. نۆبەتیی نەبوو، زیـاتر وەکمانـدوو بـوونێکی بێسنوور دەچوو، تامەزرۆیییـەک بـۆ خـزین و پاپۆکەخواردنـەوە لـە دەروونـدا، چاوەکـانی، بەتایبەت چاوەکانی بەرەو ناخیدرەوشاندەوە و هـەتا تـوانی بـەرەو پـێش خوشـی تـا گەیشـتە قووڵاییمێشکی و بە چاوی خەیاڵ دیتی، دیارە لەوێ جیاوازی دیتن و نەدیتن بـەچاوی ناتـەیار روون نابێتەوە. لەشی بە ئارامی، زۆر بە ئـارامی لەگەڵـخۆی کێشـا و بـەو رێگایـەدا کـە هـاتبوو بەرەو شوێنی خۆی گەڕایەوە، بەپەنا ئەو دەسبەسەر کراوانەدا تێپەڕی کـە وەکـوو خەوگـەڕان دەچوون،رەنگە خۆشـی لای ئـەوان هـەر وا بـوو بێـت. تەنانـەت پێویسـت نـەبوو وابنوێنـێ کـە کوێرە. دوو ئەویینداری کوێری دیکە دەستی یەکتریاننەگرتبوو، ئەوان لە پەنا یەک خـەوتبون، کچە خۆی وێکهێنابوو هەتاگەرم دابێ، بە سرنجێکی لە نیزیـکڕا دەردەکـەوت کـە دەسـتی یەکتریانبەرنەداوە، دەستی پیاوە لـە سـەر سمـتی کچـە و پەنجـەیان تێـکهـاڵابوو، لـەژووری بەشەکەدا ئەو ژنە کوێرەی خەوی لە چـاوان رەویبـوو هێشـتا لەسـەر تەختەکـەی دانیشـتبوو و چاوەڕوانی ئەو کاتە بوو کە لەشیشەکەتی بە سەر خۆڕاگری مێشکیدا زاڵ بـێ. ئـەوانی تـر بـە رواڵەتخەوتبوون، هێندێک دەتگوت بـۆ دۆزینـەوەی تـاریکی دوورە دەسـتسـەریان وەژێـر پەتوو دابوو. لە سەر مێزی پەنای تەختی کچەیچاویلکەیی شووشەیەکی قەترەی چاوان خـۆی دەنواند. چاوی چاکبوونەوە بەڵام خۆی نەیدەزانی.

## کوێری

ئەو پیاوە کوێرەی سەرحیسێبی ماڵ و سامانی حەرام و تەرامیتاقمی گەندەپیاوان بوو بێتوو لەپڕێ سۆمایی گەڕابانەوە چاوان و تەمیگومانی رەویبا، دەستی دەدایە قەڵەم و کاغەز و بەرەو ئێرە دەهات و بەبێشک ئێستا خەریکی نووسینی راپۆرتێکی خەماوی و دڵتەزێن بوو لەبابەت چۆنیەتی ژیان و کەم و کووڕی خورد و خوراک و بێ بەشییەکانیدیکەی ئەو هاوبەندە تازانەی کە ساف لە ساف تالان کرابوون. ئەوسەرەتای باسەکەی خۆی ئاوا دادەگیرساند کە لە بەشەکەی ئەوداداگیرکاران نەک تەنیا بەندییە بەرێزە کوێرەکانیان وەدەرنابوو هەتاتەواوی هۆڵەکەیان لە دەستابێ، بەڵکوو زۆر خراپتر دەجوولانەوە ونەیاندەهێشت دوو بەشەکەی تری قۆڵی چەپ لەم دامەزراوانەی بەرواڵەت بۆ پاک و خاوێنی و لەش ساغی ساز کرابوون کەلک وەرگرن. ئەو دەینووسی کە ئاکامی لەرێوەی ئەم زوڵمە بێشەرمانەیە دەبوو بەهۆی ئەوەی ئەم چارەڕەشانە بەرەو ئاودەستەکانی قۆڵی راستهرووژم بێنن و هێنانە بەرچاوی ئەو دیمەنە تەنیا بۆ کەسانێکی کە لەپێشینەی ئێرە ئاگادارن هاسانە. هەروەها وەبیری دێنایەوە کە بێتووبتهەوێ بە حەوشەی ژوورەوەدا رابری بێگومان بە سەر کەسێکادەکەوی کە هەڵترووشکاوە و زگ چوونیەتی یان لەخۆوە دەنەقێنێ وئاخریش چی پێناکرێ. جا چونکە مرۆڤێکی وردبین و مووقەڵێشە بەئانقەست خۆ لە نووسینەوەی جیاوازی ئاشکرای نێوان ئەو بڕە شێوەیخەڵکەکە دەیخوا و ئەوەندە پیسایییەی دەیکا ناپارێزێ، هەتا

ڕەنگە ئاوانیشانی بدا کە پەیوەندیی مەنشووری هۆ و هۆکـار کـە ئـەم هـەمووەیباس دەکـرێ لانی کەم لە جەغزی چەندایەتیدا هەمیشە جێی متمانە نیە. هەروەها دەگێڕێتەوە لەو دەمـەدا کـە دەفرەکـان لـە ژووری تـاقمیچەتەکانـدا قـەلاپچن کـراوان هێنـدەی نابـا کـە ئـەم بـەخت وەرگـەڕاوەلێقەوماوانـە ناچـار بـە چنینـەوەی وەرکـەنانی وەریـوی سـەر تـەختی بـنیپیسـی ژوورەکان دەبن. دیسانیش سەر حیسابی کوێر بە سرنجدان بەمدوو ئەرکەی وەکـوو بەشـدار و راپۆرت نووس کەوتۆتە سەرشانی لـەبیری ناچـێ کـە کـردەوەی ڕەش و زۆردارانـەی کـوێرە نامەردەکانمەحکووم بکا کە لێدەگەڕێن خواردنەکە بگەنێ بەلام نایـدەن بەبرسـییەکان، بەڵـێ ڕاستە هێندێک لەم خواردەمەنییانە چەند حەوتوویەکخۆ ڕادەگرن و خـراپ نـابن، بـەلام ئـەو شێوانەی لێندراون بێتـوو خێرانـەخورێن، بـە زوویـی دەترشـێن و کـەڕوو دێـنن و مـرۆڤ بـۆی ناخورێن،هەڵبەت ئەگەر بشێ ئەم تاقمـە لـێقـەماوە بێنـە ڕیـزی مرۆڤـان. کـابرایڕووداونـووس وێڕای پاراستنی ئـەو نێوەرۆکـە باسـەکەی دەگـۆڕی وبەخـەم و پەژارەیـەکی یـەکجار زۆرەوە دەینووسی ئا لێرە نەخۆشیی تەنیابە کۆئەندامی هەرسەوە بەند نابێ کە ڕەنگە هی کـەم خـواردن یانتێکچوونی کاری ڕێخۆڵە و گەدە بێ، چونکە لە پێشدا زۆربەی قەرەنتینـەکراوەکان جگـە لە کوێری ساغ و سلامەت بـوون و دەتگـوت گـوێزی ئازان،بـەلام ئێسـتا وەک ئـەوانی تریـان لێهاتووە و نازاندرێ چۆن تووشیهەلامەت هاتوون و ناتوانن لە سەر تـەختی پیسـکە و چەڵـی خۆیان ڕاستببنەوە، تەنانەت حەبێکی ئاسپرینیش لە تەواوی ئەو پێنج بەشـەدا دەسناکـەوێ بـۆ ئەوەی تا و یاویان ڕۆمرکێنێ یان سەرئێشەیان لە کۆڵکاتەوە و دوای ئـەوەی یـەکێک تەنانـەت بەر و بەرێکی جانتای ژنەکانیهەڵگێڕایەوە، هەر چی مابوو لـەڕێوە پـاش قـول درا. بـێ گومـان راپۆرتنووس خۆی لە بیری نووسینی باسی تەواوی ئەو نەخۆشییانەی ئاوقایزۆربەی ئەم تاقمە سێسەد کەسییەی لەم قەرەنتینە نائینسانییەدادەسبەسـەر کرابـوون دەپاراسـت، بـەلام نەیـدەتوانی نەخۆشـییشـێرپەنجەی پـەل هاویشـتووی دوو کەسـان نەهێنێتـە بـەرچاو، چونکەبالادەسـتانی حکوومەت وەختی کۆکردنەوە و زینـدانی کـردنی کوێرەکـانلێـرەدا بـە ڕوو دانەدەکـەوتن و تەنانەت گوتیان یاسا پاش دامەزران بۆهـەمووان یەکسـانە و دێموکڕاسـی لەگـەڵ هـەلاواردن و جیاوازی کردنناحاوێتەوە. چارەنووسـی بـێ بـەزەی کـوێر جگـە لـەوە زیـاتری لـێچاوەڕوان ناکرێ کە لە نێو ئەم هەمووە زیندانییەدا تەنیا دوکتۆرێکهەبێ و ئەویش دوکتۆری چاو، یـانی ئەو کەسەی لێرە بە کەلکی هیچنەدەهات. سەر حیسابی کوێر کە دەگەیشتە ئێرە لە گێڕانـەوەی ئەوهەمووە بەش مەینەتی و چارەڕەشییە شەکەت دەبوو و قەڵەم و کاغەزیفڕێ دەدایە سـەرمێز

و بە دەستێکی لەرزۆک بە دوای پەنچکە نانێکی‌بەیاتا دەگەڕا کە وەختی بەجێ هێنانی ئەرکی خۆی وەکوو راپۆرت‌نووسی ئاخری زەمان لە پەنایەک دابنابوو، بەڵام نەیدەدۆزییەوە، چونکە‌کوێرێکی تر بە بۆن دیتبوویەوە و فڕاندبووی. پاش ئەو ئاکار و کردەوەبرایانەیە، چاوی لە ئاست ئەو هەست و ویستە مرۆڤ‌دۆستانەیەدەقووچاند کە بەرە و ئێرەی راکێشابوو و دەگەیشتە ئەو ئاکامە باشتروایە تا دەرفەت ماوە بگەڕێتەوە بەشی سێی لای چەپ، چونکە راستەلەوێ دادکوژی گەندەپیاوان تووڕەیی سادقانەی دەبزاوت، بەڵام هەرنەبێ برسی نەدەمایەوە.

ئەوە خۆی بۆتە گرێ کوێرەیەکی ئەستەم، یانی هەر جارێک‌نوێنەرەکان بە جیرەیەکی کەمترەوە دەگەڕێنەوە، لەگەڵ شەپۆلی‌تووڕەیی هاوبەندەکانیان بەرەو روو دەبن، هەمیشە کەسێک پەیدا دەبێ کە پێشنیاری خۆپیشاندان و گەلەکۆمەکی بدا و بەڵگەی روون و بەهێزبێنێتەوە و لە بارەی هێزی کەڵەکە کراوی جەماوەردا قسەی بە تام وخۆی بکا و بڵێ ئەم مەبەستە گەلێ جار سەلماوە و مەنتیقی دیالیکتیکیش‌بە مسۆگەری دەزانێ کە ویستی پتەوی جەماوەر لە بارودۆخی ئاساییداتەنیا لە سەر یەک کەڵەکە دەکرێ، بەڵام لە هەل و مەرجی تایبەتا دەتوانێ‌بێ بڕانەوە تێکدا جار کرێت. بەڵام هێندەی نەکێشا کە هاوبەندەکان‌ئەهوەن بوونەوە، لێرەدا ئەوەندە بەس بوو کە ئینسانێکی‌بەرژەوەندکارتر بە ئامانجی هەڵسەنگاندنی چاکە و خراپەی هەڵوێستی‌پێشنیار کراو، داهاتووی پڕ کارەسات و مەرگاوی بەرەو رووبوونەوەی چەکی گەرم بۆ لایەنگرانی دژکردەوەی بە کۆمەڵ شی‌بکاتەوە، ئەوانەی لە ریزی پێشەوە دەڕۆن دەزانن چ رووداوێک‌چاوەڕێیانە، بەڵام لە بابەت ئەو کەسانەی لە دواوەن باشترە هەر باسی‌نەکەین، چونکە بێتوو یەکەم فیشەک بتەقێ و ئێمە بتۆقین کەس بەسەرکەسەوە نابێ و زۆربەمان بەر لە ئەنگوان لە ژێر قاچ و قولانداده‌پلیشێینەوە. لە یەکێک لە بەشەکاندا ڕێی ناوینەیان بە باش زانی وهاتنە سەر ئەو بڕوایە نوێنەرە هەڵفرێوەکانیان بگۆڕن و تاقمێکی دەدوازدە کەسی بنێرن کە یەک دەنگ ناڕەزامەندی گشتیی رابگەیەنن،هەڵبەت ئەم هەواڵە زارەو زار گەڕا. بۆ ئەو کارە دەبوو کەسانێک داخوازبن، بەڵام وەک گوتمان بە هۆی ئەو وریایی‌یەی مرۆڤی دوورئەندێش‌دابوویان، لە هەموو بەشەکاندا ویستیار کەم بوو. بەختەوەرانە ئەم‌دیمەنە بەرچاوەی کە ئاکاری لاواز دەینوێنێ نە گرینگییەکی ئەوتۆی‌پەیدا کرد و نە بوو بە هۆی سەرشۆڕی کەس، چونکە کاتێک ئاکامی ئەوراسپێراوییەی بەشی پێشڕەو دابووی دەرکەوت، هەموو تێگەیشتن کەخۆ پاراستن ڕێی ئەقڵە. هەشت سەربزێوی ئازایان

لـەڕێوە بـە گۆپـاڵ وکوتـەک ڕەپـاڵ نـا و ڕاسـتە فیشـەکێک تـەقی، بـەڵام بـە قەدرایـە گوللەکانی پێشوو رووەو حەوا نەبوو، بە گوتەی نارِەزامەندان بەڵگەش ویزە ویزیئـەم گوللەیـە بوو کە بە پەنا گوێیاندا خوشیبوو. جا ئەو فیشـەکە بـە قەسـتیکوشـتن هـاویژرابوو یـان نـا ئـەوە رەنگە پاشان ئاشکرا بێ، لە حاڵیحازردا تیرهاوێژەکە لە تەپ و مژی گوماندا بەجێ دێڵین، بـە واتایەکی تردەڵێین یا ئەو تەقەیە بە مانای هەڕەشـە و ترسـاندنی زیـاتر بـوو یاسـەرکردەی ئـەو گەندەپیاوانە بەژنی خۆپیشاندەرانی بە قوڵەتر زانیبوویان لەوەی تاڵـتر، هەڵـەی لـەوەدا بـوو کـە ئـەوانی بـە باڵابـەرزتر دەزانی،ئەگـەر وا بـێ ناچـارین ویسـتی مـرۆڤکـوژیی ئـەو کابرایـە بـە وردیلێکدەینەوە. ئێستا لەم وردەکێشانە دەس هەڵدەگرین و دەڕۆینە شـوێنئـەو مەبەسـتانەی سـرنجی گشـتیی رادەکێشـا کـە تـەنیا ئـەوەش زۆر گرینگە،ئەگـەر ئـەم خاڵـە هەڵـکەوتێکی ئاشکراش بێ بەڕاستی بە خێر رابوورد کەخۆپیشاندەران گوتیـان نوێنـەری فڵانـە بەشـن. کـە وا بـوو تـەنیا ئـەو بەشـەبە مەبەسـتی سـزادان سـێ رۆژان لـە خـواردن بـێ بـەش کـرا، هەڵـبەت دیارەبـەختیان سـوار بـوو کـە بـۆ هەمیشـە رسـق و رۆزییـان لـە دەم نەگرتنەوە،چونکـە سـزای دادپەروەرانەی ئەو کەسەی بوێرێ قـەپاڵ بـە دەسـتی ئاغـایسایەچەوری خۆیـدا بگـرێ لـەوە کەمتر نابێ. کـە وا بـوو بەشـی سـەربزێو لەخولانـەوە و خوازەڵـۆکی پـەنچکێک نـان و پلێـک گۆشت و برە پەنیرێک چیتر نابێ، راستە لە برسان نەمردن بەڵام وەکوو نـوقڵ و نـەبات جنێـو وقسەی سووکیان بۆ داباری، بەم بیرە جوان و تازانەوە چیتان چاوەڕواندەکرد، بێتوو بـە گـوێی ئێوەمان بکردایە ئێستا حاڵمان شڕ بوو، بەڵامخراپتر لـە هـەموو شـت ئـەوە بـوو کـە پێیـان بڵـێن سەبوور بن، سەبوور بن،قسەی لەوە بێ روحمانەتر پەیدا نابێ، جنێو و سووکایەتی زۆر باشـترە. سێ رۆژەی سزادان کە بنەی هات، وایانزانی بار و دۆخەکە ئاسایی‌دەبێتەوە، بـەڵام روون بـۆوە کە سزا دانی بەشی لێقەوماو کە چلهاوبەنـدی سـەربزێوی تێـدا بـوو، هێشـتا دوایـی نـەهاتووە، چونکە ئەوجیرەیەی هەتا ئێستا بە زەحمەت بەشی بیست کەسی دەکرد ئێستا بەرادەیـەک کـەم کراوەتەوە کە دە کەسیشی پێ تێر نابێ. کە وایـە خۆتـاندەتـوانن رق و تـووڕەیی ئـەوان بێننـە بەرچاو، هەروەها لێیگەڕێن هەرکەس ویستی بتۆرێ با بتـۆرێ، حەقیقـەت حەقیقەتـە، تـرس و خۆفیبەشەکانی تر بێننە بەرچاو کە هـەژاران دەورەیـان دابـوون و لـە نێـوان دوودڵ کـردەوەدا دڵاودڵیان دەکرد، یەکیان بـەجێ هێنـانی ئـەرکی لەمێژینـەیمەبەسـتی بـەرزی یـەکگرتـوویی ئینسانیی و ئەوی دیکە پاراستنی داب ونەریتی کەونارایە، کـە دەڵـێ، هـەتا مـاڵ پێـی بـوێ، لـە کلیسایە حەرامە.

لەم بگرە و بەردەدا بوو کە لات و لووتەکان فەرمانیان دا دەبێ‌دیسانیش پوولّ و کەل و پەلی باش و بە قیمەت گرانیان بدەنێیە، چونکەلە سەر ئەو بڕوایە بوون نرخی خورد و خۆراک زۆر لەو پێشەکییەزیاترە کە وەریانگرتووە، تازە بە قەولی خۆیان بە دلّێکی فرەوانەوەنرخی شڕ و شالاّتیان زۆر لە سەر گرتووە. هەموو بەشەکان ناهومێدانەرایانسپارد کە پوولّێکی سووتاویان بە دەستەوە نەماوە و هەر چی‌بایی‌دار و جوانە بە وردی کۆ کراوەتەوە و دراوەتە خزمەتیان. هەر وەهابە بێ‌شەرمی بەلّگە و ریس و گوریسیان هێنایەوە کە بێتوو جیاوازی‌نرخی کەل و پەلە پێشکەش کراوەکان لەبەر چاو نەگیرێ هەر تەمایەکی‌بیگرن ئینسافی تێدا پێخوست دەکرێ، بە زمانێکی ساکارتر بێ‌ئینسافی‌بوو کە مرۆڤی راست و دروست لە جیاتی تاوانباران سزا بدرێن. کە وایەنابێ ئەو کەسانەی وێدەچێ هێشتا بایی ئەوەی داویانە ئازووخەیان‌وەرنەگرتووە قوت‌بڕاو کرێن. ئاشکرایە هیچ بەشێک نرخی‌پێشکەشییەکانی بەشەکەی دیکەی نەدەزانی، بەلاّم هەر بەشێک‌وایدەزانی تەنیا خۆی هەقی وەرگرتنی خورد و خۆراکی ماوە و ئەوانی‌دیکە سەرەیان سووتاوە. بەختەوەرانە چونکە ئەو کێشەکێشە پەلی‌نەگرت و لەڕێوە قڕپ‌وقپ بوو چەتەکان لە سەر قسەی خۆیان‌راوەستان، دیارە فەرمانبەرداری و مل‌کەچی لە سەر شانی هەمووان‌واجب بوو، لێرە تەنیا سەر حیسابی کوێر جیاوازی قیمەتی شتەگرانبایی‌یەکانی دەزانی، لە بەشەکاندا دمەقالّی و نێوان ناخۆشیی گرژ وتالّ خۆی نواند و جار و بارێک کار گەیشتە تێک‌هەلّدان. هێندێک لایان وابوو تاقمێک خۆ بە زل زانی گزیکار کەل‌وپەل و شت‌ومەکی باش وبایی‌داری خۆیان پاش دەوەن کردووە، جا کە وایە لە سەر بەشی ئەوکەسانە لەوەڕاون کە هەموو سامانی خۆیان بۆ قازانجی گشتیی‌بەخشیوە. تاقمێکی تر بە هاتنە نێو ئەو باسەی ئەورۆ دمەقالّی گشتیی‌بوو گوتیان ئەگەر ناچار نەبووبان زگی ئەو خوێڕیانە تێر کەن،ئێستاوئێستاش بەو شتەی داویانە دەیانتوانی نان و پێخۆر وەرگرن. گەندەپیاوان لە سەرتاوە هەڕەشەیان کردبوو کە هەموو ژوورەکان‌دەپشکنن و ئەو کەسانەی گوێ‌رایەلّی فەرمان نەبن سزا دەدرێن، ئێستاکار گەیبووە جێیەکی کە ئینسانە راست و دروستەکانی هەر بەشێک لەبەرامبەر گزیکاران و تەنانەت رقەونانیدا ئەو ئەرکەیان وەئەستۆ گرت. سامانێکی بەرچاو نەدۆزرایەوە جگە لە چەند سەعات و ئەنگوستیلە کەزیاتر هی پیاوان بوو نەک هی ژنان. بەلاّم با بزانین، عەدالّەتی نێوخۆیی‌چۆنی سزا دان، هەر یەکەی دوو سێ شەپ و زللە و چەند مستەکۆلّەی‌لابەلایان وێکەوت، دیارە دمەقڕەکە زیاتر شەڕە جنێو بوو، هەلّبەت چەندوردە فەرمایشی تالّ و سوێریشان لە دوڕوەشانیی رابردووڕاهێنابوویەوە کایە، بۆ

وێنە تۆ تەنانەت دایکیشت دەکرۆسێوە، چاکی بێنەبەر زەیـن، دەڵـێی کـردەوەی دزێـوی لـەم چەشـنە و تەنانـەت خراپتـریش‌دەتوانـێ لـەو سـەردەمەدا کـە هـەموو کـوێر بـوون بقـەومێ و وێڕای‌رۆرژانی ئاوی چاو حەیاش بتکێ و کەس ڕێز بـۆ کـەس دانـەنێ و ئەورێگایـەش کـوێر بێتەوە. لات و لووتەکان کە هەڕەشەیان دەکـرد بـە تونـدی‌تۆڵـە دەسـتێننەوە هـەر چـی هـەبوو وەریـانگرت و بەختەوەرانەهەڕەشـەکەیان نـەبردە سـەر، گریمـان ئـەوە بـوو کـە لـە بیریـان چۆتەوە،بەڵام هەر وەک بەم زووانە روون دەبێتـەوە بـە ئاشـکرا فکرێکـی دیکـەیان لەمێشـکیدا بوو. بێتوو هەر وا بە زوڵم و زۆری زیاترەوە هەڕەشەی خۆیانبردبایـە سـەر بـارو دۆخەکـە پتـر دەشێوا و رەنگ بوو لەڕێوە رەنگدانەوەی‌نـەخوازراوی هـەبێ، چونکـە تـا ئێسـتا دوو بـەش بـۆ دەرباز بوون لەسزادانی شاردنەوەی کەل و پەل بایی‌دار خۆیان گۆڕیبوو و باری‌قورسی تاوانیان هاویشتبووە سەرشانی ئەو بەشانەی سالـمەخەتەیان‌نـەکردبوو. لـە راسـتیدا یـەکێک لـەو بەشـانە ئەوەندە پـاک رەوشـت و بـەرزەئاکار بـوو کـە لـە رۆژی یەکەمـدا هـەر چـی هـەبوو و نـەبوو گەسکی لێ‌دا وپێشکەشی کرد. بەختەوەرانـە سەرحیسـاب بـۆ ئـەوەی کـاری زیـادی‌نەکەوێتـە ئەستۆی تەمای گرت سیایی ئەو شتانەی تازە دەدرێن بە جیارابگرێ و ئەو کارەش بە قـازانجی هەمووان بوو، تاوانبار و بێ‌تاوان‌تەواو بوو، چونکە هەر کامیانی بردبایـەوە سەرحیسـابی پێشـوو بێ‌گومان‌سرنجی دەکەوتە سەر لاری و لەوێری ئێرە و ئەوێ.

حەوتوویەک دواتر گەندەپیاوان رایانسپارد کە ژنیـان دەوێ. هـەرزۆر سـادە، دەبـێ ژنمـان دەبەر کەن. ئەو داوا چاوەڕوان نەکراوە هەرچەند لـە سـەر یـەک نائاسـایی نـەبوو، هـەر وەک چـاوەڕوان دەکـرێ بـوو بـەهۆی هـەرا و هەڵـلا و گـاڵ و بـوغر، ئـەو راسـپێراوە چەواشـانەی ئەوفەرمانەیان راگەیاندبوو لەڕێوە گەڕانەوە هەتا بلـێن هـیچ‌کـام لـە بەشـەکان‌ناچنـە ژێـر بـاری گرانی ئەو سووکایەتییە و بەڵگەشیان ئەوەیـە نابـێ پلـەی‌شـەڕافەتی ژنـان پێخوسـت بکرێـت و پەڵەی رەش بخرێتە سەر داوێنی‌مرۆڤایەتی، جا با بەشی سێی دەستی چەپ ژنیشی لێ‌نەبێ خـۆ ناکرێ‌بەرپرسایەتی ئەو کارە، ئەگەر بەرپرسایەتییەک هەبێ، بخرێتە سەرشانی خەڵـکی دیکـە. وڵام کورت و پتەو بوو، بێتوو ژنمان بۆ نەنێرن کەس‌نـان و پێخـۆری ناگاتـە دەسـت. راسـپاردە سەرشـۆڕەکان بـەم فەرمانەوەگەڕانـەوە بەشـەکان، یـان دەبـێ بچـن یـا هیچمـان نادەنێیـە. ژنـە بێ‌مێردەکان، ئەوانەی کە پیاوێکی دیاری‌کراو یا کاتییان نەبوو خێرانارەزامەندییان دەربڕی کـە ئامادە نین خۆیان بە دەستەوە بدەن و زگی‌پیاوی ژنێکی دیکە تێر کەن، تەنانەت یەکێک تەواو رووی خۆی هەڵماڵی‌و هیچ ڕێزی بـۆ ژنییـەتی خـۆی دانـەنا و گـوتی ئەگـەر پـێم خـۆش بـێ

دەچمبەڵام هەر چی وەگیرم کەویٚ هەر ئی خۆمە و بەشی کەسی لیٚنادەم،ئەگەر پێشم خۆش بوو لە لایان دەمێنمەوە، کە وا بیٚ هەم جیٚ خەومەیە و هەم خۆراک. بیٚ لە روو دامان ئەو قسانەی کرد، بەڵام بە کردەوەلە دووی نەچوو، خێرا مەترسیی بەرەو روو بوونەوەی لەگەڵ بیستپیاوی تێماوی تامەزرۆی هێنایە بەرچاو کە تاسە و مەیلی پێویستیاننیشانی دەدا هەوەس کوێری کردوون. بەڵام ئەو قسەیە کە هەر وابەهەوا لە بەشی دووی لای راست وێژرابوو نەکەوتە قۆل و قۆزرایەوە،یەکێک لە راسپاردەکان بە دەرفەت هێنان قۆڵی بۆ گوتەی ژنە کێشا ووتی باشتر وایە ئەو ژنانەی خۆیان خوازیاری ئەو خزمەتەن بێنە پێش ولە بیریان بیٚ ئەو کارەی کەسیٚ بە ویست و دڵخوازی خۆی بیکا دەرد وئازاری کەمترە لەوەی بیهەویٚ بە زۆری و بە بیٚدڵی ئەنجامی بدا. تەنیاتۆزیک شەرم و حەیا کە پێویستی زمان پاراستنی دێنایەوە بیر نەیهێشتپێشنیارەکەی بەم پەندە داکووژێنیٚ، کە دەڵیٚ، هەتا بزن نەکا بێلە بێلیٚ،نێری ناکا هێلە هێلیٚ. سەرەڕای ئەوە، هێشتا قسەکەی تەواودەرنەبڕیبوو کە لافاوی نارەزامەندی کەوتە ریٚ و کابرای بە تووڕەییرامالی، پیاوەکان کە بە پێی داب و نەریت و پلەی کۆمەلایەتی لە روانگەیئەخلاقییەوە ورەیان بەردابوو لە لایەن ژنانەوە درانە بەر تەوس و پلارو هەر نێو و نیتکەیان بۆ داباری، ئەوان بە هەق دەرهەڵبوون و گوتیانپیاوەکان خوێڕین، سەرگرن، پیسکەن، زێروون، دەڵەچەن، گەوادن وچی و چی. هێندێک لە ژنەکان پەشیمان بوون لەوەی رۆژێک بە دڵاوایی‌تاسە و ئارەزووی شەریکی رۆژانی پڕ دەرد و کوێرەوەری خۆیانرۆمرکاندووە و ئێستا ئەوان بیٚئەمەگی دەنوێنن و دەیانهەویٚ بیانخەنەزاری هەژدیهاوە و گرفتاری چارەنووسێکی شوومیان دەکەن. پیاوەکانتێکۆشان ریس و گوریس بۆ وەزعی خۆیان بێننەوە و بلێن واش نیە ونابیٚ بیٚتامی بکەن، قیرە و قیژە بۆچی، خەلک دەتوانن بە وتوویژ بگەنەرێک کەوتن، ئاخر وا باوە کە لە وەختی هاتنی بەلای لابەلا و ناخۆشدا،کە بیٚگومان ئەوەش یەکێکە لەوان، لیٚگەڕێن خوازیاران دەنگ هەڵبڕن،دەنا هەموومان، هەم ئێمەو هەم ئێوە، مەترسیی لە برسان مردنمان لەرێدایە. هێندێک لە ژنەکان بەم قسانە ئەهوەن بوونەوە، بەڵام یەکێک لەژنەکان لە پڕ دەرهەڵبوو و ئاوری ئاژاوەکەی گەشاندەوە و بە تەوسەوەپرسی ئەگەر ئەو خوێڕییانە لە جێی ژن پیاویان لیٚویستباین ئێوە چیتاندەکرد، دەنگ هەڵێنە با هەموو گوێیان لیٚبێت. ژنەکان لە خۆشییان لەکەولی خۆیاندا نەدەحەجمین، بە قریوەقریو و کەیفساز گوتیان بلێندەی، زۆریان پیٚخۆش بوو کە پیاوەکانیان لە داوێکی ئەستەم خستبوو،ئەو داوەی ریی گەڕانەوەی بۆ بەدی نەدەکرا، ئێستا دەیانهەویست بزانن‌ئەو مەنتیقە

بەرز و پیرۆزە فریودەرانەی پیاوان هەتا کوێ بڕ دەکا،یەکێک لە پیاوەکان غیرەتی قسانی وەبەر خۆی نا و گوتی ئێمە لێرەلووسکەی ژنانیلەمان نیە و ئەم ژنەی ئەو پرسیارە دنەدەرەیهەڵاییساندبوو گوتی هەروەها سەرکۆشیلەشمان نیە، بێتوو هەشمانبێتئامادە نین لەبەر خاتری ئێوە دەس بکەن بە خۆفرۆشیی. پیاوەکان بەدڵئێشاوی شانیان هەڵتەکاند و دەیانزانی تەنیا وڵامێک دەتوانێ کوڵوکۆی ئەو ژنە رقەونانە دامرکێنێ. ئەگەر پیاویان ویستبایە ئێمەدەچووین، بەڵام کەس غیرەتی گوتنی ئەو رستە کورت و روون وئاشکرایەی نەبوو و لەبەر دڵساردی لە بیریان چووبۆوە کە گوتنەکەیزەرەدی بۆ کەس نابێ، چونکە ئەم بیژووانە نەیاندەویست ئاوریتامەزرۆیی خۆیان بە پیاوان رۆمرکێنن.

ئێستا ئەوەی بە بیری پیاوەکاندا نەهاتبوو بە زەینی ژنەکان گەیشت،دەنا ئەو بێدەنگییەی پاش ئەم دمەقڕەیە وردە وردە وڵاتی داگرتمانایەکی دیکەی بۆ نەدەدۆزرایەوە، دەتگوت تێگەیشتبوون کەسەرکەوتنیان لە شەڕە قسە و کێبەرکێی هۆش و فیتنەگێڕیداجیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ ئەو تێشکانە مسۆگەرەی بۆیاندیاری کرابوو، رەنگە لە بەشەکانی دیکەش دمەتەقە و شەڕە قسە هەر وامەیدانداری کردبێ، چونکە دەزانین کە فامین و نەفامینی مرۆڤ لە هەمووشوێنێک یەکسانە. لێرەدا تەنیا کەسێکی حوکمی دوایی دا ژنێکی پەنجا وچەند ساڵە بوو کە دایکی پیری بە ملەوە ببوو و هیچ شتێکی تری بۆ دابینکردنی خورد و خۆراکی شک نەدەبرد. گوتی من دەچم و نەیدەزانی ئەوەدووپات کردنەوەی وتەی هاوسەری چاوپزیشکە لە بەشی یەکی قۆڵیراست، من دەڕۆم، لەم بەشەدا ژن کەمن، وێدەچوو هەر بۆیەناڕەزامەندیی کەمتر و ئارامتر بوو، جگە لە خێزانی دوکتۆر لەو بەشەداژنەکانی دیکە بریتی بوون لە کچەی چاویلکەیی، ژنی کوێرەپیاو، کچەیبەردەستی دوکتۆری چاوان، کیژەکەی خزمەتکاری هۆتێل، ئەو ژنەیکەس هیچی لە بارەیدا نەدەزانی و ئەو ژنەی نەیدەتوانی بخەوێ، بەڵاموەها خەمبار و لێقەوماو بوو کە باشتر وا بوو هەر لێی گەڕێن، چونکەبەڵگەیەک بەدەستەوە نەبوو کە لە یەکیەتی ژنان تەنیا پیاوان بەهرەوەربن. کوێرەپیاو دەستی کرد بەو قسانەی کە خێزانی ئامادە نیە بە هیچجۆرێک ئەو کارە دزێوە بکا و خۆی بەدەستەوە بدا، نە خۆی پێیخۆشەو نە ئەو ئیزنی ئەو ئاکارە چەپەڵە دەدا، چونکە شەڕەف لە قیمەت نایە وکاتێک مرۆڤ دەستی کرد بە دانی قانی بچووک، لە ئاخریدا ژیانی کلۆر وبێمانا دەبێ. پاشان چاوپزیشک لێی پرسی، باشە لەو بارودۆخەیئێستادا کە برسی و تینوو هەتا ملان لە پیسایی و زەلکاو رۆچوون و کێچو ئەسپێ و هەزاران جڕ و جانەوەر پێیان

هەڵگەڕاون و جێیەکی ساغیانلە جەستەیدا نەهێشتوون، چ مانایەک بەدی دەکا، منیش پێم خۆش نیەخێزانم بچێ، بەڵام ویستی من بە کەلکی چ دێت، خۆی گوتوویەتیئامادەیە بچێ. تەمای خۆیەتی، دەزانم هەستی بەرزەفڕی پیاوانەم کە بەغیرەت نێودێر کراوە، دەژاکێ و بریندار دەبێ، هەڵبەت ئەگەر دوای ئەوهەمووە سووکایەتی و خوێڕی کردنە شتێکی شایانی ئەو ناوە مابێ ونەفەوتابێ، بەڵام چارە چیە، بێتوو بمانهەوێ نەمرین رەنگە ئەوە تەنیارێ چارە بێت، کوێرەپیاو هەڵچوو و بە تووڕەیی وەڵامی دایەوە هەرکەس بە ربەی ئەخلاقیی خۆی دەپێوێ، ئەوە بڕوای منە و لە سەری‌سوورم. پاشان کچەی چاویلکەیی گوتی خۆ خەڵکی دیکە نازانن ئێرەچەند ژنی لێیە، کە وایە تۆ دەتوانی ژنەکەت نەنێری و هەر پاوانی تایبەتیخۆت بێ، ئێمە زگی تۆ و ئەو تێر دەکەین، ئەو کات پێم خۆشە بزانمسەبارەت بە شەڕەفت چ هەست و هەڵوێستێکت هەیە و ئەو نانەی بۆتدێنین چ تامێک دەدا، کوێرەپیاو ویستی بڵێ مەبەست ئەوە نیە، قسە لەوەدایە کە، بەڵام ئیتر هیچی بە مێشکیدا نەهات و قسەکەی نیوەچڵ مایەوە،بەڕاستی نەیدەزانی دنیا چۆنە، ئەوەی لە پێشدا گوتبووی بیروڕایەکیلێڵ و تەماوی و تایبەت بە دنیایەکی دیکە بوو، نەک ئەو دنیایە، بێ‌گومانلەجێی قبووڵ کردنی ژیانی خوێڕیگەری لە سایەی خۆ بەدەستەوەدانیژنی خەڵکەوە دەبوو شوکرانە بژێری ئەو نیعمەتەی خوا بێ کە تەپڵیحەیا تکانی لێرولەوێ بۆ لێ‌نەدەن. ئەگەر وردتر باسی بکەین لە سایەی‌سمتی خێزانی چاوپزیشک درێژەی بە ژیان دەدا، چونکە جگە لە کچەی‌چاویلکەیی کە مارە و تەڵاقی کەسی بە سەرەوە نەبوو و ئێمە گەلێ‌چووینە نێو پێچ و پەنای چۆنیەتی ژیانی بێ پنج و مۆری، بێتوو ئەوانی‌تر مێردیان بووبێت، مێردەکانیان دیار نەبوون. ئەو بێ‌دەنگییەیی بەدوای گوتەی دوا بڕوای ئەوا باڵی ئەنگاوت دەتگوت چاوەڕێی کەسێک‌بوو کە بێ ئەمڵا و ئەولا بارودۆخەکە بۆ هەمووان روون کاتەوە و ئەوەتەنیا دەنگی ساف و بێ‌گرێی ژنی کوێرەپیاو بوو کە گۆمی مەندیشڵەژاند و گوتی من هیچ جیاوازییەکم لەگەڵ ژنەکانی دیکە نیە، هەر چیئەوان بیکەن منیش دەیکەم، پیاوەکەی هاتە نێو وتەکانی، نا، تەنیا ئەوکارەی من دەڵێم دەیکەی، ئەوندە فیز و فەرمان لێ‌مەدە، لێرە کڕیاری‌نیە، تۆش وەک من کوێری، ئەوە نانەجیبییە، تۆ نانەجیب مەبە و لێرە بەدوا هیچ مەخۆ، وەڵامێکی بێ‌روحمانە بوو، هیچ‌کەس چاوەڕوانیی ئەوقسانەی لە ژنێک نەدەکرد کە تا ئەوڕۆ هەمیشە بە ویستی مێردەکەی‌هەستاوە و دانیشتووە و سەری بەرداوەتەوە و رێزی لێ‌گرتووە. نیمچەقاقایەک دەنگی دایەوە، کارەکەری هۆتێل بوو، ئای زگ، ئای زگ، ئاخرپیاوەی چارەڕەش قوڕی کوێ وەسەر کا و لەپڕ

پێکەنینەکـەی بـوو بـەگریان، قسـەکانی گـۆڕان، گـوتی چ قـوڕێکی وەسـەر کـەین، زۆر وەکپرسیار ئەو رستەیەی لە لێو دابـاری، پرسـیارێکی کـە جگـە لـە خۆبەدەسـتەوەدان و سـەر داخستن کەم و زۆر وڵامێکی تری نـەبوو، وەکووسـەر لەقانـدنێک لـە رووی ناچارییـەوە، کـار گەیشتە ئەو جێیەی مونشیمەتەب لەبەر خۆیـەوە دووپـاتی کـردەوە بەڕاسـتی قـوڕی کـوێ بـە سەرداکەین. هاوسـەری دوکتـۆر نیگایـەکی هاویشـتە سـەر مقەسـتە گۆرینـەیهەڵاوەسـراو، لـە چاوانیڕا وا دیار بوو ئەویش هەر ئەو پرسیارە لە خۆیدەکـا، بـەڵام ئـەوەی ئـەو لێـی دەگـەڕا وڵامی ئەو پرسیارە بوو کە بەسەریاندا رووخا، چتان لە من دەوێ.

بەڵام هەر شتێک لە وەختی خۆیدا جوانە، ئەگەر کەسێک لە پێشخەڵکا لە خـەو هەسـتێ، ناشی بڵێ دەبێ زووتریش بمرێ. هاوبەندانیبەشی سێی لای چەپ، بە شێوەیەکی رێکوپێک خۆیان سازداوە وتەمایان گرتووە کە لە نیزیکترین بەشـەکانەوە، یـانی ژنـەکانی بەشـەکانیلای خۆیانەوە دەس پێ بکەن. کەلک وەرگرتن لە شێوەی نۆرە گەڕان بـەرێوجـێ و جـوان و بـێ گرێوگۆڵە، یەکەم چونکە هەر وەختێک بیانهەوێبزانن کێ نۆرەی کردووە و کێ ماوە بیکـا دیـارە، وەکـوو ئـەوەی لـەکاتژمێـر بـڕوانین و بڵـێین چەنـدەی رۆژ چـووە و چەنـدمان کـار کردووە،ئەوەندەی ماوە و نەماوە، دووهەم کاتێک تـەواو بـوو دەس پـێکردنـەوەیسـەرلەنوێ کەش و هەوایەکی خـۆش و تـازە و حاشاهەڵـنەگری بەدواوەیـە، بەتایبـەت بـۆ ئـەو کەسـانەی بیرگەی هەستیان لاوازە. کە وایەرێ بدەن ژنەکانی بەشەکانی قۆڵی راست کـەیفیان سـاز بـێ، ئاگرەسوورێ، لە خۆم دوورێ، ئەوە رستەیەک بوو کـە هـیچکـام لـە ژنـەکاننەیاندێنایـە سـەر زمان، بەڵام لە بـیری هەموونـدا راوێچکـەی دەکرد،بەڕاسـتی مرۆڤـێک لـە دایـک نـەبووە کـە خاوەنی قاپۆری دووهەم یانی خۆبە زل زانی نەبێ، ئەو قاپۆرەی زۆر لە ئەوی دیکە زیـاتر خـۆ رادەگرێ کەلەڕێوە خوێنی دەڕژێ. دەبێ ئەوەشمان لـە بـیر بـێ کـە ئـەو ژنانـە بـە دووبارانـدا کەیفیان ساز بوو، نەهێنییەکانی روحی مرۆڤ ئاوایە، چونکەمەترسیی ئەو سووکایەتی پێکرانـە خێرایەی دەبوو بیچێژن، ئیشتاینەفسانیی، کە بـە هـۆی ژیـانی یـەکبـینی پـەرەگرەوە رەنگـی دۆڕابوو،بزاوتن و گەشەی پێدا، دەتگوت پیاوەکـان بـەر لـەوەی ژنـان بنێـرنلـەتاوان شەقڵـیان دەکردن و ژنەکانیش دەیانویست بیرەوەری ئەو چێژ وئۆخژنەی بە مەیلی خۆیـان دەسـتەملانی دەبوون بێننەوە یاد هـەتا لەبەرامبـەر دەسـدرێژی ئـەو گـوڕ و تینـە نـەخوازراوەی بـە سـەریاندا دەسەپاو ئەگەر کرابا ملیان پێ نەدەدا، بەرگری لە خۆیـان بکـەن. ناچـارین بەشـییـەکی قۆڵـی راسـت بـۆ وێنەیـەکی بـەرچاو هەڵـبژێرین و بـزانین کێشـەیزۆری و کـەمی ژن و پیـاو چلـۆن

چارەسەر دەکرا، تەنانەت ئەگەر پیاوەبێ دەسەلاتەکان دەرهاوێژین، چەشنی پیرەپیاوی چاوبێن لە چاو وهەروەها ئەو پیر و لاوە نەناسراوانەی بە هەر بەڵگە و بۆنەیەک بێ، نەقسەیەکیان کردووە و نە کارێک کە بایخی ئەوەیان هەبێ بێنە نێوداستانی ئێمەوە. هەر وەک پێشتر گوتمان ئەم بەشە حەوت ژنی تێدایە،بۆ وێنە ئەو ژنەی گیرۆدەی نەخۆشیی نەخەوتنە و ئەو ژنەی کەس‌نایناسێ و ئەو ژن و مێردەی ئاسایی دێنە ژومار، کە وا بوو رادەی ژن وپیاوەکان زۆر یەکتر ناخوێننەوە، هەڵبەت کورە خیلەکەش هێشتا بە پیاوحیساب ناکرێ. رەنگە لە بەشەکانی ترا ژن زیاتر لە پیاوان بن، بەڵام ئەویاسا نەنووسراوەی کە خێرا تێکڕا قۆڵیان بۆ کێشا و پاشان بوو بە باو،وا حوکم دەکا هەر گیروگرفتێک لە هەر کام لە بەشەکاندا بێتە پێش دەبێ‌لە سەر بنەڕەتی بیر و ڕای پێشینیان کە هەرگیز لە پێ‌هەڵاگوتنی ئەقڵ وفامیان ماندوو نابین چارەسەر بکرێ، جا چەندە جوانە خۆزگە ئەودەستە بەم دەستە موحتاج نەبێ. کە وایە ژنەکانی بەشی یەکی لای‌راست، جگە لە خێزانی دوکتۆر کە بە زۆر بەڵگە و بۆنەوە کەس‌نەیدەوێرا چ بە قسە و چ بە کردەوە هەڵیفریوێنێ، ئەو پیاوانەی لەگەڵیان‌لە ژێر میچێکا حەواونەوە دڵداری دەدەنەوە. وەک ئاگامان لێیە تا ئێرەژنی کوێرەپیاوە بەم وڵامە توند و تیژەی دایەوە بە مێردەکەی سەردەقی‌شکاند و بە قەولی خۆی هەر ئەو کارەی کرد کە ژنەکانی تر دەیانکرد. بەڵام شێوەیەک روو لێ‌وەرگێران هەیە کە نە ئاوەز چی پێ لەگەڵدەکرێ، نە ئیحساس، چەشنی بابەتی کچەی چاویلکەیی کە هەر چەندی‌شاگرد دەوافرۆش لە بەری پاڕایەوە و وەبەری هەڵخوێند و شێر ورێوی بۆ هێنایەوە نەیتوانی دڵی نەرم کا و بەم شێوەیە تۆڵەی‌سووکایەتی پێشووی لێ‌کرایەوە. هەر ئەو کیژە کە لە هەموو ژنەکانی‌ئەو بەشە بەژن و باڵا تەرز و جوانتر و دڵخوازترە، کاتێک باسی جوانیی‌بێ سنوور و وێنەی کەوتە سەر زاران تێکڕا ئاوریان بۆ گرتبوو،ئاخرییەکەی شەوێکی سەری لە پیرەپیاو هەڵێنا، هەر بەڕاستی کەس لەکاری ژنان ناگا. پیرەپیاو ئەوی وەکوو رێژنە بارانی هاوینی قۆزتەوە وزۆر چاک تاسەی دامرکاند و بەم شێوەیە جارێکی تر سەلماندی کەئینسان نابێ فریوی رواڵەت بخوا و ناکرێ لە رووی رواڵەت و نەرمیی‌ئەندامەوە هێز و وزەی دڵ و دەروون بەدی بکرێ. هەموو دانیشتوانی‌بەشەکە ئەو کردەوەی کچەیان بە جۆرێک لاواندنەوە و خێر پێ‌کردن‌هێنایە ژومار. . . بەڵام تەواوی ئەو پیاوە دڵناسک و خەیاڵاوی‌یانەی هەتائێستا گیرۆدەی ببوون داوی باڵی باڵندەی خەیاڵیان هەڵپساند و بەخۆیان گوت لە دنیادا هیچ دیارییەک بەم رادەیە بەرز و مەزن نیە کەپیاوێک بە تەنیا لە جێگادا رابکشێ و خەریکی تێک

کردنەوەی خەیاڵیدوورەدەست بێ کە لە پڕ دەستێک بە نەرمی پێخەفی لە سەر لادا وبخزێتە باڵی، دیارە ئەوانەش بەڵگەیەکی روون و بەرچاو نادەنبەدەستەوە جگە لە وەی کە دڵی ژنە ویستوویەتی. ئەوە شانس وبەختێکە نەمر، برێ جار بۆ رەخسانی هەلێکی وەها پێویستە پیاوێک پیربێ و چاوبێنی رەشی لە سەر قاپێلکی چاوی قەلپووچی بێت. جگە لەمانەشتی وا هەن کە باشترە کەندە و کۆژەیان لە سەر نەکرێ، باشتر وایەخەریکی گێڕانەوەی رووداوەکان بین و بیر و هەستە نەهێنییەکانیخەڵک نەدۆزین، بۆ وێنە باسی ئەوە بکەین کە ژنی دوکتۆر لە تەختیخەوەکەی هاتە خوار تا بچێ کوڕە خێلەکە داپۆشێتەوە. بەلام لەگەڕانەوەدا ئێستێک راوەستا و لە باریکەڕێی نێوان تەختەکانی بنەباندایاڵی بە دیوارەوە دا و بە لێقەوماوی لە دەرگای ئەو سەری روانی، هەرئەو دەرگایەی رۆژێک پێیا وەژوور کەوتن و ئێستا گەلێ دوورە دەستو بێبواری دەنواند. هەر لەو شوێنە راوەستابوو کە بینی شووەکەیهەستا و چەشنی خەوگەڕان چاوی بز کردن و راستە و راست بەرەوتەختی کچەی چاویلکەیی خوشی. کچە کارێکی وای نەکرد کابرابپرینگێتەوە. ژنە هەر وا راوەستا و دیتی کە ئەوەی نەدەبوو بکرێ کرا،کچە گوتی ئەیرۆ دوکتۆر، جا ئەم وشانە دەیانتوانی بە گاڵتە دەستاودرابنەوە بەلام نا وا نەبوو، دوکتۆر گوتی بمبوورە، نازانم چیم بە سەرهاتووە، ئێمە هەقمان بەدەستە، ئێمە کە وا بەرچاو تەنگین چۆن دەشێشتێ بزانین کە ئەم خۆی نایزانی. لە سەر تەختی تەسک راکشا بوون وتەنانەت بە بای خەیاڵیشاندا نەدەهات کە کەسێک دەیانبینێ، بێگومانچاوپزیشک بە خەیاڵیا رانەدەبوورد، بەلام لەپڕێ کەوتە دوو دڵی و لەخۆی پرسی داخوا ژنەکەی خەوتووە یا هەر وەکوو شەوان خەریکەولات دەپشکنێ، تەکانێکی لە خۆیدا هەتا بگەڕێتەوە سەر تەختەکەیخۆی، بەلام دەنگێک گوتی هەڵمەستە و دەستێک چەشنی شنەی بای باڵیباڵندەیەک لەسەر سینەی ئۆقرەی گرت، دەیهەویست شتێ بڵێ، رەنگەویستبای دووپاتی کاتەوە کە نازانێ چی بە سەر هاتووە، بەلام دەنگەکەگوتی بێتوو متەق نەکەی باشتر تێدەگەم. کچە لە پڕمەی گریانیدا و بەورتەورت گوتی ئێمە چەند چارەڕەشین، جا پاشان، منیش دەمویست،منیش دەمویست، تاوانی تۆ نەبوو، ژنی دوکتۆر بە نەرمی گوتی ئارامبگرە، وەرن هەمووومان ئارام بین، جاری وایە قسە کردن هیچ دەردێکچارە ناکا، خۆزیا منیش ئەسرینم داباریبان، ئەو کات بە فرمێسکمهەموو شتێکم دەگوت و ناچار نەبووم بدوێم و خەڵک گوێی لێبێ. لەسەر لێواری تەختەکە دانیشت، باوەشی بۆ کردنەوە، دەتگوت ئەم دووەوێکرا لە باوەشی دەگرێ، لە سەر کچەی چاویلکەیی داهاتەوە و بە گوێیاچرپاند من دەبینم. کچە

بێدەنگ و هێور جووڵەی نەکرد. تەنیا سەری لەوە گێژ بوو کە سەری سوڕنەماوە. دەتگوت هەر لە هەوەڵەوە دەیزانیو وەسەر خۆی نەدێنا، چونکە ئەوە رازی ئەم نەبوو. بە ئارامی سەریوەرسووڕاند و بە گوێی خێزانی دوکتۆریا چرپاند دەمزانی و تەنیا تەواولێم سوور نەبوو، بەڵام لام وایە دەمزانی، ئەوە رازێکە و نابێ لای کەسبیدرکێنی. دڵنیا بە، من باوەڕم پێتە، دەبێ هەر واش بێت، پێم خۆشە بمرمو خەیانەت بە ئێوە نەکەم، دەتوانی بە من بڵێی »تۆ«، ئاخ نا ناتوانم، قەتناتوانم. دوو ژنەکە هەر وا بە نۆرە بە گوێی یەکتریانا چرپاند، قژ و گوێی یەکتریان بە دەست و زمان لاواندەوە، ئەوە شێوە دوان و زمانێکی شاراوە بوو، زمانێکی زۆر قووڵ و پتەو، هەڵبەت بێتوو بشێ ئەمدژایەتییە پێکەوە سازاو نیشان بدرێن، وتوویژێکی کورتی یەک گرتووانە کە دەتگوت پیاوەکەی تێدا بە نەبوو گیراوە، بەڵام ئەویشی لەمەنتیقێکی ئەوپەڕی سنووری راستەقینە و بیرورا هیچ و پووچەکانادەختستە داو. پاشان ژنی دوکتۆر بە مێردەکەی گوت ئەگەر دڵت پێیخۆشە هێندێکی تریش لێرە رابکشێ. نا، دەگەڕێمەوە سەر تەختی خۆمانکە وایە منیش یارمەتیت دەدەم. هەستا هەتا رێی جووڵانەوەی زیاتر بۆمێردەکەی چۆل بکا و کەوتەوە یادی ئەو دەمەی دوو سەر لە سەرسەرینی تۆزاوی جووت ببوون، ئەم دووە سەر و روخساریان هاڵۆز وچڵکن بوو و تەنیا چاویان بێ ئامانج دەدروشایەوە. چاوپزیشک بەهێمنی هەستا و دەستی بۆ شتێ کوتا، پاشان بە دڕدۆنگی لە پەناتەختەکە رەق راوەستا، دەتگوت لەپڕ جەغزی شوێنەکەی لێشێوا،پاشان هاوسەری وەک هەمیشە دەستێکی گرت، بەڵام ئەم جووڵانەوەیەئەوجار مانایەکی تری هەبوو، دوکتۆر هەرگیز وەک ئێستا پێویستی بەرێنوێنیی کەسێ نەبوو، هەڵبەت خۆی هەرگیز ئەو مەبەستە نازانێ وتەنیا دوو ژنەکە بە ڕاستی دەیانزانی. دروست لەو کاتەدا کە ژنیچاوپزیشک بە دەستەکەی دیکەی روومەتی کچەی دەلاواندەوە، کچە بەناچاری پەنجەی گرت و ماچی کرد. دوکتۆر لای وا بوو دەنگی هەنیسکیدێتە گوێ، دەنگێکی ناژنەوتەنی کە تەنیا دەتوانێ هی ئەم فرمێسکانە بێ کە بە نەرمی بە کوڵمەدا سەرەولێژی سووچی لێو دەبن و وا لەمشوێنەوە بزر دەبن هەتا خولی بێبڕانەوەی پەژارە و شادییە مەزنەکانیئینسانیی سەر لە نوێ دەس پێبکەنەوە. کچە خەریک بوو تەنیادەمایەوە، کەسێک بوو کە دڵدانەوەی دەویست، هەر بۆیە خێزانیچاوپزیشک لە کێشانەوەی دەستیدا پەلەی نەبوو.

بۆ سبەینێ لە سەر شێو کردن، بێتوو بشێ بەم چەند ورکەنانەرەق وتەق و گۆشتە برشاوییە بگوترێ شێو، سەر و سۆراغی سێ پیاوی کوێر لە قۆڵەکەی دیکەوە پەیدابوو، ئەوان لە

نێودەرانەی بەشی سێهەم‌راوەستان. یـەکیان پرسـی ئێـرە چەنـد ژنی لێیـە، ژنی دوکتـۆر وڵامـی دایەوەشەش، بیری پاک و بەخێر بوو و دەیهەویست ژنە بێ‌خەوەکە هەڵاوێرێ،بەڵام ژنەکـە بـە راوێژێکی لێ‌قەومانە قسەکەی راست کردەوە، ئێمەحەوتین. گەندەپیاوان لـە فرقـەی پێکـەنینیان دا، یەکیان گوتی، لێتان قەوما،ئەمشەو کارتان دژوار دەبێ، ئەوی تـر پێشـنیاری کـرد رەنگـە وا باشتر بێ‌بچینە بەشەکی تر و بە دوای هێزی یارمەتی‌دەرا بگەڕێین، سێهەمیان کەهێنـدێک وردە حیسابی دەزانی گوتی بە زەحمەتەکەی نابێ، هەر یەکەی‌وەبەر سـێ پیـاوان دەکـەون، بەرگـە دەگرن. یەکیان بەم قسەیە پێکەنی وئەو کەسەی رادەی ژنـەکانی پرسـیبوو فـەرمانی دا ئەگـەر ئیشتان تەواوبوو وەرنە لای ئێمە و زیادی کرد هەڵبەت ئەگەر دەتانهەوێ سبەی شتێ بخـۆرن و شیر بدەن بە شووەکانتان. لە هەموو بەشەکان ئـەو قسـانەیان‌کردبـوو، سـەرەڕای ئـەوەش وەک یەکەم رۆژ کە ئەو جەفەنگانەیان سازکردبوو لە قاقای پێکـەنینیان دا. بـە پێکـەنین رەش و شـین دەبوونەوە،پێیان بە زەویدا دەکوتـا، گۆپاڵـە ئەسـتوورەکانیان لـە حـەرز دەدا، هەتایـەکیان لەپـڕ هەڕەشەی کـرد، بـاش پژنـەون، هـەر کامتـان سـەر و بـنی‌مانگتانـە گـەرەکمان نیـە بێـت، لێـی دەگەڕێین بۆ جارێکی تر، ژنی دوکتۆرگوتی کەس لە حەیزدا نیە، کە وایە ئامادە بـن و زۆری پێ‌مەخایەنن، ئێمەچاوەڕوانتانین. گەڕانەوە و رۆیشتن. بـێ‌دەنگـی باڵـی بـە سـەر بەشەکەکێشا. تاوێک دواتر ژنی کوێرەپیاو گوتی ئێدی خواردنم لـە گـەروو ئاوانابـێ، پارووچکەیـەکی پـێ بوو و هێزی خواردنی نەبوو. ژنەی خەو تاراوگوتی منیش هەرواتر، ئەم ژنەی کەس نەیدەناسی گوتی منیش،کارەکەری هۆتێل گوتی ئیشـتیام بـە سـەر چـوو، کچـەی مونشـی دوکتۆرگـوتی منیش هەر وا، کچەی چاویلکەیی گوتی مـن لـە سـەر روخسـاری‌یەکـەم کەسـێ کـە نیـزیکیم لێ‌بکا ئەوەی خواردوومە دەیهێنمەوە. هەمووله‌رزۆک و تەماگرتوو هەستابوونە پێ. پاشـان ژنی چاوپزیشـک گـوتی مـن‌لـە پێشـەوە دەڕۆم. کوێرەپیـاو لـە بـیری چوویـەوە کـە کـوێرە و لـە تاوانسەری لە ژێر پێخەفەکەی راکرد. دوکتۆر خێزانی بۆ لای خۆی راکێشا وبێ ئـەوەی شـتێ بڵێ نێوچاوانی بـە سـاردی رامووسـی، تـازە چـی لـە دەس‌دەهـات، بـۆ پیاوەکـانی تـر فـەرقی نـەدەکرد، هـەتا ئـەو شـوێنەی پەیوەنـدیی‌بـەم ژنانـەوە هـەبوو هـیچ‌کـام لـە پیاوەکـان ئـەرکی مێردایەتییان بەسەریانەوە نـەبوو، کـە وا بـوو کـەس نەیـدەتوانی لـە پێشـیان قـوت بێتـەوە وبڵـێ گەوادی رازی، رووی گەوادی ناڕازی سپی کردۆتەوە. کچـەی‌چاویلکـەیی کەوتـە دوای ژنی چاوپزیشک، پاشـان کارەکـەری هۆتێل،مونشـی دوکتـۆر، ژنی کوێرەپیـاو، ئـەم ژنـەی کـەس نەیدەناسـی و ژنـەی‌بـێ‌خـەو ریزیـان بەسـت، ریزێکـی خـواروخێچی ژنی شڕۆڵـی بۆگـەنی

پیس،وەکوو دیارە ناشێ مەیلی پیاوەتی پیاوان ئەوەندە بەهێز بێ کە هەستی‌ناسکی بۆن کردنیان لە کار بخا، تەنانەت هێندێک لە زانایانی دینی لایان‌وایە کە ناخۆشترین بەشی ژیانی نێو دۆزەخ خوو گرتن بە بۆگەنی هێلنج‌هێنە، هەر چەند تەواو ئەم وشانەش ناهێننە کایەوە. ژنەکان بە ئارامی‌کەوتنە رێ و ژنی چاوپزیشک رێنوێنی دەکردن و تێکڕا دەستیان لە سەرشانی یەکتر دانابوو. هەموویان پا پەتی بوون و نەیاندەویست لەم‌گێرەوکێشە و کوێرەوەرییەی قەرار وا بوو بە سەر شانیاندا بێت‌پێڵاوەکانیان گوم کەن. کاتێک گەیشتنە سەرسەرا، خێزانی چاوپزیشک‌بەرەو دەرگای دەرەوە کەوتە رێ. بێ‌گومان تامەزرۆ بوو بزانێ داخۆهێشتا دنیا ماو یان نا. پێشخزمەتی هۆتێل کە بۆنی هەوای تازەی هەست‌پێ‌کرد بە ترساوی وەبیری هێنایەوە کە ناکرێ بچینە دەرەوە،سەربازەکان وا لەوێن. ژنەی بێ‌خەو گوتی باشتر، لە چاوتروو کانێکاهەموومان دەمرین، دەبێ هەر واش بێت. دەبێ هەموو بمرین،بەردەستەکەی دوکتۆر پرسی مەبەستت لەم چەند کەسەیە، نا،هەمووومان، هەموو ژنەکانی ئێرە، ئەو کات لانی کەم کوێریمان باشتر بۆدەچێتە سەر. لەوەتی هێنابوویانە ئێرە، ئەوەندەی قسە نەکردبوو، ژنی‌چاوپزیشک گوتی وەرن بڕۆین، کاتێک مەرگ ئینسانی هەڵبژارد هەواڵی‌بۆ نانێرێ. بەم دەرگایەدا کە بەرەو لای چەپ دەکرایەوە تێپەڕین،رێڕەوە تەسک و درێژەکانیان هەڵبوارد، ژنەکانی دوو بەشی ئەوەڵ‌ئەگەر پێیان خۆش بایە دەیانتوانی پێیان بڵێن چ شتێک چاوەڕوانیان‌دەکا، بەڵام چەشنی ماینی قەمچی‌کوت لە تەختەکانیاندا خۆیان وێک‌هێنابوو، پیاوەکان نەیاندەوێرا دەستیان بکەنێ یا تەنانەت لێیان نیزیک‌ببنەوە، چونکە ژنەکان لەڕێوە دەستیان دەکرد بە قیژە و هەرا.

لە ئاخرین رێڕەوی بنەبانی ساختومانەکەدا ژنی چاوپزیشک‌پیاوێکی کوێری بینی کە وەک هەمیشە ئێشکی دەکێشا. رەنگە خشپەی‌پێ بیستبن کە هەواڵی دا ئەوە دێن، ئەوە دێن. لە ژوورەوە بوو بە قاقا وپێکەنین و چەپڵەڕێزان. چوار پیاوی کوێر رانەوەستان و خێرا ئەم‌تەختەی کرابوویە لەمپەر لایاندا، یەکیان گوتی خێراکەن کچینە وەرنەژوور، وەرنە ژوور، هەموومان وەک ئەو ئەسپانەین کە بۆنی ماینمان‌کردبێ، ئیتر گەندەپیاوان گەمارۆیان دان، بەڵام کاتێک سەرکردەی‌دەمانچە بەدەست گوڕاندی خۆتان دەزانن کە لە پێشدا من هەڵدەبژێرم،تێکڕا کشانەوە دوا. چاوانی زەقی چەتان بە تامەزرۆیی لە دوایان‌دەگەڕان. هێندێک دەستی تامەزرۆیان رائەنگاتبوو بەڵکوو بە هەڵکەوت کەسێکی وەبەر بێت و پاشان بە مەیلی خۆی لەگەڵ بکا. لە باریکەڕێی‌نێوان دوو ریزی تەختەکاندا ژنەکان چەشنی ئەو سەربازانەی لە

سان‌درابن جەلەیان بەستبوو. سەرکردەی کوێری دەمانچە بـە دەسـت بـۆ لایـان‌بـزووت، هێنـدە چوست و چالاک بوو کە دەتگوت دەیدیتن. دەستی بەتاڵی‌لە ژنەی بێ‌خەو کە یەکـەم کـەس بوو کوتا. ژنەی کوێر دەستی کرد بە قیژەو هەرا و کابرا پاڵێکی پێوەنا، کالیارە کـۆن. گەیشـتە ئەوی تر کە بەهەڵکەوت ژنەی کەس نەناس بوو، ئێستا دەمانچەکەی لە گیرفانی نابوو وبـە دوو دەستان پەنجەی لێ‌دەکوتـا، ئـەوەیان خـراپ نیـە، پاشـان گەیشتەسـەر ژنی کوێرەپیـاو، دوایـە مونشی دوکتۆر و دواتر کارەکەری هۆتێل،لێرەدا گوڕاندی گوێ بگرن کوڕینە، ئەوانە جسـنی چاکن. زۆرکارانی کوێرقاقا پێکەنین و پێیان بە زەویدا کوتا، هێندێک هەرایان کرد هـەدادە بـا دەس‌بەکار بین، خەریکـە درەنـگ دەبـێ، سـەرکردەی لات‌ولووتـەکان گـوتی پەلەمەکـەن بـا ئەوانی تریش هەڵسەنگێنم. دەسـتی لـە پـەژن و بـاڵای کچـەی‌چاویلکـەیی کوتـا و لەخۆشـیان فیتوویەکی لێ‌دا، بەه DEL بەه DEL بەختمان‌وتوویەتی هەتا ئێستا شتی ئاوا ناسک نەکەوتۆتە داومـان. هـەر وا کـە لەهەڵسـەنگاندنی کچـە گـڕی گرتبـوو بـەرەو خێـزانی چاوپزیشـک بـزووت و وفیتوویەکی تری لێ‌دا، ئای لەم شەنگە ژنە، بەڵام سەیر جانانەیەکیشە. ئەم‌دووەی بۆ لای خۆی کێشا و گوتی من ئەم دووە دەبەم، کە تەواو بووم بۆئێوەیان بەڕێ دەکەم. راکێشـی کـردن بـۆ بنە بان، راست ئـەو شـوێنەی‌دەفـری گـەورە و بچـووکی شـێو و خواردەمـەنی لـە سـەر یـەک کەڵەکەکرابوون و تاقمێکی گەورەی پێ تێر دەکرا. ژنـەکان تێکـڕا بـە تـەواوی هێـزو توانـاوە دەیانزیقاند، لە هەموو لاوە دەنگی تێ‌کوتان و زللە و لێ‌تووڕەبوون دەهاتـە گـوێ، بـێ‌دەنـگ بن، هەی جەندەینە، ئەو جندانەهـەموویان تـوخمێکن، هەمیشـە دەس دەکـەن بـە زیـق و هـۆڕ، چاکی بگە فریاهەتا بێ‌دەنگ بێ، راوەستە نۆرەی من بێـت، ئـەو کـات دەبـینی تێکڕادەکەونـە لالانەوە و پاڕانەوە، خێرابە بزانم، ئیتر تەواو تاقەتم لێ‌بڕا. ژنەی‌کوێری بـێ‌خـەو وەبـەر دەسـتی پیاوێکی چوارشانەی بەخۆوە کەوتبوو ودەگریا، چەند پیاو وەکوو دەستەیەک کەمتیار دەوری کەلاکی چوار ژنیان‌دابوو. ژنی چاوپزیشک لە پەنا ئەو تەختـە راوەسـتابوو کـە کابراکێشـابوویە ئەوێندەرێ و بە دەستی لەرزۆک پەنجـەی لـە لاتـاری تەختەکـەقایم کردبـوو، تەماشـای کـرد سەرۆکی گەندەپیاوان پڕی بە جلی کچەی‌چاویلکەیی داکرد و دایدڕی، وتە بـێ‌شـەرمانەکانی دەبیست، کچە متەقی‌نەکرد، تەنیا زاری کردەوە هەتا بڕشـێتەوە، سـەر بـۆ لایـەک شـۆڕ ببـۆوە ونیگای بەرەو ئەو زەق دەچوون، کوێرە تەنانەت نەیزانی کە رشاوەتەوە،مرۆڤ کاتێـک بـۆنی رشـانەوەی بـۆ دێـت کـە ژینگـە بۆگـەن نـەبێ، لـە ئاخریداچەنـد جارێـک مچـوڕکی ئـۆخژن رایتلەکاند و کابرا وەک سەگلاوک‌مشاندی و تەواو بـوو. کچـەی چاویلکـەیی بـە بـێ‌دەنگـی

گریا. کوێری چەکدار دەستی بۆ لای ژنی چاوپزیشک راکێشا و بە دەنگێکی گوماناوی گـوتی ئێرەییت پێی نەیا دوایە نـۆرەی تۆیـە، پاشـان دەنگـی هەڵـێنا و هـەرای کـرد هـۆ کورپنـە وەرن ئەمەیان راگوێزن، بەڵام جوانی لەگەڵ بجوولێنەوە،بەڵکوو سەرلەنوێ بخوازم بێتەوە لام. پێـنج شەش پیاوی کوێر بەهەنگاوی لار و لوێر هاتنە بەرەوە و پڕیان بـە کچـە داکـرد و کـەم و زۆر بەراکێش راکێش بردیان. یەکیان گـوتی سـەرەتا مـن، سـەرەتا مـن، کـوێری چەکـدار لـە سـەر تەختەکەی دانیشتبوو، ژنی چاوپزیشکی لە سەر کۆشی ڕۆنا و داوای کارێکی دزێوی لێ کـرد و ئەو خۆی لێ پاراست، کابرا گوتی یان دەبێ بیکەی یا تێهەڵـدانت بەردەکـەوێ و بـێ شـێو سـەر دەنێیەوە، ژنەپرسی ناترسی تۆڵەت لێ بکەمەوە، گەندەپیاو بە هەڕەشە کردنەوە گـوتی دەسـم وا لە سەر قوڕگی تۆیە، هەر بەر لەمەی جوولە بکەی دەتخنکێنم. پاشان گـوتی لام وایـە دەنگـت ئاشنایە، بەڵی وایە تۆش رەنگت ئاشنایە، خۆتۆ کوێری و مـن نـابینی، راسـتە، نـابینم، کـە وایـە چـۆن ئێـژی رەنـگ وروخسـارم دەناسـی، چونکـە بـێ گومـان ئـەو دەنگـە هـەر دەتوانـێ خاوەنی رەنگ و روخسارێک بێ، خەریک بە، زۆری لە دوا مەچوو، نا، یا قبووڵی دەکەی یـان بەشەکەی تۆ رەنگی خۆراک بە خۆیەوە نابینێ. بڕۆ پێیان بڵێ تۆ بە گوێت نەکردین و هەر بۆیە نان و پێخۆریان پێ نەداین، پاشانوەرەوە و بزانین بڕوای ئـەوان چۆنـە. ژنـە داهاتـەوە، دەسـتی چەپی لە سەرزەوی بوو، بە کوێرە کوێرە دەسـتی لـە دوولینگـەی کـابرا کوتـا، ئاسـنی سـارد و رەقی دەسکی دەمانچەکەی هەست پێ کرد، بە خۆی گوتدەتوانم بیکوژم. بەڵام نەیـدەتوانی، چونکە گیرفانی تەواو وێکهاتبوو و بەهیچ بارێکدا دەس تێوەبردن نـەدەلوا. بـە خـۆی گـوت ئێستا ناکرێ بیکووژم، سەری بردە پێش و ملی لێ نا، چاوی نووقانـد هـەتا دیمەنەکەنـەبینێ و بـە زۆرەملی خۆی دایە دەس شەپۆلی هەڵکەوتی ژیان.

بەری بـەیانی بـوو کـە چەپەڵـپیاوانی کـوێر ژنـەکانیان ئێـزن دابگەڕێنـەوە. ژنـەکان کـە بـە زەحمەت خۆیان بە سەر پێوە رادەگرت ناچاربوون دەس بخەنە ژێر باڵی ژنـەی بـێ خـەو و بـە هــەزار کــوێرەوەری بیبەنــەوە. ئــەو ماوەیــەی لــە نێــو پیاوەکانــا ئــەو دەستەودەســتیان پێ کرابوو،سووکایەتی لە سووکایەتی و پەستیی لـە پەسـتیی زیـاد کردبـوو، هەرکردەوەیـەکی دزێـوی تـا سـەر سـنووری مـەرگ دەکـرا بـە سـەر ژنێـک بێـت بەسـەریان هێنـابوون. کـاتی گەڕانەوەیان کوێری چەکدار بە گاڵتەجاڕی گوتی خۆ باش دەزانن کە لە جیـاتی مـزە و کـرێ دەبێ کەڵوپەل بەرنەوە،بە پیاوە لـێ قـەوماوەکانتان بڵـێن بـێن بەشـەکانتان وەرگـرن. پاشـان بـە گاڵـتەپێ کردنـەوە گـوتی بـە ئومێـدی دیـدار کچینـە، بـۆ نـۆرەی دواتـر بـە خۆتـان رابگـەن.

گەنـدەپیاوانی تـر کـەم و زۆر یـەک دەنـگ دووپاتیـان کـردەوە بەئومێـدی دیـدار کچینـە، هێندێکیان بە دەستەگوڵیان گاز کردن و هێندێک بەجنـدە، بـەڵام لـەرزەی دەنگیـان دەیگـوت تاسە و هەستی پیاوانـەیان تەواودابـەزیوە. ژنـەکان کـەڕ و کـوێر و لاڵ بـە نـۆچدان و لاتـرەوە بەستن بەرەوپێش هەنگاویان دەنا و ئەوەندەیان هێـز لەبـەردا نـەمابوو کـە تـەواو دەسـتی‌یـەکتر بگرن و لێـک هەڵـنەبڕێن، دەڵـێین دەسـت، نـەک وەک ئـەو دەمـەی‌هـاتن، بـێ‌گومـان بێتـوو کەسێک پرسیاری لێ‌کردبان کە بۆچی لە کاتی‌رۆیشتنا دەستی یەکتریان گرتووە، هـیچ‌کامیـان وڵامێکیان نەبوو، هەر واتووشـی هـاتبوون، هێنـدێک جووڵانـەوە و کـردەوە هـەن کـە نـاکرێ هەمیشەشی کردنەوەیـەکی سـاکاریان بـۆ بدۆزرێتـەوە، جـاری وایـە تەنانـەت‌لێکدانـەوە و شـی کردنەوەیـــەکی پـــڕپێچ و قـــەمچیش دەس نـــادا. کاتێـــک بەسەرســـەرادا تێپـــەڕ دەبـــوون ژنی چاوپزیشک چاوێکی لە دەرەوە کرد،تاقمێک سەرباز و لۆرییـەکی بـینی کـە بـێ‌شـک شـێوی دەس‌بەسەرکراوەکانیان دێنا. دروست لەم کاتەدا پای بـێ‌هێـزی ژنـەی بـێ‌خەوفیزانـەوە، وەک ئەوەی بە زەبرێک پەی کرابێ، دڵیشی هەرواتر، تەنانەت‌کوتانی رێـک‌وپێکـی دڵـی کـە تـازە دەستی پێ‌کردبوو خۆی نەگرت،ئاخرییەکەی زانیمان کە ئەو ژنە بۆچی خەوی لێ‌نەدەکـەوت، ئێستا ئیتردەخەوێ، وا باشترە خەبەری نەکەینـەوە. خێـزانی دوکتـۆر بـە راوێژێکـی‌سـارد و سـڕ گوتی مردووە، نەدەکرا وەها دەنگـێ، دەنگێکـی مـردووی‌چەشـنی ئـەم وشـەیەی بیسـتمان لـە دەمی ئادەمیزادێکی زیندووڕاهەڵقولێبێ. جەستەی لەپڕ تێـک‌شـکاوی ژنـەی هەڵـگرتەوە، پـێ شەتلانی‌خوێن و زگی رەش و شین هەڵگەڕابوو و سینەی پڕ دەردی رووت وقـووتی دەنوانـد. لەشی بە شێوەیەکی دڕندانە بریندار کراوە و جێ گاز وقەپاڵ لە سەر شانی دەبیندرێ. بە خـۆی گـوت ئـەوە وێنـەی لەشـی منـە. وێنـەی لەشـی تـەواوی ژنـەکانی ئێرەیـە، ئـەم سـووکایەتییە تەنیاجیاوازییەکی لەگـەڵ پـەژارەکانمان هەیـە، ئـەویش ئەوەیـە ئێمـە هێشـتازیندووین. کچـەی چاویلکەیی گوتی بەرەو کوێی بەرین، خێزانی‌چاوپزیشـک گـوتی جـارێ دەیبەینـەوە شـوێنی خۆمان، پاشان تەسلیم بەخاکی دەکەین.

پیاوەکـان لەبـەر دەرگـاوە چاوەڕییـان بـوون، تـەنیا کوێرەپیـاو لەنێویانـدا نـەبوو، هـەر کـە تێگەیشـت ئـەوە ژنـەکان دەگەڕێنـەوە پەتۆکـەی بەسـەر خـۆی کێشـایەوە، کـوڕە خێلەکـەش خەوتبوو. هاوسەری چاوپزیشک‌بێ راوەستان و بێ ئەوەی تەختەکان بژمێرێ، ژنەی بـێ‌خـەوی لە سەرتەختەکەی خۆی راکێشا. کاری نەدابوو بە سەر ئەوەوە کە رەنگە ئەم‌شێوە جووڵانەوەیـە سـەیر بێتـە بـەر بـاس، بـۆ چمـا هـەموو نەیانـدەزانی کەتـەواوی کـەلێن و قـوژبنی ئەوێنـدەرێ

پێ‌دەزانێ. هەمان وتەکەی پێشووی‌دووپات کردەوە، مردووە، دوکتۆر پرسی چی بووە، بەڵام خێزانی‌زەحمەتی وڵام دانەوەی نەنایە بەرخۆی، رەنگە مەبەستی لەم پرسیارەتەنیا چۆنیەتی مردنەکە بوویێت، بەڵام دەکرا ئەم مانا ورد و باریکەشی تێدا بوایە کە لەوێ چیان بە سەر هێناون، هەر چونێک بێ بۆ هیچ‌کامیان‌وڵامێک نەبوو، تەنیا مرد، بە چی مرد خۆ گرینگ نیە، پرسیارێکی‌نەفامانەیە کە خەڵک دەپرسن فلانەکەس بە چی مرد، مرد ئیتر، پاش‌ماوەیەک هۆی مردن لە بیر دەچێتەوە، تەنیا وشەیەک دەمێنێ، مرد،ئێمەش تازە ئەو ژنانە نین کە لێرەوە رۆیشتین، چونکە ناتوانین وەک‌پێشوو هەر قسەیەکی کە دەمانبیست دەمانگێڕایەوە ئێستا سێ‌ودووی‌لێ‌نەکەین، بەڵام سەبارەت بە پاشماوەی رووداوەکە دەبێ بڵێین بێ‌ناو وداپۆشراوە و هیچی دیکە. خێزانی چاوپزیشک گوتی بڕۆ نان و خوانەکەبێنە. بەخت، چارەنووس، هەڵکەوت یا هەر ناوێکی پڕ بە پێستی تر بۆ ئەم‌شتەی ئەو گشتە ناوەی هەیە گاڵتە پێ کردنێکی رووتە، چ شتێک‌دەیتوانی لێمان روون کاتەوە کە بۆچی دەبوو تەنیا مێردی ئەم دوو ژنەبۆ وەرگرتنی خواردن هەڵبژێردرێن، ئەویش لە حاڵێکا لە مێشکی کەسانەدەگونجا نرخی خواردنەکە هەر ئەو شتەیە کە تازە دراوە. دەکراپیاوی تر لەجێی ئەوان بچن، پیاوانی رەبەن و ئـــــــــــــازاد کــــــــــــــە ناچــــــــــــــــار نــــــــــــــــەبن هەرێمی ژن و مێردایەتی بپارێزن، بەڵام بە هەڵکەوت ناوی ئەم دووەدەرچوو بوو کە بێ‌گومان ئێستا دڵیان نەیدەخواست دەستی سەرشۆڕی‌بۆ لای ئەم گەندە داوێن پیسانە راکێشن کە ژنەکانیان ئەتک کردبوون. کوێرەپیاو سوور و پتەو گوتی من ناچم، هەر کەس پێی خۆشە بچێ،دوکتۆر گوتی من دەچم، پیرەپیاو گوتی منیش دێم، نان و پێخۆرەکە زۆرنیە. بەڵام باشە ئەوەی بزانین بڕێک قورسە، هێشتا ئەوەندەم تاقەت هەیەکە نانی خۆم لە کۆڵم بدەم، هەمیشە بارە نانی خەڵک قورسترە، من مافی‌گلە و گازندەم نیە، ئەو قورسایی‌یەی کەوتۆتە سەر شانی خەڵک شێوی‌منی دابین کردووە، باشتر وایە لە جێی گێڕانەوەی وتوێژی ئەوان کەئیتر مەبەستێکی کۆن و تێپەڕیوە، دیمەنی دوو لایەنی وتوووێژکار بێنینەبەرچاو، بەرەو رووی یەکتر وێستاون و دەڵێی یەکتر دەبینن، کە دیارەئەم بابەتە هەرگیز بووز ناخوا، تەنیا ئەوەندە بەسە کە بیرگەی هەرکامێکیان لە جەرگەی سپیایی چاو بە شەوارەخەری دنیای خۆیانا دەم ولێوێک بێنێتە بەر زەین کە ئەم قسانە دەکا و پاشان چەشنی تیشکێ کەلەم ناوەندەوە باڵ دەگرێ، بەشەکانی تری دوو روخسارەکە وەدیاردەکەوێ، یەکیان هی پیرەپیاوە و ئەوی تر هی پیاوێکی لە نێوەچوو، جاهەر کەسێ بتوانێ ئاوا ببینێ لە خۆوە رادەخوڕێ، ئەم دووە

کەوتنە ڕێ هەتا مزەی ئەو سەر شۆڕییە وەرگرن، لەم نێوەدا خێزانی چاوپزیشک بەژنەکانی دیکەی گوت سەبر کەن ئێستا دەگەڕێمەوە. دەیزانی لە چی دەگەڕێ بەلام نەیدەزانی داخۆ دەیدۆزێتەوە یان نا، لە دەفرێکی وەک سەتڵ دەگەڕا کە کارەکەی مەیسەل کا، دەیهەویست پڕی بکا لە ئاو، تەنانەت ئاوی پیس و بۆگەن، دەیویست مەیتی ژنەی بێ خەو بشوا و بەپاک و خاوێنی لە ناخی رۆکا، هەڵبەت بێتوو لەم شێتخانەیەی تێیدا دەژین باسی پاکی و خاوێنی مانایەکی هەبێ، چونکە دەزانین کە خاوێنیی روح لە دەس هەمواندا نیە.

لە ژووری شێو خواردن پیاوە نابیناکان لە سەر مێزەکان راکشابوون. شێرەی سەر قاپ شۆرییەکی پڕ لە تلتەوتاڵ میزۆڵەیەکی ئاو پێدا دەهاتە خوار. هاوسەری چاوپزیشک بە وردی لێرولەوێ گەڕا بەلام شتێکی بە کەلکی گیر نەکەوت. بوونی لەوێ بوو بە هۆی سەرودڵگیرانی پیاوێ و پرسی کێ لەوێیە، ژنە ولامێکی نەدایەوە، دەیزانی پێشوازی لێناکرێ و کەس ناڵێ هاتووی بۆ ئاو، باشە بەرە وبێتوو بزانێ بۆ شۆردنی مەیتی ژنێکە رەنگە بڵێ چەندەت دەوێ بەرە. زبڵ و زاڵی پاش خوان تەواوی ولاتی تێوەدابوو، لەم شپرێوییەداتوورەکەی گەورەی پەلاستیکیی وەبەر چاو هاتن. بە خۆی گوت رەنگەبدرێن، پاشان بیری کردەوە بێتوو دووسێیەکان تێک بنێ ئاوەکە کەمترخەسار دەبێ. لەرێوە دەس بەکار بوو، کوێرەکان راست ببوونەوە ودەیانپرسی کێ لەوێیە، ئێستا ئیتر بە خورەخوڕی ئاو پتر نیگەرانببوون، پاشان بەرەو دەنگەکە کەوتنە رێ، ژنی دوکتۆر خۆی کەنار دا ومێزێکی بۆ کردنە لەمپەر هەتا دەستیان پێ رانگا، پاشان توورەکەیوەبەر ئاوەکە گرت، ئاوەکە چاک نەدەهات، بە ناهومێدی لە شێرەیئاوەکە نووسا، ئێستێک دواتر وەکوو ئەوەی ئاو لە زیندان رزگاریبوویێت بە پڕتاو لووزەوی بەست، پڕیشکەی تەواوی ولاتی داگرت وهەموو لەشی تەڕ کرد. پیاوە کوێرەکان ترسان و کشانەوە، لایان وا بووبێ گومان لوولەیەک تۆقیوە و کاتێک ئاو گەیشتە لاق و لەتەریان لەمبابەتەوە پتر دڵنیا بوون، نەیاندەزانی کە ئەمە کاری غەوارەیەکە کەهاتۆتە ئەوێندرێ، ژنەش تازە تێگەیشت کە بارێکی وەها قورسی بەدەس بۆ ناچێ. گرێیەکی لێدا و بە کۆڵی دادا و تیژ بۆی دەرباز بوو.

کاتێک دوکتۆری چاوان و پیرەپیاو بە خواردنەوە گەڕانەوە نێوبەشەکە، نەیانبینین، نەیاندەتوانی ببینن، حەوت ژنەکە رووت بوون، مەیتی ژنەی بێ خەو خاوێنتر لە تەواوی سەردەمی تەمەنی لە سەرتەختەکەی راکشابوو، ژنەکەی دیکە تاق تاق هاوڕێیانی و پاشان خۆشی دەشۆرد.

رۆژی چـوارەم دیسـانیش سەروسـەنەمەی گەنـدەپیاوان پەیدابوویـەوە. هـاتبوون نرخـی خواردنەکە لە ژنانی بەشی دووهەم وەرگرن،بەڵام ماوەیەک لەبەر دەرگاوە وێستان هـەتا بـزانن داخـوا ژنـەکان دوایئـەم شـەوە هاتوونـەوە سـەرخۆ یـان نـا، یـەکیان کـە دەم و لەوسـی دەلستەوەگوتی چەند خۆش بوو، یەکیان بۆی ئەستاندەوە بەڵێ گیانەکەم، ئەوحەوتە چاردەیـان دێنا، هەڵبەت یەکیان شتێکی وانەبوو، بـەڵام لـەوزاق وزیقـەدا کـێبەکێیـە، پیاوەکانیـان چەنـدە خۆش شانسن، هەڵبەت ئەگـەربتوانن! باشـتر وایـە نـەتوانن، چونکـە ئـاوا باشـترە! ژنی دوکتـۆر لەبنەبانـەوە دەنگـی هەڵـبڕی و گـوتی ئیـدی حـەوت کـەس نـین، یـەکێک لەخوێرییـەکان بـە پێکەنینەوە پرسی یەکتان دەرباز بووە، دەرباز نەبووە،مردووە، پەح، بەم‌لاوەتر چێـت، کـە وایـە جارێکی دیکە حاڵتان پەشێوە،خێزانی دوکتۆر گوتی قوربانی چاوتان، جوانێکی هێندە ناسـک نەبوو. راسپێراوەکان بە سەرسوڕمان و ترسەوە کەوتنە گێژاوی نیگەرانی، بەلایانەوە ئەم وتەیەی بیستیان زۆر دزێو بوو، هێندێکیان بەم ئاکامەگەیشتن کە بێونەبێ هەموو ژنێک پێی بە خـواری دادەنێ، ئەوبێ‌حورمەتییە بە وەها ژنێک کە تەنیا لەبەر ئەوەی سەر و سـکە و سمـت وسـاتێکی وای نەبوو تاڵی نواند. لە بەر دەرگا گومانـاوی ئـەم پـێ و پێیـاندەکـرد و چەشـنی بووکەڵـەی قورمیشـی دەجوولانـەوە و ژنی دوکتـۆریچـاوان تەماشـای دەکـردن. ناسـینییەوە، هەرسـێکیان دەسدرێژییانپێ‌کردبوو. لە ئاخریدا یەکیان چێوە تەقەیەکی کرد و گوتی با بـڕۆین. چێوەکوتـە و هاوار و هەڕەشەیان دەنگی دەدایەوە کە دەیانگوت دوورکەونـەوە، دوور کەونـەوە ئێمـەین، دەنگیـان وردە وردە لـە رێڕەوەکەدابـەرەو نـەمان دەبـزووت و پاشـان بـێدەنگـی خێـوەتی ئەنگاوت وغەڵدەغەڵدێک نەبا نەدەبیسرا، فەرمانیان دا بە ژنـەکانی بەشـی دووهـەم کـەبۆ پـاش شێو کردن خۆیان ئامادە کەن.

دیسانەوە چێوەتەقە دەنگیدایەوە، دوور کەونەوە، دوور کەونەوە،سێبەری سێ پیاوی کوێر بە بەر دەرگادا تێپەڕی و دوور بوویەوە،خێزانی چاوپزیشـک کـە چێروکێکـی بـۆ کـوڕە خێلـە دەگێڕایەوە، دەستیهەڵێنا و بە بێدەنگێکی مقەستەی هێنایە خوار. بە کوڕێژگەی گـوتپاشـان پاشماوەی چیرۆکەکەت بۆ دەگێڕمەوە. لەم بەشەدا هیچ کەس لێینەپرسی بۆچ وا بـە سـووکی باسی ژنەی بێخەوی کرد. تاوێک دواترکەوشـەکانی داکەنـد و چـوو هـەتا مێردەکـەی دڵـنیا بکاتـەوە کـە زۆریپـێناخایـەنی، زوو دەگەڕێمـەوە. بـەرەو دەرگـا هـەنگاوی نـا. لەبـەر

دەرگاوەوێستا. دە دەقیقە دواتر ژنەکانی بەشی دووهەم هاتنە ڕێڕەوەکە. پازدەکەس بوون. هێندێکیان دەگریان. ریزیان نەگرتبوو و بە شەق و شپرێوی‌دەڕۆیشتن، بەم شیتاڵانەی دیار بوو لە مەلافەکانیان دادڕیوە خۆیان‌تێک‌خستبوو. لە بەر دەرگاوە کە تێپەڕین ژنی دوکتۆر کەوتە شوێنیان. هیچیان نەیانزانی کە کەسی تریان تێکەڵاو بووە. دەیانزانی چچارەنووسێک چاوەڕییانە، ئەو پەستییەی بە سەریان دەهات‌مەبەستیکی شاراوە نەبوو، ئەو دزێوییانەش بەڕاستی شتێکی تازەنەبوون، چونکە بێ‌گومان دنیا لە دەسپێکەوە وا دامەزراوە. ئەوەی‌دەیڕەواندنەوە خودی دەسدرێژییەکە نەبوو، بەڵکوو کەیف و نەهەنگی‌بەر بەڕەڵڵای هەوسار پساو، شەرم و ناوزڕان و چاوەڕوانیی شەوێکی‌پڕ مەترسیی بوو کە خێوەتی لە سەر هەڵدەدان، پازدە ژنەکە کە لە سەرتەخت یا حەرز تخێڵ بوون، پیاوەکان سوار بوون و وەک بەرازدەیانمشاند. یەکێک لە ژنەکان بە خۆی گوت لە هەموو شت خراپترئەوەیە کە رەنگە پێم خۆش بێت. کاتێک گەیشتنە ڕێڕەوی بەشی گۆرین،ئەو کوێرەی ئێشکی دەکیشا هەواڵی دا بە ئەوانی تر کە دەنگی پێیان دێت،هەربینا گەیشتنییە. لەرێوە تەختەکەی بەردەرگایان وەلابرد، ژنەکان‌یەک یەک وەژوور کەوتن، سەرحیسابی کوێر کە بە ئیشتیا دەیژماردن،هاواری کرد وەی گیان چەندەش زۆرن، یازدە، دوازدە، سێزدە، چاردە،پازدە، پازدە، پازدە کەسن. کەوتە شوێن ئاخرین کەس و دەستی‌تامەزرۆی لێ‌کوتا، گوتی ئەوە زۆر سازە، هی خۆمە. وا بە وردی‌دەستیان پێداکێشابوون کە ئێستا برێکیان سەبارەت بە کزی و قەڵەوی‌هەموویان دەزانی. لە راستیدا ئەگەر قەرار وا بوو تێکڕا گیرۆدەی‌دەستی چارەنووسێک بن بە فیڕۆ دانی هەل و زەمان بۆ هەڵبژاردنیان‌وەک کارێکی بێهوودە خۆی دەنواند و رەنگ بوو لەم ماوەیەدا ئاوری‌بەتینی تاسەیان رۆمرکابا. کە وایە بە زۆری ملیان لێ‌نا و چی وارانەبوورد کە دەنگی گریان و ناڵین و پاڕانەوەی هەمیشەیی بەرز بۆوە،بەڵام بێتوو وڵامێکیش درابایەوە هەر چەندپاتەی گوتەکانی پێشوو بوو،ئەگەر خواردنت دەوێ هەدا دە. ملیان دادەخست، کردەوەی زۆردزێوتریان لە هێندیکان داوا دەکرد، چەشنی ئەوەی کە لە پێش ئەژنۆی‌سەرکردەی گەندەپیاوان داچەمی‌بوو و ئەمەیان هیچی نەدەگوت. ژنی‌دوکتۆر هاتە ژوور، لەسەرەخۆ بە نێو تەختەکانا خوشی، بەڵام ئەو پارێزکردنەی نەدەویست، تەنانەت ئەگەر سۆلی دارینیشی لە پا کردبایە کەس‌هەستی پێی نەدەبیست، بەڵام خراپترین شت لەو گوڕە و هەرایەدا ئەوەبوو دەستی پیاوێکی کوێرێکی وێ بکەوێ و لە هەبوونی ئاگادار بێت،بێتوو وا بوایە ئەمی لەگەڵ

ژنەکانی تر لێدەگۆڕا و کەسیش نەیدەزانی،لە وەها هەل و مەرجێکا جیاوازی نێوان پازدە و شازدە کارێکیئەوەندەش هاسان نیە.

تەختی سەرکردەی لات و لووتەکان هێشتاش هەر لە بنەبانیژوورەکە لە لای کۆگای دەفرو خواردەمەنییەکان بوو. تەختەکانیدەوروبەریان لێ دوور خستبۆوە، ئەم ئینسانە پێی خۆش بوو چاکهەڵبسوورێ و لە جیران تەختەکانی هەڵنەنگوێ. کوشتنی بە سانیدەهاتە بەرچاو. هاوسەری چاوپزیشک ئارام ئارام بە باریکەرێی نێوانتەختەکاندا بەرەو پێش هەنگاوی دەنا و تەواوی جووڵە و کردەوەی ئەوپیاوەی هەڵینابوو بیکووژێ خستبوویە ژێر چاوەدێری. کابرا وەختیخەریک بوون سەری بە پشتەوە دادەخست. دەتگوت سواری ملی خۆیدەبێ. ژنی دوکتۆر هێدی و هێمن نیزیک بوویەوە. بە دەوری تەختەکداسوورا و لە پشت سەری کابرا راوەستا. ژنە کوێرەکە هەر چیسەرکردە دەیگوت وای دەکرد. خێزانی دوکتۆر لە سەرەخۆ مقەستەکەیهەڵێنایەوە، دمی مقەستەکە بەحاڵ کرابوویەوە، هەتا وەک دوو زەرگبوەشێن و قووڵ تێراچن. لەم کاتەدا، دروست لە ئاخرین چرکەدادەتگوت کابرای کوێر هەستی بە بوونی کەسێک کردووە، بەڵام ئیتربەرەو پەرپەرۆچکەی تامی جووت بوون باڵی گرتبوو و سنووری دنیایئاسایی هەستەکانی بەزاندبوو و تازە چی پێنەدەکرا، هاوسەری دوکتۆربە خۆی گوت مەرگ مەودات نادا لەم سەرخۆشییە هەنگاو راگوێزی ودەستی بە پڕتاو داهێنایەوە. مقەستەکە لە گەرووی کابرای کوێر رۆچوو،دەمی لێک نیزیک بوونەوە و رەگ و دەماری هەڵپساند، پاشان بە رقیزیاترەوە رۆچوو و گەیشتە مۆرتخەی گەردنی. بە ئاستەم هاوار ونالەی کابرا دەبیسرا، زیاتر وەک مشەمشی کاتی جووت بوونیجانەوەرێک دەچوو، چەشنی ئەم دەنگەی لە هەمووڵاوە بەرز بۆوە،رەنگە هەر واش بووبێت، چونکە لەم کاتەدا خوێن پڕژایە سەر دەم وچاوی ژنەی کوێر کە شتێکی لە زاریدا بوو. هاواری ژنە پیاوەکوێرەکانی تێکڕا برد، خوویان بە زیقە و هەرا گرتبوو، بەڵام ئەوەیانوەک هیچکام لەم هەرایانە نەدەچوو. ژنەی کوێر دەیقیژاند، ئەو خوێنە لەکوێوە هاتبوو، رەنگە بێ ئەوەی بزانێ ئەندامێکی کابرای گەستبێ وپچکرِیبێتی. کابرا کوێرەکان ژنەکانیان بەردا و بە کوێرە کوێرە لێیاننیزیک بوونەوە، پرسیان چی رووی داوە، ئەم هەموو قیژ و هەرایەبۆچیە، بەڵام لەو حاڵەدا دەستێک بە سەر دەمی ژنەی کوێرا رۆگیرابوو وکەسێک بە سرتە پێیدەگوت بێدەنگە بە، پاشان بە ئەهوەنی ژنەیکێشاوە دوا، قسە مەکە، دەنگەکە ژنانە بوو، هەر ئەوە بڕێکی ئۆخژنبردەوە بەر، هەڵبەت بێتوو بکرێ لەم چڕە و گۆڕەیەدا باسی ئۆخژنبکرێت. سەرحیسابی

کوێر بەر لە هەموویان گەیشتە سەری و یەکەم کەس بوو کە دەستی لە کەلاکی تخێڵ کراوی کابرا کوتا و هەر وا لەپڕێبە سەرسوڕمانەوە گوتی مردووە. سەری بە لاتەنیشتی تەختەکەدا شۆڕبۆوە و هێشتاش خوێن هەر وا بڵقی دەدا، گوتی کوشتوویانە. پیاوەکوێرەکان پێیان بە هەردەوە ویشک هەلات، باوەڕیان نەدەکرد، چۆندەکرێ کوژرابێ، کێ کوشتوویەتی، قورگیان هەڵبڕیوە، بێگومان کاریئەو بێشەرەفەیە کە لەگەڵی راکشاوە، دەبێ بیدۆزینەوە. کوێرەکاندیسانەوە کەوتنە جوولانەوە و خولانەوە، بەلام ئەمجارەیان ئارامتر،دەتگوت دەترسان تووشی ئەم تیخەڵە بن کە گەرووی سەرکردەکەیانیهەڵبڕیبوو. نەیاندەتوانی ببینن کە حیسابداری کوێر بە پەلە گیرفانەکانیکابرای کوژراو دەپشکنێ و دەمانچە و توورەکەیەکی بچووک و دەفیشەکەکە هەڵدەگرێ. لە ناکاو تێکرا بە قیژە و هاواری ژنەکان ترسیانوەبەرنیشت و ئالۆزان، ژنەکان هەستابوونە پێ و بە پەشۆکاویدەیانویست لەوێ راکەن، بەلام هێندێکیان بیریان کاری نەدەکرد و لایگەڕانەوەیان لێ تێکچوو بوو و خۆیان لە پیاوەکان دەکوتا، ئەوانیشلایان وا بوو کەوتوونە بەر پەلامار، لە ئاکامدا خۆ پێکدادان و پاڵپێوەنان گەیشتە ئەوپەڕی خۆی و بوو بە گرمە و هەرایەک وەرەسەیرێ. ژنی دوکتۆر بێ هەست و خوست چاوەڕوانی دەرفەتێکی باشبوو هەتا دەرباز بێ. توند دەستی ژنە کوێرەی گرتبوو و بە دەستەکەیتری ئامادەی پارێزگاری و زەبر وەشاندن بوو. هەر ئێستا چۆل بوونیدەور و بەری بە قازانجی بوو، بەلام دەیزانی کە ماوەیەکی درێژ ناتوانێلەوێندەرێ، بمێنێتەوە. سەرەنجام تاقمێک لە ژنەکان دەرگایاندۆزیبۆوە، ئەو دەستەیە هەوڵیان دەدا خۆیان لە چنگ پیاوان راپسکێنن ودەرباز بن، تەنانەت یەکیان دەیهەویست دەس بخاتە تینتینۆکەی دوژمنو بیخنکێنێ و تەرمێکی تریش بخاتە سەر دەستیان. حیسابداری کوێر بەتووڕەیی بە سەر تاقمەکەی خۆیا گوڕاند کە ئەهوەن ببنەوە، بە سەرمێشک و دەمارتاندا زاڵ بن، بنج و بناوانی رووداوەکە روون دەکەینەوەو بۆ ئەوەی حوکمەکەی چاکتر ببڕێ فیشەکێکی بەرەو حەوا تەقاند. ئاکام تەواو بە پێچەوانەی چاوەڕوانیی ئەو رەنگی دایەوە. ملهوڕەکان کەتێگەیشتن دەمانچەکە وا لە دەس کەسێکی ترایە وئەو جار سەرۆکێکینوێیان دەبێ حەبەسان ودەستیان لە گێرە و کێشە هەڵگرت و لەتێکۆشان بۆ سەرکەوتن دابڕان، هەڵبەت یەکیان بۆ هەمیشە دەستی لەبەربەرەکانی کێشایەوە، چونکە خنکابوو. دروست لەم کاتەدا خێزانیچاوپزیشک ویستی بکەوێتە رێ. بە زەبری ئانیشک دڕی پێدان و ڕێی کردەوە. ئێستا نۆرەی زلحۆرتە کوێرەکان بوو کە پێکهەڵپڕژێن وبیکەنە هەرا و هەڵلا و تێکهەڵدان، هەر کەس لەوێ بوایە و

چاوی‌هەتەری کردبا دەیزانی کە بشێوی پێشوو لە چاو ئی ئێستا گەمەی‌منالانە بووە. هاوسەری چاوپزیشک نەیدەخواست کەس بکووژێ وتەنیا دەیهەویست خێرا رزگاری بێت و لەمەش باشتر هیچ ژنێکی کوێرجیێنەهێلێ. کاتێک مقەستەکەی لە سینەی پیاوێکا رۆدەبرد بە خۆی گوت‌ئەوەش روح دەرنابا. دەنگی تەقەیەکی تر بیسرا، ژنی چاوپزیشک هەرژنێکی کوێری دەکەوتە بەر گورمی پالی دەدا و دەیگوت با برۆین، بابرۆین. یارمەتی دەدان نەکەون و پەیتا دەیگوت خێرا کەن، خێرا کەن، لەم‌کاتەدا سەر حیسابی کوێر لە بنەبانی ژوورەکەوە هەرای کرد بیانگرن،رێ مەدەن دەرباز بن، بەلام تازە زۆر درەنگ ببوو، ژنەکان گەیبوونەرێڕەو، بە هەلس‌وکەوت و نیوە رووت غارایان دا و تا ئەو جێیەی‌دەیانتوانی جلی شل و شۆڕیان لە خۆیان شەتەک دا. خێزانی چاوپزیشک‌لە نێودەرانەی بەشەکە راوەستا و بە راوێژێکی پڕ رق و قین قیژاندی‌لەبیرتانە چەند رۆژ پێشتر چیم گوت، گوتم کە رەنگ و روخساری لە یادنابەمەوە، جا ئێستا لەبیرتان بێت دەلێم چی، چونکە قەلافەت وروخساری ئێوەش فەرامۆش ناکەم، حیسابداری کوێر هەرەشەی کردکە ئەم راپەرینەت هەر وا بە سووکی بۆ ناچێتە سەر، ژن و پیاوتان وای‌ناخۆن، تۆ نە دەزانی من کێم و نە دەزانی لە کام بەشەوە هاتووم، یەکێک‌لەو پیاوانەی دەچوو هەوال بۆ ژنەکان بەرێت گوتی تۆ هی بەشی یەکی‌قۆلەکەی تری و سەرحیسابی کوێر درێژەی دا دەنگت دیارە، ئەوندەم‌بەسە بەرەو روو گوێم لە دەنگت بێ جا بزانە چۆنت بە قوربانی‌گوللەیەک دەکەم، ئەوەی تریش هەر ئەو قسەیەی کرد و ئێستا کەلاکی‌لەوێندەرێ کەوتووە، بەلام من کوێرێکی وەک تۆ یان ئەو نیم، کاتێک‌ئێوە کوێر بوون من زۆر شتم لە بارەی ئێرەدا دەزانی، خۆ تۆ هیچ لە مەرکوێری منەوە نازانی. تۆ کوێر نیت. ناتوانی هەلمفریوێنی، رەنگە من لەهەمووتان کوێرتر بم، من مرۆڤم کوشتووە و بێتوو ناچار بم دیسانیش‌دەکووژم، بەلام لە پێشا لە برسان دەمری، تازە لێرە بەم‌لاوە نان وخواردەمەنی بنەی هات، تەنانەت ئەگەر تێکرا بێن و خۆشتانماندەبەرکەن هەر دلتان بە خواردن روون نابێتەوە. ئێوەش هەر رۆژێک‌نان و پێخۆرمان پێ نەدەن یەکتان لێ‌دەکووژرێ، نا ئێوە ناتوانن لەچنگمان رزگار بن، با، دەتوانین، چونکە لەوەی بەم‌لاوە خۆمان خواردن‌وەردەگرین، ئێوەش ئەوەندی لێرە حەشارتان داوە بیخۆن، هەی‌پاشەلتەڕ، ئەم ژنانەی پاشەل پیسن نە پیاون نە ژن، تەنیا خراپەیەکن کەپوولێکی سووتاو ناهێنن. سەرحیسابی کوێر وەهای گڕ گرتبوو کەتیرێکی بەرەو دەرگا تەقاند. گوللەکە بە ویزە ویز بە بن گوێی‌پیاوەکوێرەکانا خوشی و بێ ئەوەی کەس زامار کا لە دیواری رێڕەوهەلچەقی. ژنی

دوکتۆر گوتی تیرت بە خەتا چوو، بەڵام وریا بە و هۆشت‌جەم بێ بێتوو فیشەکت تەواو بێ زۆر کەس دڵیان بۆ سەرۆکایەتی‌دەکورکێنێ.

پاشان کەوتە ڕێ و چەند هەنگاوێکی قورس و پتەوی هاویشت، بەپەنا دیوارا هەنگاوی نا، هێندەی نەمابوو لە سەر خۆی بچێ، لەپڕئەژنۆی فیزانەوە و شلپ کەوت، چاوی لە ڕەشەوە چوون، بە خۆی گوت‌خەریکە کوێر دەبم، بەڵام پاشان تێگەیشت کە وا نیە، تەنیا ئەسرین بەری‌چاوی لێڵ کردبوو، ئەو فرمێسکانەی لە تەواوی تەمەنیاهەڵینەوەراندبوون، لەبەر خۆیەوە گوتی من مرۆڤم کوشتووە،دەمهەویست بیکووژم و کوشتم. سەری بۆ لای دەرگای بەشەکەوەرسووڕاند، بێتوو لەم وەختەدا پیاوەکوێرەکان گەیشتبانە سەری‌بەربەرەکانی بۆ نەدەکرا. ڕێڕەو کەسی لێ‌نەبوو. ژنەکان گەڕابوونەوە،پیاوەکان کە هێشتاش بە تەقەی دەمانچە و کەوتنی چەند کەلاک‌چوخسابوون، نەیاندەوێرا دەرکەون. خێزانی چاوپزیشک وردە وردەئاهێکی هاتەوە بەر. هەر وا نەرم و هێدی ئەسرینی دادەبارین، دەتگوت‌دڵی داناسەکنێ. بە زەحمەت هەستایە سەرپێ. دەست و جلەکانی شەلاڵی‌خوێن بوون و لە نەکاو لەشی شل و شەوێقی نیشانی دا کە پیر بووە، بەخۆی گوت پیر و مرۆڤ‌کوژ، بەڵام دەیزانی بێتوو پێویست بێ دیسانیش‌دەکووژێ و هەر وا کە بەرەو سەرسەرا دەیئاژوا پرسی کەی پێویستەمرۆڤ بکووژێ و خۆی وڵامی دایەوە کاتێک ئەو شتەی هێشتا زیندووەمردبێ. سەرێکی راوەشاند و بیری کردەوە ئەم وتانە یانی چی، تەنیاوتەن، هیچ نین جگە لە گوتە. تەنیا هەنگاوی هەڵدێنایەوە. لەو دەرگایەنیزیک بوویەوە کە بەرەو حەوشەی پێشەوە دەکرایەوە. لە کەلێنی‌دەروازەوە، تەنیا سێبەری سەربازی ئێشکی دەبینی. لە دەرەوەی ئەوجەغزەوە هێشتاش ئینسان دەبزوێ. ئەو کەسانەی کوێراییاندانەهاتووە. بە بیستنی هەستی پێی پشت سەری مچوڕکێکی پێداهات ودڵی لەرزی، بە خۆی گوت خۆیانن و بە مقەستی ئامادەی پەلامارەوەوەرسووڕا. مێردەکەی بوو. ژنەکانی بەشی دووی سەر ڕێگا بە دەنگی‌بەرز ڕووداوەکەیان گێڕابوویەوە و گوتبوویان ژنێک بە کێردسەرکردەی ملهوڕانی کوشتووە و تەقەش کراوە، چاوپزیشک‌نیشانەکانی ژنەی نەویستبوو، ئەوە تەنیا کاری کەسێ بوو، ژنەکەی بەکوڕەی خێلی گوتبوو پاشماوەی چیرۆکەکەی پاشان بۆ دەگێڕێتەوە،ئێستا چ بەلا و نەهامەتییەکی تووش ببوو، ڕەنگ بوو ئەویش مردبێ، ژنەگوتی من لێرەم و بەرەو ڕووی بزووت و باوەشی پێداکرد، کاری بەوەنەبوو کە خوێن لە جلەکانی ئەمیش هەڵدەسوێ یا خۆ پێی زانی و بەهێندی نەگرت، چونکە تا ئێستا لە هەموو شتێکا شەریک بوون. دوکتۆرپرسی چ

رووی داوه، گوتیان پیاوێک کوژراوه، بەڵێ من کوشتم، بۆچی،یەکێک دەبوو ئەم کارەی کردبا و جگە لە من کەسێکی دیکە نەبوو، دەیپاشان، پاشان ئەوەیە کە تازە ئازادین، ئێستا دەزانن بێتوو بیانهەوێسالمەخەتەی بکەن تووشی چ بەڵایەک دێن، رەنگە شەڕ و پێکدادان پەیدابێ، کوێرەکان بەردەوام خەریکی شەڕ و کێشەن، هەمیشە خەریکی شەڕو کێشە بوون، دیسانیش مرۆڤ دەکووژی، ئەگەر ناچار بم بەڵێ، منهەرگیز لە چنگ ئەو بەڵای کوێرییە رزگاریم نابێ، دەی شێو چی بە سەردێت، خۆمان وەریدەگرین، پێموانیە بوێرن بێنە ئێرە، لانی کەم بۆ چەندرۆژێک ناوێرن و دەترسن ئەوانیش گەرووبان بە مقەستێک هەڵبڕێ، لەسەرەتاوە کە هاتن خۆیان داسەپێنن و باج وەرگرن بەربەرەکانیمانیەکردن، بەڵێ وایە، بەڵام ترسابووین و ترسیش هەمیشە راوێژکارێکیباش نیە، باشتر وایە وەگەڕێین، بۆ ئەوەی خۆمان بپارێزین وا باشەچەشنی ئەوان تەختان لە سەر یەک هەڵچنین و بەری دەرگا بگرین، قەیناکا هێندێکمان بێ تەخت دەخەوین، ئاوا زۆر ناخۆشە بەڵام لەوەیباشترە کە لە برسا بمرین.

رۆژەکانی دواتر لەخۆیان دەپرسی داخوا لەبرسان نامرن، لە پێشدازۆر بەلایانەوە سەیر نەبوو، لە مێژ بوو خوویان بە نەخواردن و کەمخواردن گرتبوو، گەندەپیاوانی کوێر راستیان دەکرد کە هێندێک جارسەربازەکان شێو هێنان وەدرەنگ دەخەن، بەڵام پاشان بە دەرفەتهێنان و گەورە کردنەوەی ئەم بیانووە بە راوێژێکی شەیتاناوی گوتیانجگە لە جیرەبەندی چ چارەیەکی تریان نیە، ئەوانەن ئەرکی دژواری ئەمکەسانەی ناچارن حکوومەتیان بە دەستەوە بێ. رۆژی سێهەم کە داهاتجگە لە تڵتەوتاڵ و ورکەنان چ شتێک گیر نەدەکەوت، هاوسەریچاوپزیشک لە تەک چەند کەسان چوونە حەوشەی گەورە و هەرایانکرد هۆۆۆی، ئەوە چیە، چی رووی داوە، کوا نان و خوانی ئێمە، لە دوورۆژ لێرەوبەرەو چیمان نەخواردووە. گرووبانێکی تر جگە لەمەی پێشووهاتە پشت پەرژینە ئاسنینەکان هەتا بڵێ تاوانی سپا نیە، کەس نایهەوێنانیان لێبدزێ، شەڕافەتی سپایی هەرگیز رێی کارێکی وەها چەپەڵ نادا،هەر بەڕاستی هیچ شتێک نیە، کە وایە هەمووتان لە شوێنی خۆتانراوەستن، یەکەم کەسێ کە بێتە بەرەوە خۆی دەزانێ چی بە سەر دێت،فەرمانەکان نەگۆڕان، هەر ئەو هەڕەشەیە بەس بوو بۆ ئەوەیهەموویان لە ژووریَ کاتەوە، پاشان دەستیان کرد بە تەگبیران، باشەئەگەر نان و پێخۆرمان بۆ نەهێنن چ بکەین، رەنگە سبەی بێنن، هاتوودوو سبەی یا وەختێک کە ئیتر ئێمە هیچ هەناوێکمان لەبەردا نەمابێ،دەبێ بچینە دەرەوە، هەتا بەر دەرگاش ناتوانین بڕۆین، خۆزیا چاومانبوایە، ئەگەر چاومان بوایە ئێمەیان نەدەخستە ئەو

جەهەندەمــەوە، زۆرمپــێخۆشــە بــزانم لــە دەرەوە چ خەبــەرە، ئەگــەر چووبــاین و داوامــان کردبایەرەنگە ئەم حەرامزادانە شتێکیان پێدابان، ئاخر ئەگەر خـواردن بـۆ ئێمەنیـە بـۆ ئـەوانیش هەر وایە، کە وایە وێناچێ لەوەی حەشاریان داوەبەشمان بـدەن و بـەر لـە تـەواو بـوونی نـان و پێخۆرەکەیان ئێمـە لـە برسـانمـردووین، کـە وایـە دەبـێ چـی بکـەین، لـە ژێـر نـووری کـزی زەردەڵەی تەنیاچرای سەرسەرا بە دانیشـتنەوە کۆزیلکـەیان بەسـتبوو، چاوپزیشـک وخێـزانی و پیرەپیاو لە نێو ئەم پۆلەدا بوون کە لە شوێنەکانی ترەوەهاتبوون و پاشـان ئـەم دنیایـەی کـوێران پەردەی لە سەر هەڵدرایەوە،ئەمەی هەمیشە روو دەدا تێیا قـەوما، یـەکیان گـوتی تـەنیا ئەوەنـدە دەزانم کە بێتوو سەرکردەکەیان نەکووژرابا ئێستا تووشی ئەم دەرد و مەرەدەنەدەهاتین، لە خۆم دەپرسم باشە چ خراپییەکی هەبوو کە ژنەکان هەرمانگەی دوو جار دەچوون و ئەم شـتەی کـە سروشت پێی بەخشیون‌دەیانکردە دیاری. هێندێک ئەم وتەیان زۆر بـە کـەیفێ بـوو. هێنـدێکیان بەزۆری بزەیان هێنایە سەر لێو و زگی برسی پێشی نارەزامەندی زۆریانیگرت و هەر ئەو پیـاوە بە پێداگری گوتی گەلێکم پێخۆشە بزانم کێ‌کوشتوویەتی، ئەو ژنانەی ئەم رۆژە لەوێ بـوون بــە ســوێندانەوە رەش وشــین دەبوونــەوە کــە کــاری هــیچ‌کامیــان نــەبوو، خۆمــان دەبــێ یاسابەرێوەبەرین و تاوانبار بە سزا بگەیەنین، خۆزگە بمانزانیبا کاری کێیە،ئەو کات دەمـانگوت وەرن ئەوەش ئەم کەسەی لێی دەگەرێن، ئێستاشێوی ئێمە بدەن، خۆزگە بمانزانیبا کاری کێیـە. ژنی دوکتۆر سەری‌بەردایەوە و بە خۆی گوت بێتوو کەسێ لە برسان بمـرێ تـاوانی منە،بـەڵام ئەم رقەی لە ناخیدا هەڵدەچوو شانی بۆ هیچ تاوانێک نەوی نەکردو سەری هەڵبری، بـەڵام بـلا ئەو پیاوانە لەپێشدا بمرن تا تاوانی ئەم ژنەکەفارەی گوناهی ئەوان بێت. پاشـان سـەری هەڵـێنا و فکـری کـردەوە بێتووگوتبـام مـن کوشـتوومە سـەرەرای ئـەوەی دەیـانزانی بـەرەو گێـژاوی مەرگم‌دەنێرن دیسانیش بە قۆڵبەستی دەیاندامە دەس گەندەپیاوان. یان لەبرسان یان چونکە ئـەو فکرە چەشنی گەرداوێکی رەش هەڵیفریواند، هـەروەک ئـەوەی گێـژ بوویێـت سـەری کەوتـە سووران، لەشی بە پێچەوانەی‌ویستی رادەتلەکا، دەلەرزی، زاری کردەوە هەتا شتێ بلـێ، بـەڵام دروست‌لەم کاتەدا کەسێک قۆڵی گرت و لێی‌بادا، روانی، پیرەپیاو بـوو کـە گـوتی‌بێتـوو هـەر کەس خۆی بدا بە دەستەوە دەیخنکێنم، ئەوانەی ریزاوریزدانیشـتبوون پرسـیاریان کـرد بـۆچی، چونکە ئەگەر قەرار وا بێ لەم‌دۆزەخەدا کە خۆمـان ئەوەنـدەی ترمـان تـاڵ کـردووە هێشـتاش شەرم وحەیایەک مابێ لە سامی سێبەری ئەو کەسەیە کە وێرای کەمتیار لە لانی‌خۆیا بکووژێ، بەڵێ وایە، بەڵام خۆ شـەرم و شـکۆ زگ تێـر ناکـا، هەرکەسـێ بی قسـەکەت راسـتە، هەمیشـە

کەسانێک هەبوون چونکە حەیایان‌تکاوە زگیان تێر کردووە، بەڵام ئێمە جگە لەم تۆزە شەرەفەی شایانی‌هەڵگرتنی نین شتێکی ترمان نیە، وەرن لای کەم نیشانی بدەین کەهێشتاش بۆ وەدەس هێنانی مافی خۆمان شەڕ دەکەین، ئەوە دەڵێی چی،ئێمە کە وامان داناوە ژنەکانمان چەشنی گەوادی کەس نەناس و خوێڕی‌بدەین بە دەستەوە و لە پاشەڵی ئەوان‌ڕا خۆمان تێر کەین، ئێستا وەختی‌هاتووە پیاوەکان بنێرین، هەڵبەت ئەگەر پیاوێکمان هەبێ، روونتر بدوێ،بەڵام لە پێشا بێژە هی کام بەشی، ئی بەشی یەکی لای راستم، دەی‌فەرموو، زۆر هاسانە وەرن بچین بە دەستی خۆمان نان و پێخۆروەربگرین، ئەوان چەکیان پێیە، هەتا ئەو جێیەی من دەزانم تەنیادەمانچەیەکیان پێیە و درەنگ یا زوو فیشەکیان لێ‌دەبڕێ، ئەوەندەیان‌فیشەک پێیە کە چەند کەسمان لێ‌بکووژن، زۆران بۆ شتی زۆربێ‌بایەختریش کوژراون، من کە ئامادە نیم گیانم فیدا کەم هەتا خەڵک‌ژیانیان خۆشتر بێت. پیرەپیاو بە راوێژێکی سەرکۆنەکەرانە پرسی‌ئەگەر قەرار وا بێ کەسێک روحی فیدا بکا هەتا زگی تێر بێت داخوا تۆئامادەی برسییەتی بکێشی، بەڵام کابرای پرسیار لێ‌کراو وڵامی‌نەدایەوە.

لە نێودەرانەی ئەم دەرگایەی بەرەو بەشەکانی قۆڵی راست‌دەکرایەوە ژنێک پەیدا بوو کە تا ئێستا دوور لە چاوان گوێی دەدایەقسەکانیان. هەر ئەو ژنە بوو کە خوێن بە روخساری هەڵپڕژابوو، هەرئەو کەسەی ژنەی چاوپزیشک بە گوێیا چرپاندبوو بێ‌دەنگ بە، بەڵام‌ئێستا بە خۆی دەڵێ چونکە لە نێو ئەم کۆزە دانیشتووم ناتوانم بڵێم‌بێ‌دەنگ بە، ئاشکرام مەکە، بەڵام بێ‌گومان دەنگم دەناسێوە، ناکرێ لەیادت چووبێتەوە، دەستم لە سەر زارت بوو و لەشمان پێکەوە نووسابووکە گوتم بێ‌دەنگ بە، ئێستا وەختی ئەوەی هاتووە کە بزانم بەڕاستی کێم‌رزگار کردووە و چ جۆرە ئینسانێکی، هەر لەبەر هەندێیە کە دەمهەوێ‌قسە بکەم، هەر بۆیەیە کە بە دەنگی بەرز دەدوێم هەتا ئەگەر قسمەتی من‌و تۆ بێ لە قاوم بدەی، ئێستا دەڵێم نەک تەنیا پیاوەکان بەڵکوو ژنەکانیش‌دەچن، ئێمە دەبێ بگەڕێینەوە ئەو شوێنەی کە لێی پەست کراوین، هەتائەم سووکایەتیانەی بە سەرمان هاتوون خاشەبڕ بن، هەتا لە کۆت وبەندی ئەو پەستیی و خوێڕیگەرییە هەر بەو شێوەیە رزگاریمان بێت کەئاوی پیس و بۆساردی گەندەپیاوانمان تف کردەوە. ئەو قسەیەی کرد وگوێی بۆ وڵامی ژنە هەڵخست، وڵامی ژنە ئەوە بوو، بچی بۆ هەرشوێنێک منیش دێم. پیرەپیاو بزەیەکی هاتێیە، دەتگوت بزەی شادییە،رەنگە واش بووبێت، ئێستا وەختی چاک نیە بۆ ئەوەی لێی بپرسین،دیتنی حاڵەتی سەرسوڕمان لە روخساری پیاوەکاندا سرنج راکێشترە،دەڵێی شتێک بە سەر سەریاندا تێپەڕیوە،

باڵندەیەک، هەورێک، یەکەمتیشکی لەرزۆکی درەوشانەوەیەک. چاوپزیشک دەستی خێزانی گرت وپاشان پرسی داخوا ئێستاش کەسانێک هەن کە بخوازن بزانن کێ کابرای کوشت یان ئەوەمان قبووڵە ئەو دەستەی سەری بڕیوە دەستیهەموومان بووە، یا باشتر بڵێم تاق تاق دەستی هەر کامێکمان بووە. هیچ کەس متەقی نەکرد. هاوسەری چاوپزیشک گوتی وا باشە هێندێکیانماوە بدەینێیە، ئەگەر هەتا سبەینێ خواردنیان نەهێنا ئەو کات دەکەوینەرێ. رابوون و هەر پۆلەی بۆ لایەک رۆیشتن، هێندێ بۆ راست و هێندێبۆ چەپ، ناپارێزییان کردبوو و بیریان لەوە نەکردبۆوە کە رەنگە یەکێکلە ملهوڕەکان وتەکانی بیستبن، بەختەوەرانە بەپێی ئەو پەندە بەجێیە کەدەڵێ، لە پشت هەموو دەرگایەک شەیتان رانەوەستاوە، کەس خۆی لێمات نەدابوون بەلام نەهرەتەی بڵیندگۆ شتێکی بێجێ بوو، لەمئاخرییانەدا بڵیندگۆ لە هەل و کاتی تایبەتیدا نەبوایە نەدەکەوتە کار وزیاتر قڕوقپ بوو، بەلام بەپێی بڕیاری پێشوو هەمیشە سەری وەختیخۆی چەقەی دەهات، دیار بوو شریتی وتەکان لە کاتی خۆیا بلاودەبوویەوە، رەنگە قەت نەزانین کە بۆچی ماوەیەکی دوور و درێژبێدەنگ دەمایەوە، ئەوە مەبەستی دنیای دەرەوەن، بەلام هەرچۆنێک بێمەبەستگەلێکی گرینگن چونکە زۆرجاران رۆژ ژمێری دەشێواند، ئەورۆژ ژمێرانەی پیاوانی خاوەن تەکووز بە گرێدانی بەن سازیانکردبوو، ئەو کەسانە ئەم کارەیان دەکرد کە بڕوایان بە بیرگەی خۆیاننەبوو، دەتگوت خەریکی نووسینی بیرەوەرین. تا ئێستا دەزگاکەتێکچووبوو، شتێک شکابوو، هێزدەریک کاری نەدەکرد یا سیمێک هاتبووبەر ببێت، خوا بکا شریتەکە نەگەڕابێتەوە ئەوەڵ، ئێستا کە هەموو کوێرو شێتین هەر ئەوەمان کەم بوو. دەنگێکی گڕ و حاکمانە چەشنی دوایینراسپارد و هەڕەشە لە رێڕەو و ژوورەکانا دەنگی دایەوە، دەوڵەت زۆربەداخە کە لە رووی ناچارییەوە ئەرکی یاسایی خۆی بۆ پارێزگاری لەگەل، لەم هەلومەرجە ئاستەنگەدا بە هەموو شێوەیەک بەڕێوە دەبا، بەرواڵەت وا دیارە کە کوێرییەکی لێوەگر بلاو بۆتەوە و بە شێوەیەکی کاتیپێی دەگوترێ نەخۆشیی سپی، ئێمە بۆ بەرگری لە پەرەگرتنی ئەونەخۆشییە پاڵمان داوە بە ویژدانی گشتیی و هاوکاری تەواویهاوولاتیان، گریمان ئەوەیە کە بەرەو رووی نەخۆشییەکی پەرەگربووینەوە، ئەویش نەک تەنیا لە رووی ئەم چەند هەڵکەوتەی کە مەبەستیهاوکات بوونیان هێشتا قسەی لە سەرە. تەمای ورد و باریک گیراوە بۆئەوەی تەواوی ئەو کەسانەی ئالوودە بوون یا بە شێوەیەک پێوەندییانلەگەڵ نەخۆشەکان بووە لە شوێنێک کۆ بکرێنەوە و تێکەڵ نەکرێن. دەوڵەت ئەرکی خۆی بە تەواوی دەزانێ و هیوادارە بیسەرانی ئەمراسپاردەیەش کە بێگومان

هاوولاتیانێکی ڕێزدارن ئەرکی خۆیان بزانن و تێبگەن کە ئەم دابڕانەی ئێستا لە ئەستۆیان هالاوە لە سەررووی قازانجی تاکە کەسییە و نیشانەی یەکگرتنیانە لەگەڵ جەماوەر. بە سرنجدان بەم وتانە داوا دەکەین هەمووتان بە وردی گوێ بدەنە ئەمدەستوووراتە، یەک، چراکان قەت ناکووژێنەوە، هەر هەوڵێک بۆدەستێوەردانی کلیلەکان بێهوودەیە، هیچیان کار ناکەن، دوو، چوونە دەرلێرە بە بێ ئێزن بە مانای مردنی لەڕێوەیە، سێ، لە هەر بەشێکاتەلەیفوونێک هەیە کە تەنیا بۆ داخوازی کەلوپەلی پاک و خاوێنی لەدەرەوەڕا دابین کراوە، چوار، قەرەنتینە کراوەکان دەبێ جلەکانیان بەدەست بشۆرن، پێنج، پێشنیار دەکرێ کە نوێنەری هەر بەشێک دیاریبکرێت، ئەمە پێشنیارە نەک دەستوور، قەرەنتینە کراوەکان چۆنیان پێخۆشە وا خۆ ڕێک خەن، بەو مەرجەی ڕێ و شوێنی دیاری کراوبپارێزرێ، شەش، هەموو ڕۆژێ سێ جار چێشت و خواردەمەنی لە بەردەرگای ڕاست و چەپ دادەنرێ و دەبێ لە نێو نەخۆشەکان و ئەوکەسانەی وێدەچی تووشی نەخۆشیی بووبن دابەش بکرێ، حەوت، هەرچی پاش خوان و دەوری و کەوچک و چنگاڵە دەبێ بسووتێندرێ، ئەوانەگشتیی لە کەرەسەی ئاوربەر ساز کراون، هەشت، تەنیا لە حەسارەکانیژوورەوە یا مەیدانی وەرزشدا ئێزنی ئاور کردنەوە هەیە، نۆ، قەرەنتینەکراوەکان بەرپرسی هەموو چەشنە سووتمانێکن، دە، بێتوو ئاورەکەپەرە بگرێ ڕاسپێراوانی ئاورکوژێنەوە خۆی تێناگەیەنن، یازدە، هەر بەمشێوەیە قەرەنتینە کراوەکان لە کاتی پەیدا بوونی هەر چەشنە نەخۆشییو ئاڵۆزییەکدا نابێ چاوەڕوانی خۆ تێهەڵقوتاندنی دەرەوە بن، دوازدە،بێتوو بە هەر هۆیەک کەسێ بمرێ دەبێ خۆتان بێ هیچ ڕێ و ڕەسمێک بینێژن، سێزدە، پەیوەندیی نێوان ئەو بەشەی نەخۆشەکانی لێیە و ئەوبەشەی تر کە گومانلێکراوەکانی تێدایە دەبێ لە سەرسەرای ناوەندییچوونە ژوورەوە ئەنجام بدرێ، چاردە، بێتوو گومانلێکراوەکانی ئەمنەخۆشییە کوێر بن، خێرا رادەگوێزرێنە بەشەکەی تر، پازدە، ئەمئاگادارییە هەموو ڕۆژێک لەم کاتەدا بۆ حاڵی بوونی تازەهاتووەکان بڵاودەکرێتەوە، دەوڵەت، بەڵام ڕاست لەو وەختەدا چراکان کووژانەوە وبڵێندگۆ بێدەنگ بوو، یەکێ لە پیاوە کوێرەکان بە بێ خیاڵی گرێیەکی لەوبەنەدا کە لە دەستیا بوو، پاشان ویستی گرێیەکان یا ڕۆژەکان بژمێرێ،بەڵام چاوی لێپۆشی، گرێیەکان کەوتبوونە سەر یەک یان بە واتەکی تربووبوونە گرێ کوێرە. هاوسەری چاوپزیشک بە مێردەکەی گوت چراکانکووژاونەوە، ڕەنگە سیمێک پڕیشکەی دابێ و پسابێ، سەیریش نیە،چونکە بێ وچان کارەبا کاری کردووە، تەواوی چراکان کووژاونەوە،بێ گومان گرفتەکە لە دەرەوەی ئەم ساختومانەیە، ئێستا تۆش

وەکهەموومان کوێری، رادەوەستم هەتا تاو هەڵدێت. لە بەشەکە چووە دەر،لە سەرسەراوە تێپەڕی و بۆ دەرەوەی روانی. ئەم بەشەی شار نوقمیتاریکی ببوو، نوور هاوێژی سپا کاری نەدەکرد، بێشک بە رایەڵەیسەرانسەرییەوە گرێ درابوو، ئێستا هەموو شتێ وای دەنواند کە کارەبادابڕاوە.

بۆ سبەی ئەو رۆژە ژن و پیاو تاق و واز وردە وردە بە دوای یەکاهاتن و لە سەر پلیکانەکان کۆ بوونەوە، دیارە خۆر بۆ تەواوی کوێرەکانوەک یەک هەڵنایە و زۆرتر دەگەڕێتەوە سەر گوێ سووک بوون وپێویست ناکا بڵێین کە لە بەشی ملهوڕانەوە کەس نەهاتبوو، چون رەنگەهەر ئێستا خەریکی خواردنی نانی بەیانی بن. ئامادەبووان چاوەڕوانیبیستنی دەنگی کرانەوەی ئارامی دەرگا و پێکداسووان و جیڕەجیڕیلاولاوەی وشک و برینگ بوون، ئەو دەنگانەی مزگێنیدەری هاتنی شێوو خواردن بوون، دیارە هاوکات گوێیان بۆ بیستنی دەنگی گرووبانیکێشک هەڵخستبوو کە بڵێ هەر لە شوێنی خۆتان راوەستن، مەهێڵن کەس بێتە پێش، پاشان خێشکەخێشکی هەستی پێی سەربازەکان بەرزبێتەوە کە خەریکن دەفرە گەورەکان دەکێشن و پاشان بە پڕتاودەکشێنەوە و سەر لە نوێ دەروازە جیڕ و هۆڕی دەبیسترێ و دواترئیزن دەدرێ، ئێستا دەتوانن بێنە پێش. ئەوەندە راوەستان هەتا بوو بەنیوەڕۆ و هەر وێستان هەتا ئێوارە داهات. هیچکەس، تەنانەت ژنیدوکتۆریش نەیدەخواست وەپێ و شوێنی خواردن بکەوێ. هەتا ئەوکاتەی نەیاندەپرسی ولامێکی تاڵ و ناخۆشیشان نەدەبیست و تا ئەوددەمەی بە زمانیاندا نەهاتبوو هێشتاش دەیانتوانی هیوادار بن کە رەنگەگوێیان بە بیستنی ئەوە شێویان هێنا زاخاو درێتەوە، راوەستن ئەوەهات، تۆزێک ددان بە جەرگتاندا رۆگرن. تاقمێکیان ئەگەرچی پێیانخۆش بوو بەلام هێزیان بنەی هات و برسییەتی بە سەریاندا زاڵ بوو،هەر لەوێ لەسەرخۆ چوون، دەتگوت خەوتوون، بەختەوەرانەهاوسەری چاوپزیشک بۆ رزگار کردنیان داوێنی کردبوو بە لادا، جێیسەرسوڕمان بوو کە ئەو ژنە ئاوا خێرا دەگەیشتە سەر رووداوەکان،دەتگوت جۆرێک هەستی شەشەمی هەیە، شێوە روانگەیەک کە پێویستیبە چاو نەبوو، بە کورتی لە سایەی سەری ئەمەوە لەبەر تیشکی خۆرهەڵنەقرچان، بەڵکوو خێرا هەموویان بردنەوە ژوور و بە تێپەڕ بوونیزەمان و ئاو لێ پڕژاندن و نەرمە شەپلاغان تێکڕا هاتنەوە هۆش. بەلامچاوەڕوانی دەس کردنەوە و بەربەرەکانیان لێوەنەدەکرا، ئەوان تەنانەتکلکی پشیلەیەکی مێیان بۆ نەدەگیرا، هەڵبەت ئەوە قسەیەکی زۆر کۆنە وقەتیش دەرینەدەخست کە بۆچی گرتنی کلکی پشیلەی مێ لە هی گورپەهاسانترە. ئاخرییەکەی

پیرەپیاو گوتی شێو نەهاتووە، ئیتر نایە، با بڕۆین‌نان و خوانمان وەرگرین. هەر خودا دەزانێ بە چ حاڵێک هەستان ورۆیشتن هەتا لە دوورترین شوێن لە بنکەی شەڕخوازان کۆ ببنەوە ونەیکەنە نەقڵەکەی ئەو رۆژە. لە وێڕا چەند کەسیان بۆ کۆ کردنەوەی‌باس و هەواڵ ناردە قۆڵەکەی تر، ئەوانە هاوبەندانێ بوون کە لەوێندەرێ‌دەژیان و تەواوی کەلێن و قوژبنیان پێ دەزانی. بە دیتنی هەرکردەوەیەکی گومانلێ‌کراو خێرا بگەڕێنەوە و هەواڵمان بۆ بێنن. ژنی‌دوکتۆری چاو لەگەڵیان چوو و بە هەواڵی زۆر تاڵ و ناخۆشەوە گەڕاوە،چوار تەختیان لە سەر یەک داناوە و رەوگەیان بەستوە، یەکیان پرسی بەکوێدا زانیت چوار تەختە، کارێکی دژوار نەبوو، دەستم پێداخشاندن،کەس نەیزانی کە لەوێی، فکر ناکەم، ئێستە دەبێ چی بکەین، پیرەپیاودیسانیش پێشنیاری کرد وا باشترە بڕۆین، باشتر وایە لە تەمای خۆمانپاشگەز نەبینەوە، جا یا دەبێ ئەو کارە بکەین و یان لەگەڵ مەرگ وتوانەوە بەرەو روو بین، کوێرەپیاو گوتی ئەگەر بچین هێندێکمان زووتردەمرین، هەر کەس قەرارە بمرێ هەر ئێستاش مردووە و خۆی ئاگای‌لێ‌نیە، لەم رۆژەوە لە دایک بووین دەزانین کە سەرەنجام رۆژێک‌دەمرین، هەر بۆیە بە هێندێک باراندا دەڵێی بە مردوویی لە دایک بووین،کچەی چاویلکەیی گوتی لەو قسە بێ‌تامانە گەڕێن، ناتوانم بە تەنیایی‌بچم، بەڵام ئەگەر قەرار وایە وادە و بەڵێنی بخەینە ژێر پێوە، ئەوە من لەسەر تەختەکەم رادەکشێم و ئامێز بۆ مەرگ دەکەمەوە، دوکتۆر گوتی‌هەر کەس موددەی تەواو بێ دەمرێ نەک کەسێکی دی و دەنگی هەڵێنا وگوتی ئەوانەی رازین بچین دەستیان بەرز کەنەوە، ئەو کەسانەی هەردەوێژن و ناپێژن هەمیشە گێرۆدەی بەلای ئاوا لابەلا دەبن، ئێستا کەس‌نەبوو بتوانێ بیانژمێرێ، یا وێکڕا لە سەر ئەم رایە بوون، چ فایدەیەکی‌هەبوو کە لێیان بخوازن دەستیان بەرز کەنەوە و پاشان بڵێن سێزدەکەس، ئەگەر وا بوایە باس و دمەقڕەیەکی نوێ هەڵدەگیرسا هەتا لەبەرتیشکی فام و زانین روون بێتەوە کام رێگا دروستە و باشترە بۆ دەربازبوون لە چنگ شوومیی سێزدە ویستیارێکی دیکەیان بوێ یان بە پشک‌هاویشتن کەسێک قرت کەن. چەند کەس کە تەواو بڕوایان بەم‌جووڵانەوەیە نەهێنابوو دەستیان هەڵێنا، شک و گومان لە روخساریانداشەپۆلی دەدا، چونکە یا لەم مەترسییەی تووشی خۆیان دەکرد تەواوئاگادار بوون یان ئەم داخوازییەیان بەلاوە پووچ بوو. چاوپزیشک‌پێکەنی، چەندە شتێکی سەیر و سەمەرەیە کە ویستم ئێوە دەست بڵیندکەن، باشترە بجووڵێنەوە، بلا ئەوانەی کە ناتوانن یا ناخوازن لەگەڵمان‌بێن. رانەوەستن و بڕۆن، ئەوانی دی راوەستن بزانین دەبێ چ بکەین،هاروژان، هەستی پێ و بۆڵەبۆڵ و هەناسە هەڵکێشان دەنگی دایەوە،مرۆڤی

ترسەنۆک و خوێڕی وردە وردە خۆیان کەناردا، فکری‌چاوپزیشک زۆر باش و بەجێ بوو، بەم شێوەیە بە سانی نەدەکرا بزانی‌کێ ماوە و کێ خۆی دزیوەتەوە. ژنی دوکتۆر ئەوانەی مابوونەوەژماردنی، بە خۆی و مێردەکەیەوە دەبوونە حەڤدە کەس. پیرەپیاو وکچەی چاویلکەیی و شاگرد دەواخانە لە بەشی یەکی قۆڵی راستمابوونەوە، داخوازەرانی بەشەکانی تر تێکڕا پیاو بوون، جگە لەم ژنەی‌کە گوتبووی بۆ هەر کوێ بچی منیش دێم، بەڵێ ئەویش لێرەیە. لەرێڕەوێ ریزیان بەست، چاوپزیشک ئەژماردنی، حەڤدە کەس، حەڤدەکەسین، شاگرد دەواخانەکە گوتی زۆریش نین، سەرکەوتوو نابین. پیرەپیاو گوتی ئەگەر بکرێ زاراوەی نیزامی بە کار بێنین دەبێ بڵێین‌خەتی پێشەوەی پەلامار دەبێ باریک بێ، دەبێ بتوانین لە دەرگا وەژوورکەوین، لام وایە بێتوو زیاتر بواین وەزعەکە هاڵۆزتر دەبوو، یەکی ترقسەکەی بۆ سەلماند زۆریان لێ‌دەکوشتین، بە رواڵەت هەموویان لەئاخریدا خۆشحاڵ بوون کە تاقمەکەیان کەمترە.

ئێستا ئیتر بۆ پاراستنی خۆیان و بەرەنگاریی دوژمنان دەستیان‌کردووە بە هەڵوەشاندنی لاتاری تەختەکانیان و سەرقۆڵ و نێودەلانە وپێچکەکانیان دەرهێناوە و هەر ماوەتەوە بزانین داخوا هێزی پەلاماردەریا تاقمی پشتیوان چۆن دەیانکەنە لۆسە و سەرەنێزە و کەلکیان‌لێ‌وەردەگرن. پیرەپیاو کە دیارە بە لاوی زۆری شەڕ و شووڕ دیوەپێشنیاری کرد تێکڕا بەرەو رووی لایەک ریز بگرن، چونکە بەم شێوەیەپەلاماری یەکتریان نەدەدا، هەروەها گوتبووی دەبێ لەوپەڕی بێ‌دەنگیداباژوێن هەتا هێرشەکەیان کوت و پڕ بێ و نابێ کەسیش پێڵاوی لە پێ‌دابێ. یەکێک گوتی پاشان دۆزینەوەی پێڵاوەکانمان دژوار دەبێ و یەکی ترلە سەری رۆیی هەر کەوشێکی زیاد بێ دیارە خاوەنەکەی نەماوە،هەڵبەت هەمیشە دوای هەڵکەوتی وا لانی کەم کەسێک پەیدا دەبێ بیانکاتەپاوە، ئەوە چیە بۆ هێندە باسی کەوشی مردوو دەکەن، بە پێی پەندێک‌کەوشی مردوو بە میرات ناشێ، بۆچی، چونکە ئەو پێڵاوانەی‌مردۆکانیان پێوە دەناشت لە جنسی مقەببا بوون و نیازی ئەوانی‌جێ‌بەجێ دەکرد، هەتا ئەو جێیەی ئێمە دەزانین روح لە سەر پێ ناڕوا،پیرەپیاو گوتەکەی بڕی، مەبەستێکی تریش هەیە، کاتێک گەیشتینە شوێنی‌دیاری‌کراو دەبێ شەش کەس، شەش ئازا بە تەواوی هێزەوە تەختەکان‌پاڵ دەن تا هەموومان بتوانین وەژوور کەوین، ئەگەر وا بێ ناچارین‌چەکەکانمان دابنێین، لام وایە ئەم کارە پێویست نیە، بێتوو دروستکەلکیان لێ‌وەرگرین یارمەتیشمان دەدەن، ماوەیەک بێ‌دەنگ بوو، پاشانبە راوێژێکی خەماوی گوتی نابێ لە یەک جیا بینەوە

ئـەگینا حاڵـمان شـڕدەبێ، کچـەی چاویلکـەیی گـوتی ژنـەکان چلـۆن، ئـەوان فـەرامۆش مەکە،پیرەپیاو گوتی تۆش دێی، باشتر بوو نەهاتبای، پێم خۆشە بزانم بۆ چی،تـۆ زۆر جـەوانی، لێرە باسی پیر و لاو و ژن و پیاو لە گوڕێدا نیە، کە وایەژنەکان فەرامۆش مەکە، نا، فەرامۆشـیان ناکەم، پیرەپیاو دەتگوت لەگەڵکەسێکی دیکەدا دەدوێ، بەڵام وردە وردە راوێژی بەجێ بـوو، بەپێچەوانە، خۆزگە یەکێ لە ژنەکان چاوی هەتەری کردبا و ئەوەی ئێمەنایبینین ئـەو دیتبـای و رێگای دروستی پێ نواندباین و توانیباما وەکووژنەکە نـوکی نێزەکانمـان لـە گـەرووی ئـەم بێژوانە رۆکردبا، هاوسـەری‌چاوپزیشـک وەبـیری هێنایـەوە چاوەڕوانییـەکی زۆرە، نـاکرێ ئـەو کـارەی‌لـە پێشـا کردوومانـە بەسـانی دووپـاتی کەینـەوە، ئـەوجار کـێ دەزانـێ کەلـەڕێوە نەکووژراوەتەوە، هەتا ئێستا کە هیچ سەر و سـۆراغی نیـە، کچـەی‌چاویلکـەیی گـوتی ژنـەکان کاتی لە دایک بوون روحیان جێ گۆڕکێ دەکا،ژنی داوێن پـاک دەبێتـە داوێـن پـیس و ژنی داوێن پیس بە داوێن پاکی چاودەپشکوێ. بـێدەنگییـەکی قـورس وڵاتی داگـرت، ئـەوەی لـە بابەت ژنانەوەپێویست بوو باسی کرا، پیاوەکان ناچار بوون بە راوێژێکی تر بدوێن ودەشـیانزانی کە ناتوانن.

بە ریز وەدەرکەوتن، بە پێی قسەی ئەو شەش کەسەی ئازاتر بوون‌وەپێش کەوتن و ئـەوانی تر بە دوایانە کەوتنـە رێ، هـەر یەکـەی کوتەئاسـنێکی دەس دابوویـە، چاوپزیشـک و شـاگرد دەواخانەکە لە پـێش‌پێشـەوە دەڕۆیشـتن، لەشـکرێکی نێـزەداری چارەڕەشـی شـڕۆڵ، کاتێـک بەسەرسەرادا تێدەپـەڕین چـەکێ بـەربۆوە و شـریخەی دەتگـوت دەمانچەیـە،بێتوو ملـهوڕەکان گوێیان لێ‌بووبێت و بە کاری ئێمەیان زانیبێ حاڵمان‌شڕ دەبێ، ژنی دوکتۆر بێ ئەوەی تەنانەت مێردەکەشی ئاگادار کاتەوەبە خێرایی کەوتە پێش و چاوێکی بـە بنـەبانی رێڕەوەکـەدا گێـڕا، پاشان‌زۆر بە ئارامی بە پەنا دیوارا خۆی گەیاندە دەرگای بەشەکە، بـە وردی‌گـوێی هەڵخسـت، دەنگە دەنگەکە هیچ نیشانەی دڵەڕاوکە وسەرلێ‌شێواوی پێوە دیـار نـەبوو. لـەڕێوە گەڕایـەوە و ئەم هەواڵەی بۆهاوڕێیانی گێڕایەوە و پێشڕەویی دەستی پـێ‌کـردەوە، ئـەو بەشـانەی‌کەوتبوونـە سەر رێی بنکەی گەندەپیاوان دەیانزانی چ خەبەرە، هەر بۆیەتێکڕا بە ئـارامی لەبـەر دەرگاکـان کۆ ببوونەوە هەتا ئاگایان لەتێک‌هەڵـچوون و شـەڕ و لێـک‌دان بـێ، ئەوانـەی گـەرم و گـوڕتر بوون و لەترسی بۆنی باڕووت پێ‌دزەیان دابوویە ئێستا لە ئـاخرین دەمادەیانویسـت تێکـەڵ بـن، چەند کەسێک گەڕانەوە هەتا خۆیـان تـەیار کەن،ئـەوجار حەڤـدە کـەس نـەبوون و لانی کـەم ببوونە دوو هێند، بێ‌گومان‌پیرەپیاو دڵی بە هێزی پشتیوان خۆش نەبوو، بەڵام هەرگیز نەیدەزانی

کەئێستا سەرکردایەتی دوو لەشکری بە ئەستۆوەیە. لە پەنجەرەکانی سەرحەوشە بچکۆلەوە دوایین تیشکی لەرزۆکی خۆر داوێنی کۆ دەکردەوە،گزینگێکی رەنگ بزرکاوی روو لە ئاوا بوون کە ئێستا بەرەو چاڵاویرەش و قووڵی شەو دەکشا. جگە لە خەمی بێبڕانەوەی کوێریی کەبێپشوو ئەوکی گرتبوون، دەسبەسەر کراوەکان پەژارەیەکی ئەوتۆیانلەمەڕ ئاڵوگۆڕی شەو و رۆژ و ئاو و هەواوە نەبوو، دیارە ئەوەشزۆریان بە قازانج بوو، چونکە ئەو مەبەستە تەواو سوور بۆتەوە کە هەرئەم ئاڵوگۆڕانە لە رابردووی دوورا کە خەڵک چاویان هەبوو ودەیانبینی دەبوو بە هۆی سەرهەڵدانی بیری تەمگرتووی هیوابڕاو. کاتێک گەیشتنە ئەو بەشە تووکلێکراو و شوومە وڵات وەها تاریک داهاتبووکە ژنی دوکتۆر نەیزانی لە جیاتی چوار تەخت بە هەشت تەختان بەردەرگایان گرتووە، رادەی تەختەکان هاوکات لەگەڵ هێرشبەراندادووقات کرابوون، هەڵبەت زۆر بە زوویی بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەمزیاد کردنە گەلێک بە زەرەدی پەلاماردەران تەواو دەبێت. پیرەپیاو بەمانای فەرمانی هێرش نەهرەتەی لە سینگی بەتاڵ کرد، رستەی ئاساییبۆ پێشەوەی نەهاتەوە یاد، یان رەنگە وەبیری کەوتبێتەوە بەڵام ئەوزاراوەیەی لێرە بە دزێو زانیبێ، مەتەرێزێکی پیس و پڕ لە کێچ و ئەسپێ کە دۆشەگەکانیان لەبەر ئارەقە و میز رزیبوون و پەتۆکان ببوونە جلو پەلاس و تازە بۆریان نەدەنواند، بەلکوو رەنگی ناخۆشەویستییان لەخۆ گرتبوو، خێزانی چاوپزیشک ئەم مەبەستەی بە وردی دەزانی، نەکئەوەی ئێستا ئەوانەی دیتبێ، چونکە تەنانەت بە قایمکرانی سەنگەرەکانینەزانی. دەسبەسەر کراوە کوێرەکان چەشنی فریشتەکانی بارەگای خوابە شان و شکۆوە هەنگاویان دەنا، بە پێی فەرمانی سەرکردە سەریچەکەکانیان شۆڕ کردەوە و گوڕمیان بەستە تەختەکان، بەڵام تەختەکانهەر جووڵەشیان نەکرد، بێشک تاقەت و توانای پێشڕەوە ئازاکان چیوا زیاتر لە هێز و توانای ئەو کز و لاوازە بێ دەسەڵاتانەی پشتەوە نەبووکە بە زەحمەت ئاسنێکیان دەس دابوویە و وەک ئەو کەسانە دەچوون کەخاچێکیان لە کۆڵ دابن و ئێستا چاوەڕوانیی مەرگی لێوە بکەن، بێدەنگیشکابوو، لە دەر و ژوورەوە دەیانگوڕاند و هاواریان کرد، رەنگە تا ئێستاکەس سرنجی نەکەوتبێتە سەر هاوار و گوڕەی ترسێنەری کوێران، هیچڕێیەکی مەنتیقی بۆ گوڕە و نەڕەیان نادۆزینەوە، لێیان دەخوازینبێدەنگ بن و پاشان خۆمان دەس دەکەین بە هاوار کردن، هەر ئەوەمانکەمە کە خۆشمان کوێراییمان دابێ، بەڵام ئەم رۆژەش دادێ. کە وایەبارودۆخەکە ئاوا بوو. تاقمێک هێرشیان دەبرد و هاواریان دەکرد ودەستەیەک بەربەرەکانیان دەکرد و دەیانگوڕاند، هێرشبەران بەلانەچوون و

تێکنەڕووخانی مەتەریزی گەندەپیاوان زۆر تێکچوون وبە ناچاری چەکیان رۆنا و تێکڕای ئەو کەسانەی توانیان جێی خۆیانبکەنەوە بە هەموو هێزەوە پاڵیان بە تەختەکانەوە نا و دەتگوت خەریکەسەرکەون، تەختەکان بڕێک جوولانەوە بەڵام لەم کاتەدا لەپڕ و بە بێهەڕەشە و گوڕەشە تەقەی سێ فیشەک دەنگی دایەوە، حیسابداری کوێربوو کە زۆر نەوی تەقەی دەکرد. دوو کەس لە هێرشبەران بریندار بوونو کەوتن، ئەوانی تر بە سەرلێشێواوی و پەلەپڕووزێ هەلاتن، لاقیان لەئاسنەواڵەکانیان گیرا و بەربوونەوە، دیوارەکانی رێڕەو دەتگوت تووشی سەرەگێژە هاتبوون و ئەوەندەی تریان ترس وەبەر نابوون، لەتەواوی بەشەکانیشەوە گرمە بەرز ببۆوە. ئێستا هەوا ئەوەندە تاریکبوو کە نەدەکرا بزانی چ کەسێک ئەنگاوە، هەڵبەت دەکرا لە دوورەوەبپرسی کێی، بەڵام کارێکی جوان نەبوو، دەبێ بەڕێزەوە لەگەڵ برینداربەرەو روو بی و ئاگات لێی بێ. دەبێ بە مێهرەبانی بچین بۆ لایان ودەست لە سەر نێوچاوانیان دابنێین، مەگین ئەوەی بۆ بەدبەختییانگوللەکە راست تەختی تەوێڵی گرتبن، پاشان دەبێ بە دەنگێکی نەرم ولەسەرەخۆ حاڵیان بپرسین، بیانلاوێنینەوە و خاترجەمیان کەین کەبرینەکەیان سووکە و ئێستا بە دارەمەیت دەگەنە سەریان و لە ئاخریدائاویان بە زاردا بکەین، هەڵبەت ئەگەر فیشەکیان وەزگی نەکەوتبێ، ئەومەبەستە لە کتێبی یارمەتیدانی سەرەتایی زامارانـدا بە وردی باسی کراوە. ژنی دوکتۆر گوتی ئێستا چ بکەین، دوو برینـدارمان بە سەردەستیدا ماوەتەوە. کەس لێی نەپرسی لە کوێوە دەزانێ کە دوو کەسن،بۆ چما سێ فیشەک نەهاویژرابوو، تازە ئەگەر پڕیشکە و کەوانەکردنیش بخەینە لاوە. چاوپزیشک گوتی دەبێ بچین بیاندۆزینەوە،پیرەپیاو، سەرکردەی هێزی تێکشکاو وەبیری هێنایەوە کە خەتەرێکی گەورەیە، بێتوو بزانن کەسێ لەوێیە دیسانیش تەقە دەکەن، هەناسەیەکیهەڵکێشا و گوتی بەڵام ناچارین، من بە بەشی خۆم ئامادەم، هاوسەریدوکتۆر گوتی منیش هەرواتر، منیش دێم، ئەگەر لە سەر سینگ بخوشینمەترسیی کەمترە، گرینگ ئەوەیە زوو بیاندۆزینەوە هەتا ئەو کەسانەیلە بەشەکە دان نەتوانن بەرگریمان بکەن، ئەو ژنەی ماوەیەک پێشترگوتبووی تۆ بۆ هەر شوێنێک بچی منیش دێم ئێستاش دووپاتی کردەوەمنیش دێم، بە بیری هیچکەس نەگەیشت کە بڵێ زۆر بەسانی دەکرێبزانین کێ کوژراوە یان بریندار بووە، جارێ کەس ئەو مەبەستە نازانێ،ئەوەندە بەس بوو هەموو بڵێن من دەچم یا ناچم، ئەوانەی دەنگیان نەبوودیارە یا کوژرابوون یان بریندار.

بەم جۆرە چوار کەسی داخواز بە زگە خشکە کەوتنە ڕێ، بەهەڵکەوت دوو ژنەکە کەوتبوونە نێوەڕاستی پیاوەکان، ئەو کارە لەرووی شەرم و حەیای پیاوانە و پاراستنی ژنەکان نەبوو، حەقیقەت‌ئەوەیە بێتوو سەرحیسابی کوێر دیسان تەقەی کردبا هەموو شتێک‌دەگەڕاوە سەر سیلەی دەمانچەکە. بەڵام ڕەنگە هیچیش نەقەومێ،پیرەپیاو بەر لە ڕۆیشتن تەگبیرێکی باشتر لە پێشووی بۆ کردن و بە پێی‌پێشنیاری ئەو تێکڕا دەبوو بە دەنگی بەرز قسەیان کردبا و تەنانەت‌نەهرەتەشیان کێشابایە، دیارە ئەم کارەیان لە هەموو بارێکەوە دروست‌بوو، چونکە دەیانهەویست بەم گرمەگرم و قیژەقیژە شڵپ‌وهۆڕی‌هات‌وچۆ و جووڵانەوە و کردەوەیان کە تەنیا خودا پێی دەزانی بخەنەژێر باڵی حەشار. رزگاری‌دەران لە ماوەی چەند دەقیقەیەکا گەیشتنەشوێنی مەبەست، بەر لەوەی دەستیان بگاتە مەیتەکان ئەوەیان زانی، ئەوشێلاوگە خوێنەی بە سەریدا دەخوشین چەشنی تەتەرێک بوو کەدەیگوت من ژیان بووم و ئێستا نەمان کەوتۆتە سەرم، ژنی دوکتۆر بەخۆی گوت ئەی خوایە لەم هەموە خوێنە، ڕاستی دەکرد، گۆمیلکەی‌خەست دەڵەمەی دابوو، لەشیان بە حەرزەوە نووسابوو، دەتگوت‌چەسپیان کردوون. هاوسەری چاوپزیشک لە سەر ئانیشکان درێژەی بەرۆیشتن دا و ئەوانی تریش هەر وایان کرد. دەستیان درێژ کرد وسەرەنجام گەیشتنە مەیتەکان. هاوڕێکانیان ئەوەندەی توانیان گرمە وقیژە و هەرایان ساز کرد و ئێستا چەشنی ئەو کەسانەیان لێ‌هاتبوو کەکاریان شین‌گێڕی و تازیەدارییە و دەگەنە حاڵەتی لەسەرخۆ چوون. دەستی هاوسەری چاوپزیشک و پیرەپیاو گەیشتنە جومگەی لاقی یەکێک‌لە بریندارەکان، دوکتۆر و ژنەکەی دیکەش لاق و دەستی برینداری‌کی‌تریان گرت و تێکۆشان لە بەر تێزەی تیری دوژمن دووریان کەنەوە. کارێکی هاسان نەبوو، ناچار بوون ئاخێز بکەن و بە گاگۆڵە بڕۆن، ئەوەتەنیا ڕێگای کەلک وەرگرتن لەو بڕە هێزە بوو کە لە بەریاندا مابوو. شریخەی دەمانچە سەرلەنۆی وڵاتی داگرت، بەڵام ئەمجارەیان کەسی‌نەپێکا. ترسی پەرەگر بازرەی نەکردن و بە پێچەوانە بوو بە هۆی ئەوەی‌بە تەواوی هێز و تواناوە ئەرکی خۆیان جێ‌بەجێ کەن. ماوەیەک دواترلە مەترسیی دوور کەوتبوونەوە، ئەوەندەی دەیانتوانی خۆیان لەم‌دیوارەی دەرگای بەشەکەی تێدابوو نیزیک کردەوە، تەنیا ڕەنگە بووئەگەر فیشەکێک کەوانەی کردبا گەیشتبایە ئەوان، بەڵام نەدەکراسەرحیسابی کوێر ئەم شێوە کارە ورد و باریکەی بزانیایە. تێکۆشان‌کەلاکەکان ڕاست کەنەوە، بەڵام پەشیمان بوونەوە. چونکە قورس بوون‌تەنیا دەیانتوانی ڕایانکێشن و بەم کارە ئەو خوێنەی لە بەریان‌ڕۆیشتبوو و دەڵەمەی دابوو دەتگوت بە بان گلان لە زەوی هەڵدەسووراو بە

شـوێنیاندا دەهـات و ئـەم خوێنـەی لـە لەشـی برینـدارەکانا مـابوو هـەروا شـۆڕەی دەکـرد. چاوەڕوانەکان پرسیان ئەوانە کێن، پیرەپیاو گوتی‌خۆ ئێمە چاومان نیە هەتا بزانین کێن، یەکێک گوتی نابـێ لێـرە بمێنینـەوە وئـەوی تـر قـەراخی بـۆ تـێ‌کـردەوە بێتـوو بکەونـە بـیری پـەلامار دووبریندارمان زیاتر بە سەر دەستیدا دەمێنێتـەوە، دوکتـۆر گـوتی یـان مەیت،ئەوانـەش نـەزمی دەستیان لێ‌نادا. چەشنی لەشکری تێشکاو مەیتەکانیانبـە رێ‌ڕەوا رەکـێش کـرد، پـاش ئـەوەی گەیشتنە سەرسەرا راوەستان،دەکرا بلێی بـە خەیاڵـی حەسانەوە و وچـان دان، بـەڵام راستەقینە شتێکی‌تر بوو، هیچ هێزیان لەبەردا نەمابوو، من کە هەر لێرە نابزووم، منیش‌ناتوانم پێ لەبەر پـێ بنێم. لێرەدایە کە دەبێ دان بەو مەبەستە دابێنین زۆرسەیرە کە شەڕخوازانی لات و لووت ئێسـتا تەنیا بەرگرییان لـە خۆیـاندەکـرد و کۆسـپ و تەگـەرەیان دەخسـتە بـەرپێیان و لـە ژوورەوەڕا تەقـەیاندەکـرد، دەتگـوت ئـەم دڵـڕەقە بـێ ویژدانانـە ترسـیان وەبـەر نیشـتبوو ونەیانـدەوێرا وەدەرکەون و بێنە مەیدانی شەڕی دەستەویەخە. ئەوەش‌وەکوو هەموو شتێکی ئەم ژیانە بۆنـە و بەڵگەی تایبەتی خۆی هەیـە، یـانی‌دوای کارەسـاتی کـوژرانی یەکـەم سـەرکردەیان رایەڵـەی رێک‌وپێکی وفەرمانبەردارییان لێک‌هەڵوەشا، هەڵەی ئاشکرای حیسابداری کـوێر ئـەوەبوو کـە وای دەزانی هەڵگرتنەوەی دەمانچەکە بۆ پاوانی دەسەڵات‌تـەواوە، بـەڵام دروسـت مەسـەلەکە هەڵگەڕایەوە، هەر جارێک تەقـە دەکائاکـامی پێچەوانـە خـۆ دەنوێنـێ، بـە واتایـەکی تـر هـەر فیشـەکێکی دەیهـاوێ‌زیـاتر لـە دەسـەڵاتی کـەم دەکاتـەوە، کـە وایـە دەبـێ بـزانین کاتێـک گوللەی‌لێ‌بڕا چۆن دەبێ، هەر وەک جـل‌وبـەرگی جـوان نـاکرێ نیشـانەی‌ئینسـانییەت بـێ، بـە بوونی عەسای سەڵتەنەتیش پاشایەتی ناکرێ و دەبێ‌قەت ئەم خاڵە گرینگە فەرامۆش نـەکرێت. جا بێتوو ئەوە حەقیقەت بـێ کەئێسـتا عەسـای حکوومـەت کەوتۆتـە دەس حیسـابداری کـوێر، ئینسان وای‌لێ‌دێت کە بڵێ ئەگەرچی پاشا نەماوە و لە بەشەکەی خۆیا زۆر بەناحەزی نێژراوە و چاک دانەپۆشراوە، هێشتاش لە یادان نەچۆتەوە،چونکە لانی کەم بۆگەنی کەلاکی هەبوونی بە هێــزی دەخاتــەوە یــاد وبــیران دەهــەژێنێ. لــەم گێرەوکێشــەیەدا مانــگ هــەڵات. لــە دەرگای‌سەرسەراوە کە بە سەر حەساری دەرێدا دەکرێتەوە تریفەیـەک دەنگـوێ‌و وردە وردە پتر باڵ دەگرێ، لاشەی تخێڵ خۆیـان دەنـوێنن، دوویـانمـردوون و ئـەوانی تـر زینـدوو، وردە وردە بە درەوشانەوەی رووناکی،قەبارە، بیچم، تایبەتمەنـدی و سـەر و پۆتـڕاکی پـڕ مەترسـییان خۆ دەنوێنێ،ترسێکی قورس و بێ ناو و نیشان. هەر ئێستا ژنی دوکتۆر بۆی‌دەرکـەوت خـۆ بـە کوێر نواندن تا ئێرە مانایەکی هەبوو، بەڵام لێرە بـەدواوە تـەواو بـێ مانایـە، دیـارە نـاکرێ لێـرە

کەس رزگار بکرێت. کوێرییش هەر بەم مانایەیە، ژیان لەو دنیایەدا کـە تـەواوی ئومێـدەکان بـا بردوونی. هەروەها توانی کوژراوەکانیش بناسێتەوە، ئەوەیان شاگردیدەوافرۆشە و ئەوەش ئەو کەسەیە کە دەیگوت گەندەپیاوان لەخۆوە تەقەدەکـەن و پـلاری کـوێرە دەیهـاوێن، پێویسـت ناکا بپرسن لە کوێوە دەزانم،وڵامەکەی زۆر سادەیە، من هێشتاش دەبیـنم. هێنـدێک لـە ئامـادە بووان‌دەیانزانی و باسیان نەدەکرد، تاقمێک لە ماوەیـەک لێرەوبـەرەوە شـکیان‌کردبـوو و ئێسـتا وەڕاست گەڕابوو، بەڵام واق مانی دەستەیەک زۆرسەیر بوو، بەڵام کە جوان بیریان کردەوە بە خۆیان گوت رەنگە هیچ‌جێی سەرسوڕمان نەبێت، ئەگەر ئێستا هەل‌ومەرجێکی دیکە بوایـە ئـەم لەقاودانە دەبوو بە هۆی ترس و خۆف و دڵەڕاوکەیەکی پەت‌پساو،خۆزگەم بە خۆت کا، چۆن توانیوتە لـە شـەڕی ئـەو بەڵایـە خـۆ بپـارێزی، چەقەترەیـەک دەکەیتـە چاوتـەوە، نـاو و شـوێنی دوکتۆرەکەت بدە بە من،یارمەتیم بدە هەتا لەو بەنـد و گێـژی ئەسـکەندەرە رزگـار بم، بـەڵام ئێستاتەواوی شتێک ساماڵ و یەکسانە، لە مەرگا هەموو بە رادەیەک کوێرن. لەم کاتەدا کە بـێ پەسار و بەرگر مابوونەوە و مست و پێلاقە چی پـێ‌نـەدەکرا، دەبـوو ئـەم شـوێنە جـێ بێڵـن. بـە رێنوێنیی هاوسەری چاوپزیشک‌جەنازەکانیان بۆ حەوشەی گەورە راکێش کرد و لەبەر تریفـەی مانگەشەو رایانکێشان، لەبەر درەوشانەوەی زێوینی ئەو ئەستێرەی بەرواڵەت مەیلەو سپی دەواند و لە دەروونیدا رەش. پیرەپیـاو گـوتی واباشـە بگەڕێینـەوە بەشـەکانمان، پاشـان رێگایـەک بـۆ رێک‌وپێکی‌دەدۆزینەوە. ئەوە وتەی ئەو بوون، ئەم وتە شێتانەیەی کـەس گـوێی‌پـێ‌نـەدا و لای لێ‌نەکردەوە. بە پێی ئەو بەشانەی لێیەوە هاتبوون‌بڵاوەیان لێ‌نەکرد، بەڵکوو هـەر وا دەڕۆیشـتن و لە رێگا تووشی یەک‌دەهـاتن و یـەکتریان دەناسییەوە، هێنـدێک بـۆ لای چـەپ دەڕۆیشـتن وپۆلێک بۆ لای راست، ئەو ژنەی گوتبووی بۆ هەر شوێنێک بڕۆی منـیش‌دێم هـەتا ئێـرە ژنی دوکتۆری جێ نەهێشتبوو، بەڵام ئیتر بڕوای گۆڕابوو،کەچی دڵـی نەیدەویسـت باسـی لێوەبکـا، پەیمان‌شکێنی مەبەستێکی‌نائاسایی نیـە، جـاری وایـە بـێ‌هێـزی رێـی بـۆ خـۆش دەکـا و هـەلی وایەهێزێکی سەرتر کە هەر نەهاتۆتە بەرحیساب.

کاتەژمێرێک تێپەڕی، مانگ بـە تـاقی ئاسمانـەوە درەوشـایەوە، تـرس وبرسـییەتی رێگـری خەون، لە بەشەکەدا تێکڕا وەخەبەرن. بەڵام هۆی‌نەخەوتنیان تـەنیا ئەوانـە نـین. رەنگـە بەشـێکی بگەڕێتەوە سەر ئەوهەڵگرانەی دوایی کە هەرەسێکی تاڵی بە دواوە بوو یـان مەبەسـتێکی ترکـە نایەتە نێو چوارچێوەی نووسـین و لـە هـەوادا شـەپۆلی دەدا،دەس‌بەسـەر کراوەکـان ناسـرەون. هـیچ‌کـەس نـاوێری پـێ بنێتـەرێ‌ڕەوەکـان، بـەڵام ژووری هـەموو بەشـەکان بۆتـە هێلانـە

زەرگەتەیەکی پڕ لە زەرگەتەی نێر و هەر ژاوەی دێ، دیارە هەموو کەس دەزانێ نێرەکان کەمتر مەیلیان لە تەکووز و ڕێک وپێکییە، نیشانەیەک بەدەستەوە نیە کە بە درێژایی تەمەنیان کارێکی وایان کردبێت بۆ باس کردن بشێ و قەت سەبارەت بە داهاتوو دڵنیگەران نەبوون، هەر چەندبێتوو کوێرەکان، ئەم بوونەوەرە چارەڕەشانە بە ملۆزم و مفتەخۆربشوبهێنین زۆر بێ ئینسافییە، باشە مفتەخۆر و ملۆزمی سەر کام نان وخوان، بۆ پێکەوە هەڵسەنگاندن پارێز کردن مەرجی پێویستە، ئەگینائاکامێکی بێ بناغە و لەرزۆک خۆ دەدا بە دەستەوە. بەڵام هیچ ڕێسایەک بە بێ هەڵاواردە نیە و ئەم مەبەستە لێرەشدا بە ڕوونی دەیخوێنێتەوە، بۆسوور بوونەوەی قسەکەمان دەتوانین بڕوانینە ئەو ژنەی پێی نایە بەشیدووی قۆڵی ڕاست و لەڕێوە شڕو شالاتی خۆی پشکنی تا شتێکی بچووکی دیتەوە و لە مستیدا ڕێکیکوشی، دەتگوت دەیهەویست لەسیلەنیگای قوژبن پشکنی نامۆی حەشاردا، خووی لەمێژین خاشەبڕبوونی سەخڵەتە، تەنانەت ئەو کاتەی لامان وایە زۆر لەمێژەفەرامۆشمان کردوون. لێرەدا کە دەبوو کەس تەنیا لە بیری خۆیا نەبێ وهەموو پاڵپشتی یەکتر بن دیتمان کە ملهوڕان چلۆن نانی دمی هەژارانیان دەفڕاند و ئێستا ئەم ژنە وەبیری هاتبۆوە کە چەخماخێکی لە جانتاکەیاهەڵگرتووە، مەگین لەم شەڕ و هەرایەدا گومی کردبێ، بۆیە زۆر بەتامەزرۆیی دەستی لێ کوتا و ئێستا پەنامەکی حەشاری دەدا، دەڵێی کوولەکەی ڕوحی خۆیەتی، ئەو لێرەدا ناکەوێتە بیری یەکێک لەچارەڕەشانی هاوبەشی کە ڕەنگە جگەرەیەکی لا مابێ و ئێستا بۆداگیرساندنی دامابێ. خۆ ئێستەش وەختی داوا کردنی چەخماخ نیە. ژنەبێ هەست و خوست و ماڵاوایی ڕۆیشتووە، ملی ڕێیە بە ڕێڕەوی چۆلادەگرێتە بەر، ڕاست بە بەردەرگای بەشی یەکا تێدەپەڕێ، کەسێ لێرەئاگای لێ نەبوو، لە سەرسەراوە تێپەڕ دەبێ، مانگی بەرەو ئاوا بوون کووپەیەکی شیر لە سەر تەختی بنی ژوورەکە قلْپ کردبۆوە، ئێستا ژنەگەیوەتە قۆڵەکەی تر، دیسانیش ڕێڕەوێک، شوێنی مەبەستی بنەبانە وبە ڕەوگەیەکی ڕاستەوخۆدا ڕێی لێ تێک ناچێ. هەر لەم کاتەدا دەنگ وهەست و خوستێک دەژنەوێ کە بۆ لای خۆیانی ڕادەکێشن، بە واتایەکی تر ئەوەی دەیبیسێ بەزم و هەرایەکە کە گەندەپیاوان لە ئاخرین بەشادەیگێڕن، سەرکەوتنی خۆیان کردۆتە جێژن و هەر چی پێیان خۆشەدەیخۆن و دەیخۆنەوە، ئەم زێدەڕەوییەی ئێمە بە قەستی دەینووسین ئێوە وەبەر چاوی مەگرن، نابێ لە بیرمان بچێ کە هەموو شتێک لە ژیانانیسبییە، ئەوان تەنیا ئەوەی لەبەر دەستیانە دەیخۆن و دەیخۆنەوە و بڵارابواردنیان نەمر بێ، ئەوانی تر ئەوە دڵیان دەتۆقی بۆ ژەمێکی وا، بەڵام هەیهات گەلێ دوورە دەست بوو، هەشت تەخت و

دەمانچەیەکی پڕ، لەنێوان ئەوان و دەفری خواردنا ببوونە شوورەیەکی قایم. ژنە دروست لەپەنا تەختەکانی بەر دەرگا چۆکی داداوە، بە ئارامی پێخەفەکانڕادەکێشێ ناگاتە تەختی چوارەم، گرینگ نیە، پلێتەکان ئامادەن، ئێستاهەر ماوە ئاوریاندا. هێشتاش لەبیری ماوە کە چۆن گڕی چەخماخەکەخۆش کا، سەرکەوت، ئەوە خەنجەرێکی نوور، ترووسکەدار و نووک تیژچەشنی دوو دمەی مقەست. لە تەختی سەرەوەڕا دەس پێدەکا، گڕ بەزەحمەت مەلافە پیسەکان دەلێسێتەوە، پاشان سەرەنجام هەڵدەگرێ،پاشان بە نۆرە هەموویان ئاور دەدا، ژنە بۆ کڕووزی مووی‌هەڵپرووزاوی خۆی دێتە بەر لووت، دەبێ وریابێ، ئەو کەسێکە لێژەداری مردوو سووتاندن هەڵدەگرێنێ نەک ئەوەی خۆکوژی بکا، هاوارهاواری لات و لووتان لە ژوورەوەڕا دێتە گوێ، لەم کاتەدا لەپڕ بە بیریداهات نەکا ئاویان لەبەر دەستا بێ و بتوانن ئاورەکە داکووژێنن، لەبەرهیوابڕاوی خۆی خزاندە ژێر تەختی یەکەم، ئاوری وەبەر دۆشەگەکە داو ئەوەندەی ئێر و ئەوێ بە چەخماخەکە کرد هەتا ئاور باڵی کێشا و بووبە پەردەیەکی بەرینی ئاگر، باوەشێک ئاو قەڵەمبازی هاویشت و بڕێکیش‌ژنەی گرتەوە، بەڵام بێهوودە بوو، لەشی ئەویش ئێستا ببوو بەدەستەچیلەی خرمانی ئاور. بڵێی لە نێو بەشەکە چ خەبەر بێ. خۆ کەس‌ناتوانێ خۆ بە ئاوردا بدا و بچێتە ژوورەوە، خۆ دەبێ بڕستی خەیاڵی‌ئێمەش بڕ کا و بە کەلکی شتێ بێ، ئاور خێرا ئەم تەختاوتەخت دەکا ودەتەنییەتەوە، دەڵێی دەیهەوێ هەمووشتێک وێکڕا هەڵبلووشێ وسەریش دەکەوێ، گەندەپیاوان ئەو بڕە ئاوەی هەیانبوو بێ سێ و دووبە فیرۆی دەدەن، ئێستا تێدەکۆشن دەستیان بگاتە پەنجەرەکان، بەلەرزە لەرز هەڵدەکشێنە ئەو شوێنەی هێشتا ئاور خۆی لێنەداوە، بەڵام‌لە نەکاو ئاگر پەل دەکوتێ و کوێرەکان دەخزێن و شڵپ بەردەبنەوە،تەبەقە شووشە بە تینی ئاور شەق دەبەن و دەشکێن، هەوای تازە بەلووره لوور خۆ بە ژوورا دەکا و ئاورەکە دەگەشێنێتەوە، هەر وەهاهاواری پڕ ترس و تووڕەیی و زیقە و هەرای ژان و ئێش لە بیر نەکراون،وەهەر حاڵ ئەوندەتان لە بیر بێت کە تەواوی ئەوانە وردە وردەرۆدەمرکێن، بۆ وێنە ژنەی خاوەنی چەخماخ زۆر لەمێژە متەقی لێبڕاوە.

ئێستا ئیتر هەموو هاوبەندە کوێرەکان ترساو و سەرلێشێواو بەرەورێڕەوە پڕ لە دووکەڵەکان رادەخوشن و هاوار دەکەن ئاور، ئاور، جالێرەدایە کە چۆنیەتی شێوەی ناجۆر سازکرانی ئەم شوێنانە و دابین‌کردنی دانیشتوانیان دەردەکەوێ، بڕوانن بزانن تەختەکان بەو لاتارانەی‌دەڵێی سەرەنێزەن چۆن دەبنە داوی مەرگ، ببینن ئەو بەشانەی تەنیا بۆچل کەسان

سازکراون و تەنیا دەرگایەکیان تێدایە چ ئاکامێکی تاڵ وناخۆش ئامێزی بۆ کردوونـەوە، بێتـوو ئەوێنـدەرێ ئـاور بگـرێ و ڕێـیدەربـاز بـوون ببەسـتێ، کـەس بـە سـلامەتی رزگـاری نابـێ. بەختەوەرانەمێژوو نیشانی داوە کە هیچ سەیر نیە بێتوو شەڕ وەخێر گەڕێ،ئەگەرچی بەسەرهاتی لەم چەشنە کەمتر رووی داوە، دژایەتییەکانیدنیای ئێمە ئـاوان، هێنـدێک بابـەت پتریـان سـرنج دەوێ، ئێستا باشـیکارەکـە لەوەدایـە کـە هـەر بەشـێک تـەنیا دەرگایـەکی هەیـە، یـانی بێتـوو ئاوانەبووبا ئاور خێرا تەواوی ولاتی دادەگرت، جا ئەگەر بارودۆخەکـەزۆرتر نەشلـەژێ رەنگـە ناچار نەبین بۆ مردووی زیـاتر شـەمۆلە دابگـرین. هەڵـبەت زۆرێـک لـەم دەسبەسـەر کراوانـە دەکەونـە بـەر پێیـان، وێـکدەکـەون و بـۆ ئـەملا و ئـەولا رادەدرێـن، ئـەوە ئاکـامی ترسـە. ئاکامێکیئاسایی و سروشتی، دەکرێ بڵێین ئەوە سرشتێکی حەیوانییە، بەلامئەگەر گیاوگۆڵـیش ئاوا رەگ و ریشەیان دانەکوتابا و پابەندی بەنـدیزەوی نـەبووبان بـێگومـان رەویـان دەبـرد و تەماشا کردنی دیمەنیهەلاتهەلاتی دارستان بە نێو جەرگەی ئـاگرا چەنـدە خـۆش و دڵـگرە. ئەوکوێرانـەی خـەریک بـوون پەنجـەرەی رێڕەوەکـان بکەنـەوە توانیـان لەپـەناگای حەوشـە بچکۆلـە کـەلکی بـاش و پێویسـت وەرگـرن. خۆیـان حـەوادەدا، دەکـەوتن، سـەر و ملیـان تێکدەچەقی، هەڵدەستانەوە، هەڵدەنگووتن،دەگریان و هاواریـان دەکـرد، بـەلام وا ئێسـتا کـە کەوتنە ژێر نوایەک، باشتروایە هیوادار بـین کاتێـک بانەکـە تێـکقرمـا و گێژەڵـووکەی ئـاگر بەرەوئاسمان باڵی گرت و خـۆی دایـە دەم بـا، زمـانی نەگاتـە لـق و پـۆپی داران. لەقۆڵـەکەی تریش ترسی تێکڕایی ولاتی هەژاندووە، بۆنی دووکەڵ بۆ کوێروەک ئەوە وایە ئاورت لە پـەنا کردبێتەوە، بەلام دیارە ئەوە هەڵەیە، هێندینـەبرد وێکـڕا هرووژمیـان کـردە نێـو رێڕەوەکـان، بێتـوو کەسـێک لێرەرێـکوپێکـی و تـەکووز دابـین نـەکا سـەلا لـە کـوێران. لـەو تێکەولێکـە وزەنازەنایەدا یەکێک وەبیری دێتەوە کە خێزانی دوکتۆر چاوی دەبینێ. خەڵکەکە دەپرسن لـە کوێیە، وا لێرەم، تازە چووبوومە دەر، تـاوانی کوڕەخێلەیـە، کـەس نازانـێ چووبـوو بـۆ کـوێ، ئێسـتا وا لـە لای منـە، تونـد دەسـتیمگرتـووە، تـازە بـەرینـادەم، مـەگین دەسـتم بپسـێنێ، بـە دەسـتەکەی دیکـەمدەسـتی مێردەکـەم گرتـووە، ئـەویش قۆڵـی کچـەی چاویلکـەیی بـە دەستەوە،کچەش پیرەپیاو، پیرەپیاویش کوێرەپیاو و ئەمیش دەستی ژنەکەیگرتووە، هەموومان وەک دەنکی هەنار پاڵمان رێکداوە و هیوادارم کەتەنانـەت بـەم گـوڕ و تـینی ئـاورەش لێـک دانەبڕێین. لەو دەمەدا هێندێک لـەکوێرەکانی ئێـرە لاسـای کوێرەکـانی ئەوبـەریان کـردەوە و خۆیان فڕێدایەحەسارە بچکۆلە، ناتوانن ببینن کە هەر ئێستا بەشی زۆری قۆڵەکەی ترئـاگرێکی

گەورەی گرتووە، بەڵام تین و بڵێسە پێستی دەست و دم وچاویان دەکزێنێتەوە، هەتا ئێستا بـان تێکنەقرماوە، بەڵام گەڵای دارەکانوردە وردە هەڵدەقرچێن. پاشان یەکێک هاواری کرد ئێمە لێرە چیدەکەین، بۆچی ناچینە دەرەوە، ئەو وڵامەی کە بە نێو دەریای سەر وگوێلاکانـدا باڵـی گرت سێ چوار وشە زیاتر نـەبوو، سـەربازەکان لـەدەرەوە راوەسـتاون، بـەڵام پیرەپیـاو گـوتی باشـتر وایـە بکەوینـە بەردەسـرێژ و نـەچۆقین و نەبینـە کۆڵـوو، دەتگـوت دەنگـی ئەزموونـە دەنگدەداتەوە، کە وایە زۆر وێدەچێ ئەوەی قسەی دەکرد پیرەپیاو نەبووبێ،رەنگە ئەو ژنـەی چەخماخی پێ بوو قسەی بۆ کردبێ، ئەوکەسەی بەختنەبوو بە هاواڵـی تـاکوو تـامی ئـاخرین فیشەکی حیسابداری کـوێر بچێـژێ. ئـەو کـات خێـزانی چاوپزیشـک گـوتی رێ بـدەن بـڕۆم. لەگەڵ سەربازەکانقسە دەکەم، نابێ لێگەڕێن ئاوا بمرین، ئاخر خۆ ئەوانیش ئینسانن وهەستیان هەیە. بەم هیوایەی کە رەنگە هەر بەڕاستی سەربازەکانخاوەنی هەست بن ئاپۆرەکـە درِی دا و هاوسەری چاوپزیشک وهاوڕێیانی بە شانە چرکە تێپـەڕ بـوون. دووکـەڵ بـەری چـاوی گـرت، هەربەم زوانە ئەویش وەک ئەوانی تر کوێر دەبوو. کـەس نەیـدتوانی بچێتـە نێوسەرسـەرا. ئـەو دەرکانەی بەرەو حەوشە دەکرانەوە تێکشکابوون، ئەمهاوبەندانەی لە سەرسەرا پەنایان گرتبوو لەڕێو تێگەیشتن کەئەوێندەرێ بۆ مانەوە نابێت، دەیانویست بڕۆنـە دەرەوە، بـە تـەواویهێـزەوە یەکتریان پاڵ پێودەنا، بەڵام ئەو کەسانەی لەو سەر بوون پێیانچەقاندبوو و بەربەرەکانیان دەکرد و پێشیان گرتبوون، لەو دەمەداترسیان زۆر لەوە پتر بوو سەرباز و تفەنگیان بە مێشکدا بێ، بەڵام هەتاتاقەت و هێزیان بەرەو کزی دەچوو و ئاورەکە نیزیکتـر دەبوویەوەقسـەی پیرەپیـاو جـوانتر وەدی دەهات کە مردن بە گوللە خۆشترە هەتا بەسووتان. چاوەڕوانی هێندەی درێژە نەکێشـا و ســەرەنجام ژنی دوکتۆرتــوانی خــۆی بگەیەنێتــە بەرهــەیوانی ســاختومانەکە، جــل شــڕ و نیوەرووتدەستی هاواڵەکانی گرتبوو، دیارە زۆر بـە زەحمـەت تـوانی ئـەو کەسـانیخـەریک بوون ببنە تۆقی ملی و خۆیان بەم جەللەیەوە هەڵواسن لە کۆڵخۆی بکاتەوە، بێگومان کاتێـک سەربازەکان ئەویان بە سەر و سینگیرووتەوە دەبینی چاوان وەک کەشـکە فەریکـە لـە ژێڵـڵا دەهات. ئێستا ئیترتریفەی مانگە شەو نەبوو کە حەوشەی پـان و بـەرینی هـەتا دەروازەروونـاک کردبۆوە، بەڵکوو نووری سرنج راکێشی ئـاگر وڵاتی وەک رۆژلـێکردبـوو. خێـزانی دوکتـۆر هاواری کرد تکا دەکەم رێگا بدەن بۆ ئەوەیوێژدانتان نەشەمزێ و گەردی لێنەنیشێ ئێمە لێرە دەرکــەوین، پیــاوەتیبکــەن و تەقــەمان لــێمەکــەن. وڵامێــک نەدرایــەوە. نــوور هــاوێژ هێشتاشکووژابۆوە، هـیچ بوونـەوەرێک جووڵـەی نـەدەهات. خێـزانی چاوپزیشـک بـەترس و

لەرزەوە دوو پلیکان هاتە خوار، مێردەکەی پرسی چ رووی داوە،بەڵام ئەو وڵامی نەدایەوە، باوەڕی بەو دیمەنە نەدەکرد. پلیکانەکانی تەواو بەجێ هێشت و بەرەو دەروازە کەوتە رێ، هێشتاش هاواڵەکانی بەدوای خۆیا ڕەکێش دەکرد، ئیتر جێی گومان نەبوو، سەربازەکان بازرەببوون، رەنگە کوێراییان داهاتبێ و رایانگوێزتبن، سەرەنجام هەمووموقرایین داهاتبوو.

پاشان بۆ ئەوەی تەواوی کارەکان هاسان ببنەوە هەموو شتێک بەدوای یەکا رووی دا، ژنی دوکتۆر بە دەنگی بەرز رایگەیاند هەمووئازادن، بانی لای راست خرمەی کرد و گرمەیەکی سەیری لێوە هەستا وبوو بە هۆی ئەوەی ئاور شاڵاو بۆ هەموو لایەک بەرێت، هاوبەندەکوێرەکان کە بە تەواوی هێز و تواناوە نەهرەتەیان دەکێشا بەرەوحەوشە تەقین، هێندێک دەرنەچوون و ئاگر لە دیوارانی قایم کردن،تاقمێک وەبەر پێیان کەوتن و بوونە پێخوستی پڵیشاوەی کەس نەناس. ئەو ئاورەی لەپڕێ پەرەی گرت هێندەی پێناچێ کە هەموانهەڵدەلووشێ و دەیانکاتە خاک و خۆڵەمێش. دەروازە لە سەر گازەرایپشت کراوەتەوە و زنجیر پسێنان دەڕەون.

کوێری

بە پیاوێکی کوێر بڵێن تۆ ئازادی، ئەو دەرگایەی لە دنیای دەروەیدەپچڕێتەوە بخەنە سەر گازەرای پشت. سەر لە نوێ پێی دەڵێین تۆئازادی، برۆ، کەچی ئەو ناڕوا، لەوێ لە سەر چەقی رێیە چەقیوە، لە پەنائاواڵەکانی راوەستاوە، هەموو دەترسن، نازانن بەرەو کوێ برۆن، وتەیورد و باریک ئەوەیە کە ژیان بەم گشتە هەزارە و دوولایەی هەیەتی و لەمانادا پڕ بە پێستی شێتخانەکەیە، دیسانیش لەگەڵ چەواشەیی دەرەوەتەواو جیاوازیی هەیە، ئەویش بێ کوێرکێش و سەگی رێنوێن، بیرگەشلە نێو هەزار بە هەزاری شارێکی شێواودا بەکار نایە، چون تەنیا دەتوانێوێنەی شوێنەکان بێنێتەوە یاد، نەک ئەم رێگایانەی بەرەو لایانراکشاون، هاوبەندە کوێرەکان لەبەر ئەو ساختومانەی ئێستا تەواو گڕیگرتووە راوەستاون و بڵێسەی زیندووی گەرما لە سەر روخساریخۆیان هەست پێدەکەن، ئەم بڵێسەیە بە شێوەیەک جۆرێک لەمپەرپاراستنیانە، چەشنی ئەم دیوارانەی پێشتر دەیانپاراستن، یانی هەمبەندیخانە و هەم پەسار و حەشارگەیان بوون. لە پەنا یەکتر جووڵەناکەن، وەکوو کەرکە مەڕێک تێکدەبەزن، هیچکەس نایەوێبەرخۆڵەیەکی دابڕاو بێ، چونکە دەزانێ شوانێک بە دوایا ناگەڕێ. ئاورەکە

ورده ورده روو دەکاتە ڕۆمرکان، دیسانەوە خێوەتیمانگەشەو ترووسکەی دێت، هاوبەندە کوێرەکان بێئۆقرەن، بە وتەیەکیان خۆ ناکرێ هەتا هەتایە لەوێندەرێ ڕاوەستن. یەکی تر پرسیشەوە یا ڕۆژ، هۆی ئەم پرسیارە بێجێیە لەڕێوە ئاشکرا بوو، کێ دەزانێدنیا چۆنە، ڕەنگە شێومان بۆ بێنن، بەڵکوو لێیان تێکچووبێ بۆیەوەدرەنگ کەوتوون، جارانیش شتی وا رووی داوە، بەڵام خۆ تازەسەربازەکان لێرە نەماون. خۆ ئەوە نابێتە بەڵگە، ڕەنگە چونکە تازەپێویست نەبێ لێرە بن ڕۆیشتوون، من کە تێناگەم، یانی لات وایە تازەمەترسیی گرتنەوەی کوێری نەماوە یا ڕەنگە دەرمانی دەردی ئێمەیاندۆزیبێتەوە، خۆشە، بەڕاستی خۆشە، ئێستا چ بکەین، من کە تا سبەیلێرە دەبم، جا چۆن دەزانی ڕۆژ بۆتەوە، بە ئەنگووتنی خۆر، بە تینەکەی،ئەگەر هەور بێ چی، دەور و خولی شەو و ڕۆژ دیارن و ئاخرییەکەی، لەشوێنێک ڕۆژ لەنگەر دەگرێ. زۆرێک لە کوێرە لێقەوماوەکانڕۆنیشتبوون، ئەوانەی پتر شڵەژاو و شەکەت بوون پۆل پۆل سەریانوێک کردبوو و تاقمێکیش لەسەرخۆ چووبوون، وادیارە شنەی فێنکیشەو وەهۆشی هێناونەوە، بەڵام دەتوانین دڵنیا بین کە کاتی خۆ پێچانەوەو وەڕێکەوتنی ئەو لەشکرە هێندێک لەو بەختوەرگەڕاوانە ڕاستنەبنەوە، هەتا ئێرە ملەیان پێکراوە، چەشنی ئەو کەسەی سێ شەقاویپتر نەمابوو بگاتە خەتی ئاخری کیبەرکێی هەڵاتن کە بەرەو دم کەوت ومرد، هەر چۆنێک بێ ئەوەمان لێروونە کە هەموو ژیانێک بەر لە وەختیخۆی کۆتایی دێت، جا با خۆی لە دار و بەردیش بدا. زۆر کەس ماون کەهێشتاش چاوەڕوانی سەربازەکان دانیشتوون یا خەوتوون، دەڵێنبەڵکوو کەسانی تر بگەنە فریایان، یەکێک لەم فریشتە خێرخوازانە خاچیسوورە، ڕەنگە نان و پێخۆر و یارمەتی بنێرن، دەرباز بوونی ئەمکەسانە لە جەغزی بیر و خەیاڵ زۆرتر ئەخایەنێ و تەنیا جیاوازیشیانلەگەڵ ئەوانی تر ئەوەیە. جا ئەگەر کەسێک لێرە لای وا بێ دەرمانێک بۆچاوی ئێمە دۆزراوەتەوە لام وانیە ئەو فکرە لە ئاواڵەکانی زیاترخۆشحاڵ کردبێ.

ژنی چاوپزیشک بە بۆنەی ترەوە وای بە باش زانی هەتا بەیانیڕاوەستن و بە هەموانی گوت ئێستا گرینگترین مەسەلە ئەوەیە کەخواردن پەیدا کەین و ئەو کارەش بە تاریکی زۆر دژوارە. مێردەکەیپرسی دەزانی لە کوێین، بەڵێ کەم و زۆر، لە ماڵەوە دوورین، زۆر دوور. تێکڕا پێیان خۆش بوو بزانن چەندە لە ماڵی خۆیان دوورن، هەر کەسشوێن و نیشانیی ماڵی خۆی باس کرد، خێزانی چاوپزیشک ئەوندەیبۆی کرا وڵامی دانەوە و حاڵی کردن، کوڕە خێلەکە هیچی لەبیر نەماوە،سەیر نیە، چونکە ماوەیەکە باسی دایکی ناکا. ئەگەر خوازتبایان ماڵ

بەماڵ لە پێشەوەڕا دەس پێ‌بکەن، لە پێشا نۆرەی کچەی چاویلکەیی‌دەهات، دوایە ماڵی پیرەپیاو، پاشان ماڵی چاوپزیشک و ژنەکەی و دواترماڵە کوێرەپیاو. بێ‌شک هەر ئەم ڕەوگەیە دەگرنە بەر، چونکە کچە هەرلە ئێستاوە ویستوویەتی خێرا بیبەنەوە ماڵ، گوتی نازانم دایک و بابم‌چیان بە سەر هاتووە، ئەم دڵەخورتە پاک و بێ‌ریایە پێشداوەری ئەوکەسانە دەباتەوە پاش کە بە هۆی پەرەدار بوونی کردەوەی دزێو وناشیرین، بە تایبەت لە چوارچێوەی ڕەوشتی کۆمەڵایەتیدا، هەستی قووڵو بێ‌گەرد و پڕ لە خۆشەویستی فرزەند بەرامبەر بە دایک و باوک وەبەرچاو ناگرن. شەو رووی کردە ساردی، شتێکی وا بۆ سووتان نەماوە،ئاورەکە وەها ڕۆمرکاوە کە هاوبەندە کوێرەکانی پێ گەرم نابێتەوە، ئەوکەسانەی کە چەشنی هاوسەری دوکتۆر و هاواڵەکانی زۆر لە دەروازەدوور کەوتنەوە. لە سەرمان سڕ بوون. پاڵیان ڕێکداوە، سێ ژنەکە کوڕەخیلەیان لە نێوانیان گرتووە و سێ پیاوەکەش دەوریان داون، بێتووکەسێک ئاوا بیانبینێ وا دەزانێ هەر بەم جۆرە لە دایک بوون، لە ڕاستیدادەڵێی تەنیا لەشێکن، هەموو یەک هەناسە و بە یەک زگ برسی. ئاخرییەکەی تاق و لۆق خەو دەیانباتەوە، سووکەڵە خەوێکی گەلێ جارلێی رادەپەڕن، چونکە ئەو هاوبەندە کوێرانەی دێنەوە سەرخۆ،هەڵدەستن و خەواڵوو لەم کۆسپ و گرێ ئینسانییە هەڵدەنگوون، یەکێک‌بە لایانەوە دەمێنێتەوە، فەرقی نەدەکرد لێرە یان لە شوێنێکی تر بخەوێ. کە تیشکی هەتاو پڕشنگی هاویشت تەنیا چەند ئەستوندەکی باریکی‌دووکەڵی بزووت و نیوەسووتاوەکان بەرەو ئاسمان قوڵی دەکێشا، بەڵام‌ئەوەش زۆری نەخایاند، چونکە دایدایە باران، وردە بارانێکی یەک‌بینی‌تەماوی، لە پێشدا شوێنێکی ئەوتۆی نەکردە سەر وڵاتی سووتاو، چونکەلەڕێوە دەبوو بە هەڵم، بەڵام یەک وچان دەباری و هەر وەک دەزانین‌دڵۆپە بەردی کون دەکا. هێندێک لەو هاوبەندانە کوێرایی هەر بەچاویانەوە ڕانەوەستاوە و تەنانەت تووشی دڵ کوێریش هاتوون، چونکەلە خۆوە لایان وا بوو تازە بەم بارانە نان و خوانیان ناگاتە دەست، ئەوەتەنیا لێکدانەوە و بۆچوونیان بوو لە سەر باران. بە هیچ شێوەیەک‌قەناعەتیان نەدێنا کە هێنانە گۆڕی گەلالەی خودی مەسەلەکەمەبەستێکی هەڵە و چەواشەیە و کە وا بێ ئاکامیش لەم جەغزە بەدەرنابێ، ئامادە نەبوون گوێ بگرن کە هێشتا وەختی بەرچایی نەهاتووە،شەمزاو و هیوابڕاو خۆیان دەگەوزاند و بە خوڕ فرمێسکیان دەباراند. یەک‌بین دەیانگوت نایهێنن، باران دەبارێ نایهێنن، ئەگەر کرابا هێشتاش‌ئەو وێران بووە پیس و ناخۆشە بۆ سەرەتاییترین شێوەی ژیان کەلکی‌لێ‌وەربگیرێ، دەبوو هەر ببێتەوە شێتخانەکەی جاران.

پیاوێکی کوێر کە پاش دمەونخوون بوون شەوی لەوێ کردبوو بەرۆژ، نەیدەتوانی هەڵستێ. هەر وا پاپۆکەی خواردبۆوە، دەتگوت‌دەیهەویست دوایین تینی دڵ و دەروونی رابگرێ و سەرەڕای ئەوەی‌باران بە ڕێژەو دەباری لە جێی خۆی چورتەی نەکرد. ژنی دوکتۆر گوتی‌مردووە، وا باشترە ئێمەش هەتا هێزێکمان لەبەردا ماوە بڕۆین و دوورکەوینەوە. بە هەر کوێرەوەرییەک بوو هەستانە سەرپێ، شل و کوت وشەمزاو خۆیان بە یەکترەوە راگرت، پاشان جەللەیان بەست، ژنێکی‌چاوساغ لە پێشەوە دەڕۆیی، بە دوایدا ئەو کەسانەی چاویان هەبووبەڵام نەیاندەبینی ئاوا ریز بوون، کچەی چاویلکەیی، پیرەپیاوی چاوبێن‌لە چاو، کوڕەخێلە، هاوسەری کوێرەپیاو، مێردەکەی و لە ئاخریدادوکتۆر. ئەو رێیەی گرتیانە بەر بەرەو ناوەندی شار دەچوو، بەڵام خۆئەوە شوێنی دڵخوازی ژنی چاوپزیشک نیە، ئەو دەیهەوێ هەر چی‌زووتر جێیەکی باش و پەنا بدۆزێتەوە و هاواڵەکانی لێ دابین بکا وپاشان خۆی بە دوای خواردندا بڕوا. شەقامەکان چۆل و هۆلن. جا یان‌زۆر زووە یان چونکە باران چاکی داداوە و بەرێژەو دەبارێ. هەمووولات پڕە لە زبڵ و زاڵ، زۆربەی دووکانەکان داخراون، بەڵام دەرکەی‌هێندێکیان هەر وا ئاوەڵایە، کەچی هیچ نیشانەی ژیان و جووڵانەوەیان‌تێدا بەدی ناکرێ. خێزانی دوکتۆر کەوتە بیری ئەوەی کە باشتر وایەهاوڕێیانی بباتە نێو یەکێک لەم دووکانانە و ناوی شەقام و ژومارەی‌پلاک بە یاد کا هەتا کاتی گەڕانەوە سەری لێ‌نەشێوێ و گومیان نەکا. راوەستا و بە کچەی گوت هەر لێرە چاوەڕێم بن، لە جێی خۆتان‌نەبزوون، پاشان هەنگاوی نا و بە دەرگای شووشەیی دەواخانەیەکدا لەژوورەوەی روانی، لای وا بوو تاپۆی مرۆڤ گەلێ دەبینێ کە تخێڵ بوون،پتەیەکی لە شووشەکە دا، یەکێک لە قەڵافەتەکان چەشنی داوەڵجووڵایەوە، دیسانیش پتەی لێ‌دا، چەند قەڵافەتی تریش بە نەرمی‌جووڵانەوە، یەکیان هەستا و سەری بەرەو دەنگەکە وەرسووڕاند، ژنی‌دوکتۆر بە خۆی گوت هەموو کوێرن، بەڵام نەیزانی چلۆن وێکڕالەوێندەرێ یەکتر گیر ببوون، رەنگە ئەندامانی بنەماڵەی دەوافرۆش بن،بەڵام بێتوو وا بێ بۆچی لە ماڵی خۆیان نەماونەوە کە هەزار بەرابەر لەوحەرزە رەق وتەقە خۆشتر و چاکترە، رەنگە بۆ پاراستنی ماڵ وسامانیان لێرە کۆ بووبنەوە، بەڵام بۆچی، خۆ دەوا وەکوو کەل و پەلی‌دیکە نیە، هەر وەک دەتوانێ نەخۆش ساغ کاتەوە، دەشتوانی زیندووئاودیوی هەرێمی مەرگ بکا. لەوێ رانەوەستا و تێپەڕی و لە دووکانێکی‌تری روانی، جەماوەرێکی پتری ژن و پیاو و زارۆک بینی کە راکشاون،وا وێدەچوو تاقمێکیان ئامادەی رۆیشتن بن، یەکیان هەستایە سەر پێ وهاتە بەر دەرگا، دەستی درێژ کرد و گوتی دەبارێ، یەکێک لە ژوورەوەپرسی

چاک دەبارێ، بەڵێ، دەبێ راوەستین تا لێی دەکاتەوە، پیاوەکە،ئەو پیاوەی هەتا بەر دەرگا هاتبوو ئێستا لە پەنا خێزانی دوکتۆرراوەستابوو، هەتا ئێستا ئەوەی نەزانیبوو، هەر بۆیە کاتێک رۆژباشیبیست، لە نەکاو تێکڕابوو، خوو و خدەی رۆژباش کردنی لە دەستدابوو، هەڵبەت نەک بە هۆی ئەوە ئەگەر بە وردی باسی بکەین رۆژیکوێران قەت بەخێر نەبووە، چونکە قەت دڵنیا نەبوون کە ئێوارەیە یانشەو، جا ئێستە بە پێچەوانەی ئەوەی گوتمان، دەبێ بزانین کە ئەو تاقمەکەم و زۆر بەیانان هاو کات خەبەریان دەبێتەوە، چونکە هێندێکیان تازەچەند رۆژێکە کوێر بوون و هێشتا بە تەواوی هەستی هات و چۆی شەوو رۆژ و خەو و بێدارییان لە دەست نەداوە، پیاوە گوتی باران دەبارێ،پاشان پرسی تۆ کێی، خەڵکی ئەو دەور و بەرانە نیم، لە خواردندەگەڕێی، بەڵی چوار رۆژە کە هیچمان نەخواردووە، چۆن دەزانی کەچوار رۆژە، بە شک وا دەڵێم، تەنیای، شووەکەم و چەند کەسێکین، چەندکەسن، حەوت کەس، ئەگەر دەتانهەوێ لە لای ئێمە بمێننەوە سەراوبنیلێحاڵین، چونکە هەر ئێستاش هێندێکمان زیادین، ئێمە رێبوارین، لەکوێوە دێن، لەو کاتەوە نەخۆشیی کوێری سەری هەڵداوە ئێمەدەسبەسەر بووین، ئاخ بەڵێ دەسبەسەر، لە خۆوە دەسبەسەر، بۆچیئەو قسەیە دەکەی، چونکە ئیزنی دەرکەوتنیان داون، کەس ئیزنی نەداین،هەموو وڵات ئاوری گرت و ئەو دەم تێگەیشتین کە نیگابانەکان ونبوون، دەی دەی، ئێوەش دوایە هاتنە دەر، بەڵێ، گۆیا سەربازەکانی لایئێوە دوای هەموان کوێر بوون، هەموو کوێر بوون، تەواوی شار،سەرانسەری وڵات، ئەگەر کەسێکیش تا ئێستا کوێرایی دانەهاتبێدەیشارێتەوە و نایدرکێنێ، بۆچی لەماڵەکانتانا نەماونەوە، چونکە بەماڵی خۆمان نازانینەوە، تۆش نازانی لە کوێیە، خۆت چی دەزانی ماڵت لەکوێیە، من، ژنی دوکتۆر دەیهەویست بڵێ خۆی و ئاواڵەکانی راستبەرەو ئێرە دەهاتن و ئێستا تەنیا شتێکی دەیانهەوێ پاروویەک نانە هەتاگیانێکیان بێتەوە بەر، بەڵام دروست لەم کاتەدا توانی لە بارودۆخەکەحاڵی بێ، ئەو کەسەی بینایی رۆرژاوە و لە ماڵ دەرکەوتووە چیامۆجیزەیەک روو بدا دەنا هەرگیز ناتوانێ بگەڕێتەوە، وەکوو رابردوونەبوو کە کوێر بتوانێ بە هیوای رێبوارێک بێ و کەسێک بیخاتەوە سەرراستەڕێیان و لە شەقام بیپەڕێنێتەوە، کە وایە تەنیا ئەوەندەی گوت کەماڵەکەیان لێرەوە زۆر دوورە، کە وایە قەت ناتوانن بگەڕێنەوە، بەڵێوایە، دەی باشە ئێستا هاتییە سەر قسەکەی من، منیش هەر کەوتوومەهەل و مەرجێکی ئاوا، هەموو ئاوان، ئێوە کە قەرەنتینە و دەسبەسەرکرابوون ئێستە دەبێ زۆر شت فێر بن، ئێوە نازانن چەند بە هاسانیدەکرێ ماڵەکەت لە دەس بێتەوە، یانی چۆن، خەڵک وەک ئێمە بە پۆل

ڕێدەکەون و بە شوێن خواردنا دەگەڕێن، ئەوە تەنیا ڕێگای گوم نەکردنی‌یەکترە، جا چونکە وێکڕا دەڕۆین کەس نامێنێ کە ئاگای لە ماڵەوە بێت،گریمان بتوانین سەر لە نوێ ماڵی خۆمان بدۆزینەوە، بەڵام ڕەنگەتاقمێکی تر کە خانووی خۆیان نەدۆزیوەتەوە ئەوێیان داگیر کردبێ، لەراستیدا ئێمە سواری چەرخ‌وفەلەک بووین و دەسووڕیین، لە پێشدا زۆرلێمان دەبوو بە شەڕ و هەڵلا، بەڵام هەر زۆر زوو زانیمان کە ئێمەی‌کوێر جگە لە جلکی بەرمان چی ترمان نیە. کە وایە تەنیا ڕێچارەی ژیان‌بنەگر بوون لە چێشتخانەیەک دایە، چونکە هەتا خواردن هەیە پێویست‌ناکا کەس دەر بکەوێ، هەر کەس ئەو کارەی کرد بۆ ساتێکیش رووی‌حەسانەوەی نەبینی. چونکە بیستوومە هێندێک ئەو کارەیان کرد ودەرگایان لە سەر خۆیان گاڵەدا، بەڵام نەیانتوانی پێشی بۆنی چێشت وخواردەمەنی بگرن، برسیتریش لە بەر دەرگاکە ئاپۆرەیان بەست وچونکە ئەوانەی ژوورەوە دەرگایان نەدەکردەوە ئەوێیان ئاگر دا، ئەمەرێچارەیەکی دزێو و نامرۆڤانە بوو، خۆم نەمدیوە بەڵام بۆیان گێڕاومەوە، وەهەر حاڵ ئەو فێڵە چارەساز بوو، چونکە هەتا ئەو جێیەی‌ئاگادار بم ئیتر کەس نەیوێرا دووپاتی کاتەوە، کە وایە ئیدی کەس لەماڵاندا ناژی، بۆچی، بەڵام ئاکامەکەی هەر یەک شتە، ڕەنگە زۆر کەس‌کەلکی لە ماڵی من وەرگرتبێ، لە کوێوە بزانم کە دەتوانم تازە ماڵەکەم‌وەدۆزم، ئەمجار لەم هەل ومەرجەدا هەر وا باشترە کە لە کەلێن وقوژبن و دووکانی حەرزەکیدا بخەوین، چونکە ئاوا لە چوونە سەر وهاتنەوە خواری پلیکانان رزگاریمان دەبێت، هاوسەری چاوپزیشک‌گوتی باران لێی کردۆتەوە. ئەوانەی کە درێژ ببوون بە بیستنی ئەو وتەیەراست بوونەوە، پڕوپرێسکە و بارگە و بنە و توورەکەی هەمە جۆریان‌تێکەوە پێچا، دەتگوت دەیانهەوێ بچنە سەفەرێکی پشکنین و دۆزینەوە،لە راستیشدا سەفەرێکی وەها بوو، دەچوون بە شوێن خواردنا بگەڕێن،تاق تاق لە دووکانەکە دەرکەوتن، خێزانی دوکتۆر کە سرنجی داتێگەیشت تێکڕا جلی گەرمیان پۆشیوە، ئەگەر چی ڕەنگ و درێژی وکورتی هیچیان یەکتری نەدەخوێندەوە بەڵام دیسانیش سەرمادەروەستیان نەدەهات، چەند کەس لە پیاوەکان باڵتە و بارانییان لەبەرکردبوو، دوو ژن باڵتۆی ئاودامێنی درێژیان لە خۆیانەوە پێچابوو، کەس‌چەتری بە دەستەوە نەبوو، ڕەنگە لەبەر ئەوەی زۆر دەست و پێ‌گر بووو هەمیشە ئەم مەترسییە لە گۆڕا بوو کە تێلەکانی چاوی کەسێک لەقاپێلک دەرهێنێ. ئەو تاقمە کە پازدە کەسێک دەبوون کەوتنە ڕێ. وردەوردە تاق و لۆق ئینسانی کەساس و دەستەی گەورە و بچووک لەملا ولەولاوە سەر و سۆراغیان پەیدا بوو، چەند پیاو دوای وەخەبەر هاتن لەپەنا دیواران هەلمیزتن، ژنەکان ئوتۆمبیلی بەجێ‌ماوی بێ

خاوەن ودووورە دەستیان بە باش زانی. چین‌چین پیسایی باران دیتوو تەواوی‌پیادەڕێیەکانی تێوەدەدا.

خێزانی چاوپزیشک گەڕایەوە لای تاقمەکەی، ئەوان بە شێوەیەکی‌سروشتی خۆیان وەپەنا پەساری دووکانێکی کێک‌ساز کردن دابوو کەبۆنی سەرتوێی ترشاو و خواردنی گەنیوی لێوە دەهات. گوتی وەرن بابڕۆین پەنا و نوایەکم دیوەتەوە، ویکڕا بە ئارامی دەستیان تێک‌گرت وبەرەو ئەم دووکانە کەوتنە رێ کە تازە تاقمەکەی تر چۆلیان کردبوو،کەل و پەلی نێو دووکانەکە دەستی لێ‌نەدرابوو، هیچی خواردەمەنی وپۆشەمەنی نەبوو، تەنیا چەند یەخچاڵ، مەکینەی جل‌شۆری، مەکینەی‌قاپ‌وقاچاخ شۆری، ئۆجاخ گازی ئاسایی، تێکەڵدەر، ئاومیوەگر،گەسکی کارەبایی و هەزار و یەک حەلەم قەلەم و شڕ و شالاتی لەم‌بابەتەی تێدابوو کە بۆ مەبەستی حەسانەوە و خۆشیی ژیان سازکراون. وڵات لیپاولیپ بوو لە بۆگەنێکی کە پیسایی نەگۆڕ و بەمۆلەق وەستاوشتەکانی بێ‌مانا دەنواند. نازانم لە کوێ دەیدۆزمەوە، لە دوور یا لەنیزیک، نازانم، تۆزێک سەبر بگرن، تاقمی تریش لە شەقامانداده‌خولێنەوە، ئەگەر هاتوو کەسێک ویستی وەژوور کەوێ بلێین ئێمە لێرەبنەگر بووین، وا دیارە هەر ئەوەندە قسەیە بەسە و دەڕۆن، ئەوە باوی‌ئێرەیە، شووەکەی گوتی منیش ویڕای تۆ دێم، نا، وا باشترە تەنیا بڕۆم،دەبێ بزانین خەڵک ئێستا چلۆن دەژین، بیستوومە هەموو کوێر بوون،پیرەپیاو بە تەوسەوە گوتی کە وا بێ هەر دەڵێی ئێستاش لە شێتخانەین،نا وا نیە، قەت ئێرە و شێتخانەکە پێکەوە بەراورد ناکرێن، لێرە دەتوانین‌هەرچۆنێک بخوازین بێین و بچین، بێ‌گومان کێشەی خواردنیش‌رێ‌چارەیەکی هەیە، لە برسان نامرین، دەبێ چەند کوتێک جل‌وبەرگ‌پەیدا کەین، جلەکانمان شڕۆڵ و شیتاڵ شیتاڵن، خۆی زیاتر لە هەموان‌پێویستی بە پۆشەمەنی هەبوو، چونکە لە پشتێند بەرەژوور چی وای‌پێوە نەبوو. مێردەکەی راموسی، لەو دەمەدا ژانێک دڵی رێک‌کوشی. تکایە هەر رووداوێک قەوما، تەنانەت ئەگەر کەسێک ویستی بێتە ژوورلێرە مەبزوون و بە هەڕەشەی کەس وەدەر مەکەون، ئەگەرچی رەنگەقەت وا نەبێ، بەلام دەبێ هەموو هەڵکەوتێک بگرینە بەرچاو، لێرە دانیشن‌هەتا دەگەڕێمەوە. بە چاوی لێڵی فرمێسکاوی بۆی روانین، تاقمەکەی‌وەکوو کۆزیلە منالێک دەچوون کە هەر چاویان لە دایکیان بێ. بە خۆی‌گوت ئەگەر ونیان کەم چۆن دەبێ. بە بیریدا نەهات کە دەور و بەرەکەی‌هەموو کوێرن بەلام هەر زیندوون و دەژین، خۆشی دەبوو کوێرایی‌داهاتبا تا زانیبای خەڵک رادێن و خوو بە هەموو شت دەگرن، بە تایبەت‌ئەگەر خووی ئینسانیشیان دۆڕاندبا، جا با هێشتا نەگەیبنە ئەم

قۆناخە،بۆ وێنە کوڕە خێلە بێننە بەرچاو کە ئیتر ببڕا ببڕا باسی دایکی ناکا. پاشان چوویە سەر شەقام، روانی و ژمارە و ناوی دووکانەکانی بە یادکرد، ئێستا دەبوو ناوی شەقامەکە بدۆزێتەوە و بیخاتە بیرگەی،نەیدەزانی گەڕان بە شوێن خواردنەوە هەتا کوێی دەبا و چی وەدەستدەکەوێ، رەنگە سێ یا سێسەت ماڵ ئەولاتر گەڕابا، بەلام دیسانیشدەبوو بە هیچ شێوەیەک رێی لێنەگۆڕێ و گوم نەبێ، کەسێ نەبووپرسیاری لێبکا، ئەوانەی پێشتر دەیانبینی کوێر ببوون و ئەم کە دەیبینیشوێنەکانی پێنەدەزانی. تاو هەلاتبوو، گزینگی دەکەوتە سەر ئەوگۆمیلکانەی کە لە نێو زبلوزاڵدا خۆیان دەنواند و گیا وردەڵە وپـژارەواری کەلێنی سەنگچنەکان جوانتر دەهاتنە بەرچاو. خەڵکێکی زیاتررژابوونە شەقام، هاوسەری چاوپزیشک لەخۆی پرسی چلۆن رێگایاندەدۆزنەوە، رێگایان نەدەدۆزییەوە، زیاتر بە پەنا ماڵ و ساختومانەکاندابە کوێرە کوێرە دەڕۆیشتن و دەستیان دەکوتا و پەنجەیان دەبزاوت،تەواو چەشنی ئەو مێرووولانەی بە دوای خواردنا دەسووڕێنەوە بێنێوبڕ وێکدەکەوتن، بەلام کەس پێی تووڕە نەدەبوو، کەس متەقی نەکرد،پۆلێک لە دیوار دوور دەبوونەوە و بۆ لای دیواری بەرەوڕوو هەنگاویاندەنا و بە پێچەوانە و چەواشە دەسووڕانەوە و ئەوەندەیان ئەو کارەدەکرد و لە بازنەدا دەخولانەوە کە لەگەڵ پۆلێکی تر تێکهەڵدەنگووتن. جاروبار بە ئومێدی دیتنەوەی خواردن رادەوەستان و لەبەر دەرگایهەر دووکانێک بۆنیان دەکرد، پاشان درێژەیان بە رێگایان دەدا ودەڕۆیشتن، لە پێچێک قۆرتیان دەکردەوە و ئاوا دەبوون، بڕێک دواترتاقمێکی تر پەیدا دەبوو، وا دیارە ئەوەی لێی دەگەڕان نەیاندۆزیبۆوە. ژنی دوکتۆر دەیتوانی خێراتر باژوێ، هەلی بە فیڕۆ نەدا و خۆی بەچوونە ژوورەوەی دووکانان نەخافلاند، بەلام زۆر زوو بۆی دەرکەوتئەوەی بەحاڵ وەبەر ددانان بێت وەگیری ناکەوێ، لە سەر رێیە چەنددووکانی تالان کراوی بەقالانی هاتە بەرچاو کە دەتگوت قاپێلکەشووتین.

گەلێ شەقام و مەیدانی گەورە و بچووکی هەڵبوارد و زۆر لە مێرد وئاواڵەکانی دوور کەوتبۆوە کە لە پڕ گەیشتە بەر دەرگای فرۆشگەیەکی گەورە. ئەوێش بە تالان چووبوو، قەفەزە و جامخانەکانهەڵگەڕابوونەوە، کوێرەکان زۆربەیان بە گاگۆڵە دەڕۆیشتن وراوێچکەیان دەکرد ودەستیان چەشنی گەسک دەگێڕا هەتا بەڵکوو شتێکبۆ خواردن بدۆزنەوە، هەر چی بایە فەرقیان پێنەدەکرد، بۆ وێنەپەتاتەیەکی پلیشکاوە یا پەنچکەنانێکی وەکوو بەردی رەقیش هەردەسکەوتێکی گەورە بوو. هاوسەری دوکتۆر لە دڵی خۆیدا گوتی بەپێچەوانەی رواڵەتی دەبێ شوێنێکی ئاوا گەورە شتێکی تێدا مابێ. پیاوێکی کوێر هەستایە

سەرپێ و هاواری کرد کە تیزماڵکە شووشەیەکیلە ئەژنۆی راچووە، خوێنی بە لاقیدا دەهاتە خوار. کوێرەکانی تردەورەیان دا، چیە، چی بووە و ئەویش پێی گوتن کە تیزماڵکەشووشەیەک لە ئەژنۆم راچووە، کام ئەژنۆت، ئەژنۆی چەپ، یەکێک لەژنەکان چۆکی بۆ دادا، وریا بە رەنگە دەور و بەرت وردە شووشەیلێ‌ڕژا بێ، بۆ دیتنەوەی برینەکە دەستی کوتا، پاشان گوتی ئا لێرەیە، لەگۆشتەکە رۆچووە، یەکێک لە پیاوە کوێرەکان دایە پێکەنین، دەی کە وایەکەلکی لێ‌وەرگرە. بزانە چ تێرادەچێ خۆی لێ‌مەبوێرە، ژن و پیاو لێکرا لەقاقایان دا. ئەنگوستی گەورە و شادەی لێک نیزیک کردەوە،جوولانەوەیەکی سروشتی کە پێویستی بە هیچ راهێنانێک نیە، ئینجاشووشەکەی دەرهێنایەوە، پاشان کوتە پەڕۆیەکی لە جانتای شانیهێنایەدەر و برینەکەی پێچا، ئەوجار خۆشی بۆ پێکەنین دەستی کرد بەگاڵتە و گەمە، لەوە زیاتر چی تر نەدەکرا، هەموو پێکەنین و کابرایبریندار ولامی داوە هەر کات پێت خۆشە وەرەوە لای خۆم، وا دیارە هیچ‌کەس لە نێو ئەو تاقمەدا ژن و مێردی نیە، چونکە دەتگوت کەسی پێ‌رانەچەنی، بێ‌گومان هێندە دەربەستی ئاکاری پاک نەبوون و لە ژێرەوەدەستیان تێکەلاو کردبوو، هەڵبەت وێدەچوو ئەم دوانەی ئاخری ژن ومێرد بن، چونکە زۆر ئازادانە دەدوان، بەلام وەک دیاربوو بە پێچەوانەدەهاتە بەرچاو، جگە لەوەش ژن و مێرد قەت لە لای خەڵک ئەو قسانەناکەن، ژنی دوکتۆر چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا، تەماشای کردلە سەر هەر شتێکی بڕە کەلکێکی هەبێ شەڕە مست و خۆ لێک‌دانێکە کەکەس دۆست و دوژمن ناناسێ، جاری وا بوو ئەم شتەی لە سەری‌کێشەیان بوو لە دەستیان دەکەوت و چاوەڕوانی تێهەڵەنگووتنی کەسێ‌دەمایەوە، خێزانی چاوپزیشک لە دڵی خۆیدا گوتی بە توون، خۆ من لێرەدەرناکەوم و قسەیەکی کرد کە لێی نەدەوەشاوە و جارێکی دیکە نشانیدا کە تاڵ و سوێری و تەوژمی رۆژگار شوێنی بەرچاویان هەیە لە سەرزمان، سەربازێک بێننەوە یاد کە بە بیستنی قوولەی دەردەست بە، گوتیهەی تڕ و بەم جۆرە قسەی سووک و دزێوی داهاتووی لە هەل ومەرجی ئاساییدا بە حەوت ئاوان شۆردەوە. دیسان بیری کردەوە دەیجابە جەهەندەم، لێرە وەدەر ناکەوم، بەلام کاتێک بیری چوونەدەر بەمێشکیدا هات دەتگوت بیرێکی باشتر و خۆشتری پێ ئیلهام کرا، لەمفرۆشگە گەورەیەدا دەبێ حەمبارێکیش هەبێ بۆ راگرتنی شتی پێویستیبەردەستان. بەم فکرە گەشایەوە و ئۆخژنێک بە دەروونیدا گەڕا و کەوتەدوای دەرگایەکی داخراو کە دەیبردە سەر ئەشکەوتی خەزێنە، بەلامتەواوی دەرگاکان ئاوەڵە بوون و هەر ئەو کوێرانەی دەهاتە بەرچاو کەلە نێو زبڵ و زاڵدا دەسووڕانەوە.

سەرەنجام لە تاریک و روونی ڕێڕەواشتێکی چەشنی ئاسانسۆری تایبەتی بارکێشانی بە چاو ئەنگاوت. دەرگای ئاسنینی گاڵە درابوون و دەرکەیەکی تری لە پەنا بوو،دەرگایەکی کە لە سەر شان دێودەچێ، بە خۆی گوت حەمبار، ئەوکوێرانەی تا ئێستا گەیشتبوونە ئێرە دەستیان لە دەرگای ئاسانسۆرکەکوتا بوو و گەڕابوونەوە، چونکە هیچیان بیریان لەوە نەکردبۆوە کە بۆهەڵومەرجی نائاسایی دەبێ پلیکان ودەرگای تایبەتی هەبێ. دەرگایخزۆکی پاڵ پێوەنا و هاوکات دوو هۆکاری قورس و گران تەپیان دایەسەر و شوێنیان تێکرد، یەکیان ئەو تاریکییە ئەنگوستە چاوەی دەبووبەرەخوار تێی رابچێ و پاشان بۆنی ئاشکرای خواردەمەنی، چونکەبرسییەتی هەمیشە زوو هەست بە بۆن دەکا، تەنانەت ئەگەر خواردن لەشووشە و قودوولەی سەربەستراویشا بێت. لەڕێوە گەڕایەوە هەتا لەنێو زبڵ و زاڵەکەدا هێندێک توورەکەی نایلوێن پەیدا کا، لەم وەختەدا لەخۆی پرسی بە بێ رووناکایی چۆن بزانم دەبێ چ شتێک هەڵگرم، شانیهەڵاویشت، چ دڵەخورتەیەکی نەفامانە، بە سرنجدان بەم بێهێزییەیهەستی پێدەکرد دەبوو ئێستا نیگەران و پەرۆشی ئەوە بێ داخوادەتوانێ توورەکەکان بەپڕی بەرێتەوە یان نا، داخوا بازگەی گەڕانەوەیدەدۆزێتەوە یا تلاسا دەبێ، بە دەم ئەم بیرانەوە ترسێکی گران دڵیوێکهێنا، نەکا نەگاتەوە ئەو شوێنەی کە شووەکەی چاوەڕوانی بوو،ناوی شەقامەکەی لە یاد مابوو، بەڵام زۆری پێچاوپێچ بڕیبوو، لە بەرتەوژمی نائومێدی لە پێ پەڕی، پاشان هێدی هێدی وەکوو ئەوەی مێشکیتەزویوی کەوتبێتەوە کار خۆی بینی کە لە سەر نەخشەی شارداهاتۆتەوە و بەنووکی قامکی بە دوای کورتترین رەوگەدا دەگەڕێ،دەڵێی دوو جووتی چاو هەیە، جووتێکیان وەختی نەخشە خوێندنەوەتێیهەڵدەڕوانن و جووتەکەی تر چاو لە بازگان دەگێڕن و رێگا دیاریدەکەن. ڕێڕەو چۆل بوو، زۆر بەشانس بوو چونکە لە خۆشیان لە بیریچووبوو دەرگاکە پێوەداتەوە. ئێستا بە وردی دەرگاکەی راکێشا و کەوتەنێو دەریای ئەنگوستە چاوی تاریکی، ببوو بە یەکێک لە کوێرەکانی دەورو بەری، بە واتایەکی ورد و باریکتر ئەگەر بشێ رەش و سپی بە رەنگبێنە حیساب تەنیا جیاوازییان لە رەنگی کوێرییەکەیاندا بوو. دەستی بەدیواریدا کێشا و لە پلیکانەکان شۆڕ بۆوە. بێتوو ئاشکرا بێ کە ئێرە لەپێشدا بە خاوەن کراوە و کەسێک لە ژێڵلا بێت، دەبێ هەر ئەو کارە بکەنکە لە شەقامەکان دەکران، یەکیان دەبوو چاوپۆشی لە پەساریحەوانەوەی بکا، لە حاڵێکا خەیاڵی هەبوونی کەسێکی لەوێندەرێدەتاراند، بۆ چرکەیەک مچوڕکێکی تیژتێپەڕ و ترسێکی نەفامانە لەشیداگرت کە نەکا ئەو دیوارەی بەرەو روو بنەی بێت. لێرەدا، لەبەر خۆیەوەگوتی خەریکە

شێت دەبم، دیارە بەم نوقم بوونە لەم گۆڕیچە تاریکەدا وبە بێ هیوای دیتنی هیچ شتێک هەقی بە دەس بوو، ئێرە چەندە قوولە، ئەوژێرخانانە کەم و زۆر قوول نین، پێگۆڕکەی یەکەم، ئێستا هاوار دەکەم،ئێستا هاوار دەکەم، پێگۆڕکەی سێهەم، تاریکی چەشنی قوڕەسوورەیەکی تونـد دەم و چاوی دادەپۆشێ، چاوی بوونە دوو مەڕمەڕیقیل، چیم لە پێشە، پاشان بیری تاڵ و پڕ مەترسیتر بە مێشکیدا هات، باشەلە گەڕانەوەدا پلیکانەکان چۆن بدۆزمەوە، لەپڕ تێک‌هەڵگلا و ناچار بۆدابێتەوە هەتا نەکەوێ، خەریک بوو بێهۆش بێ، بە تورە تور گوتی‌خاوێنە، مەبەستی لە تەختی بنی ژێرخانەکە بوو، خاوێنی لێرەدا بە لایەوەزۆر سرنج راکێش رەنگی دایەوە. وردە وردە هاتەوە سەرخۆ، سەر دڵی‌ژانی دەکرد، هەڵبەت ئەوە کۆنە دەرد بوو، بەلام لەم کاتەدا دەتگوت‌ئەندامێکی زیندووی تر لە لەشیدا نیە، بێ‌شک هەبوو، بەلام خۆی‌نەدەنواند، دڵی وێنەی دەهۆڵ رمبەی دەهات، کوێرکوێرانە یەک بین لەتاریکیدا زرمە زرمی بوو، لەم رۆژەوە کە لە یەکەم ئەنگوستەچاوی‌منالدانا گوورا بوو تا دوایین تاریکایی کە تێیدا لە لێ‌دان دەکەوت وا خۆی‌هەڵداویشت. هێشتاش توورەکە کۆنەکانی بە چنگەوە بوو و فڕێی‌نەدابوون، ئێستا تەنیا ئەوەندەی مابوو پڕیان بکا، ئارام بە، خۆ ژێرخان‌شوێنی رووح و هەژدیها نیە، ئێرە تەنیا تاریکە و بەس و خۆ تاریکاییش‌نە پێوەدەدا و نە ئازاردەرە، پلیکانەکانیش دەبینمەوە، تەنانەت ئەگەرپێویست بێ تەواوی کەلێن و کاژێری ئەو کونە خۆفناکەش ژێر و ژوورکەم. لە سەر تەمای خۆی سوور بوو، دەیهەویست هەڵستی بەلام هاتەوەیادی کە ئێستا ئەویش چەشنی هەموان کوێرە، کە وایە باشترە وەکوو‌ئەوان بجووڵێتەوە و بە گاگۆڵە بڕوا و دەستەکوتە بکا هەتا دەگاتە ویست‌و ئامانجی و خواردنێک دەدۆزێتەوە، خواردن هەر شتێک دەبێ ببێ،بەلام خۆزگە شتێک بێ بە بێ‌لێنان و گەرم کردنەوە بخورێ، چونکەئێستا وەختی کابانییەتی دڵخواز نیە.

هێشتا چەند هەنگاوێکی نەنابوو کە ترس بە بەدفەڕی لێی قوت بۆوە،رەنگە بە هەڵە چووبێت، رەنگە هەژدیهایەکی نەبەدی شەویلاکەی‌لێ‌داپچڕی بێ یان روحێک دەستی هێنابێ و بێهەوێ بیباتە ولاتی پڕترس و خۆفی مردوان کە مەرگیان بێ‌بڕانەوەیە، چونکە هەمیشە کەسێک‌پەیدا دەبێ کە زیندوویان کاتەوە. پاشان بە ژاکانێکی بێ‌بڕانەوە خۆی‌دایە دەستی خەم، وای بە بیر داهات ئەو شوێنەی دیویەتەوە هەماری‌خواردەمەنی نیە، بەڵکوو گاراژە، تەنانەت وای زانی کە بۆی بێنزینی‌لەبەر لووتی دێت، وەی لە چنگ زەینی ئادەمیزاد بە تایبەت ئەو دەمەی‌دەردەستی دۆڵپای ئێسک‌گرانی خودساز دەبێ و دەکەوێتە گێژاوی ترس‌و گومان.

پاشان دەستی وە شتێک کەوت کە نە چنگۆڵەی پەلاماردەریرووح بوو و نە زمانی ئاورین و کەڵپی گڕی هەژدیها، بەڵکوو تەزووی‌ساردی شتێکی ئاسنینی تەختەکی بوو، بە بیریدا هات رەنگە قەفەزە بێ،بێ ئەوەی بزانێ باشە قەفەزە بۆچی دەبێت، وای دانا کە چین چین هەتامیچی ژێرخانەکە وا بێ، ئێستا تەنیا مەبەست دۆزینەوەی شوێنی‌خواردەمەنییەکان بوو، ئێرە لێی نیە، چونکە دیارە بۆنی کەل و پەلی پاک‌و خاوێنی نەبێ لێی نایا. بێ ئەوەی ئیتر بیر لە کۆسپی دۆزینەوەی‌پلیکانەکان بکاتەوە بە کوێرە کوێرە دەستی لێ‌کوتان، بۆنی کردن ورایتڵەکاندن. ئەوێ پڕ بوو لە قودووی مقەبایی، بوتری شووشە و باغە،کووپەڵە شووشەی درشت و ورد، قوتولەی بچووکی وەها کە رەنگەکۆنسێرو بێ و چەند شڕ و شالاتی تر. هەر چی وەبەر دەستی هات لەتوورەکەیەکی ئاخنی، بە هەڵپە گوتی تەواوی ئەمانە دەخورێن. پاشان‌بزووت و ئەو هەڵکەوتەی چاوەڕوانی نەدەکرد رووی دا، هەر وا کە بەکوێرە کوێرە دەستی دەکوتا نەیزانی و ریزێکی قوتوولە بەردانەوە. ئەم‌تەقە و رمبەیە هێندەی نەمابوو دڵی لە لێ‌دان بخا، بە خۆی گوت شەمچە. لە حاڵێکا لە حەیبەتان دەلەرزی داهاتەوە، دەستی گیرا، ئەوەی لێی‌دەگەڕا دۆزییەوە، نەخێر ئەو بۆنە لە دوورەوە دیارە و ئینسان لەگەڵهیچ بۆنێک لێی تێک‌ناچێ، خللەی دەنکەکان دەناسێتەوە و زووراییی‌کاغەز پەرداغی سەر شانی قالبەکە نەگۆرە، پێداکێشانی دەنکە شەمچە وگڕ گرتن و درەوشانەوەی کزی جەغزی دەوروبەر ئەوەندە رووناک‌دەکاتەوە دەڵێی ئەستێرەیەک لەوبەری مژەوە زریوەی دێت، ئەی‌خودایە، کە وایە نوور ماوە و منیش چاوم هەیە و دەبینم، سلاو لە تیشک‌و رووناکی. ئێستا ئیتر کۆ کردنەوەی دەسکەوت هاسان بوو. توورەکەیەکی پڕ کرد لە شەمچە. ئاقڵی بێ‌پارسەنگ گازی کرد پێویست‌ناکا هەموان بەرێت، پاشان گڕی لەرزۆکی شەمچە تەواوی کەلێن وقوژبنی قەفەزەکانی ئەنگاوت و زۆر زوو توورەکەکان پڕ بوون، دەبووتوورەکەی یەکەم هەڵڕێژێتەوە چونکە شتێکی بەکەلکی تێدا نەبوو،ئەوانی تر ئەوەندەیان شتی بەنرخ و بایخ تێدابوو کە شارێکی پێ‌دەکڕدرا،پێویست ناکا بۆ سەودایەکی ئاوا سەرمان سوڕ بمێنێ بەم مەرجەوەبیریان بێتەوە کە زەمانێک پاشایەک دەیهەویست تەواوی هەرێمی ژێردەسەلاتی بە ئەسپێک بگۆڕێتەوە کە وایە ئەو پاشایە بێننە بەرچاو کەخەریکە لە برسان دەمرێ و لەپڕ بۆنی ئەو توورەکانە بیری پەل‌کێش‌دەکەن، جا بزانن چی دەکرد و حازر بوو لەگەڵ چ شتێکیان بگۆڕێتەوە. پلیکان لێرەوەیە و رێگای دەرکەوتن لە لای راست. بەلام هاوسەری‌چاوپزیشک لە پێشدا لێی دادەنیشێ و بەستەیەک سۆسیس و پەنچکێک‌نانی رەش و شووشەیەک ئاو دادەنێ

و به بێ عەزابی ویژدان دەس دەکابە خواردن. ئەگەر ئێستا شتێکی نەخواردبا تاقەتی بردنـەوەی ئەوهەمووە کەل و پەلەی نەبوو، ئاخر تـەنیا ئـەو تاقمەکـەی بـەخێو دەکـرد وکەسـی تـر. پـاش ئەوەی تێری خوارد هەر قۆڵەی سێ توورەکـەی پێوەهەڵواسـی و دەسـتی بـەرەو پـێش درێـژ کردن، لە سەر یەک لـە سـەر یـەک‌شـەمچەی گـڕدا و خـۆی گەیانـدەوە پلیکانـان، پاشـان بـە زەحمەت وەسەرکەوتەوە، هێشتا خواردنەکەی هەڵـنەتاوابوو، زەمـان پێویسـتە هـەتاخواردن لـە تەواوی لەش دەمرێ و لە بابـەت ئـەو ژنـەوە دەبـوو بگاتـە ئەوشـوێنەی کـە زیـاتر لـە هـەموان خۆڕاگری دەنواند کە مێشکی بوو. دەرگا بێ‌چرپە لـە سەرشـان خـزی و کرایـەوە، هاوسـەری چاوپزیشک لە خـۆی‌پرسـی ئەگـەر هـاتوو کەسـێک لـە ڕێڕەو بـوو چ بکـەم، ڕێڕەو چـۆڵ بوو،بەڵام دیسانیش لە خۆی پرسی دەبێ چ بکەم. کاتێک گەیشتە دەرگای‌دەرکەوتن دەتوانـێ سـەری وەرسـووڕێنێ هـەرا بکـا بنـەبانی ڕێڕەوخـواردنی لێیـە، پلیکانـەکان دەچنـە حـەمباری ژێرخان و پێیدا بڕۆنە خوار،دەرگام گاڵە نەداوە. دەیتوانی ئەم کارە بکـا بـەڵام پەشـیمان بـۆوە. بەشانیی دەرگاکەی پێوەدا، بە خۆی گوت وا باشە متەق نەکا، ئـەو قیامەتـەی‌پەیـدا دەبـێ بێننـە بەرچاو، کوێرەکان وەک شێتان خۆ بە هەموودەرگایەکـدا دەدەن، هـەر ئـەو دیمەنـە دووپـات دەبێتەوە کە وەختی‌سووتانی شێتخانەکە خولقاندبوو، لە پلیکانان دەخلیسـکێن و هەڵـدەدێرێن‌و لە ژێر پێی ئەو کەسانەی بە دوایانا دێـن دەپلیشـێنەوە، ئـەوانیش‌سـەرەنگرێ دەبـن و دەکـەون، پێ‌دانان لە سەر پلیکانی قایم لەگەڵ پێ‌دانان‌لە سەر لەشی خـزۆک و لـەرزۆکی بنیـادەم زۆری جیاوازیی هەیـە. دوای‌ئەوە لـە دڵـی خۆیـدا گـوتی هـەر کـات خواردنمـان لـێ‌بـڕا دیسـانیش دەتوانم‌بگەڕێمەوە ئێرە. توورەکەکانی توند گرتبوو، پشوویەکی قووڵی هەڵکێشاو کەوتـە ڕێ. کوێرەکان نەیاندەبینی، بەڵام بـۆنی ئـەوەی خواردبـووی‌لەبـەر لووتیـان دەگـەڕا. جـا چـاو ئـەو نەفامییەی کردم، خۆ بۆنی سووسیس‌وەکوو شـوێن پێیـەکی زینـدوو لـە دوام دەگـەڕێ. ددانی دەچیڕەوە برد، بەهەموو هێزەوە پڕی دایە توورەکەکان و گوتی دەبێ بـڕۆم. کەوتـە بـیری‌ئـەو پیرەپیاوەی شووشەی لە ئەژنۆ راچووبوو، نەکا منـیش تووشـی ئەوبەڵایـە بم، نـەکا نـەزانم پـێ بنێمە سەر ورکە شووشان، ڕەنگە لە بیرمان‌نەمابێ کە ئەو ژنە پا پەتییە، هێشـتا دەرفـەتی ئـەوەی نەبووە کە وەک‌کوێرەکانی تری شار بچێتە دووکانی پـێڵاو فرۆشـتن، نابیناکـان ئەگـەرچی‌بـۆ بەدبەختییان کوێرن بەڵام لانی کـەم بـە دەس لـێ‌کوتـان پـێڵاوی بـاش بۆخۆیـان هەڵـدەبژێرن. پێویست بوو تێی‌تەقێنێ، تێی تەقاند و هەڵات. لە پێشاویستی بـە بـێ هەسـتێکی بخوشـێ و خـۆ لەکەس نەدا، بەڵام ئەو شێوەتێپەڕینە هەنگاوی شل کردەوە و ناچار بوو لێکدالێکدا راوەستێ و

ڕێگابدۆزێتەوە، لە ئاکامدا بۆنی خواردنی لێهەڵدەستا، چونکە خرمانەیدەوروبەری تەواوی ئادەمیزادەکان خاوەن بەرامە و عەتری ئاسمانییننین، هێندەی نەکێشا کە پیاوێکی کوێر هاواری کرد ئەوە کێیە لەو دەور وبەرانە خەریکە سووسیس دەخوا، ژنی دوکتۆر بە بیستنی ئەو قسەیە بەبێپارێز و ترس دەرپەڕی، خۆی لەم و لەو دەکوتا و گرم دمەونخوونیدەکردن، کردەوەیەکی ناحەز و بەرەڵلایانە و هەڵگری سەرکۆنە، چونکەجووڵانەوەی ئاوا لەگەڵ ئەو کوێرانەی خودا گرتوونی هەڵەیە.

کە گەیشتە شەقام باران وەک گۆزەی سەرەو و ژێر دەباری. بەخۆی گوت زۆر باشتر، لەم بارانەدا بۆنی خواردن کەمتر دیاری دەکا،دەیهانکاند و لاقی دەلەرزین. یەکێک دەستی لە شرۆشیتاڵی بەژن پۆشیگیر ببوو و تەواو دایدڕیبوو، ئێستا بە سینگی رووت و قووت و سپی وسۆڵەوە ڕێی دەبڕی، دیمەنێکی روون و بێگرێ و ڕێژنە بارانیئاسمانیی، ئەوە ئازادی نەبوو کە خەڵکی ڕێنوێنیی دەکرد، ئەوتوورەکانەی بەختەوەرانە پڕن، ئەوەندەی بەلاوە قورسن کە ناتوانێچەشنی ئالا لە سەر سەری بیانشەکێنێتەوە. بەڵام ئەو کارەش زۆرچارەساز نەبوو، چونکە بۆنی ئێشتیا بزوێنی خواردەمەنییەکانی تۆماربە تۆمار دەپڕژا و سەگەلی بەرەو خۆی رادەکێشا، ئەو سەگەبەرەڵلایانەی کەس سەولەی نەدەدانێیە و بە ساحیبی نەدەکردن، کەم وزۆر پۆلێک سەگ کەوتوونە شوێن خێزانی چاوپزیشک، دەبێ هیواداربین هیچیان بۆ تاقی کردنەوەی خۆڕاگری توورەکەکان قەپیانپێدانەگرن. لە وەها بارانەیەکی بەرێژەودا وا چاوەڕوان دەکرێ کە خەڵکلە شوێنێک پەنا بگرن و راوەستن هەتا بڕێکی هەڵدەبرینگێنێ و خۆشیدەکاتەوە. بەڵام ئێستا بارودۆخەکە بە پێچەوانەیە، نێوە نێوە گەلەکوێرێک دێنە بەر چاو کە روویان کردۆتە ئاسمان و زاریان داپچڕیوە وتوونیایەتی خۆیان دەشکێنن و لەشیان پاراو دەکەن، تاقمێکی تر کەبەرژەوەندکارتر یان ئاقڵترن، سەتڵ و مەنجڵ و قابلەمەیان بەرەوئاسمانی دڵاوا ڕاگرتووە، دیارە کە خوا بە رادەی توونیایەتی هەوردەنێرێ و دیکاتە دیاری. هەر بە بیری خێزانی چاوپزیشکا نەهاتبوو کەتەنانەت لەم شتە بایخدارە لە لوولە و شێرەی هیچ ماڵێکا نەماوە ونابزوێ، ئەوەش وێنەیەکە لە کۆسپ و تەگەرەی ژیاری، وامان خوو بەنیعمەتی ئاوی لوولەکێشی نێو ماڵەکان گرتووە کە فەرامۆش دەکەین بۆئەو مەبەستە کەسانێک پێویستن کە شێرفەلەکەکان بکەنەوە وبیانبستنەوە، هەماراو و مەکینە و توورومپای کارەبایی دەبێ هەبن، کۆکامپیۆتێرێک پێویستن کە کەم و کووڕییەکان بدەنە دەست و کاریبەڕێوەبردن ڕێک و پێک بکەن و دیارە بۆ تەواوی ئەم ئیشانە چاودەوری سەرەکی دەگیرێ. هەروەها بۆ دیتنی ئەم

دیمەنەش دەبێ‌چاومان هەبێت، ژنێک چەند توورەکەی پێیە و لە شەقامی پڕ ئاو وسێلاو، بە نێو زبڵ و زاڵی بۆگەن و پیسایی ئینسان و حەیواندا هەنگاودەنێ، ئوتۆمبیل و لۆری بەجێ‌ماو شەقامەڕێیان بەستووە و هەر لەئێستاوە دەوری تەگەری هێندێکیان شینکەی لێ‌ڕواوە و لێکدا لێکدا کوێرو کوێرن کە بە زاری ئاوەڵاوە چاویان بەرەو ئاسمانی ساو زەق کردووەو زۆر سەیرە لە ساوی پاک بباریێ. ژنی دوکتۆر ناوی شەقامەکانی‌رەوگەی دەخوێنێتەوە و دەچێتە پێش، هێندێکیانی وەبیر دێنەوە و هێندێک‌نا، جاری واشە دەبینی ڕێی لێ گۆڕاوە. بەڵێ بێ‌گومان ڕێی لێ گوم بووە. بادەداتەوە سەر شەقامێک، پاشان بۆ شەقامێکی تر، نە شەقامەکانی لە یادماوە نە ناویان، دواتر خەمبار و شەڵەژاو بە داماوی لە سەر قوڕە رەش‌دانیشت و لە پرمەی گریانی دا. سەگەل گەمارۆیان دا. بۆنیان بەتوورەکەکانەوە کرد، بەڵام مەیلێکی وایان نەنواند. دەتگوت جەم مردووبوون، یەکێک لە سپلۆتەکان دەم‌وچاوی دەلستەوە، رەنگە لە گوجووکی‌ڕافێر بووبێ فرمێسکان بسترێتەوە. ژنە دەستێک بە سەر سەگە دا دێنێ ودەیلاوێنێتەوە، سەگە دەگرێتە ئامێز و دەگری. کاتێک سەرەنجام سەری‌هەڵبڕی، هەزار سڵاو بۆ خواژنی چوار ڕێیان، نەخشەیەکی گەورەی بەچاو ئەنگاوت، لەو نەخشانەی کە شووڕای شاران لە ناوەندی باژێران‌هەڵیدەواسن و زیاتر مەبەستییان ڕێنوێنیی ڕێبواران و گەڕۆکانە کەپێیان خۆشە بزانن چوونە کوێ و ئێستا لە کام شوێنن. ئێستا کە هەمووکوێرن ڕەنگە بکەونە دڵەخورتە و بڵێن ئەو کارە پووڵ فڕێ دانە، بەڵام‌مانای ورد و باریک لە سەبر و خۆڕاگری دایە، دەبێ ڕاوەستین زەمان‌باژوێ، دەبێ بۆ جاری ئەوەڵ و ئاخر فێر بین کە چارەنووس هەتا دەگاتەئاکام هەزاران پێچ و گەوەی تێدایە، تەنیا چارەنووس دەزانێ نرخی ئەونەخشەیە چەندە بۆ ئەوەی ژنە ڕێگای خۆی بدۆزێتەوە. بە پێچەوانەی‌بۆچوونی خۆی زۆر لە تاقمەکەی دوور نەبوو، تەنیا ڕەوگەی لابڕی‌لێ‌تێک‌چوو بوو، تەنیا دەبێ ملی ئەو شەقامە بگری هەتا دەگەیە مەیدان،لە وێوە دەبێ پێچ کەیەوە بۆ لای چەپ و دوو شەقامان هەڵبوێری، پاشان‌لە شەقامی یەکەم بەرەو ڕاست بڕۆی، ئەوە شەقامی دڵخوازی تۆیە،دیارە ژمارەی پلاکەکەشت لەبیر ماوە. سپلۆتەکان وردە وردە بڵاوەیان‌لێ‌کرد، لە ڕێگادا شتێک هۆشی بڕین، یا بە چەشنێک خوویان بەم گەڕەکەگرتووە نایانهەوێ بڕۆن و دوور کەونەوە، تەنیا ئەم سەگەی‌فرمێسکەکانی ئێشک کردبۆوە کەوتە شوێنی، رەنگە ئەو چارەنووسەی‌ژنەی هێنایە سەر نەخشەی شار، بەشێکی سەگەشی دەگرتەوە. حەقیقەت‌ئەوەیە وێکڕا لە دووکانەکە وەژوور کەوتن، سەگی ئەسرین‌لێسەوە بەدیتنی ئەو ئادەمیزادانەی کە وەک مردوان بێ جووڵە تخێڵ

ببوونهەڵنەبەزییەوە، خووی بەم دیمەنە گرتبوو، جاری وا بوو لێی دەگەڕان لەپاڵیان وەرکەوێ و بخەوێ و کەم و زۆر کاتی وەخەبەری هەموو زیندوودەبوونەوە. ژنە گوتی ئەگەر خەوتوون هەستن، خواردنم هێناوە، بەڵام لەپێشا دەرگای داخستبوو هەتا ئەگەر کەسێک بەوێدا تێپەڕی دەنگی‌نەبیسێ. کوڕە خێلە یەکەم کەس بوو کە سەری هەڵێنا، هەستی بێ‌تاقەتی‌ئیزنی جووڵانەوەی تری پێ‌نەدەدا، ئەوانی تر زۆریان پێ‌چوو، خەویان‌دەدیت کە بوونە بەرد و هەموو دەزانین کە خەوە بەردینە چەندە گرانە،پیاسەیەکی سووکەڵە بە دەوری شارا ئەم مەبەستە روون دەکاتەوە، لەوێندەرێ کوێران پێیان لە خاک و خۆڵ کێشاوە و خەوتون و خوا دەزانێ‌چاوەڕوانی کام بێدارین. بەڵام وشەی خواردن خاوەنی هێزێکی‌سێحراوییە، بە تایبەت کاتێک برسییەتی هێرش دێنێ، تەنانەت سەگەش کە زمان نازانێ کلکەسووتە دەکا، ئەم جووڵانەوە سروشتییە وەبیری‌هێنایەوە کە هێشتا کردەوەی سەگەلی تەڕی لە خۆی نیشان نەداوە،سەگی تەڕ خۆیان رادەوەشێنن و پڕیشکیان دەور و بەریان ئاوپڕژێن‌دەکا، ئەو کارەیان بەلاوە خۆشە و کەولی پڕ و تووکنیان دەڵێی باڵتەیە،ئاوێکی متفەڕکی بە خێروبێر لە ئاسمانەوە سەرەخوار دەبوو وپڕیشکەکانی بەردەکانی دەکردەوە ئینسان، لەم ماوەیەدا هاوسەری‌چاوپزیشک توورەکە نایلوێنەکانی دەکردەوە و لەم توانەوە و ژیانەوەدابەشداری دەکرد. هێندێک لە خواردەمەنییەکان لەسەر بۆنی سروشتیی‌خۆیان نەمابوون، بەڵام بێتوو قسەی زل زل بکەین، بۆنی پارووپەک نانی‌بەیات وەکوو شیلەی ژیانی شازە. ئێستا ئیتر هەموو وەخەبەرن،دەستیان دەلەرزێ، تامەزرۆیی لە روخساریاندا شەپۆلان دەدا، لەم‌کاتەدا چاوپزیشک، هەر وەک لە پێشا بۆ خێزانی رووی دابوو، وەبیری‌دێتەوە کێیە، وریا بن، زۆر خواردن باش نیە، زەرەدی هەیە، کوێرەپیاوگوتی ئەوەی زەرەدی بێ برسێتییە، هاوسەری چاوپزیشک بە سەریارۆیی و گوتی بە گوێی دوکتۆر بکەن، شووەکەی بێ‌دەنگ بوو و تۆزەگەردێکی لە دڵی نیشت و بیری کردەوە خۆ ئەو پیاوە هیچ شتێک لەبارەی چاودا نازانێ، هەڵبەت ئەوە بۆچوونێکی نادروست بوو، بە تایبەتی‌ئەگەر لە یادمان بێ کە دوکتۆریش لە ئەمان بیناتر نیە، بەڵگەش ئەوەیەهەر نەیدەزانی خێزانی لە پشتێن بەرەو ژووری رووتە، چونکە ژنەکەی‌داوای کۆتەکەی لێ‌کرد هەتا خۆی پێداپۆشێ، تەواوی کوێرەکان روویان‌تێ‌کرد، بەڵام تازە زۆر درەنگ ببوو، خۆزگە زووتر روانیبایان.

کاتی ژەم کردن ژنە بە پوخت و پاراوی تەواوی رووداوەکانی‌گێڕایەوە، تەنیا باسی داخستنەوەی دەرکەی هەمارەکەی نەکرد، لەم‌مەیلی مرۆڤ‌دۆستانەیەی وەلای خۆی دابوو

تـەواو دڵـنیا نـەبوو، بۆتێهەڵـێنانەوەی ئـەو مەبەسـتە بەسـەرهاتی ئـەو کـابرا کـوێرەی گێڕایـەوە کەشووشەی لە ئەژنۆی راچـوو بـوو، هـەموو بـە دڵ پێکـەنین، هەڵـبەتهـەموویان نـا، پیرەپیـاو بزەیەکی تیژتێپەڕ لـە سـەر لێـوی ئاسـۆگی دا وکورێژگـەش تـەنیا گـوێی دەدایـە کرمـە کرمـە خواردنی خۆی. سەگەشسەولەی خۆی وەرگرت و لەرێوە بە هەڵـپە دەسـتی کـرد بـە وەڕیـن بەمکەسـانەی لـە دەرەوەڕا دەرگـای دووکانەکـەیان دەلەرانـدەوە و ئـا بـەمشـێوەیە قـەرەبووی کردەوە. هەر کەس لە پشـت دەرگـاوە بوایـە زۆرییێداگری نـەدەکرد، لـە هـەموو شـوێنێک دەنگۆ بوو کە شار پڕە لە سەگیهاری بەڕەڵڵا. هەموو وردە وردە ئۆقرەیان گـرت و برسـێتییان شـکا وئـەوکات خێـزانی چاوپزیشـک نەزیلـەی ئـەو کابرایـەی بـۆ گێڕانـەوە کـە لـەدووکان دەرکەوتبوو هەتا بزانێ دەباریێ یان نا. پاشان سەر و بنیقسەکانی بردەوە سـەر یـەک و گـوتی بێتوو ئەو قسانەی بـە مـنی گوتووەراسـت بـێ، وەک پێشـوو نـاتوانین سـەر بـە ماڵـی خۆمانـدا بکەینەوە، تەنانەترەنگە هەر نەتوانین بچینـە ژوورەوەش، لێـرەدا مەبەسـتم لـەو کەسـانەیەکاتی وەدەرکەوتن دەستە کلیلەکانیان لە بیر چووە یا گومیان کردوون،بۆ وێنە ئێمە کلیلمان پێ نیە و لە سووتمانەکەدا ون بووە، تازەدۆزرانەوەی لە خۆڵەمێشدا دەس نادا، وشـەی سـووتمانی وا بـە سـەرزاریدا هـات دەتگـوت گـرەکان دەبـێنی کـە مقەسـتەکەی هەڵدەلووشن،سـەرەتا خـوێنی وشک هەڵاتووی سەر مقەستەکە دەسووتێنن، پاشان دمو نووکی تیـژی لـوول دەدەن و کـولی دەکەن، مقەستەکە وردە وردە رەشهەڵـدەگەڕێ، سـوور دادەگیرسـێ و وەهـا خـوار و خـێچ دەبێ کە کەس بڕواناکا ئەم کوتە ئاسنە زەمانێکی توانیبێتی گەرووی کەسێک هەڵپسێنێ،ئاور کە دەستی خۆی وەشاند و رۆمرکا تازە ناکرێ لە نێو ئەم کۆمائاسنەواڵـە قـاڵ بـووەدا کلیـل و مقەست لێک بناسرێنەوە، چاوپزیشک گوتیکلیلەکان لە لای منن، زۆر ناشیانە سـێ قـامکی لـە گیرفـانی بچـووکیدوولینگـە شرِوشۆڵـەکەی رۆبـرد و ئاڵـقەیەکی چکۆڵـەی بـە سـێ کلیلەوەدەرهێنا، لە جانتاکەم دەرهێنا، ترسام ون بێت، گوتم بـەلای خۆمـەوەچاکتر رادەگـیرێ، هەروەها جۆرێک دڵخۆشیی و دڵنیایی دەدامێیە کەرۆژێک دەگەڕێینەوە ماڵ، کلیل پـێ بـوون ئینسان خاترجەم دەکا، بـەڵامرەنگـە دەرگـای ماڵـەوەیان شـکاندبێ، هـاتوو نەیانشـکاندبێ. بـۆ ماوەیەکئاواڵەکانیان لە یاد بردبۆوە، بەڵام ئێستا بە لایانەوە گرینگ بوو بزانن‌ئەوانیش چیان لـە کلیلـەکانیان کـردووە، یەکـەم کەسـێکی هاتـە جـواب کچـەیچاویلکـەیی بـوو، ئوتـۆمبیلی نەخۆشبەر کە هاتە شوێنم، دایک و بابم لەماڵ بوون، نازانم پاشان چیان بە سەر هاتووە، دوایە نۆرەی پیرەپیاوهات، من لە ماڵەوە کوێر بووم، لە دەرگایان دا، خـاوەن ماڵـەکە هـات وگـوتی

چەند نەخۆشەوانی پیاو بە شوێنما دەگەڕێن، وەختی ئەوەم نەبووبیر لە کلیل بکەمەوە، ئێستا نۆرەی ژنی کوێرەپیاو بوو، بەڵام ئەو وتی‌نازانم، لە بیرم نەماوە، هەم دەیزانی و هەم لە یادی بوو، بەڵام ئەوەی‌دەیشاردەوە ئەمە بوو کاتێک دیتی لە نەکاو کوێر بووە، هەڵبەت وشەی‌دیتن لێرەدا زۆر بێ‌مانایە، بەڵام وەها قووڵ لە زماندا پنجی داکوتاوە کەناچارین بە کاری بێنین، بەڵێ کاتێک خۆی ئاوا دیت بە زیق و هۆڕ لە ماڵدەرپەڕیبوو و هاواری جیرانەکانی کردبوو، ئەم جیرانانەی هێشتا لەوێ‌مابوون لە یارمەتی دانی کەوتنە دوودڵی، کاتێک مێردەکەی تووشی ئەم‌نەهامەتییە هاتبوو ئەو وەسەر خۆی نەهێنا و ئازایەتی و لێ‌زانینی نواند،بەڵام ئێستا خۆی دۆڕاندووە و دەرگای بە ئاواڵەیی و لە سەر خوا جێ‌هێشتووە، تەنانەت بە مێشکیدا نەهاتبوو ئیزن بخوازێ و خێرا بگەڕێتەوەو دەرگا گاڵە بدا و بگەڕێتەوە. هیچ کەس باسی کلیلی ماڵی لە کوڕە خێلەنەپرسی، چونکە تەنانەت لە بیری نیە ماڵیان لە کام شوێنە. پاشان ژنی‌دوکتۆر بە ئارامی دەستی کچەی چاویلکەیی لاواندەوە، لە ماڵی تۆوە کەنیزیکترە دەس پێ‌دەکەین، بەڵام دەبێ لە پێشدا جلک و پێڵاو پەیدا کەین،ناکرێ بەم سەروسەکوتە پیس و ئاڵۆز و نەشۆراوە و ئەو تڕوتیتۆڵانەدەرکەوین. ویستی بەرز بێتەوە، بەڵام دیتی کە کوڕەی کاڵ بە زگی تێرئاسوودە لێی خەوتووە. گوتی کە وایە با ئێمەش تۆزێک چاو گەرم کەین‌و بحەسێینەوە، دوایە دەچینە دەرەوە بزانین چ باسە. داوێنەخووساوەکەی داماڵی و بۆ ئەوەی گەرم بێتەوە لە باوەشی مێردەکەی‌خزا، کوێرەپیاو و خێزانیشی هەر وایان کرد، شووەکەی پرسی تۆی وکەوتەوە یادی ماڵ و حاڵی خۆیان و ژانێک دڵی ڕێک‌کوشی، نەیگوت‌دڵنواییم بکە، بەڵام دەتگوت هەر ئەوەی لە مێشکیدا دەهات و دەچوو،ئەوەی تێی‌ناگەین هەستێکە کە بوو بە هۆی ئەوەی کچە دەستی باوێتەئەستۆی پیرەپیاو، بەڵام بێ‌گومان ئەو کارەی کرد و هەر ئاواش خەوی‌لێ‌کەوت، بەڵام پیرەپیاو نەخەوت. سەگە چوو لە لای دەرگاڵییەوەرکەوت و نێودەرانەی تەنی، کاتێک کەسێکی نیە فرمێسکەکانی‌ویشک کاتەوە گەلێ تووڕە و لاڕێ دەبێ.

کوێری

جل و بەرگ و پێڵاویان پۆشی و هەر ئەوە ما بزانن چۆن خۆیانبشۆن، بەڵام هەر لە ئێستاشەوە لەگەڵ کوێرەکانی تر جیاوازییان هەبوو،چونکە ئەگەرچی تەواو بە مەیلی خۆیان نەیاندەتوانی هەڵبژێرن بەڵام‌ڕەنگی بەرگەکانیان یەکتری دەخوێندەوە، بە واتەی مەنشوور

هەمووشتێک سەر گوڵی جوانە، ئەوەش لە چاکەی هەبوونی مشوورخۆرێکە کەوەختی خۆی بڵێ ئەوە بکە بەرت لەگەڵ دوولینگەکەت دێتەوە، ڕێ ڕێ وپنۆک پنۆک لێکناکاڵێنەوە و ئەم شتانە، هەڵبەت ئەوانە بۆ پیاوان گرینگنین، بەڵام هەم کچەی چاویلکەیی و هەم ژنی کوێرەپیاو پێداگرن لە سەرئەوەی کە بزانن چ ڕەنگ و تەرزێکیان کردۆتە بەر هەتا بە یارمەتیخەیاڵ دیمەنیان بێننە بەر زەین. بەڵام بۆ پێڵاو تێکڕا لە سەر ئەو باوەڕەبوون کە نەرمی و بەپا خۆش بوون لە جوانی باشترە، پێڵاوی قەیتاندارو پانێ بڵێند و چەرمەگوێلک و بریقەدار بەکەلک نایە، کەوشی ناسک بەکاری ئەم ڕۆژگار و ڕێیانە نەدەهات، چەکمەی پەلاستیکی هەتا چۆکاندرێژ بەکەلکیان دێت کە بە هاسانی بیکەنە پا و دایکەنن، هیچ شتێک لەوەچاکتر نیە بۆ قوڕەشێل. بەداخەوە لەم چەکمانە وەگیر هەموان نەکەوت،بۆ وێنە هیچ چەکمەیەک بۆ پێی کوڕە بچکۆلەکە نەدەبوو، چەکمەیگەورە پێ لە لاقیدا دەتگوت ساقۆڕن، کە وایە ناچار بوو بە جووتێک کەوشی وەرزشی بحاوێتەوە کە لێرە کەس نەیدەزانی هی کام وەرزشە،ئەگەر دایکی گوم بووی لێرە بوایە و کەسێک دیمەنەکەی بۆ باس کردبا،دەیگوت سەیر هەڵکەوتێک، ئەوە ڕاست هەر ئەو کەوشەیە ئەگەرکوڕەکەم چاوی دیتبای هەڵیدەبژارد. پیرەپیاوی پێیان بە جووتێک کەوشی بەسکتباڵ خۆی تەیار کرد، ئەو پێڵاوە باشانەیان بۆ یاریکەرانیباڵا بەرز ساز کردبوو. ڕاستە کە بەم کەوشانەوە بڕێک سەیر دەهاتەبەرچاو، بەڵام ئەو دیمەنە گاڵتاوییە هێندە تەمەن ناکا، هێشتا دەدەقیقەیەک ڕانەبردووە، کەوشەکان پیس دەبن، بەڵێ ژیان زۆریپێدەوێ و بەرسیلە بە دەرفەت دەبێتە ترێ.

باران لێی کردۆتەوە، ئیتر هیچ کوێرێک لە بەر باران ڕووەوە ئاسمانزاری دانەپچڕیوە. خول دەخۆن و نازانن چ بکەن، لە شەقامانچەواشەن، بەڵام قەت هێندە نابا، چوون و مانەوە بۆیان یەکسانە، جگە لەگەڕان بە شوێن خواردنەوە هیچ ئامانجێکی دیکەیان نیە، ئیتر دەنگیمووسیقی بڕاوەتەوە، هەرگیز دنیا ئەوەندە بێدەنگ نەبووە، شانۆگە وسینەماکان تەنیا پەنا و پەسیوی ئەو هەژار و بێماڵ و حاڵانەن کە بەناهومێدی دەستیان لە دۆزینەوەی خواردن شۆردووە، ئەو سەردەمەیهێشتا دەوڵەت یا خۆ چەند کەسێک لە پایەبەرزانی حکوومەتی هەر واهەوساری وڵاتیان بە دەس بوو، هێندێک لەم هۆڵە گەورانەیان کردبوو بەقەرەنتینەی کوێرەکان، ئەو کات هێشتا لە سەر ئەو باوەڕە بوون کەنەخۆشیی سپی بەری لێدەگیرێ و چارەسەر دەکرێ، بەڵام چ نەکرا وسەردەمی ئەم بەرگرییانەش بە سەر چوو، ئیدی لێرە تەنانەت پێویستبە سووتمانیش نەبوو، بەڵام لە بابەت مۆزەخانەکانەوە بەڕاستیناخۆشە کە ئەم

گەشتە مرۆڤە، مەبەستی تایبەتیم هەیە کە دەڵێم مرۆڤ،ئەم هەموو تابلۆ نەقاشییە، ئەم گشتە پەیکەرە تەنانەت کەسێک نەبیٚسەریان لیٚبدا و دیداریان لیٚبکا. هەر خوا دەزانیٚ کوێرانی ئەم شارەچاوەڕوانی چین، ڕەنگە ئەگەر بڕە باوەڕێکیان مابیٚ هێشتاش چاوەڕوانی دەرمان و چارەسەریی بن، بەڵام وەختێکی بوو بە دەنگۆ کەکەسی ساخ نەماوە و هەموو کوێراییان داهاتووە و چاوێک نەماوە لەمیکرۆسکۆپ خورد بێتەوە و ئەزموونگەکان چۆل کراون، ئومێدیان بووبە بلٚقی سەر ئاو. سەرەتا خزم و کەسی زۆرێک لە کوێرەکان کە هێشتاریٚزیان بۆ خۆشەویستی و پەیوەندیی بنەماڵەیی دادەنا، لە تەکیانا بەرەونەخۆشخانەکان هرووژمیان برد، بەڵام لەویٚ چاویان بەگەڵەدوکتۆرێکی کوێر دەکەوت کە نەزمی دەستی ئەو نەخۆشانەیان‌دەگرت کە نەیاندەبینین یان گوێیان بە پشت و سینەیانەوە دەنان، چونکەهێشتا هەستی بیستنیان کاری دەکرد و ئەوە تەنیا کاریٚ بوو کە لەدەستیان دەهات. بەڵام پاشان ئەو نەخۆشانەی هێشتا دەیانتوانی بەرێگادا بڕۆن، بە برسییەتی لە نەخۆشخانەکان هەڵاتن، داهاتوویەکی تاڵو مەرگاوی لە شەقاماندا بە بیٚکەسی چاوەڕوانیی دەکردن، ئەو تاقمەئەگەر خاووخێزانێکیشیان هەبوو، دیار نەبوو لە کویٚ ئاوارە وسەرگەردانن و بۆ ناشتنیان هەر ئەوەندە بەس نەبوو یەکێک بەهەڵکەوت تێیانهەڵەنگویٚ، بەڵکوو دەبوو کەلاکەکان بۆگەن ببوایەن وراستە و راست لە سەر شەقامەڕێیان کەوتبان. هیچ سەیر نیە کە سەگەڵبە سەر و گوێلاکی ئادەمیزادان هەڵدەڕووسکێن، هەر لە ئێستاوە دەڵێی‌کەمتیارن، کوان و بلۆقی کەوڵیان چڵکی تێزاوە و کلک لە گەڵۆز دەگەڕێن،دەڵێی دەترسن مردۆکان و ئەوانەی قووتیان داون زیندوو بنەوە ولەبەر خاتری ونجڕونجڕ کردنی بیٚشەرمانەی ئینسانە بیٚدەسەڵاتەکان‌سزایان بدەن. پیرەپیاو گوتی دنیا چی لیٚهات، هاوسەری چاوپزیشک‌وڵامی داوە لە نێوانی دەر و ژوور، ئێر و ئەویٚ، کەم و زۆر، ئەمڕۆ وسبەی جیاوازییەک نیە، کچەی چاویلکەیی پرسی خەڵک چلۆن،کارەکانیان چۆن جیٚبەجیٚ دەکەن و بەڕیٚ دەچن، چەشنی رووح‌سەرگەردانن، ڕەنگە هەر ئەوە بێت مانای رووح ،هەڵبەت، بیٚگومان ژیانهەیە، چونکە چوار هەستەکەتان وا دەڵیٚ و لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانن ببینن،کوێرەپیاو کە دزرانی ئوتۆمبیلەکەی هەر لەبیر مابوو پرسی ئوتۆمبیل‌زۆرە، بەڵیٚ دەڵێی گۆڕستانی ماشێنانە. نە چاوپزیشک شتێکی پرسی ونە ژنی کوێرەپیاو، ئەگەر قەرار وا بوو هەر وڵامی لەم چەشنە ببیستن چفایدەیەکی هەبوو. بەڵام کوڕە خێلە بە ئاواتی خۆی گەیشتووە و بەم‌پێڵاوانە ئەوەندە دڵخۆشە تەنانەت لەوەی کە نایانبینیٚ کەیفی ناشێوی،ڕەنگە هەر بۆیە وەکوو رووحی لیٚ بە سەر نەهاتبیٚ. بەڵام سەگیٚ‌ئەسرین‌لێسەوە

که کەوتۆتە شوێن خێزانی چاوپزیشک ناشێ پێی بلێی کەمتیار، چونکە ئەو نەکەوتۆتە دوای گۆشتی لەشی مردوو، بەڵکوو کەوتۆتە جەغزی جووتە چاوێکی کە دەزانێ گەش و زیندوون.

ماڵی کچەی چاویلکەیی دوور نیە، بەڵام دوای حەوتوویەک برسییەتیوا تازە خەریکە تاقمەکە گیانێکی دێتەوە بەر، هەر بۆیە نەرم نەرمدەڕۆن، بۆ حەسانەوە ناچارن ڕۆنیشن و وچان بگرن، هەڵبژاردنیڕەنگ و جۆری جل و بەرگ بە زەحمەتەکەی نەدەبوو، چونکە هەر لەئێستاوە پیس بوون. خەیابانی شوێنی ژیانی کچە کورت و تەسکە، هەربۆیە چ ئوتۆمبیلی لێ بەدی ناکرێ، خەیابانەکە یەک سەرەیە و جێڕاوەستانی نیە، ڕاگرتن لێی قەدەغە بوو. چۆل بوونیشی جێیسەرسوڕمان نەبوو، لەم جۆرە شەقامانەدا بە درێژایی ڕۆژ هیچجووڵەوەرێک بەدی ناکرێ. ژنی دوکتۆر پرسی ژمارەی پلاکی ماڵتانچەندە، ژمارەی حەوت، قاتی دووهەم دەستی چەپ. یەکێک لەپەنجەرەکان کرابوویەوە، لە وەختی ئاساییدا ئەمە خۆی نیشانەی ئەوەبوو کە زۆر وێدەچێ کەسێک لە ژوورەوە بێ، بەڵام ئێستا نەدەکرا لەهیچ شتێک دڵنیا بی. ژنی دوکتۆر گوتی پێویست ناکا هەمموومان بچینەسەرەوە، ئێمە دوو بە دوو دەچین، ئێوە لێرە چاوەڕوان بن. تێگەیشت کەدەرگای چوونە ژوورەوەی ساختومانەکە بە زۆرەملی کراوەتەوە، دیاربوو زمانەی قفڵەکە شکاوە و تەڵەزمێکی باریک و درێژ لە لاشیپانەکەبۆتەوە. باسی ئەم مەبەستەی نەکرد، کچەی وەپێش دا، چونکە ڕێگاکەیپێدەزانی، بایخی نەدایە تاریکایی پلیکانەکان، کچە لە خۆشیان دوو جارهەڵخلیسکا، بەڵام بە پێکەنینەوە گوتی چاوت لێبێ، ئەوە هەر ئەمپلیکانانەن کە بە چاوی نووقاو دەمتوانی سەر و خواریان پێدا بکەم،ڕاهاتن و جەغزی دیاری کراوی زمان ئاوان و لە بەرامبەر هەزاران خاڵیورد و باریکا خۆ نابزێون، بۆ وێنە خاوەنی ئەم زمان و ڕاوێژە فەرقینێوان چاوی نووقاو و کوێر ناکا. لە پێگۆڕکەی قاتی دووهەم دەرگایماڵەکە بە داخراوی خۆی نواند. کچەی چاویلکەیی دەستی بە لاشیپانەیدەرگادا کێشا و زەنگەکەی دیتەوە، ژنی چاوپزیشک وەبیری هێنایەوە کەکارەبا نیە و کچە ئەم وشانەی وەک هەواڵێکی تاڵ و ناخۆش بیست، ئەمهەواڵەی بەلای زۆر کەسانەوە گەلێ شومە. ڕایەک، دووڕا تەقولبابی کردو ڕای سێهەم دەرگای دایە بە مست و هاواری کرد، دایە، بابە، بەڵام کەسدەرگای نەکردەوە، ئەو قسە خۆش و گەرم و گوڕانەی لە مێشکیداشەپۆلیان دەدا نەیانتوانی ڕاستەقینەی تاڵ بگۆڕن، کەس نەهات بڵێڕۆڵەی خۆشەویستم ئاخرییەکەی گەڕایەوە، بەخێربێیەوە، بەڕاستیخەریک بووم ناهومێد بم، وەرە ژوور، وەرە ژوور و فەرمووی ئەمخاتوونەش بکە، ببوورن کە ماڵەکە تۆزێک شپرێوە، بەڵام دەرکە هەر

واما و نەکرایەوە. کچەی چاویلکەیی گوتی کەس لە ماڵ نیە، پاڵی وەدەرگادا، دەستی تێک‌بەزاند و سەری وێکردن و لە پڕمەی گریانی دا، دەتگوت‌هەموو ئەندامی بە لێ‌قەوماوی نزای روحم و بەزەیی دەکا، ئەگەرئەوەندە ئەزموونەمان نەبووبا و نەمانزانیبا روحی مرۆڤ چەندە پڕ پیچ وفلووچە، سەرمان لەم هەمووە خۆشەویستی و پەژارەیەی سەبارەت بەدایک و باوکی دەینواند، سور دەما، ئەویش لە کیژێکی ئەوەندە بەڕەڵلا،بەڵام هەر لەم نیزیکانە کەسێک هەیە کە پێشتر نیشانی‌داوە کە لە نێوان‌ئەم دووەدا نە جیاوازییەک هەیە و نە دەبێ. هاوسەری چاوپزیشک‌ویستی دڵنوایی بکا، بەڵام هیچی بە زەینیدا نەهات، هەموو دەزانن کەژیانی درێژخایەن بۆ خەڵک لە ماڵەوە یەگجار کورتە، پێشنیاری کرد بابزانین ئەگەر هاوسایەک ماوە لێیان بپرسین، کچە گوتی بەڵێ با بڕۆین‌بپرسین، بەڵام راوێژی زاری بەستەڵەکی زستانی دێنایەوە یاد. دەرگای‌ئاپارتمانی بەرەو روویانی کوتا. بەڵام ئەوجاریش کەس وڵامی نەدایەوە. لە قاتی سەرەوە دەرکەی دوو ماڵ کرابوونەوە. ئەو ماڵانە تاڵان کرابوونو دۆڵابی و قەفەزەکان بە بەتاڵی خۆیان دەنواند. وا دیار بوو تازەکەسێک یان تاقمێکی بەڕەڵلا خۆیان تێ‌کوتابوون، ئیتر ئێستا هەمووکەس کەم و زۆر بەڕەڵڵایە، ئەو ماڵەوماڵیان دەکرد و ئێرە و ئەوێ‌دەچوون.

گەڕانەوە قاتی یەکەم، هاوسەری چاوپزیشک دەرکەی نیزیکترین‌ماڵی کوتا، وەک چاوەڕوانییان دەکرد کەس وڵامی نەدانەوە، پاشان‌دەنگێکی گڕ بە گومانەوە پرسی کێیە، کچەی چاویلکەیی چووە پێش، منم،هاوسێی سەرەوەم، لە دوای دایک و بابم دەگەڕێم، تۆ نازانی لە کوێن وچیان بەسەرهاتووە. خشکە خشکی پێ هاتە گوێ، دەرگا کرایەوە و سەرو پۆتڕاکی پیرێژنێکی کزەڵۆکە دەرکەوت، ببوو بە یەسک و پێست،دەتگوت چیلەکەیە، پرچی درێژ و ئاڵۆزی دزێوی دەنواند. بۆگەنیو و بۆهەڕنەهووتێکی یەگجار ناخۆش قەف قەف خۆی بە دەرێدا کرد وژنەکان لە حەیبەتان کشانەوە. پیرێژن چاوی زەق کردن، چاوی کەم وزۆر سپی دەچوون، بە سۆراغی دایک و بابت نازانم، رۆژێک دوای‌ئەوەی تۆیان برد هاتن لە دووی ئەوانیش، ئەودەم من دەمبینی، کەسی‌دیکەش لێرە ماوە، جارجارە هەستی پێی هاتوچۆکەران دەبیستم، بەڵام‌هی دەرەون و دیارە تەنیا بۆ نوستن روو دەکەنە ئێرە، کە وایە دایک وبابی من چییان بە سەرهاتووە، گوتم کە هیچ هەواڵێکم لێیان نیە، مێرد وکوڕ و بووکەکەت لە کوێن، ئەوانیشیان برد، ئەی تۆیان بۆ نەبرد، من‌خۆم حەشار دابوو، لە کوێ، راست لە ماڵی ئێوە، چۆن توانیت بچیەژوور، لە پشتەوەڕا، بە پلیکانەکانی دەربازبووندا

وەسەرکەوتم وتەبەقێکم شووشە شکاند و دەستم برد و دەرگاکەم کردەوە، دەرگا کلیلی لە سەر بوو، خێزانی دوکتۆر پرسی هەتا ئێستا چۆن ژیاوی، پیرێژنواقی ورما، سەری وەرسووڕاند و پرسی ئێرە کێی دیکەی لێیە، کچەدڵنیای کردەوە کە ئەوە دۆست و ئاشنای منە، یەکێکە لە ئەندامانی تاقمەکەی ئێمە، هاوسەری چاوپزیشک پێداگری کرد، لێرە مەبەست تەنیایی نیە، خواردن گرینگترە، لەو ماوەیەدا خواردنت لە کوێ وەگیرهێناوە، راستییەکەی ئەوەیە کە من نەفام و گێلەکە نیم و دەتوانم بەڕەیخۆم لە قوڕاو دەرکێشم، ئەگەر پێت خۆش نیە باسی بکەی لێی گەڕێ، منهەر وا بەپرسیارم، کە وایە دەیڵێم، یەکەم کارێکی کە کردم ئەوە بووهەموو ماڵەکانم پشکنی و ئەوەی شێو و خواردەمەنی بوو کۆم کردەوە،ئەوانەی زوو خراپ دەبوون خێرا خواردمن و ئەوانی دیکەشمپاشەکەوت کرد، کچە پرسی شتێکی وات ماوە، پیرێژن وڵامی دایەوە، ناتەواو بووە، چاوە کوێرەکانی لەپڕێ بە بەدگومانی درەوشانەوە، هەڵبەتلە وەها هەل و مەرجێکا هەمیشە شێوەی وتار ئاوایە، بەڵام لە راستیدابێ بناغەیە، چونکە گلێنەی چاو زیاتر خاوەنی چلۆنایەتی نین، جا با وەک کەشکە فەریکەش زەق بچن، ئەوانە دوو گۆی خڕی نەگۆڕن و تەنیاپێلوو و مژۆڵ و برۆکانن کە لە پوخت و پاراوی روانینا دەور دەگێڕن،بەڵام وەک روونە ئەم تایبەتیانە وەلای چاو دەدەن، هاوسەریچاوپزیشک پرسی ئێستا چۆن بەڕێ دەچی، پیرێژن بە راوێژێکی پڕرەمز و رازەوە گوتی مەرگ لە شەقاماندا خۆی مەلاس داوە و بۆسەیناوەتەوە، بەڵام لە باخچۆڵەی پشت ماڵان ژیان درێژەی هەیە، مەبەستتچیە، لە باخچۆڵەی پشت ماڵان کەلەم و کەروێشک و مامر دەستدەکەوێ، گوڵیش هەیە، بەڵام نەک بۆ خواردن، دەی تۆ چ دەکەی، فەرق دەکا، جاری وایە کەلەمێک هەڵدەکەنم و جاری واشە مامر یاکەروێشکێک دەکووژم، پاشان بەکاڵی دەیخۆی، لە پێشدا دەمبرژاندن،بەڵام دوایە خووم بە خواردنی گۆشتی کاڵ گرت، لاسکی کەلەمیششیرینە، ئێوە نیگەرانی من مەبن، کچی دایکی خۆمم و لە برسان نامرم. دوو هەنگاو کشایەوە و کەم و زۆر لە تاریکی ماڵەوەدا ون بوو، تەنیاچاوەکانی سپی دەدرەوشانەوە و لە ژوورەوەڕا گوتی ئەگەر دەتهەوێبچێوە ماڵی خۆتان من رێگات لێناگرم، فەرموو برۆ. کچەی چاویلکەیی دەیهەویست بڵێ نا زۆر سپاس، بێ فایدەیە، ئێستا کە دایک و باوکم لەوێنین چ بکەم، بەڵام لە پڕ ئیشتیای کرد وەتاغەکەی ببینێ، دەمهەوێهۆدەکەم ببینم، ئێستا کوێرم ئەو ئاواتە چەند ئاواتێکی قوڕە، دەی هەرهیچ نەبێ دەس بە دار و دیوار و کەل و پەل و پێخەفەکاندا دەکێشم وبۆن بەو باڵنجەوە دەکەم کە سەری گێژم لە سەر دادەنا، رەنگە ئەوگولانەی لە بیری مابوون هێشتاش لە

شوێنی خۆیان مابن، مەگین دوایئەوەی پیرێژن زانیبێتی بۆ خواردن نابن بەری دابنەوە و بە تووڕەییپێخوستی کردبن. بەم پێیە کچە گوتی زۆر باشە، ئەگەر زەحمەت نەبێبۆتان پێشنیارەکە قبووڵ دەکەم، ئەوە ئەوپەڕی لوتفی ئێوەیە سەبارەتبە من، وەرنە ژوور، وەرنە ژوور بەڵام چاوەڕوانی دیتن و دۆزینەوەیخواردن مەکەن، ئەوەی هەیە خۆمی پێ تێر نابم، ئەوجار هەر بە کەلکیئێوەش نایا، مەگەر ئەوەی گۆشتی کاڵتان پێخۆش بێ، نیگەران مەبە،ئێمە خواردنمان هەیە، ئاخ، کە وایە هەتانە، جا ئەگەر وایە بۆ ئەوەیچاکەی منتان دابێتەوە، هێندێکم خواردن بۆ بێنن، هاوسەری چاوپزیشکگوتی خواردنیشت بۆ دێنین بە چاوان، ئارام بە و دەست و پێتتێکنەهاڵێ. رێڕەویان هەڵبوارد، بۆگەنیو ئینسانی گێژ دەکرد. لە دیویکابان کە تیشکەی رووەو ئاوا بوون بڕێکی روناکیی تێگێڕابوو، کەوڵیکەروێشک و پەڕ و پۆ و ئێسک و پرووسکی مریشک تەواوی وڵاتیتێوەدابوو، لە سەر مێزێک و دەفرێکی پیس و خوێن پێوەمردوو و چەندکوتە گۆشتی نالەبار کە دەتگوت گەلێ جار جووراوتەوە خۆی دەنواند،خێزانی دوکتۆر پرسی دەی باشە کەروێشک و مامرەکان چ دەخۆن،پیرێژن گوتی کەلەم و گیا و گوڵ و بەرماو، ناکا، کەروێشک ومامرەکانیش گۆشت بخۆن، کەروێشکەکان هێشتا نا، بەڵام مریشکەکانپێیان خۆشە، زیندەوەرانیش چەشنی ئادەمیزاد ئاخرێکەی فێر دەبن وخوو بە هەموو شتێک دەگرن. پیرێژن راست و پتەو رێی دەبڕی،کورسیلەیەکی وەها لە سەر رێ وەلابرد دەتگوت چاوی دەبینێ، پاشانئاماژەی بە دەرگایەک کرد کە بە سەر پلیکانەکانی دەرباز بووندادەکرایەوە، لێرەوە وریا بن هەڵنەخلیسکێن، لاجامەی پلیکانەکان زۆرقایم نین. کچەی چاویلکەیی پرسی دەرگاکە چی، هەر پاڵی پێوە بنێندەکرێتەوە، کلیلەکە لای منە، دەبێ هەر لێرانە بێ کچە خەریک بوو بڵێکلیل ئی منە، بەڵام دروست لەم کاتەدا بیری کردەوە ئەگەر دایک وباوکی یان کەسێک لە لایەن ئەوانەوە کلیلەکانی بردبێت هەموو جارێناکرێ بۆ هاتوچۆ زەحمەت وەبەر ئەم جیرانە بنێ. هەستی کرد دڵیتۆزێک وێکهات، رەنگە چونکە دەیهەویست وەژوور کەوێ و بە روونیتێبگا کە دایک و باوکی لە ماڵەوە نین، یان رەنگە لەبەر مەبەستێکی دیکەبووبێت.

ئاشپەزخانە پاک و خاوێن بوو، وڵات هێندەی تۆز نەگرتبوو، ئەوەشیەکێک لە باشییەکانی هەوای بارانی، ئەمجار باران دەبوو بە هۆی گەشەکردن و هەڵدانی کەلەم و گیا وگوڵ، هەر بەڕاستیش باخچۆڵەکانی پشتماڵان لەو سەرەوە لەبەر چاوی ژنی دوکتۆر دەتگوت لێڕەوارۆکەن، لەخۆی پرسی بڵێی کەروێشکەکان لێرە بە کەیفی خۆیان هەڵبەز

دابەزبکەن یا نا هێشتاش لە لانێدا چاوەڕوانی دەستی کوێرێکن کە گەڵای کەلەمیان بۆ بەرێت، پاشان گوێیان بگرێ و بە لینگەفرتە دەریانکێشێ وبە هەڕمە ملیان تێک‌شکێنێ. کچەی چاویلکەیی بە یارمەتی بیرەوەری‌پێشووی دەهات و دەچوو، هەر وەک پیرێژنی نهۆمی خواروو کە نەسەرەنگرێی دا و نە لاقی خلیسکا. جێ و بانی دایک و باوکی شپرێو بوو،رەنگە بەریبەیانی بە دوایانا چووبێتن، دانیشت و بە بانگ و سەلا گریا،هاوسەری چاوپزیشک پاڵی وەپاڵی دا و وتی مەگری، باشە چی تری‌پێ‌دەکرا، لە دنیایەکی بێ مانادا ئەسرین دەتوانێ چ مانایەکی هەبێ،چەپکە گوڵی ژاکاوی نێو گوڵدانی شووشە لە سەر دۆلابەی وەتاخی کچەخۆی دەنواند. ئاوی گوڵدانەکە ببوو بە هەڵم، بە پەنجەکوتەراستەوراست دەستی بۆ درێژ کردن، ئەنگوستی بە سەر پەلکی ویشک‌هەلاتوودا کێشا، وەختێک ژیان بێ پەرژین و بەڕەلا بێ چەندە ناسک وخۆنەگرە. ژنی دوکتۆر پەنجەرەی کردەوە و بۆ شەقامی روانی، تەواوی‌هاوڕێیانی رۆنیشتبوون و بە لەسەرەخۆیی چاوەڕوان بوون، سەگی‌ئەسرین‌لێسەوە تەنیا بوونەوەرێک بوو کە سەری هەڵبڕی، گوێی‌سووکی وریای کردبۆوە. دیسانەوە هەور دەستیان تێک‌گرت، رەنگی‌ئاسمان تاریک دادەگیرا، خەریک بوو شەو دادەهات. لە دڵی خۆیدا گوتی‌پێویست ناکا ئەوشۆ بۆ خەو بە شوێن پەنا و پەسیوێکدا بگەڕێین،دەتوانین هەر لێرە لەنگەر بگرین. لە ژێر لێوەوە گوتی رەنگە پیرێژن پێی‌خۆش نەبێ ئەو هەمووە خەڵکە بە ماڵیدا تێپەڕ بن. دروست لەم کاتەداکچەی چاویلکەیی دەستێکی لە سەر شانی دانا و گوتی دەرگا کلیلی لەسەرە، نەیانبردوون. کە وایە ئەگەر گرفتێکی ئەوتۆ هەبوو ئێستە رەهابیوو، ناچار نەبوون لەگەڵ رووگرژیی پیرێژنی نهۆمی یەکەم بەرەو رووبن، خێزانی چاوپزیشک گوتی دەچم بانگیان کەم، شەو نیزیکە، زۆر باش‌بوو، لانی کەم ئەوشۆ دەتوانین لەژێر میچی ماڵێکی خۆش و خاوێندا بخەوین، تۆ و مێردەکەت لە سەر تەختی دایک و بابم بنوون، بزانین چۆن‌دەبێ، لێرە تەنیا من دەستوور دەدەم، ئێرە ماڵی منە، ژنە کچەی گرتەئامێز، هەقی خۆتە، مەیل مەیلی تۆیە، پاشان بە شوێن ئاواڵەکانیا رۆیی. ئەگەرچی رێنوێنەکەیان گوتبووی هەر برگەیەی دە پلیکانە، هاوڕێیان‌کاتی وەسەر کەوتن بە هەڵپە قسەیان دەکرد و جار و بار لاقیان لەپلیکانەکان دەگیرا، دەتگوت هاتوونە سەیران و تەماشای ئەم شوێنە. سەگە بێ چرپە وەدوایان کەوتبوو، دەتگوت ئەوە کاری هەموورۆژییەتی. کچەی چاویلکەیی لە سەر پێگۆڕکەوە بەرەخوار دەیڕوانی،کاتێک کەسێک لە پلیکانان سەر دەکەوێ هەر دەبێ وا بێ، ئەگەر غەوارەبێ دەڕوانین هەتا بیناسین و ئەگەر دۆستیش بێ بەخێر هاتنی دەکەین،بەڵام ئێستا

پێویست بە چاو نەبوو هەتا بزانێ کێن دێن. فەرموون،فەرموون ماڵە خۆتانە. پیرێژنی نهۆمی یەکەم لە بەر دەرگای خۆیەوەهەستی راگرتبوو، لە دڵی خۆیا گوتی ئەوەش یەکێک لەو تاقمانەیە کە بۆخەوتن هاتووە، دیارە لەم بابەتەشەوە هەڵەی نەدەکرد، پرسی کێیە، کچەلە سەرەوەڕا وڵامی دایەوە ئاشناکانی منن، پیرێژن سەری سوڕما، ئەوکچە چۆن توانیویەتی خۆ بگەیەنێتە سەر پێگۆڕکە، پاشان بە زەیندا هاتو تەواو لە خۆی تووڕە بوو کە بۆچی کلیلەکانی لە سەر دەرگاجێ‌هێشتبوو، دەتگوت خەریکە مافی خاوەنایەتی ساختومانەکەی چەندمانگێکە تەنیا هی ئەو بوو لە دەستی دەردەچوو. بۆ قەرەبوو کردنەوەی‌ئەم ئاستەنگە تاڵ و چاوەڕوان نەکراوە چی پێ‌نەدەکرا غەیری ئەوەی‌سەر هەڵێنێ و هەرا کا و بڵێ لە بیرت نەچێتەوە کە گوتت خواردنت بۆدێنم، پێ لە بەڵێنی خۆت نەنێی. بەڵام ژنە و کچە هیچیان وڵامیان‌نەدایەوە، چونکە یەکیان خەریکی رێنوێنیی تازە هاتووەکان بوو و ئەوی‌تر سەرقاڵی بەخێرهێنایان، بە قەڵسی قیژاندی گوێتان لێ‌بوو چیم گوت،دیارە ئەو کارەی زۆر هەڵە بوو، چونکە دروست لەو وەختەدا سەگە بەپەنایا تێدەپەڕی، بە رقەوە شاڵاوی بۆ برد و دەستی کرد بە وەڕین،حەپەحەپی لە تەواوی کەلێن و قوژبناندا دەنگی دایەوە، ئەوە هەر زۆرباش بوو، چونکە پیرێژن لە تاوان زیڕاندی و خێرا خۆی بە ژوورێداکردەوە و دەرگای بە توندی پێوەدا. پیرەپیاو پرسی ئەم جندۆکە پیرەکێیە، ئەوەش لەو قسانەیە وەختێک خۆمان وەبەر چاو نایا لە زارماندەردەپەڕێ، ئەگەر ئەویش تامی تاڵی و سوێری ژیانی پیرێژنی چێشتباپێمان ناخۆش نەبوو بزانین بەرزی ئاکار و وتەی هەتا کوێی خۆ دەگرت.

جگە لەوەی لە توورەکەکانا هێنابوویان هیچ شتێکی دیکە لە گۆڕانەبوو، کە وایە دەبوو دەس پێوەبگرن، بەڵام بۆ رووناکایی بەخت‌سەرانسوێی کردن، هاوسەری چاوپزیشک شەمێکی دۆزییەوە کە دیارەبۆ کاتی دابڕانی کارەبا هەڵگیرابوو، دەستی دایە و بۆ خۆی هەڵکرد،ئەوانی تر پێویستیان نەبوو، چونکە رووناکی لە مێشکیانداەدرەوشایەوە، درەوشانەوەیەکی وەها کە کوێری کردبوون. ئەگەرچی‌بەشە خواردنی ئەو تاقمە کەم بوو، بەڵام دەتگوت میوانداریی‌یەکی گەرمو گوڕی خۆمانەیە، یەکێک لەو جێژنە بە هەڵکەوتانەی کە هەر کەس هەرچی هەیەتی ئی هەموانە. کچەی چاویلکەیی و ژنی دوکتۆر بەر لەوەی لەدەوری مێز دانیشن چوونە نهۆمی خوارەوە، چوون هەتا بەڵێنی خۆیان‌بەرنە سەر، رەنگە باشتر وا بێ بڵێین چوون ئەمەگداری بکەن و بە دانی‌خواردن بارانەی هاتوچۆ بدەن. پیرێژن بە تووڕەیی و رووگرژی وبۆڵەبۆڵ بە پیریانەوە هات، خودا روحمی کردبوو کە ئەو سەگە بەدفەڕەو نجڕ

ونجڕی نەکردبوو، بە تەوسەوە گوتی دەبێ خواردنتان زۆری‌زیاد هێنابێ کە دەتوانن وەها زیندەوەرێک تێر کەن، دەتگوت بەم راوێژەتاوانبارکارانە دەیهەویست ویژدانی دوو کەسەکە بخاتە عەزابەوە و لەراستیدا تێیانبگەیەنێت ئەوە بە پێچەوانەی مرۆڤایەتییە کە پیرێژنێک لەبرسان بمرێ و داعبایەکی بەدفەڕ هەتا ملان سەولەی چەور تێئاخنێ. بەڵام دوو ژنە بۆ هێنانی خواردنی زیاتر نەچوونەوە سەر، زۆر بەدڵاوایی بەشیان هێنابوو، بە تایبەتی ئەگەر بار و دۆخی تاڵ و دژواری‌ژیانی ئەمڕۆ بێنینە بەرچاو، جێی سەرسوڕمانە کە پیرە هەل و مەرجی‌باش هەڵسەنگاند، ئاخرییەکەی دەرکەوت کە دڵی لە زمانی چاکترە،چونکە چوویەوە ژوور و بە کلیلێکەوە گەڕایەوە و بە کچەی گوت بگرەئەوەش ئی دەرگای پشتەوەیە، کلیلی تۆیە، بەڵام دەتگوت ئەوەندەی زۆربەلاوە کەم بوو، هەر بۆیە کاتێک دەرگای پێوەدا لە ژێر لێوەوە گوتی زۆرسپاس. دوو ژنە بە سەرسوڕماوی گەڕانەوە، وادیارە ئەو رمۆزنە پیرەسێحربازەش هەستی هەبوو، کچەی چاویلکەیی بێ ئەوەی قسەکەی بجوێ گوتی ئادەمیزادێکی خراپ نیە، ئەوەندە تەنیا بووە مێشکی‌شێواوە. هاوسەری چاوپزیشک وڵامی نەداوە، تەمای گرتبوووتوویژەکە هەڵگرێ بۆ دوایە، وەختێک هەموو تێخزان و هێندێک‌خەویان لێ‌کەوت، دوو ژنەکە وەکوو دایک و کچ لە ئاشپەزخانەرۆنیشتبوون و بۆ جێ‌بەجێ کردنی کارەکانی دیکەی نێومال هێزیان‌دێناوە بەرخۆیان، هاوسەری دوکتۆر پرسی دەی ئێستا دەتهەوێ چبکەی، هیچ ناکەم، هەر لێرە دەبم هەتا دایک و بابم دەگەڕێنەوە، جا کوێرو تەنیا، لەگەڵ کوێری راهاتووم، لەگەڵ تەنیایی چۆن، دەبێ پێی رابێم،پیرێژنی نهۆمی خوارەوەش تەنیایە، خۆ تۆ ناتهەوێ وەک ئەوت لێ‌بێت وزگت بە کەلەم و گۆشتی کاڵ تێر کەی، وا دیارە کەس لە ساختومانەکانی‌ئەو گەڕەکەدا ناژی، دەمێننەوە ئێوە کە لە ترسی تەواو بوونی خۆراک‌یەکتر دەبوغزێنن، هەر لاسک و گەڵایەکی لێ‌بکرێتەوە بە مانای ئەوەیەپاروو لە زارای ئەوی دیکە بگیرێتەوە، تۆ خۆ ئەو پیرێژنە چارەڕەشەت‌نەدیت، تەنیا بۆگەنیوی ماڵەکەییت بۆ هات، دڵنیا بە کە تەنانەت ئەوشوێنەی پێشووشمان ئەوەندە پیس و ناخۆش نەبوو، درەنگ یا زووهەموو وامان بە سەر دێت. پاشان ئیدی بنەبانی ژیانە و کاتی‌ئاویلکەدانە، بەڵام هەتا ماوین دەبێ بژین، گوێ بگرە، ئێوە گەلێ لە من‌زاناترن، من لە بەرامبەر ئێوەدا تەنیا کچێکی نەزانم، بەڵام بە بڕوای من‌ئێمە هەر لە ئێستاشەوە مردووین، چونکە مردووین کوێرین، ئاکام‌یەکێکە، من کە هێشتا دەبینم، خۆزگە بە خۆت، خۆزگە بە مێردەکەت،خۆزگە بە حاڵی من و ئەوانی دی، بەڵام خۆ نازانی ئەو بینایی‌یە هەتاکەنگێ خۆ دەگرێ، بێتوو کوێر بی وەک هەموومانت

لیٚ دیٚت،چارەنووسی هاوسێی خوارەوە چاوەڕێمانە، قسە لە ئەورۆیە، کاری‌سبەی بۆ سبەی، مـن ئەورۆ بەرپرسم، سبەی کە کوێر بووم ئیتر نیم،مەبەستت لـە بـەرپرس بـوون چیـە، بەرپرسـایەتی چاوساخی لە نێوکوێراندا، خۆ تۆ ناتوانی ببی بە کوێرکێشی تەواوی کوێرەکـانی دنیـا وزگیـان تێرکەی، دەبێ بتوانم، بەڵام ناتوانی، ئەوەی لە دەستم بێ دەیکەم،راستە دەیکەی، ئەگـەر ئێـوە نەبووبان من ئێستە مردبووم، ئێستاش‌نامهەوێ بمری، دەبـێ لێـرە بمێنمـەوە، ئـەوە ئـەرکی منـە، دەمهـەوێ ئەگـەردایک و بـابم هاتنـەوە لێـرە بم، خـۆت گوتـت ئەگـەر هاتنـەوە، کـە وایەرێگایـەکمان نیـە جگـە لـەوەی بـزانین دایـک و باوکـت سـەر و سـۆراغیان‌مـاوە، جـوان تێنەگەیشتم مەبەستت چیە، تۆ خۆت گوتت هاوسێی‌خوارەوە لە دەروونـدا ئـادەمیزادێکی باشـە، ژنـەی چـارەڕەش، دایـک وباوکـت سـیاچارە، خـۆت سـیاچارە، کاتێـک بـە چـاو و هەسـتی کوێرەوەبگەنە یەکتر، ئەو هەست و خۆشەویستییەی پێیەوە دەژیاین و شێوەی‌تایبەتی ژیـانی بـۆ پێک دێناین پێوەندیی بەو چاوانەوە هـەبوو کـە پێیانەوەلـە دایـک بـووین، ئێستا کـە ئـەوانیش نەماون و هەتەریان لێبڕاوە نازانین‌چۆن و چ دەبێ، خۆت گوتـت چونکـە کـوێرین مـردووین، نازانم تیگەیشتی‌یان نا، ئێوە مێردەکەتان خۆش دەوێ، بەڵێ بە قەدرایە خۆم، بەڵام ئەگـەرکوێر بم، ئەگەر پاش کوێر بوون ئەو کەسەی پێشـوو نـەبم، چلـۆن‌دیسـانیش دەتـوانم خۆشـم بـوێ، بەکام ئەوین، پێشتر، بەر لە کوێر بوونی‌ئێمەش ئادەمیزادی کوێر هەبوون، بە نیسبەت زۆر کـەم بوو،ئیحساساتی زاڵی سەردەم ئـی مرۆڤـی بینـا بـوو، هـەر بۆیـە کوێرەکـانیش‌هەسـتیان وەسـەر هەستی زۆرینە گەڕابوو، هەستی خۆیان خۆی‌نەدەنواند، بێ‌گومان ئێستا ئـەوانیش هەسـتیان خـۆ دەنوێنـێ و ئـەوە جـاریٚ‌سـەرەتای کـارە، هێشـتاش بـە یـاد و بـیرەوەری ئـەوەی هەسـتمان پێ‌دەکرددەژین، بۆ تێگەیشتن لە ژیانی ئەورۆ چاو پێویست ناکا، ئەگەر کەسێک‌رۆژێ بە منی گوتبا دەبمە پیاوکوژ، بە سووکایەتیم دادەنا، بەڵام من‌ئێسـتا ئینسـانم کوشـتووە، دەی کـە وایـە دەتهەوێ من چ بکەم، لەگەڵ من‌وەرە، وەرە بچینە ماڵی ئێمـە، ئـەدی ئـەوانی دیکـە چیـان بـە سەر دێت،ئەوانیش با بێن، بەڵام من زیاتر لە بیری تۆ دام، ئاخر بـۆچی، منـیش ئەوپرسـیارەم لـە خۆم کرد، رەنگە بۆیە بێ کە تۆ ئێستا لە جێی خوشکمی،رەنگە لەبەر ئەوە بێ کە دەستەملانی مێردەکـەم بـووی و ئۆخژنـت‌خسـتۆتە دەروونی، تکایـە بمبـوورە، ئـەوە جینایـەت نیـە کـە لێبووردنی‌بویٚ، ئاخر ئێمە وەک ملـۆزم خوێنتـان دەمـژین، کاتێـک چاویشـمان دەیـدیت‌ئـەم ملۆزمانە زۆر بوون، خوێن دەبێ جگـە لـە زینـدوو راگـرتنی ئەولەشـەی تێیـدا دێـت و دەچـێ کەلکی تریشی هەبێت، ئێستە وا باشترە بخەوین، چونکە سبەی رۆژیکی دیکەیە.

باشە بەڕاستی ڕۆژێکی تر بوو یان هەر ئەو ڕۆژە. کوڕە خێلە کەهەستا لەخەو دەیهەویست بچێتە ئاودەست، زگی دەچوو، ڕەنگە پاش ئەم هەموە برسێتییە خواردنەکەی پێنەکەوتبێ، بەڵام هەر لە ڕێوە ڕوونبۆوە کە ناکرێ کەس بچێتە ئاودەست، پیرێژنی نەهۆمی خوارەوەئەوەندەی ئاودەستەکانی ساختومانەکە پیس کردبوو کە هیچیان کاریانتێدا مەیسەل نەدەکرا، شەوی رابردوو لە رووی هەڵکەوتێکی دەگمەنکەس نەیویست بەر لە خەوتن سەراوێ بکا، دەنا یەکێک لەم حەوتکەسە دەیزانی ئاودەستەکان چۆن بێزی ئینسان هەڵدەستێنن. بەڵامئێستا هەموو کاری پێشاویان هەبوو، بە تایبەت کوڕەی چارەڕەش کەئیتر خۆی بۆ رانەدەگیرا، لە راستیدا هەر چەندەش بمانهەوێ خۆمان لەحەقیقەتە تاڵەکانی ژیان بپارێزین، دیسانیش ناتوانین لەبەر چاویاننەگرین، وەختێک میزاج دروست کار بکا، بیری مرۆڤیش دروست کاردەکا و بۆ وێنە دەکرێ باسی ئەو مەبەستە بکەین کە داخوا پەیوەندییڕاستەوخۆ لە نێوان هەست و چاوا هەیە یان نا، یا بڵێی هەست بەبەرپرسایەتی کردن ئاکامی سروشتیی چاوی روون بێ یان نەخێر، بەڵاملەم پەرێشانحاڵی و چەرمەسەری و ئێش و ئۆفەدایە کە لایەن ورووکاری سرشتی حەیوانیمان جوان دەردەکەوێ. هاوسەریچاوپزیشک بە دەنگی بەرز گوتی باخچە، دیارە باشترین فکر بوو، ئەگەربوومەلێڵی بەیانی نەبوایە ئێستا جیرانی نهۆمی خوارەوەمان لەوێندەرێدەبینی، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە ئیتر وەک رابردوو بە پیرێژنی رەق و رووت ناوی نەبەین، بەڵێ هەر وەک گوتمان ئێستا لە باخچە و لە نێومریشکاندا بە هەڵترووشکاوی خۆی دەنواند، ئێستا بێتوو کەسێک لەمبابەتەوە شتێ بپرسێ بێ ئەملا و ئەولا نازانێ سەر و پۆتراکی مامرەکانچۆنە. کوڕە خێلە بە زۆری خۆی پێڕاگیرابوو، دیارە ژنی دوکتۆریشچاوەدێری دەکرد، بە خوارەکە و پێچەکە لە پلیکانان سەرەوخوار بوو،بەڵام بۆ چارەڕەشییان کە گەیشتە پلیکانی ئاخر پزووی دواوەی خۆیپێڕانەگیرا، کە وایە دەتوانن دیمەنی ئاکامی زگ چوون و داوودەلینگیبێننە بەرچاو. لەو بگەرە و بەردە دا پێنج کەسەکەی تر کە بە کوێرەوەریلە پلیکانەکانی دەرباز بوونەوە، کە ناوێکی یەگجار بە جێیە، دەچوونەخوار، ئەگەر پاش ژیانی نێو قەرەنتینە هەتا هێشتاش شەرم و حەیایەکمابوو، دەبوو ئێستا فەرامۆش کرابایە. تاقمەکە لێک بڵاو بوو و هەرکەس لەجێوە قەوەتی دەکرد و دەینەقاند، دیارە پاشماوەی شەرمیبێهوودە ئازاری دەدان، تەنانەت خێزانی دوکتۆر بە دیتنی ئەو دیمەنەکوڵی گریانی هەستا و لە جیاتی هەموویان گریا، چونکە ئەوان تازە بەرواڵەت نەیاندەتوانی بگرین، مێردەکەی، کوێرەپیاو و خێزانی، کچەیچاویلکەیی، پیرەپیاو و کوڕەی

دەدیت کە لە سەر شینکە و لە نێو لاسکی گریّ گریّی کەلەمان هەڵترووشکاون و مامرەکان تەماشایان دەکەن،سەگی ئەسرین لیسەوەش هاتبوو هەتا لە هیچیان کەم نەبێ. ئەوەندەی بۆیان دەکرا بە قولێک گیا و کەلووکە خشتێکی کە دەستیان لیی بەنددەبوو خۆیان خاوێن دەکردەوە، جاری وا بوو هەوڵیان بۆ پاراستنی پاک وخاوێنی کارەکەی دزێوتر دەکرد. لە پلیکانەکانی دەرباز بوونەوە بەبێدەنگی هەڵکشانەوە، سەر و سۆراغی هاوسێی خوارەوە پەیدا نەبوولێیان بپرسێ کێن و لە کوێوە هاتوون و بەرەو کوێ دەچن، رەنگە پاش ئەم شێوە هێشتا خەوتبێ، کە گەیشتنەوە ژوور، دەمیان وەک تەڵەیتەقیو وا بوو، نەیاندەزانی بڵێن چی، پاشان کچەی چاویلکەیی گوتی خۆناکرێ هەر وا بمێننەوە، بەڵام خۆ ئاو نەبوو خۆیان بشۆرن، بە داخەوەکە ئەورۆ وەک دوێنێ باران بەرێژەو نابارێ ئەگینا دیسانیش دەچوونەوە باخچەکە و ئەمجار رووت و قووت و بێشەرم و شکوا سەرو لەشیان ئەسپاردەی بارانی ئاسمانی دڵاوا دەکرد، تێکڕا هەستیان بەلووزەوی ئاوێ دەکرد کە سەر تاپا خوار دەیخووساندن و چەپەڵیی لێدادەماڵین، دەیانتوانی لوێچ بگرنەوە و ئاوی خاوێن بۆ شکاندنی توونیایەتی کەسێک فەرموو کەن، فەرقی نەدەکرد کێ بێ، رەنگە لێویانبەر لەوەی گەیشتبایە ئاو بە نەرمی پێستی یەکی تری ئەنگاوتبا وئەوەندە تینوو بوون کە بە تامەزرۆیی هەتا دڵۆپی ئاخریان لەم پیاڵەیەدەنۆشی و بەم جۆرە کێ دەزانێ کە توونیایەتی کەسێکی تریاندەبزاوت. هەر وەک پێشتر دیتمان ئەوەی سەر لە کچەی چاویلکەییدەشێوێنێ وزەی بیر و خەیاڵە، بەڵام لە هەل و مەرجێکی تاڵ و غەریب وخەمباری هیوابڕاوا وزەی بیر و خەیاڵ بە کاری چ دێن. سەرەڕایتەواوی ئەمانەش هەستی کارامەیی خۆی نەدۆڕاند و بەڵگەشمان ئەوەیەکە دۆلابەی وەتاغی خۆی و دایک و باوکی کردەوە و چەند مەلافە وخاولی دەرکێشا و گوتی وا باشترە بە وانە خۆمان خاوێن کەینەوە، ئەوەچاترە لە هیچ، بێگومان فکرێکی باش بوو، کە دانیشتنە سەر سفرەیبەرچایی هەستێکی تر بە دەروونیاندا گەڕابوو.

لە دەوری مێزەکە کۆزیلکەیان دابوو کە هاوسەری چاوپزیشک بیر ورای خۆی بۆ باس کردن. ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە تەما بگرین بۆداهاتوو دەبێ چ بکەین، دڵنیام کە هەموو کەس موقرایی داهاتووە و منبە دیتنی خەڵک و جووڵە و کردەوەیان بەو ئاکامە گەیشتووم، ئاو نیە،کارەبا نیە، خواردن نیە، ئاڵۆزی و پاشاگەردانییە، وڵات بێسەرەوبەرەیە. کوێرەپیاو گوتی خۆ دەبێ دەوڵەت هەبێ، زۆریش دڵنیانیم، بەڵام ئەگەریش هەبێت دەسەڵاتی کوێر بە سەر کوێردایە، یانینەبوون دەیهەوێ ئاگاداری لە نەبوون بکا، پیرەپیاو گوتی کە

وایەداهاتوویەک چاوەڕوان ناکرێ، نازانم داهاتوو هەیە یان نا، گرینگ‌ئەوەیە ئێستا چۆن خۆمان لە مەرگ رزگار کەین، ئێستا بە بێ داهاتووبەکار نایە، هەر وەک نەبوو وایە، رەنگە ئادەمیزاد بتوانێ بە بێ‌چاو بژی،بەڵام ئیتر لە مرۆڤایەتی دوور دەکەوێتەوە، ئاکام روون و ئاشکرایە،کامەمان خۆمان هەر بەو کەسە دەزانین کە لە پێشا بووین، بۆ وێنە من‌پیاوێکم کوشتووە، کوێرەپیاو هەڵبەزییەوە و پرسی تۆ پیاوێکت‌کوشتووە، بەڵێ، ئەو کەسەی کەڵەگایی لێ‌دەکردین و سەرکردەی لات ولووتەکان بوو من کوشتم و ئەوکیم بە دمی مقەست هەڵبڕی، کچەی‌چاویلکەیی گوتی تۆ بە تۆڵەی من ئەوت کوشت، تەنیا ژنە کە دەتوانی‌تۆڵەی ژنەکانی تر وەرگرێتەوە و بێتوو تۆڵە بەجێ بێ کارێکی ئینسانییە،ئەگەر مەزلووم حەقێکی لە ئەستۆی تاوانبار نەبێ دەکرێ بڵێین‌دادپەروەریش هەر نەبووە و نیە، ژنی کوێرەپیاو گوتی مرۆڤایەتیش‌هەروا‌تر، هاوسەری چاوپزیشک گوتی با بێینەوە سەر باسەکەی‌خۆمان، بێتوو پێکەوە بین رەنگە نەمرین، ئەگەر لێک‌هەڵبڕێین لەگەڵ‌ئەوانی دیکەدا تێدا دەچین، چاوپزیشک گوتی گێڕاتەوە کە تاقمی‌رێک‌وپێکی کوێرانت دیوە، ئەوە مانای وایە کە شێوەی ژیانی نوێ بەدی‌هاتووە، کە وایە بەڵگەیەک بە دەستەوە نیە کە بە پێی بۆچوونی تۆ ئێمەتێدا بچین، نازانم چەندە رێک‌وپێکن، تەنیا دەبینم بە شوێن خورد وخۆراک و پەنا و پەسیوا دەخولێنەوە، هەر ئەوە و بەس، پیرەپیاو گوتی‌ئێمە گەڕاوینەوە سەرەتای سەردەمی ژیانی بەکۆمەڵ، بەم جیاوازییەوەکە ئیتر چەند هەزار ژن و پیاو نین لە نێو سروشتی بێ سنوور و دەق نەشکاوا، بەڵکوو هەزاران میلیۆن ئادەمیزادین لە دنیایەکی لە پێ پەڕیوی‌تێماوا، هاوسەری چاوپزیشک زیادی کرد، هەروەها گردەنشین، ئەگەروەدەست هێنانی ئاو و نان دژوارتر بێ ئەو تاقم و دەستانەش‌لێک‌هەڵدەوەشێن و پەرەم پەرەم دەبن، هەر کەس پێی وادەبێ کە بەتەنیایی زیاتر دەتوانێ درێژە بە ژیان بدا و پێویست ناکا هیچ لەگەڵ کەس‌دابەش کا، هەر چی پەیدای کا ئی خۆیەتی و بەس، کوێرەپیاو وەبیری‌هێنایەوە ئەو تاقمانەی دەخولێنەوە دەبێ سەر دەستەیەکیان هەبێ کەکارەکان بەڕێوە بەرێ و دەستووران بدا، رەنگە، بەڵام ئەویش هەر وەک‌ئەوانی دیکە کوێرە، کچەی چاویلکەیی گوتی خۆ ئێوە کوێر نین، هەربۆیە دەکرێ دەستووریشمان پێ‌بدەی و کارەکانیش بە جوانی رێک‌وپێک‌بکەی، من دەستوور نادەم، هەتا ئەو جێیەی بۆم دەکرێ بە کارەکان‌رادەگەم، من تەنیا ئەو چاوانەم کە ئیتر ئێوە نیتانە، پیرەپیاو گوتی‌جۆرێک رێبەری سروشتیی، پاشایەکی بینا لە وڵاتی کوێران، کە وایەئێزن بدەن هەتا چاوم هەیە رێنوێنتان بم، پێشنیارم ئەوەیە

لێکدانەبڕێین و هەر وا پێکەوە بین، کچەی چاویلکەیی وتی دەتوانین هەر لێرەبمێنینەوە، نا، ماڵی ئێمە گەورەترە، ژنی کوێرەپیاو وەبیری هێنایەوەهەڵبەت ئەگەر داگیر نەکرابێ، دەچین و دەیبینین و ئەگەر هاتوو داگیرکرابوو دەگەڕێینەوە ئێرە یا دەچین و چاوێک لە ماڵی ئێوە دەکەین ورووی کردە پیرەپیاو یا ماڵی ئێوە، پیرە گوتی من ماڵی خۆم نیە، تەنیا لەژوورێکا دەژیام، کچە پرسی خزم و کەسێکت نیە، نەخێر تەواو رەبەن وبێکەسم، ئەگەر دایک و بابم نەگەڕێنەوە منیش وەک تۆ وام. کوڕێژگەیخێل گوتی من لە لات دەمێنمەوە، بەڵام زیادی نەکرد بڵێ مەگین دایکموەدی بێ، ئەو مەرجەی دانەنا، ئاکاری سەیر بوو، رەنگە هێندەش سەیرنەبووبێ، کوڕ و کاڵ زۆر زوو لەگەڵ هەموو هەل و مەرجێک دەسازێن وژیانیان بە گشتیی لەبەر چاوە. خێزانی چاوپزیشک پرسی بڕوات چیە،کچە گوتی منیش لەگەڵ ئێوە دێم، تەنیا تکام ئەوەیە حەوتەی جارێکبمهێنەوە ماڵ، بەڵکوو دایک و بابم بگەڕێنەوە، کلیلەکان دەدەی بەجیرانەکەی خوارەوە، بەڵێ چارە چیە، تازە زیاتر لەوەی بردوویەتینایبا، رەنگە دەس لە هێندێک شتومەکی نێوماڵ وەربدا، بەڵام ئێستا کەمن گەڕاومەوە رەنگە وا نەکا، کوێرەپیاو گوتی ئێمەش لەگەڵتان دێین،ئەگەرچی پێشمان خۆشە هەر چی زووتر بە بەر ماڵە خۆماندا رابرین وبزانین چ خەبەرە، زۆر باشە، بەلای ماڵی منا رابردن بێفایدەیە، چونکەوەک گوتم تەنیا ژوورێکم هەیە. باشە بەڵام خۆ لەگەڵ ئێمەدا دێی، بەڵێ،بە مەرجێک، لە نیگای یەکەمدا رەنگە زۆر شەرم بێ کەسێکی چاکەیلەگەڵ دەکەی هەل و مەرج دابنێ بۆ قبووڵ کردنی، بەڵام هێندێک لەپیرەکان ئاوان، ئەوەندە عومرە کورتەی ماویانە لەژێر رووبەندی باییبوونا تێپەڕی دەکەن، دوکتۆر پرسی چ مەرجێک، هەر کات لە سەرتانبوومە بارگرانی پێم بڵێن و ئەگەر لەبەر خاتری دۆستایەتی یان بەزەییدانەتانگوت هیوادارم ئەوەندەم تێگەیشتن هەبێ چ پێویستە بیکەم، کچەیچاویلکەیی پرسی دەتهەوێ چ بکەی، زۆرم پێخۆشە بزانم، دووره پەرێزدەبم، خۆم شرت و گوم دەکەم، سورم ون دەبێ، هەر ئەو کارەیفیلەکان دەیکەن، بیستوومە ئێستا وەزع گۆڕاوە، ئەو جانەوەرانە ئێترناگەنە تەمەنی پیری، ئاخر خۆ تۆ فیل نی، بە مانای تەواویش ئادەمیزادنیم. کچەی چاویلکەیی گوتی بە تایبەتی کاتێک وڵامی منداڵانە دەدەیەوە،لێرەدا وتوویژەکە ئاوا بڕایەوە.

ئێستا توورەکەکان سووکترن لەو دەمەی هێنایانن بۆ ئێرە، سەیرنیە، پیرێژنی نهۆمی یەکەمیش لێی خواردوون، دوو جاری خواردووە،جاری یەکەم دوێ شەو و جاری دووهەم ئەمڕۆ کە کلیلەکانیان هەتاگەڕانەوەی خاوەن ماڵەکان پێ ئەسپارد، دەیانهەویست

سرنجیرابکشێن و دڵی وەدەس بێنن، چونکە ئیدی ئێستا لە بارەکەی دەزانین،ئەوجار خۆ سەگیش سەولەی دەوێ، دەبێ ئینسان زۆر دڵڕەق بێ کە لەبەرابەر نیگای پڕ ویست و پاڕانەوەیدا بتوانێ خۆی گێل بکا، جا ئێستا کەباسی سەگە کرا با بزانین چۆتە کوێ، لە ئاپارتمانەکەدا نیە، خۆ لەدەرگاش دەرنەکەوتووە، تەنیا دەتوانێ لە باخچۆڵەی پشتەوە بێ،هاوسەری چاوپزیشک رۆیی هەتا چاوێک بگێڕێ، لە راستیدابۆچوونەکەی وا بوو، سەگە خەریک بوو مامرێکی هەڵدەدڕی، وەهایئامباز بوو کە مریشکە پێی نەزانی، بەڵام ئەگەر پیرێژنی نهۆمی یەکەمچاوی هەتەری کردبا و مامرەکانی ژماردبا، نەماندەزانی لە حەیفان چیلە کلیلەکان دەکرد، سەگەش کە هەم لە کردەوەی چەپەڵی خۆی ئاگادارببوو و هەمیش دەیبینی ئەو کەسەی پاریزگاریی لێدەکا خەریکە لێیدوور دەکەوێتەوە تەنیا تاوێک راما و پاشان بە پەلە دەستی کرد بەهەڵکۆڵینی زەوی نەرمی ژێر پێی، جا بەر لەوەی سەروسەکوتی پیرێژنینهۆمی یەکەم لە سەر پلیکانەکانی دەرباز بوون وەدیار کەوێ و بۆن بکا،کەلاکە مریشک شاراوەتەوە، خوێنرێژیی دیزە بە دەرخۆنە کراوە وپەشیمانیی حەواڵەی هەلێکی تر کرا. سەگە لە پلیکانەکان وەسەر کەوت،چەشنی شنەی شەماڵ بە پەنا داوێنی پیرێژنا تێپەڕی، پیرە نەیدەزانی چمەترسییەک لە تەنیشتییەوە تێپەڕیوە. سپلۆت لە پاڵ دەستی خێزانیدوکتۆر جێی خۆش کرد و ئەم سەرکەوتنەی وەک مزگێنی بۆ ئاسمانگێڕایەوە. جیرانی نهۆمی یەکەم کە وەڕینی بە هەڵپەی سەگەی گوێلێبوو، لە بابەت پاشەکەوتی خورد و خۆراکییەوە کەوتە دڵەڕاوکە،بەڵام هەر وەک دەزانین تازە کار لە کار ترازابوو، ملی هەڵێنا و رووبەرەو سەر گوتی وریا بن ئەو سەگە مامرم لێنەخوا، ژنی دوکتۆر گوتینیگەران مەبە، تێرە، تازە سەولەی خواردووە، ئێمەش هەر ئێستادەڕۆین، پیرێژن دووپاتی کردەوە هەر ئێستا، دەنگی شکایەوە، دەتگوتژانێک ئاوێتەی وتەی بوو، دەتگوت دەیهەویست قسەکەی جۆرێکی ترلێکدەنەوە، بۆ وێنە دەتانهەوێ من لێرە بە تەنیا بەجێ بێڵن و بڕۆن،بەڵام ئیتر متەقی نەکرد و پرسیارەکەی بێ وەڵام مایەوە، دڵڕەقانیشپەژارەی تایبەت بە خۆیان هەیە، دڵی ئەو ژنە جۆرێک بوو ماوەیەکدواتر کە ئەو ئەمەگنەناسانەی ئیزنی دابوون بە ماڵەکەیا تێپەڕن هاتنبۆ ماڵاوایی دەرگای لێنەکردنەوە. دەنگی دەبیستن کە لە پلیکانانەدەچوونە خوار و پێکەوە دەدوان و دەیانگوت وریا بە نەکەوی، دەستتبنێ بان شانم، دەسگیرەکە بگرە، هەر قسەی ئاسایی لەم چەشنە کەئێستا لە دنیای کوێراندا ببوو بە باو، ئەوەی سەرسوڕماوی کرد دەنگییەکێک لە ژنەکان بوو کە دەیگوت ئێرە زۆر تاریکە و هیچ شتێکنابیندرێ، هەر ئەوەندەی کە نابینایی

ئەم ژنە سپی نەبوو خود بە خودجێی سەرسوڕمان بوو، زۆر لە خۆی نووسا و بیری کردەوە کە شتێکی‌لێ حاڵی بێ بەڵام بیری کورتی چی بۆ نەدەکرا، چی وای نەکێشا کە بەخۆی گوت بێ‌گومان بە پێچەوانە حاڵی بووم. هاوسەری چاوپزیشک لەخەیابان وەبیری هاتەوە کە چی گوتووە، دەبێ وریای زمانی بێ،دەیتوانی وەکوو کەسێکی چاوی هەیە بە ڕێدا بڕوا، بەڵام بە خۆی گوت‌دەبێ قسەکانم وەکوو قسەی مرۆڤی کوێر بێ.

هاوڕێیانی کە لە پیادەڕێ کۆزیلەکەیان دابوو کردە دوو ریزی سێ‌کەسی، لە ریزی یەکەما شووەکەی، کوڕە خێلە و کچەی چاویلکەیی بەدوای یەکا جەللە بوون، ریزی دووهەم پیرەپیاو، خێزانی کوێرەپیاو ومێردەکەی دەستیان تێک‌گرت. دەیهەویست لە نیزیکەوە چاوی بە سەرهەموانەوە بێت و لێک‌دانەبڕێن، ئەوەندە بەس بوو لەگەڵ تاقمێکی‌گەورەتر یان دەس‌بزێوترا بەرەو روو بن، ئەو دەم وەک ئەمە دەچوولۆتکەیەکی بچووکی با ئاژۆ بە هەڵکەوت لە دەریادا بێتە سەر رەوگەی‌پاپۆرێکی گەورەی هەڵماژۆ و ببێ بە دوو کوتەوە، دیارە لە ئاکامی وەهارووداوێک ئاگادارین، لۆتکە شکان، کارەسات، خنکان، قیژە و هاواری‌یارمەتی خوازتنی بێهوودە لە دەشتی بێ‌سنووری ئاوا، پاپۆڕی هەڵماژۆبێ ئەوەی هەر ئاگا بکا شەپۆلان دەبڕێ و دەڕوا، سەرەنجامی تاقمەکەی‌ئاوای لێ‌دەهات، کوێرێک لێرە و یەک لەوێ دەبوونە تۆوی هەرزن لە نێوکوێرانی چەواشەی شپرێو و پەرێشا کە چەشنی شەپۆلی دەریا نەدەسەکنن و نە دەزانن کوێوە دەچن، لێرەدا هاوسەری چاوپزیشکیش‌نازانێ لە پێشدا بگاتە هانای کامیان، قۆڵی مێردەکەی بگرێ یا دەستی‌کوڕەخێلە، کچەی چاویلکەیی و دووەکەی تر بەرەڵڵا بکا و لێ‌گەڕێ‌پیرەپیاو دوور کەوێتەوە و رێی گۆڕستانی فیلان بگرێتە بەر. ئێستا ئەوپەتەی کاتێک هەموو خەوتبوون لە تیتۆڵ و کوتە پەڕۆیان هۆندبوویەوەلە دەوری خۆی و ئەمان دەهاڵێنێ و دەڵێ بەمنەوە مەنووسێن، بەڵام بەچاکی دەس بە پەتەکەوە بگرن و بە هیچ جۆرێک بەری مەدەن، هەر چی‌دەبێ با ببێ. وریا بوون زۆر لێک نیزیک نەبنەوە و لاقیان تێک‌نەگیرێ،بەڵام پێویست بوو بزانن کەسێکیان لە پەنا دەستە و راستەوخۆلێک‌هەڵنەبڕێن، تەنیا یەکیان دڵەخورتەی ئەم شێوە رێ بڕینەی نەبوو،ئەویش کوڕە خێلە بوو کە لە نێوەڕاستا دەڕۆیی و لە هەموو لایەکەوەچاوەدێری لێ‌دەکرا. بە بیری هیچ‌کام لە دۆستانی ئێمەدا رانەبرد بپرسن‌داخۆ تاقمەکانی تر چلۆن بە رێدا دەڕۆن، داخوا ئەوانیش خۆیان‌تێک‌دەخەن و دەڕۆن، بەڵام بە پێی ئەوەی بینیومانە ولامەکەی هاسانە،بە گشتیی تاقمەکان، جگە لەو دەستەیەی بە هۆگەلی نادیاررێک‌وپێک‌ترن، لە درێژایی رۆژا وردە وردە

کەم و زۆر دەبن، چونکەهەمیشە کوێرێک ڕێی لێون دەبێ و هەڵدەبڕێ و یەکێکی دی بە هۆی کێشەرێکی نەناسراو بۆ لای تاقمەکە دەکێشرێ و ئەگەر تەبەکی پڕ بێرایدەگرن و ئەگینا لە خۆیانی دوور دەکەونەوە. پیرێژنی قاتی یەکەمپەنجەرەکەی بە ئارامی کردەوە، پێی خۆشە نیە کەس بزانێ ئەویش دڵیزوو پڕ دەبێ، بەڵام چ دەنگێک لە شەقامەوە نایە، ئیتر ئەوان ڕۆیشتوون،ئەو شوێنەی ڕەنگە بە هەڵکەوت کەسێک رووی تێبکا ئێرەیە، بەم پێیەپیرێژن دەبێ خۆشحاڵ بێ، چونکە پێویست ناکا. کەروێشک و مامرانلەگەڵ کەس دابەش بکا، دەبێ کەیفی ساز بێ، بەڵام نا دڵی پڕە، دوودڵۆپ فرمێسک سەرانسوێی چاوی کوێری دەکەن، بۆ یەکەم جار لەخۆی پرسیوە کە باشە بوون و نەبوونی بە کەلکی چ دێت. وڵامێکنادۆزێتەوە، وڵامیش هەمیشە بە جێ و ڕێ نایەنە سەر زمان و ئێستاتەنیا ڕێگای روون و ئاشکرا ئەوەیە چاوەڕوانی وڵام بین. دوو خەیابانئەولاتر هۆدەی پیرەپیاوی ڕەبەن لە سەر ڕێگایان هەڵکەوتبوو، بەڵامتەمایان گرتبوو لانەدەن، خواردەمەنی و پۆشەمەنی لێ گیر نەدەکەوت وخۆ نەشیاندەتوانی کتێب بخوێننەوە. شەقامەکان پڕن لەم کوێرانەی بەدوای خواردنا وێڵن، هات و چۆی دووکانەکان دەکەن و بە دەستی بەتاڵژوور دەکەون و زۆربەی جارانیش هەر وا دێنەوە دەر، پاشان پێکەوەدەکەونە باس و راوێژ کە داخوا وا باشتر نیە کە بۆ دۆزینەوەیخواردەمەنی بەرەو گەڕەکێکی تر ڕێ کەون، ئێستا گرینگترین،مەسەلەی رۆژ نەبوونی ئاو و گاز و شێو ساز کردن و مەترسییسووتمانە، جا گریمان کردم بزانین خوێ و رۆن و ئالات و زەردەچێوەلە کوێن، ئەگەر هەوڵ بدەین بە بیر هێنانەوەی بیرەوەری تام و بۆنیخواردنی رابردوو چەند جۆر شێو ساز بکەین، یا ئەگەر بڕێکمانسەوزی بە دەستەوە بێ و بتوانین سووری کەینەوە، هێندێک ئۆخژنماندێتەوەبەر، بۆ گۆشتیش هەرواتر، جگە لە مامر و کەرۆیشکی خۆماڵی،بێتوو کرابایە سەگ و پشیلەمان گرتبایە، دەمانتوانی ئەوانیش بکەینەچێشت و بیانخۆین، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەزموون مامۆستای ژیانە،تەنانەت ئەم زیندەوەرانەش کە پێشتر دەستەمۆ و ماڵیی بوون وایانلێهاتووە کە سەبارەت بە لاواندنەوە بکەونە دوودڵی و سڵە بکەن، ئێستائیتر بە کۆمەڵ دەچنە راو و بە تێکڕایی پارێزگاریی لە یەکتر دەکەن بۆئەوەی نەبنە نێچیر، جا سپاس بۆ خوا کە هێشتا چاویان بڕ دەکا و بۆبەرەو روو بوون لەگەڵ مەترسیی و وڵامی پەلامار تەیارترن. تەواویئەو هەل و مەرج و بەڵگانە ئێمە دەگەیەننە ئەو ئاکامە کە باشترینخۆراک بۆ مرۆڤ کۆنسێرو یان شووشەی زار بەستراوە، ئەویش نەکتەنیا لە بەر ئەوەی ساز کراون و بۆ خواردن ئامادن، بەڵکوو چونکەهەڵگرتنیان هاسانترە و هەمیشە حازر بەدەستن. راستە کە تەواوی

ئەمقوتووله و شووشه و بەسته جۆراوجۆرانه ڕێکەوتێکی دیاری کراویانبۆ خواردن له سەر نووسراوه و پاش ئەو ماوەیه خواردنیان پڕ زەرەد ومەترسییه بەڵام ئاوەزی گشتیی به پڕتاو پەندێکی خسته سەر زمانان کەبە لێکدانەوەیەک هیچ ولامێکی نیه و تۆزێک وەک ئەو پەندە دەچێ کەئێستا برەوێکی وای نەماوه و دەڵێ هەر چی لەبەر چاوانه، لەبەر دلانه،ئێستا ئەمه بۆتە بنێشته خۆشکه و دەیلێنەوه، ئەو چاوەی نابینێ گەدەیلە ئاسنه، جا هەر ڕەنگە بۆیە هەموو تڵەوتاڵ و زبلوزاڵێک بخۆن. هاوسەری چاوپزیشک کە سەرۆکی تاقمەکەیە ئەوەندە خواردنەی ماوەلەبەر خۆیەوە حیسابی دەکا، تەنانەت ئەگەر سەگەش دەرهاوێن ڕەنگەهەر بەشی ژەمێک بێ، وا باشه لێ گەڕێن سەگە مڵ و مۆیه بکا بەشیخۆی پەیدا کا، هەر وەک توانی پڕداته مامرەکه و سەری هەڵپسێنێ وجیکەی لێبڕێ. ڕەنگە له بیرتان مابێ کە ژنی دوکتۆر له ماڵەوە هێندێکی کۆنسێرو هەبوو، چما کەسێک ڕاماڵی نەدابێ بەشی ژن و مێردێک دەکا،بەڵام دەبێ زگی حەوتان تێر بێ، که وایه تەنانەت ئەگەر زۆریش قرنیسیبکا دیسانیش پاشەکەوتەکەی زوو تەواو دەبێ. سبەی یا دووسبەیدەبێ ڕوو بکاتەوە هەمارەکەی پێشوو، دەبێ تەما بگرێ کە داخواشووەکەی بەرێ یان تەنیا بچێ، یان ڕەنگە کوێرەپیاو بەرێت کە جحێڵ وبە گوڕترە، لێرەدا مەبەست خورد و خۆراکی زیاتر و چوست و چالاکییەلە کاتی گەڕانەوەدا. زبڵ و زاڵی شەقامەکان کە دەڵێی له دوێنێوە بۆتەدوو هێند، پیسایی ئادەمیزادان کە بە هۆی بارانی سەرەوژێر خەست وشل داچۆڕاوە، ئەو پیسایییەی ژن و پیاو هەر ئێستا له سەر ڕێی ئێمەهەڵیدەڕێژن، هەمووی ئەوانە بە تێکڕایی ولاتیان بۆگەنیو کردووە،چەشنی مژە کوێرەیەکی کە بە زەحمەت بتوانی لێی دەرکەوی. لەمەیدانێکی پڕ دار کە پەیکەرێکی له نێوەراستایە، پۆلە سەگێک جەنازەیپیاوێک لەتوکوت دەکەن. ڕەنگە هەر ماوەیەک بەر لە ئێستا مردبێ،کاتێک سەگەکان بە قەپاڵ ڕایدەوەشێنن و گۆشتی لەشی دەپچڕن،وادیارە هێشتا ئەندامی ویشک هەڵنەهاتووە. قالاوێک بێ نێوبڕ لەدەورەیان هەڵبەز هەڵبەز دەکا هەتا ئەویش لەم جێژنەدا بەشدار بێ. ژنیدوکتۆر ئاوڕی داوە، بەڵام تازە درەنگ ببوو، دڵی تێکهەڵات و چەندجارێک ڕشایەوە، دەتگوت پۆلە سەگێکی تر لەشی هێشتا زیندوویانوەبەر قەپ دابوو، ئێتر لێرە جووڵە ناکەم، دەمهەوێ هەر لێرە بمرم. مێردەکەی پرسی چ باسە، ئەوانی تر کە بە پەت تێکخرابوون لەپڕ هاتنەپێش، چ باسە، خواردن دڵی تێکەڵ داوی، ڕەنگە یەکیان کۆن بووبێ، دەنامن هیچ نارەحەت نیم، منیش هەرواتر، خۆزگە بە خۆیان کە تەنیا مرە وچەقەی سەگەل و قارقاڕی قالاوێکیان دەبیست کە سەگێک بێ ئەوەیبزانێ پڕی بە باڵیدا گرتبوو،

پاشان هاوسەری چاوپزیشک گوتی بمبوورن خۆم پێڕانەگیرا، لێرە پۆلێک سەگ خەریکن سەگێکی دی دەخۆن. کوڕە خێلە گوتی خەریکن سەگەکەی ئێمە دەخۆن، نا، ئەوسەگەی بە گوتەی تۆ ئی ئێمەیە لە دەورەیان دێت و دەچێ و خۆی تێوەنەداوە. کوێرەپیاو گوتی دوای خواردنی ئەو مامرە رەنگە چی وابرسی نەبێ. دوکتۆر پرسی ئێستە باشتری، بەڵێ، وا باشە بڕۆین، ئەوسەگە هی ئێمە نیە و تەنیا پێمانەوە نووساوە، ئێستا رەنگە بەلای ئەوسەگانەوە بگیرسێتەوە، بەڵکوو لە پێشتردا هەر لەگەڵ ئەوانە بوو بێت ولێرە تووشیان بوو بێتەوە، ئەعەم دێ، لێرە بیکە، کوڕێژگە بۆلاندی زگم دێشێ، نەخۆشم، پاشان هەر لەوێ کارەکەی کرد، ژنی دوکتۆر جارێکی تر رشایەوە، بەڵام ئەوجار بە بۆنەیەکی تر، لە مەیدانە گەورەکە تێپەڕین و هەر گەیشتنە ژێر سێبەری داران، خێزانی چاوپزیشک ئاوڕی دایەوە. پۆلێک سەی گەڕۆلی دیکە قوت بوونەوە کە لە سەر پاشماوەی کەلاکەکەشەڕیان بوو. سەگی ئەسرین لێسەوە کە لمبۆزی لەخۆڵ وەردەدا ودەتگوت شوێنی شتێک دەگێڕێ هات، رەنگە هەر وا راهاتبێ، چونکە ئەوجار بە نیگایەکی سادە و ساکار دەیتوانی ئەو ژنەی لێی دەگەڕابدۆزێتەوە.

ئاژوان درێژەی کێشا، لەمێژ بوو ماڵی پیرەپیاویان هەڵبواردبوو،ئێستا کەوتوونە شەقامێکی پان و بەرین کە لە دوو لاوە ساختومانیبەرزی بە هەیبەت لێی بوونە شوورە. ئوتۆمبیلەکانی ئەو گەڕەکە گران وجێدار و خۆش رکێفن، هەر بۆیە گەلێ کوێر تێیانا دەخەون، وادیارەئوتۆمبیلێکی لیموزینی گەورە کراوتە ماڵ، رەنگە لەبەر ئەوەی گەڕانەوە بۆ نێو ماشێنەکە زۆر هاسانتر بێ لە گەڕانەوە بۆ ژووری ماڵ،دانیشتوانی ئەم ئوتۆمبیلە دەبوو هەر ئەو کارەیان کردبا کە ئەوان لەقەرەنتینەدا دەیانکرد، بە کوێرە کوێرە و دەستەکوتە پێداهاتبان وئوتۆمبیلەکانیان ژماردبا، ئەوەش ژومارەی بیست و حەوتی دەستیڕاست، ئەوا گەیشتمەوە ماڵ. ئوتۆمبیلەکە سەرۆکی دەستەیبەڕێوەبەریی هێنابوویە کۆبوونەوەی ئاسایی حەوتانە، ئەوە یەکەم کۆبوونەوەی پاش راگەیاندنی سەرهەڵدانی نەخۆشیی سپی بوو، بەڵام مەودا نەبوو کە هەتا ئاخری کۆبوونەوەکە ئوتۆمبیلەکە بەرنە شوێنیتایبەت و رایگرن. شۆفیرەکە کوێر بوو، هاوارێکی کرد، مەبەستمان شۆفیرەکەیە، بەڵام ئەو، مەبەستمان سەرۆکە، هاوارەکەی نەبیست. ئەمجار کۆبوونەوەی گشتیی ئەندامان زۆر تەواو نەبوو، چونکە لە چەندرۆژی رابردوودا تاقمێک لە کارگێڕان کوێر ببوون. سەرۆک تەنانەتنەیتوانی کۆبوونەوەکە دەس پێبکا، باسی کۆبوونەوەکە باس لە سەردۆزینەوەی رێچارەیەک بوو بۆ ئەوەی ئەگەر هاتوو تەواوی کارگێڕانو جێگران کوێر بوون چ بکەن، بەڵام ئەو تەنانەت نەیتوانی لە ژووری کۆبوونەوەکە

وەژوور کەوێ، چونکە ئەو ئاسانسۆرەی دەیبردە نهۆمیپازدەهەم، لەگەڵ دابڕانی کارەبا کە ئیتر نەگەڕایەوە گیری کرد، بێتووبمانهەوێ بە دروستی باسی بکەین دەبێ بڵێین لە مابەینی قاتی نۆیەم ودەیەما بەند کرا و چونکە ئەگەر خواری هێنا هەر خوار دێ، دروست لەمکاتەدا کەڵتەکارانی کارەباش کوێر بوون، ئەوانە بەرپرسی دابین کردنیکارەبای نێو ساختومان و ئاگاداری مەکینەی کارەبا بوون و ئەم مەکینەکۆنە زۆر لەمێژ بوو قەرار بوو ئاڵوگۆڕ بکرێت، جا هەر وەک گوتمانبوو بە هۆی ئەوەی کە ئاسانسۆر لە نێوان نهۆمی نۆیەم و دەیەماراوەستێ. سەرۆکی لێژنەی بەڕێوەبەر دیتی ئەو پێشخزمەتەی لەگەڵیبوو کوێرایی داهات و دوای سەعاتێک نۆرەی خۆی هات، جا چونکەکارەبا نەهاتەوە و ئەو رۆژە کوێر بوون لە بانکا بوو بە چەند هێندیجاران، بێگومان ئەم دووە هێشتاش هەر لەوێن، بەڵام پێویست بە گوتنیئێمە ناکا کە بڵێین مردوون و بەختەوەرانە تابووتێکی پۆلایین لە پەلاماریسەگەلی دڕندەی پاراستوون.

شاهیدێک لێرە نەماوە، ئەگەریش مابێ بەڵگەیەک بە دەستەوە نیەبەشدار و ئاگاداری رووداوەکان بووبێ و بۆمان بگێڕێتەوە، بێتووکەسێک لێمان بپرسێ ئێمە لە کوێوە دەزانین هەڵکەوت و رووداوەکانهەر ئاوا بوون نەک جۆرێکی تر، پرسیارێکی بەجێی کردووە، وڵامئەوەیە کە تەواوی چیرۆکەکان وەکوو نەزیلە و حیکایەتی رۆژی بنەوانو گوورانی تۆوی جیهان و ژیانە، هیچکەس خۆی لە هەوێڵدا نەبووە،کەس چی نەدیوە بە چاوان، بەڵام هەمووش دەزانن چ رووی‌داوە. هاوسەری چاوپزیشک پرسی بانکەکان چیان بە سەر هات، هەڵبەت ئەمپرسیارەی بۆیە نەکرد کە زۆری دڵ بە پووڵەوە بێ، ئەگەر چی بۆخۆشیپاشەکەوتی لە بانک دانابوو، هەر بە پێخۆش بوون پرسی و ئاوای بەمێشکیدا هاتبوو، باوەڕ بکەن هیچی دیکەی تێدا بەستە نەبوو،چاوەڕوانیش نەبوو کەسێ وڵامی بداتەوە کە بەڵێ بۆ وێنە خوا لە پێشدائاسمانەکان و زەوی خولّقاند و زەوی چۆل و بەیار و مێو لە سەر بوو وتاریکایی لە بان قووڵایی ئاو و رووحی خوا باڵی بە سەر ئاوەکانا کێشا،ئێستا دەکرێ راستی رووداوەکان لە زمان پیرەپیاوێک ببیستن کە وادیارە لەگەڵ هاوڕییانی بە شەقامێکدا سەرەولێژ دەبنەوە، پیرە گوتیوەختێک هێشتا چاوم دەیبینی لە پێشدا وامدەزانی ئاڵۆزی و بشێویپەیدا بووە، خەڵک لە ترسی کوێری و نەداری بە هەڵپە و هەڕەمە بەرەوبانکەکان بزووتن هەتا پووڵەکانیان وەرگرنەوە، وایاندەزانی کە ئاواداهاتوویان دابین دەکرێ و دەشێ بە وردی لەم مەبەستە حاڵی بین،بێتوو کەسێک بزانێ تازە کاری پێناکرێ، هەتا ماوە تەنیا رێچارەیئەوەیە پەنا بەرێتە بەر

ئەم پاشەکەوتەی لە کاتی خۆشی و ئەهوەنیداوەسەر یەکی ناوە، هەڵبەت ئەگەر بەرژەوەنـدیی کاری خۆی کردبێ وپووڵێکی وەسەر یەک نابێ، ئاکـامی ئـەم هێـرش و پـەلامارە لـە نـەکاوە بۆسەر بانکەکان بـوو بـە هـۆی ئـەوەی هێنـدێکیان لـە مـاوەی شـەو و رۆژێکداتەپڵـی نـابووتی بکوتن، دەوڵەت کەوتـە نێـوان و داوای هێـور بوونـەوەی بـارو دۆخەکـەی کـرد و هەوڵـی دا شعووری شارستانییەتی هاوشاریانوەخەبەر بێنێ و لە کۆتایی ئەم راگەیەندراوە مەزبووتـەدا کـە بڵاوی کردەوە تەواوی بەرپرسایەتی و ئەرکێکی دەگەڕایەوە سەر ئەمکارەسـاتە گشـتییە هێنایـە ئەستۆی خۆی، بەڵام ئەو هەڵوێسـتە ئارامیدەرەلـە تونـد و تیـژی قەیرانەکـەی کـەم نـەکردەوە، هۆیەکــەی ئــەوە نــەبوو کەخەڵــک لێکدالێکــدا کــوێر بــوون، بەڵــکوو ئەوانــەی هێشــتا موقراییاندانەهاتبوو دەیانویست پووڵە بێ زمانەکانیان رزگـار کـەن، ئاخرییەکـەیوای لـێهـات هەموو بانکەکان دەرگا لە رووی خەڵک داخەن و داوا بکەنپـۆلیس بێتـە هانایـان، بـەڵام ئـەوە چی پێنەکرا، لە نێـو جـەماوەری بـە گرمـەو هـەرادا کـە لـە پـێش بانکـەکان ئاپۆرەیـان دابـوو تاقمێکیش پۆلیس بە جل وبەرگی ئاسایییەوە دەبیندران کە دەیانویسـت ئـەو پاشـەکەوتەی بـە هەزارزەحمەت وەسەر یەکیان نابوو وەرگرنەوە و هێندێکیان بـۆ ئـەوەی بتـوانن بـێ دەردەسـەر بێنە ریزی خۆنیشاندان هەواڵیان بۆ سەرکردەکانیاننـاردبوو کـە کـوێر بـوون و لـەڕێوە لـە کـار لادرابـوون، بـەڵام ئەوانـەی جلـیتایبـەتییان لەبـەردابوو و هـەر وا لـە ریزەکانیانـدا مابوونـەوە و چەکیانبەرەو رووی خەڵکی ناڕازی کێشابوو، لەپڕ تازە چاویان هەتەری نـەکردو سـێرەیان بـۆ نەگیرا، ئەم تاقمە ئەگەر پاشەکەوتێکیشـیان لـە بانکـا هەبوولـە وەرگرتنـەوەی ناهومێـد بـوون و دەتگوت چارەڕەشـی هـەر ئاوایـاندەس لـە کـۆڵ ناکاتـەوە، بۆیـە تاوانبـار کـران کـە لەگـەڵ کاربەدەستانی پایەبەرز دەستیان تێکەڵ کردووە و لە ژێرەوە رێـک کـەوتوون، بـەڵاموەزعەکـە لەوەش زیاتر شێوا، جەماوەرێکی تووڕەی سـاغ و کـوێر لەبـەرلێقـەوماوی هرووژمیـان کـردە بانکەکان، ئەهوەنی و ئارامی زەمانیئاسایی پووڵ وەرگرتنـەوە بـە سـەر چووبـوو، تـازە کـەس داوای پووڵیخۆی نەدەکردەوە و هەر چی وەبەر هاتبا رامالْ دەدرا، داخلە وسندووقی گـەورە و بچووکی پووڵ و ئەمانەت دەستیان رێخرا و هەر چیپووڵی کۆنینەی بـاب و بـاپیران بـوو بـە تالان رۆیی، سەرسـەرای گـەورە وشـکۆداری بنکـەی سـەرەکی بانکـەکان، نووسـینگەی لقـی بچــــووکتر لەگـــەڕەکان دیمـــەنی ســـەیر تـــاڵ و دڵـــتەزێنیان بـــە خـــۆوە بـــینی، نابـــێ سندووقەخۆکارەکانیشمان لەبیر بچێتەوە کە بە زۆری کرانەوە و هەتا گەلایئـاخری گەسـکیان لێدرا و بە تالان چوون، لە سـەر نمایشـگەری هێنـدێکلـەم سـندووقانە ئـەم پەیامـە تەوسـاوییە

خۆی نواند کە بە بۆنەیهەڵبژاردنی ئەم بانکە سپاسی دەکرد. هەر بەڕاستی ئەم ئامرازانەنەزانن، وا دروستترە کە بڵێین ئەوانە خەیانەتیان بە خاوەنەکانیان کردووە، بە کورتی تەواوی رایەڵەی بانکیی لێکهەڵوەشا، چەشنیخانوویەکی مقەبایی پووچایەوە و هۆیەکەشی ئەوە نەبوو کە ئیتر وەدەس گرتنی پووڵ نرخی خۆی لە دەس دابێ، بەڵکوو دەبێ بزانین ئەوەیکە پووڵی هەیە نایهەوێ لە دەستی بێتەوە، بەم مانایە کە کەس لە سبەیخۆی دڵنیا و ئاگادار نیە، رەنگە ئەو کوێرانەی کە لە ژێرخانی بانکەکانبنەگر بوون هەر ئەو فکرەیان لە مێشکیدا بێ، ئەم شوێنانە سندووقیگەورەی ئامانەتی خەڵکی لێیە، ئەو کەسانە چاوەڕێی موعجیزەیەکن هەتائەو دەرگا قورس و پۆڵاییینانەی لە نێوانیاندا بۆتە لەمپەر بکرێنەوە، ئەوانتەنیا بۆ نان و ئاو و چوونە سەراو وەدەر دەکەون و پاشان دەگەڕێنەوەبنکەی چاوەدێری و ئێشک گرتنی خۆیان، بۆ ئەوەی غەوارەیەک نەیەتەنێو شووره و قەڵایان لە ناوی نەهێنی و ئاماژەی تایبەتی دەست کەلکوەردەگرن، تەواو روون و ئاشکرایە کە لە تاریکی ئەنگوستە چاوارایدەبوێرن، هەڵبەت فەرقێکیشی نیە، لەم کوێرییە تایبەتییەدا هەمووشتێک سپییە. پیرەپیاو ئەو کارەساتانەی کاتێک دەگێڕایەوە کە وردەوردە بە شارا دەهاتنە خوار، جارجارەش رادەوەستان تا کوڕێژگەیخێل ژان و برک و زگێشەی تۆزێک تەسکین داتەوە، جا سەرەڕای ئەوەیپیرەپیاو ئەم رووداوە سەیر و سەمەرانەی بە راوێژێکی پوخت و پاراو وسەلمێنەرەوە دەگێڕایەوە، وا دروستترە کە بڵێین برێکی پێوەناوە، بۆوێنە لە بابەت داستانی کوێرەکانی ژێرخانی بانکەکان ئەگەر پێشترئاشنایەتی لەگەڵ ناوی نەهێنی و ئاماژەی دەس نەبوایە چۆن دەیزانیباسیان بکا، وەهەرحاڵ بۆ ئەوەی لێمان تێکنەچێ و تەواوێک حاڵی بینهەر ئەوەندە بەسە و لێی ناکەینە هەرا.

رۆژ دەهات و ئاوا دەبوو کە سەرەنجام گەیشتنە ئەو شەقامەی ماڵیچاوپزیشک و خێزانی لەوێ بوو. ئێرەش چ جیاوازییەکی لەگەڵشوێنەکانی تر نیە، چەپەڵیی تەواوی وڵاتی داگرتووە، کوێرەکان پۆل پۆل بێئامانج دەخولێنەوە و بۆ یەکەم جار دوو جرجەمشکی گەورە بەدیدەکەن، هەڵبەت ئەوە تەنیا رێکەوت بوو کە هەتا ئێستا تووشیاننەهاتبوون، ئەو کتکانەی دەچنە راو خۆیان لێدەپارێزن، چونکە زۆرزەلام و دڕندەخووترن. سەگی ئەسرینلێسەوە زۆر بە سووکی سیلەچاوێکی دایە مشک و پشیلەکان، ئەگەر ئەم مەبەستە نەبایە کە سەگسەگە، ئەو گیانلەبەرەی خووی بە ئادەمیزاد گرتووە، دەمانتوانی بڵێینئەوە روانینی بوونەوەرێکە کە لە هەرێمی هەستێکی دیکەدا دەژی. هاوسەری دوکتۆر بە دیتنەوەی گەڕەک و کۆڵانی ئاشنا

خەمێکی ئاساییهەڵینەگرت، ئەو خەمەی لە سەر ڕەوگەی تێپەڕینی تەمەن دەخوشێ وهەزاران بیرەوەری بە دوادا دێ، بۆ وێنە نەیگوت هەر دەڵێی دوێنێ بووکە شاد و بە کەیف لێرە دەژیاین، بەڵکوو لە ناهومێدییان ڕاچەنی،لەخۆوە لێی وا بوو ئەگەر بگاتە ئێرە شەقامی بە پاک و خاوێنی دێتەبەرچاو، جیرانەکانی ئەگەر کوێریش بووبن دڵکوێر نەبوون، یەک بەخۆی گوتی چەندە کەرم، شووەکەی پرسی بۆ، چما چ رووی داوە، هیچ،خەیاڵم ببوو بە وشە، زەمان چ زوو تێدەپەڕێ، بڵێی ژوور و ماڵمان چۆنبێ، تاوێکی دیکە لێمان حاڵی دەبێ. هێزێکی ئەوتۆیان لەبەر دانەبوو، هەربۆیە زۆر بە ئارامی لە پلیکانەکان وەسەر کەوتن، لە هەر پێگۆڕکەیەکرادەوەستان و پشوویان تازە دەکردەوە، ژنی دوکتۆر گوتبووی ماڵیانلە نهۆمی پێنجەمە. بە هەر کوێرەوەرییەک بوو هەر کام بە پێی هێز وورەی خۆیان وەسەر کەوتن، سەگەکە جاری وا بوو وەپێش دەکەوت وجەلی وا بوو دەکەوتە دوا، دەڵێی لە گوجووکیڕا بە سەی مەڕی گوێیبڕاوە و فێر بووە نەهێڵی مەڕێک وەدوا کەوێ و گوم بێ. دەرکەکان کرابوونەوە، دەنگە دەنگێک لە ژوورەوەڕا دەهات، بۆگەن ئێرەشیهەڵگرتبوو، دوو جار سەروسەکوتی کوێرەکان لەبەر دەرگاوە هەڵقوڵیو بە چاوی بێگیان ڕوانییان، پرسیان کێیە، هاوسەری چاوپزیشکیەکێک لە دەنگەکانی ناسییەوە، دەنگەکەی تر ئی کەسێکی غەوارە بوو. تەنیا گوتی ئێمە سەردەمێک لێرە دەژیاین، نیشانەی ئاشنایەتی لە سەرروخساری جیرانەکە شەپۆلی دایەوە، بەڵام نەیپرسی ئەرێ تۆ خێزانیدوکتۆر نی، وێدەچێ کاتێک دەچۆوە ژوور دەیگوت جیرانەکانی نهۆمیپێنج گەڕاونەوە. پاش ئەوەی گەیشتنە ئاخری پلیکانان و بەر لەوەی پێبنێنە پێگۆڕکە هاوسەری چاوپزیشک گوتی دەرگا داخراوە. دیار بووزۆری تێنووسابوون بیشکێنن بەڵام چیان بۆ لەگەڵ نەکرابوو. دوکتۆردەستی بە گیرفانی باخەڵی کۆتە تازەکەیدا کرد و کلیلەکانی دەرهێنا. کلیلەکانی هەڵێنا و ڕاما، بەڵام خێزانی بە ئارامی دەستی گرت و بەرەوقفڵی دەرگای برد.

کوێری

ژووری ماڵەکەیان خاوێن بوو، هەر ئەوەندە شێوابوو کە ئینسانوەختێک بەپەلە وەدەر دەکەوێ ماڵەکەی شپڕێو دەبێ، هەڵبەت جگە لەوتۆزوخۆڵەی کە بە دەرفەت هێنان لە نەدیو

بوونی خاوەن ماڵ تویژیکی‌ناسک بە سەر کەل و پەل و شرە و برە دەکێشێ و لەم بابەتەوە دەتوانین‌بڵێین کە تەنیا دەرفەتێکە تەپ و تۆز دەتوانێ بنیشێ و بنەگر بێ،بێ‌ئەوەی تۆزتەکێن و گەسکی کارەبایی لیی وەخۆکەون و هەدادانی‌لێ‌هەڵگیرێ و یان منداڵێک هەڵبەز دابەز بکا و هەندرانی پێ نەهێڵێ. سەرەڕای تەواوی ئەوانەش ئەو رۆژە کە چاوەڕوانی هەڵویستی‌وەزارەتخانە و نەخۆشخانە بوون، خێزانی دوکتۆر بە تێبینی ورد وتایبەت کە مرۆڤی ئاقڵ وا لێ‌دەکەن هەتا ماون کارەکانیان لێک و لەبارکەن تاکوو پاش مردن پێویست نەکا بە پەلەپرووزێ ئیشەکان راپەڕێنن،دەفرەکانی شۆرد، تەختی خەوی رێک و پێک کرد، ئاودەستی بە جوانی‌خاوێن کردەوە، خۆ ناڵێین کارەکانی بێ‌گرێ و گۆڵ بوون، بەلام‌بەڕاستی لەم هەل و مەرجە ئاستەنگەدا بە دەستی لەرزۆک و چاوی بەئەسرینەوە لەوە زیاتر چی پێ‌دەکرا. لەگەڵ ئەوەشدا ماڵەکەیان دەتگوت‌بەهەشتێکە کە حەوت زیارەتکار پێیان تێنابوو، ئەو هەستە ئەوەندەمەزن یان ئەگەر نەمانهەوێ رێز و حورمەتی هەرێمی مانا پێخوستبکەین دەتوانین بڵێین ئەوەندە بەرز بوو کە لە بەر دەرگای ئاپارتمانەکەراوەستان، دەتگوت بۆنی چاوەڕوان‌نەکراوی ماڵەکە لە پێی خستبوون وئەوە تەنیا بۆنی ماڵێک بوو کە دەبوو بە جوانی هەوای ئاڵ و گۆڕ کرابا،بێتوو ئێستا وەختێکی دیکە بوایە هەموو لەرێو خێرا پەنجەرەکانمان‌دەکردەوە و دەمانگوت با هەوایەکی تازە بێتە ژوور، بەلام ئەمڕۆباشترین کار ئەوەیە بۆگەنی دەرەوە نەیەتە ژوور. ژنی کوێرەپیاو گوتی‌تەواوی ولات پیس دەکەین، هەڵبەت راستی دەکرد، ئەگەر بەم پێلاوەقوڕاوی و گواوییانە هاتبانە ژوور، بەهەشتەکە لەرێوە دەبوو بە دۆزەخ ودۆزەخیش بە پێی گوتەی پێشەوایانی دینی دووهەمین شوێنە کە دەبێ‌بۆگەنی پیس و ناخۆش و گرانی لە جەرگ و دڵی جەهەندەمییان کار بکاو گازی سوورەوە کراو، قازانی قیلی قاڵ و ئامرازی برژاندن وتواندنەوە لە ئاستی ئەو هیچە. هەر لە کۆنەوە وا بۆتە باو کە خاتوونی‌ماڵ دەڵێن فەرموون، فەرموون، بەڕاستی گرینگ نیە، قەی ناکا پاشان‌خاوێنی دەکەمەوە، بەلام ئەو خاتوونە وەکوو میوانەکانی دەزانێ لەکوێوە هاتوون، دەزانێ لەم دنیایەی کە تێیا دەژی ئەوەی پیسە پیستردەبێ، جا بۆیە تکایان لێ‌دەکا کەوشەکانیان لە بەردەرگاوە داکەنن، خۆراستە کە لاقیشان خاوێن نیە، بەلام دیسانیش جیاوازییان زۆرە، خاولی‌و پەڕوپاڵ و مەلافەکانی کچەی چاویلکەیی کاری خۆی کرد و لە دەس‌چەپەڵیی زیاتر رزگاری کردبوون. کە وایە بە پای‌پەتی وەژوور کەوتن،هاوسەری چاوپزیشک گەڕا هەتا پاشان بە چاکی خاوێنیان کاتەوە،هەڵبەت نەیدەزانی چۆن و کەی،

پاشان کەوشەکانی بردە بەر هەیوان،هەوای دەرەوەی لەوەی زیاتر پیستر نەدەکرد. ئاسمان تاریک داهاتبوو،هەوری رەش پەچەیان لە روو گرتبوو، لە دڵی خۆیدا گوتی خۆزگەبباریّ. بە ئاگادار بوون لەم کارەی دەبوو بیکا گەڕایەوە لای هاوڕێیانی. هەموو لە دیوی دانیشتن قڕ و قپ لە جێی خۆیان چەقیبوون، چونکەسەرەڕای شەکەتی نەیانوێرابوو بە دوای سەندەڵیدا بگەڕێن، تەنیادوکتۆر بە دزییەوە دەستێکی بە سەر مۆبلەکاندا کێشاوە و شوێنپەنجەی دیارە، تۆزتەکێن کردن لێرەوە دەستی پێکردبوو و هێندێک تۆزو خۆڵ بە سەری ئەنگوستییەوە نووسابوون، هاوسەری چاوپزیشک گوتی جلەکانتان داکەنن، ناکرێ هەر ئاوا بمێنینەوە، جلەکانیشمانوەکوو پێڵاوەکانمان پیسن، کوێرەپیاو گوتی لێرە لەبەر چاوی یەکترخۆمان رووت کەینەوە، جا کوا ئەوە کارێکی دروستە، خێزانی دوکتۆربە تەوسەوە گوتی ئەگەر پێتان خۆش بێ دەتوانم هەر کامێکتان بەرمەگۆشەیەک، ئەودەم پێویست ناکا شەرم بکەن، ژنی کوێرەپیاو گوتی منهەر لێرە خۆم رووت دەکەمەوە، تەنیا تۆ دەتوانی بمبینی، سەرەڕایئەوەش لە یادم نەچۆتەوە کە منت لە وەزعێکی خراپتردا دیوە، بەینێکەمێردەکەم شتی زوو لە بیر دەچێتەوە، کوێرەپیاو تێیڕاخوڕی نازانم کایکۆن بە با کردن چ خۆشێکی هەیە، ئەویش وەبیر هێنانەوەی رووداویتاڵ و ناخۆش و فەرامۆش کراو، کچەی چاویلکەیی گوتی ئەگەر ژنبوایەی و رێگات لەو شوێنە کەوتبا کە ئێمە چووین ئێستا بەو شێوەیەنەدەدوای، قسەکەی بڕییەوە و دەستی کرد بە رووت کردنەوەی کوڕەخێلە. چاوپزیشک و پیرەپیاو کە تا ئێستا لە پشتێن بەرەو ژوور رووتببوونەوە، ئێستا دوولینگەکانیان دادەنا، پیرەپیاو کە لە پەنا دوکتۆرراوەستابوو گوتی ئیزن بدە هەتا پاڵت پێوەبدەم و دوولینگەکەم داکەنم. ئەو بەخت وەرگەڕاوانە کاتێک هەنگڵە شەلەیان دەکرد ئەوەندە بە گاڵتەگیرابوون کە ئادەمیزاد گریانی دەهاتێیە. دوکتۆر تلاسکەی بەست وکەوت و پیرەپیاویشی بە دوای خۆیدا کێشا، بەختەوەرانە هەردووکیانبەم رووداوە کەوتنە پێکەنین، تێوەڕوانینیان بەڕاستی دڵتەزێن بوو. ئەوەی پیسە و بە مێشکی ئینساندا دێت بە لەشیانەوە نووسابوو، لەپشتێن بەرەژێریان چڵک کەمرەی کردبوو، موویان بۆز دەچوو، ئەوەشئاخر و ئاقیبەتی پیری و شوغڵی خاوەن ئابڕوو، هاوسەری چاوپزیشکبە هانایانەوە چوو هەتا بەرزیان کاتەوە، تاوێکی تر هەوا تاریک دەبوو وئیدی هۆیەک بۆ شەرم کردن نەدەما، لە خۆی پرسی بڵێی لە ماڵماندا شەمەبێ، وڵامەکەی ئەوە بوو کە هاتەوە بیری دوو چرای کۆنیان هەیە،یەکی سێ پڵێتەی نەوتی و یەکی پاڕافین سۆز، جارێ چرا نەوتییەکەبەسە، نەوتم هەیە، پڵیتەش جوور دەکەم، سبەی دەچم لە دووکانانداپاڕافین

دەبینمەوە و دێنم، دۆزینەوەیان لە قودوو کۆنسێرو هاسانترە، لەدڵی خۆیدا گوتی بە تایبەتی ئەگەر لە دووکانی بەقاڵدا بۆی نەگەڕێم،سەری لە خۆی سوڕما کە سەرەڕای ئەو ژیانە تاڵە هێشتاش مەیلی جەفەنگی هەیە. کچەی چاویلکەیی لەسەرەخۆ جلکەکانی دادەنا، بەجۆرێک کە بینەر تووشی ئەو هەستە دەهات هەر چەند کوتێکیش کەدایناب‌ێ، هێشتا کوتێکی دیکە ماوە کە رووتی لەشی داپۆشێ، سەروبەری‌ئەم شەرم و حەیا لەپڕ و نەکاوەی بۆ نەدەچۆوە سەر یەک، بەڵام ئەگەرژنی دوکتۆر لێی نیزیکتر بوایە سەرەڕای چلکنیی روخساری دەیبینی کەلە شەرمان سوور هەڵگەڕاوە، بلا هەر کەس دەتوانێ لە ژنان حاڵی بێ بابێ، یەکێک لەوانە دوای گەلێ‌جار جووت بوون لەگەڵ ئەم پیاوانەی‌نەیدەناسین ئێستا شەرم دایگرتووە و ئەوی تر دەتوانێ بەوپەڕی‌لەسەرخۆیی بە گوێیدا بچرپێنێ خۆ سەخڵەت مەکە، ناتوانێ بتبینێ،هەڵبەت ئاماژەی بۆ مێردەکەی خۆی دەکرد، چونکە لە بیرمان ناچێتەوەکە ئەم کیژە بێ‌شەرم و حەیایە چلۆن ئێشتیای بزوات و بەرەو لای خۆی‌کێشا و هەر وەک هەموو دەزانن لە بابەت ژنانەوە هەمیشە مەبەستی‌ئاگات لەخۆت بێ لە ئارا دایە.

ژنی دوکتۆر جل و بەرگە شپرزەکانی کۆ کردەوە کە لانی کەم هەرکوتەی دەبێ مانگێک لە خووسدا بن هەتا بتوانێ خاوێنیان کاتەوە،گلۆڵەی کردن و وەژێر هەنگڵی دان و گوتی هەر لێرە راوەستن، خێرادەگەڕێمەوە، جلەکانیشی وەک پێلاوەکان بردە بەر هەیوان، لەوێ‌ئەویش خۆی رووت کردەوە و لە شاری رەشی ژێر ئاسمانی تاری‌روانی. نە نوورێکی کز لە پەنجەرەکانەوە خۆی دەنواند و نە زریوەزریوی چرای سەر دەرگای مالان دەهات، ئەوەی دەیبینی شار نەبوو،گۆکا و کۆمای گەورەی قیل بوو کە پاش سارد بوونەوە شکڵی‌ساختومان و بان و دووکەڵکێشی لە خۆی گرتبوو، هەموو مردوو،هەموو بزڕکاو، سەگی ئەسرین‌لێسەوە هاتە بەر هەیوان، بێ ئۆقرە بوو،بەڵام ئەسرینێ نەبوو کە بیلێسێتەوە، ناهومێدی و پەژارە لە ناخی ژنەداشەپۆلی دەدا، بەڵام چاوەکانی ویشک و برینگ بوون. هەستی بەتەزووی سەرما کرد، کەوتەوە بیری ئەو کەسانەی بە رووت و قووتی لەنێوەڕاستی هۆدەکەدا نەیاندەزانی چاوەڕوانی چین. گەڕایەوە ژوورەکە. ئەوان بە ئەندامی ساکاری نێرەمووکەوە بیوون بە تارمایی و سێبەری‌بەر زەردایی کزی شۆقێکی کاڵەوە بوو، ژنی دوکتۆر گوتی بەڵام‌شوێنیان تێناکا، ئەوان لە نووری دەوروبەرا دەتوێنەوە و هەر نووریشەکە ناهێڵێ هیچ ببینن. گوتی دەمهەوێ چرایەک گڕ دەم، جارێ منیش‌وەک ئێوە کوێرم، کوڕە خێلە پرسی ئەرێ کارەبا هاتۆتەوە، نا، دەمهەوێ‌چرای نەوتی هەڵکەم، کوڕە پرسی چرای نەوتی چیە، پاشان

نیشانتدەدەم. لە توورەکەکەدا بە شوێن شەمچەدا گەڕا، چوویە ئاشپەزخانە،دەیزانی نـەوتی لـە کوێ داناوە، نەوتێکی زۆر پێویست نەبوو، تیتۆڵێکی لەدەسرۆکەیەک دادڕی هەتا بیکاتە پلیتە، دوایە گەڕایەوە ئەو دیوەیچرایەکەی لێبوو، ئەو چرایـە پـاش سـاز کـرانی ئـەوە یەکـەم جـار بووهەڵدەکرا، لە پێشدا قەرار وا نەبوو تووشی وەها چارەنووسێک بێت،بەڵام هیچکام لـە ئێمـە، چ چرا، چ سەگ و چ ئینسان لە پێشدا نازانین بۆچیپێمان ناوەتە ئەم جیهانە. سـێ گـڕ چەشـنی دەنکە بادام یەک بە دوای یەکالە سـەر زمانـەی زەردی چـرا درەوشـانەوە، جارجـار پتـەپتێکی دەکەن وسەری گـڕەکان لـە هـەوادا ون دەبـن، پاشـان دیسـان دەسـرەوێنەوە، دەڵـێیدەبـن بـە چلوورۆکەی سەرەوژێری گڕ. ژنی دوکتۆر دەڵێ ئێستا کەدەبینم دەچم جل و بەرگی خـاوێن بێنم، کچەی چاویلکەیی گوتی بەڵام خۆگیانمان پیسە. هەم ئەو و هەم ژنەی کوێرەپیاو مـەمک و لەشیان بەدەست داپۆشیبوو، هاوسەری چاوپزیشک گوتی ئەو کارەیان لەبـەر مـن‌نـەکردووە، بەڵکوو لەبەر تیشکی چرایە کە تێیانهەڵدەڕوانێ. پاشـان بـەدەنگی بـەرز گـوتی جـل و بـەرگ خاوێن بێ و گیان پـیس باشـترە لـەوەی کـەگیان خـاوێن بـێ و جـلوبـەرگ پـیس. چراکـەی هەڵـگرت و رۆیـی هـەتادۆلابی و کـەلێن و قوژبنـان بـە وردی بپشـکنێ، ئیسـتێک دواتـر گەڕایەوە،چەند دەست ژێرکراس و دەرپێ، بـەرگی خـەو، دامـێن، بلـووز، کراس،دوولینگـە و هەر پۆشەمەنییەکی جوان و چاکی کە بە کەلکی حەوتکەسەکە دەهـات هێنـای، راسـتە هـەر کەس ئەنـدازە و قـەد و قەڵافەتێکی،هەیـە، بـەڵام بـۆ کـزی و لاوازی دەتگـوت هـەموویان بـە زگێـک لــە دایــکبــوون. ژنــەی دوکتــۆر یارمــەتی دان خۆیــان پۆشــتەکەن، کــوڕە خێلەدوولینگۆکەیەکی دوکتۆری پۆشی، لەوانەی کە پیاوان لە قەراغ دەریا وکوێستان دەیکەنـە بـەریان و دەڵـێی منالـۆچکەن. ژنی کوێرەپیاوهەناسـەیەکی هەڵکێشـا و گـوتی وا دیـارە ئێسـتا دەتوانین دانیشین، بەڵامتکایە رێنوێنیمان بکە.

ژوورەکە وەک هەموو دیوەکانی دانیشتن وایـە، مێزێکـی پێچکـە کـورتلـە نێوەڕاسـت و چەند کورسیلەی درێژووکەی نەرم کە جێی هەموانەدەبێ، چاوپزیشک و خێزانی و پیرەپیاو لـە سەر یەکیان پاڵیان وێکداوە،کوێرەپیاو و خێزانی لە سەر یەکی تر. تێکڕا شەکەت و بێهێـزن. کوڕەلەڕێوە سەری وەداوێنی کچە کرد و خەوی لێکەوت و مەلەسەی چرایلە بیر چوویـەوە. سەعاتێک رابرد، ئەم حەسانەوەیە شانی لە شانیبەختەوەری دەدا، لە ژێـر ئـەم نـوورە بـێسـۆیە روخساری پیسیاندەبرووقایەوە، کوێرەپیاو قۆڵی کێشا و دەستی ژنەکـەی گـرت و کوشـی،لەم جووڵانەوەیەڕا دەکرێ بەم ئاکامە بگەین کە ئۆقرەی لەش ببێتە هـۆیتـەکووزی رووح. ژنـەی

دوکتۆر گوتی ئێستا شتێک ئامادە دەکەم کەبیخۆین، بەڵام دەبێ لە پێشدا بزانین قەرارە چۆن لێرە بژین، مەترسن،نامهەوێ قسەی بڵیندگۆکە بجوومەوە و دووپاتی کەمەوە، جێ بۆهەموان هەیە، دوو دیوی خەومان بۆ ژن و مێردەکان هەیە، ئەوانیدیکەش دەتوانن هەر لێرە لێی درێژ بن، سبەی وەدوای نان و پێخۆر وخورد و خۆراک دەکەوم، پاشەکەوت و ئازووخەمان خەریکە تەواودەبێ، زۆر باش بوو ئەگەر یەکتان لەگەڵم هاتبان بۆ ئەوەی هەم بۆهێنانی خورد و خۆراک یارمەتی دابام هەمیش خوارەکە و پێچکەی رێگافێر ببوایە، ئەوە هاتوو من نەخۆش کەوتم یان کوێر بووم، کە دیارەهەمیشە هەر چاوەڕوانی وەها رووداوێک هەم، ئەودەم دەبێ من لە ئێوەفێر بم، بەڵام مەبەستێکی دیکە، لەبەر هەیوان سەتڵێک ئاو بۆ کاریپێویست تەرخان کراوە، دەزانم بەو باران و بارێزە و سەرمایە چوونەبەر هەیوان بە دڵەوە نانووسێ، بەڵام هەرچۆنێک بێ لەوەی باشترە کە لەژوورەوە دا بای زگمان بەتاڵ کەین و بۆگەن وڵات دابگرێ، وەبیرتانبێتەوە کە لە قەرەنتینەشدا تووشی وەها وەزعێک ببووین، یانی وردەوردە لە پلیکانی سووکایەتی پێکران رۆچووین هەتا تەواو گەیشتینەبنەبانی پەستیی، ئێرەش بە شێوەیەکی دی دەتوانێ هەر ئاوای لێبێت،لەوێ چا بوو بیانوومان بە دەستەوە بوو و دەمانتوانی یەکی تر تاوانباربکەین، بەڵام خۆ لێرە ئەوە ناکرێ، ئێستە چ باش و خراپ هەموو لێک ولێکین، تکایە لێم مەپرسن چاک چیە و خراپ کامە، کاتێک کوێری بەدەگمەن بوو هەر کارێکی دەمانویست بیکەین چاکە و خراپەییماندەزانی، جیاوازی و هەڵاواردنی دروست و هەڵە تەواو دەگەڕێتەوە سەرئەو پەیوەندییەی ئێمە لەگەڵ خەڵک بناغەمان بۆ دارشتووە، نەک ئەومەبەستەی کە ئێمە چۆن لە خۆمان گەیشتووین، نابێ متمانە بەو شێوەحاڵی بوونە بکەین، ببوورن کە دەستم کرد بە پەند و ئامۆژگارییئەخلاقیی، ئێوە نازانن، ناکرێ بزانن لە شوێنێکی کە هەموو کوێرنچاوساخی یانی چی، خۆ من لێرە شاژن نیم، نا، تەنیا کەسێکم کە بۆدیتنی ئەو کامووسە لە دایک بووم، ئێوە تەنیا هەستی پێدەکەن، بەڵام منهەم هەست پێدەکەم و هەم دەبینم، ئێستا ئیدی وتار دان بەسە، باشتروایە شتێک بخۆین. هیچکەس هیچی نەپرسی، تەنیا چاوپزیشک گوتیئەگەر رۆژێک سەر لە نوێ چاوم سۆمایی بکەن، زۆر بە وردی لە چاویخەڵک دەڕوانم، هەر وەک بمهەوێ رووحیان ببینم، پیرەپیاوی چاوبێن لەچاو گوتی رووحیان، یان گیانیان، هەر ناوێ پێتخۆشە فەرق ناکا، ئەوکاتەیە کە لەوپەڕی سەرسوڕماندا تەماشا دەکەین تووشی کەسێ بووین کە شتێکی وەهای نەخوێندووە، کچەی چاویلکەیی گوتی لە ناخی ئێمەداشتێکی بێناو هەیە، ئێمە ئەو شتەین.

لەم ماوەیەدا خێزانی چاوپزیشک ئەو برە خواردنەی کە هەبوو لەسەر مێزەکەی دانابوو، پاشان یارمەتی دان هەموو دانیشن و گوتی‌وردی بجوون، ئاوا زوو تێر دەبن و گەدەتان هەڵدەفرێوی. سەگ بۆسەولە نەهات. لەگەڵ کەم خواردن راهاتبوو، سەرەڕای ئەوەش پاش‌پارووی چەوری بەیانی ئەو رۆژە رەنگە وای زانی‌بێ کە هەقی نیەتەنانەت پاروویەکی بچووکیش لە دەس ژنێک وەرگرێ کە گریابوو،ئەوانی تر زۆریان سرنج رانەدەکێشا. چرای سێ‌پلیتە لە نێوەڕاستی‌مێزەکە چاوەڕوانی ئەم لێدوانە بوو کە ژنی دوکتۆر بەڵینی دابوو،سەرەنجام پاش شێو ئەو بەڵێنییە هاتە جێ، بە کورە خێلەی گوت دەستت‌بدە بە من، پاشان بە ئارامی ئەنگوستی لێ نیزیک کردەوە و گوتی ئەوەپێچکەی چرایە، بە دەس پێداهێنان دەزانی کە لووس و خڕە وەک‌پێچکەی مێزی چکۆڵە، ئەوە کووپەکەیەتی کە لای سەرەوەیە و جێ‌نەوتیشە، ئێرە دەڵێم، وریا بە دەستت نەسووتێ، ئەوانەش‌سەرپێچەکانن، یەک، دوو، سێ، لەو سەرپێچانەوە کە ماشێنیشی‌پێ‌دەڵێن چەند پلیتەی بادراو هاتوونەدەر کە نەوتەکە هەڵدەکێشن،شەمچەیان پێوە دەنێین و هەتا نەوت هەبێ ئەوانە داییسێن، نووریان‌کەمە، بەڵام باشە ئینسان یەکتری پێ‌دەبینێ، خۆ من نابینم، رۆژێک‌دەبینی و ئەودەم من ئەو چرایەت بە دیاری دەدەمێیە. چ رەنگە، هەتائێستا شتێکت دیوە کە لە برنجە ساز کرابێ، وەبیرم نایە، برنجە چیە،برنجە کانزایەکی رەنگ زەردە، بەڵێ بەڵێ. کوڕێژگەی خێل ماوەیەک لەبیران راچوو، هاوسەری چاوپزیشک لە دڵی خۆیدا گوتی رەنگە هەرئێستا سۆراغی دایکی بگرێ، بەڵام بە هەڵە چووبوو، کورە تەنیا گوتی ئاودەخواتەوە، زۆر تینووە، دەبێ هەتا بەیانی راوەستێ، ئاومان لە ماڵدا نیە،بەڵام دروست لەو کاتەدا وەبیری هاتەوە کە ئاویان هەیە، چوار پێنج لیترئاوی بە قیمەت گران کە لە خەزێنەی سیفۆنی ئاودەستا بوو خراپتر لەم‌ئاوە نەبوو کە لە شێتخانەکەدا دەیاننۆشی. بە کوێرە کوێرە لە تاریکیدابەرەو ئاودەست کەوتە رێ، سەری خەزێنەکەی لابرد، نەیدەدیت بزانێ‌ئاوی تێدایە یان بەتاڵە، قامکی رۆبرد و تێگەیشت کە بەڵێ تێیدایە، بەدوای ئاوخۆرییەکا گەڕا، زۆر بە پارێزەوە رۆیهێشت و پڕی کرد،شارستانییەت گەڕابوویەوە سەر قۆناخی زۆنگ و زەلی سەرەتای ژیان. کە هاتەوە هەموو لەجێی خۆیان دانیشتبوون. تێکڕا سەریان بۆ لای ئەم‌وەسووڕاند، چرا شۆقی لە سەر روخساریان شەپۆلی دەدایەوە، دەتگوت‌کە گوتبووی هەر وەک دەبینن من گەڕاومەوە، لەو هەلە دەرفەت بێنن، لەبیرتان بێ کە ئەم نووره هەتا هەتایی نیە. ژنی چاوپزیشک‌ئاوخۆرییەکەی بۆ دمی کورە خێلە برد و گوتی ئەوەش ئاو، نەرم نەرم‌قومی لێ‌بدە، کەیف بکە، ئاوخۆرییەک ئاو نیعمەتێکی

مەزنە، رووی گوتەکەی لە کوڕە نەبوو، هەر لەگەڵ کەسی نەبوو، بە تەواوی دنیایدەتگوت کە ئاوخۆرییەک ئاو نیعمەتێکی مەزنە. مێردەکەی پرسی لەکوێت هێنا، داخوا ئاوی بارانەیە، نا، ئاوی سیفۆنە. دیسانەوە پرسی کاتێک لێرە ڕۆیشتین چما بوترێکی گەورەی ئاومان نەبوو، ژنە گوتیبۆچی بوومان، بۆ وەبیرم نەهاتنەوە، بوترێکی نیوە و یەکی پڕمان هەیە،وەی لەو شانسە، لێرەدا بە کوڕەی گوت چی دی مەخۆوە، ئیدی مەخۆ،هەر ئێستا ئاوی خاوێن و تازە دێنم، باشترین پیاڵە و ئاوخۆرێکان لێرەریز دەکەم و هەمووومان ئاوی تازە دەخوێنەوە. ئەوجار چراکەی دەسدایە و رووی کردە ئاشپەزخانە، بە بوترییەکەوە گەڕایەوە، نوور چەشنیخەیاڵێکی رووناک بە ناخی بوتریدا تێدەپەڕی و دەدرەوشایەوە وگەوهەری دەروونی دەترووسکاندەوە. لە سەر مێزەکە داینا و ڕۆیی هەتاگلاسەکان بێنێ، باشترین گلاسی کریستاڵی چاک، پاشان ئارام ئارام هەروەک ڕێورەسمێکی ئایینی بەڕێوە بەرێت. گلاسەکانی پڕ کرد لە ئاو. گوتی ئەوەش قومی ئاخری، جا وەرن وێکڕا بخۆینەوە. بە دەستە کوتەگلاسەکانیان دۆزییەوە و بە لەرزە لەرز بەرزیان کردنەوە. ژنی دوکتۆرجارێکی تر گوتی هەموو بخۆینەوە. چرای نێوەڕاستی مێزەکە هەتاویبوو کە ئەستێرەی ترووسکەدار لێی گرد بوونەوە. کە گلاسەکانیاندانایەوە کچەی چاویلکەیی و پیرەپیاو ئەسرین لە چاویان دەباری.

شەو رووبارێکی بە خوڕ بوو. ئەو خەیاڵانەی کە لە پێشدا ئاڵۆز وتەماوی بوون، لە خەوتوویەک بۆ یەکی تر باڵی دەگرت، لە لای هەرکامیان تاوێک رادەما و بە بیرەوەری نوێ، نەهێنی و مەیل و تاسەی نوێخۆی پاراو دەکرد، هەر بۆیەیە کە ئەم خەوتووانە ئاخ و هەناسەهەڵدەکێشن و دەورتێنن و دەڵێن ئەم خەیاڵە ئی من نیە، بەڵام خەیاڵ وڵامدەداتەوە تۆ هێشتا خەیاڵەکانت ناناسی، بەم جۆرە کچەی چاویلکەییزانی پیرەپیاو کێیە و پیرەپیاو کە دوو هەنگاو ئەولاتر خەوتبوو وایزانیتێدەگا کچە کێیە، بەڵام ئەوە تەنیا بۆچوونێک بوو، بۆ یەک بوونەوەیخەون و خەیاڵان پێویست ناکا هەموو وەکوو یەک خەون ببینن. بەریبەیانی هەڵیکردە باران. زریانی دڕ بە پڕتاو خۆی لە پەنجەرەکان قایمدەکرد و چەشنی داهاتنەوەی هەزاران قەمچی ویزەی دەهات. هاوسەریچاوپزیشک چاوی هەڵێنا و ورتاندی گوێ بدە خرمەی باران، پاشانسەر لە نوێ چاوی لێکنایەوە، لە ژوورەوە هێشتا شەوی تاریکخێوەتی تێکەوە نەپێچاوبوو، ئێستا دەیتوانی بخەوێ. تاوێکی چاو لەبیرەخەو راچوو، دڵەخورتەی جێبەجێ کردنی کارێک خێرا لە خەویراپەڕاند، بەڵام هێشتا نەیدەزانی چ کارێک، باران تێیڕادەخوڕی هەستە،باشە چی دەویست لە گیانی، هێدی هێدی هەر وەک ئەوەی

نەیهەویٚخەوی شووەکەی بشەمزێنیٚ، هۆدەی خەوی جیٚهێشت، لە دیـویدانیشـتنەوە تێپـەڕی، تاوێک راوەستا هەتا دڵـنیا بـیٚ کـە هـەموو لێـیخـەوتوون، پاشـان بـەرەو ئاشـپەزخانە بـزووت، ئـەوجار گۆپـاڵ بـاران وبارێزیـەک بـوو هـەر مەپرسـە. بـە قۆڵـی کراسـی خـەو هەڵـمی شووشەیدەرگای ئەستڕی و لە دەرەوەی روانی. ئاسمان یەک سوامە هەور بـوو وبـاران وەک گۆزەی سەرەوژێر دەباری. ئەو جل و جۆرە پیسانەیدایانکەندبوون لە بـەر هـەیوان کەوتبوونـە سەر یەک و لە پەنا تووورەکەیپڕ لە پێڵاو چـاوەڕوانی شـۆردن بـوون. شـۆردن. دوایـین بەشـی خەوکۆتایی پیٚ هات و رووبەندی لە سەر هەڵگیرا، بەڵیٚ ئـەو کـارەیدەیهەویسـت بیکـا ئـەوە بوو، شۆردن. دەرگای کردەوە و هەنگاوێکیهەڵێنایەوە، لە چاو تروونێکا بە باران خووسا، هەر وەک لـە ژێـر ئاوهەڵـدێرەوە وێسـتابیٚ. بـە خـۆی گـوت دەبـیٚ کـەلک لـە ئـاو وەرگـرم. گەڕایەوەئاشپەزخانە و بـە سـەبرایەکی مەنجـەڵ و قابڵـەمە و قـاپ و قاچـاخ و هەرچییـەکی بـە کەلکی کۆ کردنەوەی ئاوی باران دەهات دەستی دانییـە، بـارانلـە دەسـت بـا وەزاڵـە هـاتبوو، پەساپەسا لە ئاسمانەوە رۆدەڕژا و چەشنیگەسکێکی گەورەی بە هـاژ و هـووژ بـانی ماڵـەکانی شـاری دەماشـت. دەفرەکـانی بـردە دەر و لـە پـەنا لاتـاری بـەر هـەیوان ریـزی کـردن، ئێسـتا بۆشۆردنی جلک و پێلاوە پیسەکان ئاوی تەواوی هەیە، لە دیـوی کابـان کەبـە شـوێن فـاف و سـابوون و کـەل و پـەلیٚدا دەگـەڕا کـە بکـریٚ کـەمیٚ، تەنیاکـەمیٚ لـەم چڵـک و گـەمارە گەرووگرەی رووحە کەم بێتەوە لـە ژێـر لێوەوەگـوتی خـودا بکـا لێـینەکاتـەوە. پاشـان وەک ئەوەی بیهـەویٚ ئـەم بیرەمێتافیزیکییـە راسـت کاتـەوە گـوتی مەبەسـتم چەپەڵـیی سەرودڵـگری لەشە،دوایە درێژەی دا هەڵـبەت فـەرقێکیش ناکـا. ئـەوکات وەک ئـەوەی لـە روویناچـاریڕا دەبوایە لە نێوان وتار و ئاکاریدا هاودەنگی پێکبێنیٚ خێراکراسی خووساوی خـەوی داکەنـد و جاری وا بوو بارانەی چەشنیپەنجۆڵەی لاوێنەر و هەلی وا بوو وەک دەستی قەمچیوەشێن لە سەرلەشی خۆی هەست پیٚکرد و ملی نا لە شۆردنی خۆی و جل و بەرگـەکان. خرمـە خرمـی باران لە پێشدا نەیهێشت هەست بکا کە تەنیا نیە. کچـەیچاویلکـەیی و ژنی کوێرەپیـاو لـە بـەر دەرگای سەر هەیوان راوەسـتابوون،ناتوانین بلـێین کامـە کورکـەی دڵ یـان دەنـگ و هـاواری دەروونیی وەخۆیهێنابوونەوە یا چلۆن لەو شوێنەی رانابوون، جـاریٚ بـە شـوێن بۆنـە وبەڵـگەدا گـەڕان کـارێکی بـیٚفایدەیـە، هـەر کـەس چـۆنی پـیٚخۆشـە وایلێـکبداتـەوە. هاوسـەری چاوپزیشک کە چاوی پێیان کەوت گوتی وەرنەیاریـدەم، ژنی کوێرەپیـاو پرسـی چلـۆن، خـۆ ئێمـە نـابینین. خۆتـان رووتکەنـەوە، هـەتا بـەرگی تـەرمان کـەمتر بـیٚ پاشـان ویشـک

کردنەوەیانهاسانترە، خێزانی کوێرەپیاو دووپاتی کردەوە خۆ ئێمە نابینین، کچەوتی گرینگ نیە، هەر چی بۆمان بکرێت دەیکەین، هاوسەری چاوپزیشک گوتی منیش پاشان دەستێکیان پێدادێنم و رایاندەکوشم، جا با دەس بەکار بین، وەرن، ئێمە لە دنیادا تەنیا ژنێکین کە دوو چاو و شەش دەستی هەیە. رەنگە لە ساختومانەکەی رووبەڕوودا، لە پشت پەنجەرە گاڵەدراوەکان، ژنێکی کوێر، پیاوێکی کوێر بە گوڕمە گوڕمیبێپسانەوەی باران وەخەبەر هاتبێ و سەری بە لاجامەی ساردیپەنجەرەوە نابێ و بە هەڵمی هەناسەی لە سەر شووشە شەوی زیاتربەرەو تاریکی پاڵ پێوە نابێ و ئاخرین کەڕەت بیهێنێتەوە یاد کە وەک ئێستا لە بەر پەنجەرە وێستابوو و سەیری بارانی دەکرد. ئەوان ناتوانن بیهێننە بەرچاو کە سێ ژنی رووتیش لە بەر هەیوان راوەستاون، رووتو قووت، دەڵێی شێتن، نا، بێگومان شێتن، هیچ مرۆڤێکی ئاقڵ بە رووت وقووتی لە بەر چاوی دەر و جیرانان لەبەر هەیوان جل شۆری ناکا، جا باهەموو کەسیش کوێر بێ و نەڕوانێ، دیسانیش ئەوەی بنیادەم بێ شتیوا ناکا، ئەی خوایە، جا چاو چلۆن باران بە سەر و رووویاندا دەبارێ،چۆن دەخزێ، چۆن ئیستێک دەچەقێ و لە کەلێن و قوژبنی تاریک و ونیلەشیاندا گوم دەبێ و لە ئاخریدا لاقیان تەڕ دەکا و لووزەو دەبەستێ،رەنگە لە مەڕ ئەوانەوە بە هەڵە چووبین یا رەنگە نەتوانین ببینین کە ئەوەجوانترین و بەشکۆترین دیمەنێکە کە لە مێژووی ئەم شارەدا رووی‌داوە، توێژاڵێک کەف لەبەر هەیوان لووزەوی بەستووە، ئەی خۆزگەمنیش وێڕای ئەو لووزەوم بەستبایە و لەوپەڕی پاکی و پیرۆزی ورووتیدا رۆڕژابام. ژنی کوێرەپیاو گوتی تەنیا خودا دەمانبینێ، سەرەڕاینائومێدی و نامرادی هێشتاش زۆر توند و پتەو لای وایە کە خوا کوێرنیە و هاوسەری چاوپزیشک بە نا وڵامی دەداتەوە، نا، تەنانەت ئەویش نابینێ، هەور بەری ئاسمانی گرتووە، تەنیا من ئێوە دەبینم، کچەیچاویلکەیی پرسی ئەرێ من ناحەزم، تۆ کز و لاواز و چلکنی، بەڵامجوانی، ژنی کوێرەپیاو پرسی من چی، تۆش وەک ئەو کز و لاواز وچلکنی، بەڵام بە رادەی ئەو جوان نی و لە من شۆخ و شەنگتری، کچەیچاویلکەیی گوتی تۆ جوانی، لە کوێوە دەزانی، خۆ تۆ قەتت من نەدیوە،دووجارم خەو پێوە دیتووی، کەی، دوێشەو جاری دووهەم بوو، چونکەهەستت بە هێمنایەتی و ئارامیی کردووە خەونت بە ماڵەوە دیوە، ئەوەش پاش ئەو هەمووە چەرمەسەری و کوێرەوەرییە مەبەستێکیسرووشتییە، لە خەوتا من ئەو ماڵە بووم و بۆ ئەوەی من بببینیروخسارێکت دەویست و پاشان خۆت سازت کرد، خێزانی کوێرەپیاوگوتی منیش تۆ بە شۆخ و شەنگ دەبینم و خەونیشم پێوە نەدیوی،تەواوی ئەوانە دەیسەلمێنن کە کوێری بۆ ئادەمیزادی ناحەز

بەختیپێوەیە، بەڵام تۆ دزێو نیت، نـا، زۆر دزێـو نـیم، بـەڵام بـەم تەمەنـەوە، کچەپرسـی چمـا تەمەنت چەندە، دەچم بۆ پەنجا، وەکوو دایکم، دایکت چی،چۆن چی، هێشـتاش هـەر جوانـە، زەمانێکی جوانتریش بوو، ئەو دەردە لەهەموانـە، هـەمووومان سـەردەمێکی جـوانتر بـووین، ژنی کوێرەپیـاو گـوتیئێـوە قـەت هێنـدە جـوان نـەبوون، وشـەکان ئـاوان، واژە گـەلی بێئەنوا،هەڵدەخەڵەتێنن، بە سەر یەکا شۆڕ دەبنەوە و دەخلیسکێن، دەڵـێی نـازانن بـەرەو کـوێ دەچن و لەپڕێ بە هۆی دوو، سێ یا چوار وشەیەک کە دێنەسەر زمـان، وەکـوو ئاوەڵـناوێکی کەسـی، جـێناوێـک، کردارێـک یائاوەڵـکارێک سـادە و سـاکارن، بـە هەڵـپە دەبیـنین کـە خۆڕاگریمـانتێـکدەشـکێنن و لـە روخسـار و نیگامانـدا خۆیـەک دەنـوێنن و ئەهوەنیماندەشەمزێنن، جاری وایە دەمار خۆی پـێڕانـاگیرێ، ئـەو دەمـارەی لەگەڵـزۆر شت پێکهاتووە و حاواوەتەوە، هەر بەڕاستی لەگەڵ هەموو شتێکرێک کەوتووە، بە شێوەیەک کـە دەتوانین بڵێین دەڵێی لە پۆلایـە. بەڵـێخێـزانی دوکتـۆر دەمـاری لـە پۆلایـە، بـەڵام بـە بیستنی ئاوەڵـناوێکی کەسی،ئاوەڵـکارێک، کردارێـک، جـێناوێـک و باسـێکی تـەواو رێزمـانی و تەواوتەواوکەر، فرمێسکی لە چاوان دەبارێ، دروست چەشـنی ئـەم دوو ژنە،ئـەوان، ئاوەڵـناوی ونن، دەگرین و ژنی رستە تەواوەکە دەگرنە ئامێز،سێ جوانچاکی رووت لە ژێر بارانـەدا. ئـەو دەرفەتانە دەگمـەن و کـەمخایـەنن، سـەعاتێک پتـرە کـە ئـەم ژنانـە لێـرەن، هـەربینا سـەرمایان بوو،کچەی چاویلکەیی گوتی سەرمامە. بەرگەکان لـەوە باشـتر خـاوێن نابنـەوەو پێڵاوەکـانیش دەڵێی دەستە گوڵن، ئێستا وەختی هاتووە کە ئـەم ژنانـەخۆیان بشـۆن، سـەریان دەخووسـێنن و پشتی یەکتر دەشۆن و چەشنیئەو کچۆڵانەی لە باغا کایەی چاوشارکێ دەکەن فرق و هۆڕیـان دێ ودەتریقێنەوە. بەیان ئەنگووت، یەکەم تیشکی خۆر بەر لـەوەی دیسـانیش لەپشـت هـەوران ماتە هەڵگرێ، لە کەلەکەی دنیاڕا سەری دەسوێیە نا. بارانهەر وا دەبارێ، بـەڵام لەسـەرەخۆتر، ژنـانی جـلشـۆڕ گەڕانەوەئاشـپەزخانە و بـەم خاولییانـەی کـە هاوسـەری چاوپزیشـک لـە دۆلابچەیحەمامەوە هێنابوونی خۆیان ویشک کـردەوە، بـۆن و بەرامـەیان وڵاتیداگرتبـوو، لـە چاو ترووکانێکا سابوون توابوویەوە، بەڵام ژیان هەرئەوەیە ئیدی، دەست بە زۆر رانەگەیی، بـە کەم رازی بە، کەچی دەڵێیوادیارە لەمماڵەدا هەموو شتێک وەگیر دەکەوێ یا دەڵێی دەزانـن لەوەیهەیانە باشترین کەلک وەرگرن، ئاخرییەکەی بەرگیان پۆشی و بەهشتیانوەلانـا، کراسـی خەوی ژنی دوکتۆر تەڕ و بڕە، بـەڵام کراسـێکی گوڵـداریکـردە بـەری کـە لـەمێژ سـاڵ بـوو نەپۆشیبوو و ئەوی لە هەرسێکیانجوانتر دەنواند. کە هاتنە دیوی دانیشتن خێزانی دوکتۆر دیتی

کەپیرەپیاو هەر لە سەر ئەو کورسیلەیەی کە خەوتبوو دانیشتووە. سەری‌لە نێو دەستان گرتبوو و ئەنگوستی لە کاکۆڵی سپی کە بەرەو پاش‌ئەستۆی دادەهاتن رۆ بردبوو، مات و بێ‌دەنگ بوو، لە دەروونیدا هەڵڵا وگرمە بوو، دەتگوت دەیهەوێ بەرگەی دەرباز بوون لە بیرەکانی بگرێ یابە پێچەوانە رێی تێخزانیان گاڵە دا. هەستی بە هاتنەوەیان کرد، دەیزانی‌لە کوێوە هاتوونەوە و چیان کردووە، دەیزانی کە رووت بوون وئەوانەشی بۆیە نەدەزانی کە لە پرێ سۆمایی گەڕابوونەوە چاوانی وچەشنی هێندێ لە پیرەپیاوان خۆی لە پەنا دەرگای حەمام مەلاس دابێ وبە کونی کلیلدا لە هەرسێک ژنەکانی روانیبێ، نەخێر، کوێر بوو و کوێرمابوویەوە، تەنیا هەتا بەر دەرگای دیوی کابان هەنگاوی ناوە و قسە وفرق و هۆڕیانی بیستووە، قوولە قوولی با و خرمە خرمی بارانی‌بیستبووە، بۆنی سابوونی هەڵمژیوە، پاشان گەڕاوەتەوە شوێنی خۆی ولەم بیرانە راچووە کە هێشتاش لەو دنیایەدا ژیان هەیە، ئێستا لە خۆی‌دەپرسێ داخوا بڵێی کوتێکیش بەشی ئەو مابێ. ژنی دوکتۆر گوتی‌ژنەکان خۆیان شۆردووە، ئێستا نۆرەی پیاوەکانە، پیرەپیاو پرسی داخواهەر دەبارێ، بەڵێ، باران دەبارێ. دەفرەکانیش لە پێش هەیوان پڕن لەئاو، کە وایە من وام پێ باشترە لە حەمام خۆم بشۆرم، لە نێو تیانەدا وئەو قسەیەی بە راۆیژێک بە سەر زاریدا هات دەتگوت پێناسی خۆی‌نیشان دەدا، دەتگوت دەیەویست بڵێ من لە تۆرەمەیەکی ترم کە لە جیاتی‌حەمام باسی تیانە دەکا و دریژەی دا هەڵبەت ئەگەر بشێ، نامهەوێ‌ماڵەوە پیس کەم، بەڵێن بێ پڕیشکەی ئاو نەرێژمە تەرکی حەمام، یانی‌تەواو هەوڵ دەدەم وەک گوتم وا بکەم، جا کە وایە من ئاوت بۆ دێنمەحەمام، منیش یارمەتیت دەکەم، کاری خۆم پێ‌دەکرێ، خۆ دەبێ شتێک لەخۆ بگرم، هێشتا لە دەست و دوو نەبووم، دەی کە وایە وەرە. خێزانی‌دوکتۆر تەشتێکی گەورەی پڕئاوی راکێشایە ژوورەوە و بە پیرەی گوت‌ئێرەی بگرە و دەستی کابرای بردە لای لێواری پێشەوە، هەڵیهێنە، بەتەکانێک بەرزیان کردەوە. زۆر چاک بوو لە فریام هاتی، بە تەنیانەمدەتوانی، ئەو پەندەت بیستووە، کامە پەند، ئەوەی کە دەڵێ هیچ کارێک‌لە پیران ناحەز نیە، جا خۆ ئەو پەندە ئاوا نیە، لە جیاتی پیران دەڵێن‌منالان و لە جێی ناحەز دەڵێن عەیب، بەلام ئەگەر قەرار وا بێ پەندەکەمانایەکی هەبێ و زاربەزار بگەڕێ دەبێ لەگەڵ زەمانە بسوورێ و رێک‌بێ. ئێوە فەیلەسووفن، پەح، من تەنیا پیرەمێردێکم. ئاوەکەیان کردە تیانە،پاشان هاوسەری چاوپزیشک دولابچەیەکی بچووکی کردەوە، لە بیری‌بوو کە هێشتاش پاروە سابوونێکی هەیە. سابوونەکەی لە مستی پیرەپیاونا، ئێستا بۆن‌خۆش دەبی، بۆن‌خۆشتر لە ئێمە، خۆت بە هەمووی بشۆ،نیگەران مەبە، رەنگە خواردن وەگیر نەکەوێ، بەلام لە

دووکانانـدابێ گومـان سـابوون دەس دەکـەوێ، سپاسـگوزارم، وریـا بـە هەڵنەخلیسـکێی،ئەگەر پێت‌خۆش بێ مێردەکەم بانـگ دەکـەم بێتـە یاریـدەت، زۆر سـپاس،وام پـێ‌باشـە خـۆم، خـۆم بشۆرم، چۆنت پێ‌خۆشە با وا بـێ، ئـەها چا بـووو‌ەبیرم هاتـەوە، دەسـتت بـدە بـە مـن، ئەگـەر دەتهەوێ ریشت بتاشی ئەوەش‌تیغ و فلچە، سپاس. هاوسەری چاوپزیشک رۆیی. پیرەپیـاو ئـەو دەرپێیەی‌لە دابەشکردنا پێی براببوو دایماڵی و ورد و ئارام لە تیانەکە خزا. ئاوەکەهەم سـارد بـوو هەم کەم، کەمتر لە بستێک، ئەم حەوزۆکە بچووکە لە کوێ‌و ئەم لووزەوی ئاوی لە ئاسمانـەوە بە سەر سێ ژنەکەدا دەباری لەکوێ، هەیهوو چەندیان مابەینە. چۆکی دادا، پشوویەکی قووڵـی هەڵکێشا ولـە ناکـاو بـە هـەرتک دەسـتان ئـاوی وەسـینگی هەڵـدا کـە خـەریک بووهەناسـەی راوەستێ. خێراخێرا ئاوی لە خۆی هەڵپرژاند هەتا مەودای‌هەڵلەرزین و لێوەلەرزەی نەبێ، پاشان سمت و ران و نێوگەڵانی، بە خۆی‌گوت لە حەیوانیش خراپترم لێ‌هاتووە، دوای رانی بـاریکی نۆرەی ئەوچڵـکە بـوو کـە لـە ئـەژنۆ بـەرەژێری کـەمرەی کردبـوو. کـەفی سـازکرد هـەتاباش بخووسێ، گوتی دەبـێ سـەرم بشـۆرم و دەسـتی بـردە پشـتە سـەری‌هـەتا گرێـی چاوبێنەکـەی بکاتەوە، تۆش دەبێ خاوێن کرێتەوە، کردییەوەو لـە ئاوەکـەی هاویشـت. ئێسـاکە تینێکـی لـە لەشی زابوو، سەری تەڕ کـرد وسـابوونی لـێ‌دا، هـەموو گیـانی کـەفاوی بـوو، سـپی لـە نێـوان سپیایی‌بێ‌سنووری کوێری کە لە چاوی هەموان نـەدیو بـوو، بـەڵام بێتـوو ئـاوای‌بـیر کردبایـەوە خۆی فریو دەدا، دروست لەم کاتەدا هەستی کرد کە یـەکێک‌دەسـتی رەپشـتی دەخـا، کـەفی سەر باسک و سینەی رادەماڵێ و نەرم نەرم‌دەیباتەوە نێو شانی، چونکە ناتوانێ ببینێ، ناچارە بـە وردی دەستبزوێ، پێی‌خۆش بوو بپرسێ کێی، بەڵام قسەکەی نەهاتە سەر لێو، ئێسـتادەلەرزی بـەڵام نـەک لـە سـەرمان، پەنجـەکان بـە ئـارامی دەیانشـۆرد، ژنەنـەیگوت مـن هاوسـەری چاوپزیشکم، ژنی کوێرەپیاوم، کچەی چاویلکەییم،دەستەکان کاری خۆیان کـرد و کشـانەوە، لەم بێ‌دەنگییـەدا دەنگـی‌پێـوەدرانی لەسـەرەخۆی دەرگـا هاتـە گـوێ، پـیرە تـەنیا مایـەوە، لـە تیانەکەدابە چۆک دادانەوە هەڵدەلەرزی، دەتگوت لەبەر خودا دەپاڕێتەوە، لە خۆی‌پرسی بڵێی کێ بووبێت، مەنتیق وای دێنا کە ئەوە تەنیا کاری ژنی دوکتۆربووبێ، تـەنیا ئـەوە کـە دەبینـێ، تەنیا کەسێکە کە باڵی بە سەر کێشاوین وئاگـای لێمـان بـووە و خـورد و خـۆراکی پـێ‌داویـن، سەیر نیە کە وا ئاگای لەمنە، ئەوە رێی ئاقڵە، بەڵام خۆ ئاوەزیش بۆ متمانە پێ‌کـردن نابـێ. هـەر وادەلەرزی، نەیدەزانی لە شەرم و خۆشییانە یان لە سەرمان. چاوبێنەکەی‌لـە تـەختی بـنی تیانـەدا دۆزیوە، زۆر جوان شۆردی و رایکوشی و لە چاوی‌بەستەوە، بـە چاوبێنـەوە کـەمتر هەسـتی بـە

رووت بــوون دەکــرد. کاتێــکویشــک و برینــگ و بــۆنخــۆش هاتــەوە دیــوی دانیشــن، هاوسەری چاوپزیشک گوتی ئێستا پیاوێکمان هەیە کە هەم خاوێنە و هەم تیف تیفـەدراو، پاشـان بە راوێژێکی خەماوی گوتی زۆر حەیف کە کەس نەبووپشتت بشـوا، پیرەپیـاو متـەقی نـەکرد، تەنیا وەبیری هاتەوە کە چاکی کردووە متمانەی بە عەقڵ نەکردووە.

ئەو برە خواردنەی مابوو لە پێش کورە خێلەیان دانا، ئەوانی تردەبوو چاوەڕوانی خـواردنی تازە بـن. لـە دۆلابچـەی ئازووخـەدا چەندشووشـەی مرەبـا، هێنـدێک دانەوێلـە، شـەکر، چەنـد بیسـکویتی کـۆن و بـەیاتو بـڕێک نانەڕەقـە هـەبوو، بـەڵام پێویسـت بـوو ئەوانـە بـۆ ڕۆژی رەشترراگیرێن، پێویست بوو ڕۆژاوڕۆژ خواردن پەیـدا کـەن و ئەگـەر هاتووتـاقمی نـانهێنـەوە چەوتی هێنا و چەتی کەوتە کارەکەی و بە دەس بەتاڵی گەڕایەوە بێ ئازووخـە نەمێننـەوە، لـەو کەینـە و بەینـەدا هـەر یەکـەی دووبیسـکویت، کـەوچکێک مرەبـای گـاتوو یـان هەڵــوو، گوێزونیوێک وشەربەیەکیان ئاو وەبەر کەوت، ئەو ئاوەی هەتا مابوو نیعمـەتێکی ئاسمـانی بـوو. ژنی کوێرەپیاو گوتی ئەویش دەیهـەوێ وەشـوێن خـورد وخـۆراک کـەوێ، بـە سـێ کەسـی باشترە، جا با کوێریش بن، دوویاندەیانتوانی لە هێنانەوەی خـورد و خۆراکـا یارمـەتی بـدەن و هەر وەها بێمەیلیش نـەبوو بـەم بیانوویـەوە سـەرێکێش لـە ماڵـەوە بـدا و بزانـێ چ باسـە،داخوا کەسی تێوە چووە و ئاشنان، بۆ وێنە بلێی جیرانەکانی نەبن کەئێسـتا زۆر بـوون، چونکـە خزمـە دێنشینەکانیان بە هیوای دەرباز بوونلە چنگ کوێریی پەرەگر پـەنایان بـۆ هێنـاون، ئـاخر شـار هەمیشەخزمەتگوزاریی زیاتری لێیە. بەم پێیە سێبەسێ وەڕێ کەوتن، هەرچەندی جل و بەرگی ویشکی لە بەر دەستان بوو پۆشیان، ئەوانی تر،ئەوانەی کە خۆیان شۆردبوو، دەبوو چـاوەڕوانی ئـەوە بـن هـەوا تـۆزێکی هەڵـبرینگێنێ، ئاسمـان هـەر وا مـڕچ و مـۆن و سـاماڵ بـوو، بـەڵام مەترسیی هەڵکردنەوەی باران لـە گـۆڕا نـەبوو. سـێڵاو بـە تایبـەتی لـە شەقامەسـەرەوخوارەکاندا خلت و خاڵ و زبڵ و زاڵی راداوە و لە گۆشە وکەنارانی کۆ کردوونەوە و بەشـێکی زۆری لـە پیادەڕەوەکان خاوێن کردۆتەوە. ژنی دوکتۆر گوتی بریا بـاران لێـی نەکردبایـەوە، ئەگـەر ئـاوا بێو نەبارێ هەتاو حاڵمان پەشێو دەکا، هەر ئێسـتاش چڵـک و چەپەڵـیی وبۆگـەن لـە هـەرد و ئاسمانەوە هەڵدەقوڵێ و دادەبارێ، ژنی کوێرەپیاوگوتی ئێستا کە خاوێن بووینەوە زیاتر دڵمان رێکدەکوشرێ، مێردەکـەیقسـەکەی ئەسـتاندەوە و بـۆی سـەلماند، ئەگـەرچی وایـدەزانی بـە ئـاویسـاردی حـەمام نـەخۆش کـەوتووە. پـۆل پـۆل کـوێر بـە شـەقاماندا دەهـاتن ودەچـوون، دەرفەتیان لە خۆش کردنەوەی هـەوا هێنـابوو کـە هـەم بـە شـوێنخواردنـا بگـەڕێن و هـەمیش

سەرەڕای کەم خۆراکی لە شوێنێک خۆیانسووک کەن. سەگەل بۆنیان بە هەموو جێیەکەوە دەکرد و زبڵ و زاڵیاندەپشکنی. سەگێکی شپرێوی چاو شێت مشکێکی خنکاوی بە قەپ گرتبوو، رووداوێکی دەگمەن کە تەنیا بارانەی بە غوڕڕمی ئەو بەینەدەیتوانی سەروبەری بەریتەوە سەر یەک، بێ گومان سێلاو مشکەی زۆرپیس لە قۆل خستبوو کە مەلە و مەلەوانیی فریای نەکەوتبوو. سەگیئەسرینلێسەوە بۆ راو و شکار تێکەلاوی تاقمی هاوڕێیانی پێشووینەدەبوو، ئەو ڕێی خۆی تاق کردۆتەوە، بەلام لەوە راناوەستێ یەکێکپەنچکە سەولەیەکی بداتێیە، خوا دەزانێ ئێستا خەریکی هێنان و بردن وداکرۆژتنی چیە، ئەم کۆما زبلانە خەزێنەی وای تێدا حەشار دراوە کەهەر باوەڕ ناکرێ، تەنیا دەبێ تێیبگەڕێی و بیدۆزییەوە. کوێرەپیاو وژنەکەشی ناچار دەبن هەر دەم پێویست بێ بیرگەیان بپشکنن و ژێر وژووری کەن، ئێستا هەر چوار لایان بە یاد کردووە، نەک چوار لای ئەومالای کە تێیدا نیشتەجێن، بەڵکوو چوار گۆشەی شەقامەکەیان، ئەو چوارلایەی لە جێی چوار تەنیشتی سەرەکین، کوێرەکان سەرنج نادەنەرۆژهەلات و رۆژاوا یان باکوور و باشوور، تەنیا دەیانهەوێدەستەکوتەیان بەرەو شوێنی دڵخواز رێنوێنیان بێ، لە پێشوودا کەرادەیان کەم بوو گۆچانی سپییان بە دەستەوە دەگرت، تەقە تەقیچێوەکوتەیان لێرولەوێ وەکوو رەمزێک وا بوو کە رەوگەی نیشاندەدان، بەلام ئێستا کە هەموو کوێرن گۆچانی سپی لەم هەرا و بگرەداهەر بەکار نایە. هەر وەک هەموو دەزانن سەگەل جگە لەوەی کە بەغەریزەمان ناودێر کردووە، بە شتی تر ڕێی خۆیان دەدۆزنەوە،ئاشکرایە لەبەر ئەوەی چاویان چاک هەتەر ناکا خۆشیان زۆریان بڕوایێی نیە، بەلام لە بەر ئەوەی لمبۆزیان لە چاویان لە پێشترە هەمیشە هەرجێیەکی پێیان خۆش بێ لێی قوت دەبنەوە و لەم بابەتەوە سەگیئەسرینلێسەوە بۆ دڵنیایی زیاتر پەلی بەرەو هەر چوار تەنیشتی باهەڵێنا، بێتوو رۆژێک گوم بێ شنەبا ئەرکی هێنانەوە ماڵی دەگرێتەئەستۆ. تاقمی سێ کەسی هەر وا درێژەی بە ڕێی خۆی دەدا و ژنیدوکتۆر بۆ پڕ کردنی دۆلابچەی بەتاڵی خورد و خۆراکیان سەر و بنیشەقامی بۆ دۆزینەوەی دووکانی بەقاڵ و خواردەمەنی فرۆشان بەچاودەپشکنی. تالان هەر وا درێژەی هەبوو، چونکە لە بەقاڵییە کۆنەکانهێشتاش تۆزێک نۆک و باقلە وەدەست دەکەوت، ئەم دانەوێلانە کە لێنانو کولاندیان وەختگرە و بۆ سازکردنیان ئاو و ئاور پێویستە،ئێستەکانێ خوازیارێکی وایان نیە. هاوسەری چاوپزیشک زۆری کەیفبە پەند و مەندان نەدەهات. بەلام وێدەچوو شتێکی لەم پەندە کۆنە لەبیرگەدا مابێتەوە، هەر بۆیە دوو توورەکەی لە نۆک و باقلە ئاخنی، یەکێلە

نەنکەکانی دەیگوت بپۆشە و بنۆشە و ببەخشە، بەلام شتێکی هەلگرەبۆ پاشەرۆژ، ئەو ئاوەی نۆک و باقلەی تێدا دەنێیە خووس بە کەلکی کولاندنیشیان دێت، ئەو ئاوەی پاش کولان دەمێنێتەوە ئیتر هەر ئاوی‌روون نیە بەلکوو خۆی جۆرێک تاماوە. لە سروشتا هەموو شتێک‌جاروبارە ون نابێ و بەلکوو شتێکی لێ زیاد دەبێ.

چما نەیاندەویست بچنە ئەو شەقام و گەڕەکەی کە کوێرەپیاو وخێزانی مالیان وا لەوێ بوو، کە وایە بۆچی سەرەڕای ئەوەی زۆریان‌مەودا مابوو ئەوەندە نۆک و باقلەیەی وەبەر دەستیان هات کۆیان‌کردەوە و لە خۆیان بار کرد، ئەم پرسیارە تەنیا بە مێشکی کەسێکدارادەبرێ کە هەرگیز لە ژیانیدا تامی تالی نەبوونیی نەچێشتبێ. هەر ئەودایە گەورەیە دەیگوت ئەگەر بەردیشت وەگیر کەوێ بیبەوە مال، بەلام لەبیری چووبوو درێژەی بدا و بلێ تەنانەت ئەگەر ناچار بی دەوری دنیاش‌سووڕ بدەی، ئەوە هەر ئەم کارستانە بوو کە دەیانکرد، یانی بەدوورترین رێگادا بەرەو مال دەبوونەوە. کوێرەپیاو پرسی ئێمە لەکوێین، رووی قسەکەی لە خێزانی دوکتۆر بوو کە چاوی بۆ رۆژی وابەکار دەهات و گوتی ئالێرە بوو کە من کوێر بووم. لە سەر ئەوچوارڕێیەی کە چرای رێنوێنیی لێیە، یانی هەر راست لێرە، لەو سووچە،بەلێ راست لێرە، پێم خۆش نیە وەبیرم بێتەوە، لە نێو ئوتۆمبیلەکەمداکەوتبوومە تەلە و هیچ جێیەکم نەدەبینی، خەلک هەرایان دەکرد، من‌پەرۆش و لێ‌قەوماو هاوارم دەکرد من کوێر بووم، هەتا ئەو پیاوە لێم‌پەیدا بوو و بۆ مالی بردمەوە، ژنی کوێرەپیاو گوتی پیاوەی قوڕ بە سەر،تازە قەت ماشێن نادزێ، ژنی دوکتۆر گوتی ئەوەندە لە مەرگ دەترسین‌کە هەمیشە دەمانهەوێ لە تاوانی مردۆکان خۆش بین. دەلێی هەر لەپێشدا دەمانهەوێ کە نۆرەمان هات لە تاوانی ئێمەش خۆش بن، ژنی‌کوێرەپیاو گوتی ئێستاش تەواوی ئەو رووداوانە وەک خەون و خەیالدەچن، دەلێی خەونم دیوە کە کوێر بووم، شووەکەی گوتی منیش کە لەمالەوە چاوەڕوانت بووم هەر ئاوام بیر دەکردەوە. ئەم مەیدانەی ئەوکارەساتەی لێ‌قەوما بوو وردە وردە بەجێ‌ما، ئێستا بە شەقامی هەورازو تەسک و پڕ خوارەکە و پێچەکەدا وەسەر دەکەوتن، هاوسەری دوکتۆرئێرە چاک بەلەد نیە، بەلام کوێرەپیاو ون نابێ و بە رێیە دەزانێ، ژنی‌دوکتۆر ناوی شەقامەکان دەخوێنێتەوە و ئەو دەلێ بادەینەوە بۆ لای‌چەپ، ئێستا بۆ لای راست، لە ئاخریدا دەلێ ئەوە شەقامی ئێمەیە،مالەکەمان لە قۆلی چەپە، کەوتۆتە نێوەڕاستی شەقام، هاوسەری‌چاوپزیشک پرسی پلاکی ژمارە چەندە، پیاوە وەبیری نایەتەوە، گوتی‌دەی، نەک ئەوەی وەبیرم نەیەتەوە، جارێ مێشکم حەبەساوە، ئەگەرشوێنی ژیانمان پێ‌نەزانینەوە زۆر

خراپ و بێفەڕە، ئەگەر خەون وخەیاڵ بیرگەمان پڕ کەن چیمان بە سەر دێت، قەیدی ناکا، ئەمجار گرینگ‌نیە، زۆر باش بوو کە هاوسەری کوێرەپیاو لەگەڵیان هات، ئێستا ئەوژومارەی پلاکەکە دەڵێ، بەم کارە ئیتر پێویست ناکا دەستەوداوێنی کوێرەپیاو بێ کە خۆی هەڵدەمسێنێ کە بە سێحری دەس پێداکێشان‌دەرگاکەیان دەناسێتەوە، وەک ئەوەی گۆچانی سێحراوی بە دەستەوەبێ و بە سێ چوار ئاماژان تەواوی شکڵ و وێنەی دەرگاکە دیاری دەکا ودەڵێ دڵنیام کە خۆیەتی. چوونە ژوورەوە، هاوسەری چاوپزیشک لەپێشەوە بوو، پرسی نهۆمی چەندە، کوێرەپیاو گوتی نهۆمی سێ، بیرگەی‌وەک دەینواند هێندەش بێهێز نەبوو، ژیان هەر ئەوەیە ئیدی، هێندێک‌شتمان لە بیر دەچێتەوە و بڕێکمان لەبیر دەمێنن، بۆ وێنە لە بیرمانەوەختێک تازە کوێر ببوو هەر لەم دەرگایەوە وەژوور کەوت، ئەو پیاوەی‌هێشتا ئوتۆمبیلەکەی نەدزیبوو پرسی لە نهۆمی چەندی و ئەم وڵامی‌دابوویەوە نهۆمی سێ، جیاوازییەکەی ئەوەیە ئەمجارەیان بە ئەسانسۆرسەر ناکەون، لە پلیکانی نەبەدی وەسەر دەکەون کە هەم تاریکە و هەم‌تروسکەدار، ئەوانەی کوێر نین چەندە دڵیان بۆ گڵۆپی کارەبا، تیشکی‌هەتاو یا شەم تەنگ دەبێ، ئێستا ژنی دوکتۆر تۆزێک لەگەڵ تاریک وروون راهاتووە، لە نیوەی رێیەدا تووشی دوو ژنان دەبن کە لە قاتەکانی‌سەرەوەڕا دێنە خوار، رەنگە لە نهۆمی سێهەمڕا بەرەو خوار بووبن. کەسێ شتێکی نەپرسی و متەقی نەکرد، بەڕاستی جیرانیش هەر جیرانی‌قەدەیم.

دەرگا داخرابوو. هاوسەری چاوپزیشک گوتی ئێستا چ بکەین،کوێرەپیاو گوتی واوەرن لە ئەستۆی من. جارێک، دووجار سێ جاریان‌لە دەرگا دا. لەو دەمەدا کە یەکیان گوتی کەس لە ماڵ نیە دەرگا کرایەوە،ئەم درەنگ دەرگا کردنەوە سەیر نیە، بێتوو مرۆڤێکی کوێر لە بنەبانی‌ماڵەوە بێ خۆ ناتوانێ هەڵێ و خێرا دەرگا بکاتەوە. ئەو پیاوەی دەرگای‌کردەوە پرسی کێیە، چیتان گەرەکە، روخساری مەند و پتەوی دەنواند،وێدەچێ دوو سێ قسەی لەگەڵ بکرێ. کوێرەپیاو گوتی ئێرە ماڵی منە،ئەوی تر گوتی ئاخ، داخوا کەسیشتان لە تەکایە، بەڵێ خێزانم وئاشنایەک، لە کوێوە بزانم کە راست ئێژن، ژنی کویرەپیاو گوتی زۆرهاسانە، هەر چی لە ژوورەوە دایە یەک یەک بۆتان دەژمێرم. تاوێک راماو گوتی فەرموونە ژوورەوە. هاوسەری چاوپزیشک پاش هەموان‌وەژوور کەوت، لێرە کەس کوێرکێش و رێنوێنی نەدەویست. کابرای‌کوێر گوتی من تەنیام، بنەماڵەکەم بە شوێن خواردنا چوون، رەنگە واباشتر بوایە وتبام ژنەکان، بەڵام لام وا نیە بەڕێوجێ و جوان بێ، تاوێک‌راوەستا و پاشان درێژەی دا بەڵام رەنگە وا بیر بکەنەوە کە دەبوایەفەرقیانم بزانیایە، ژنی دوکتۆر پرسی مەبەستت چیە، ئەم

ژنانەی باسمکردن هاوسەرم و دوو کیژۆڵەی خۆمن و من دەبێ وشەی «ژنەکان» لەجێی خۆیا لەکار بکەم، ئاخر نووسەرم و نووسەران دەبێ شان و شکۆ وپلە و پایەی کەلام بناسن. کوێرەپیاو پێی خۆش بوو، تۆ بیری لێبکەوە،نووسەرێک لە ماڵی مندا بنەگر بووە، پاشان دڵی غایلەی کرد، بڵێی بێتووناوی بپرسێ کارێکی ناحەز نەبێ، رەنگە ناوی بیستبێ، تەنانەت رەنگەشوێنەواری لێخوێندبێتەوە، هێشتا لە نێوان خۆپارێزی و قوژبنپشکنیدا پەلەقاژەی بوو کە ژنەکەی بێ لە روودامان ئەم پرسیارەیهێنایە گۆڕ، ناوتان چیە، ئینسانە کوێرەکان پێویستییان بە ناو نیە، من لەدەنگما خولاسە ئەبمەوە، شتێکی تر گرینگ نیە، هاوسەری چاوپزیشک گوتی بەڵام ئێوە کتێبتان نووسیوە و ناوت وا بە سەریانەوە، ئێستا کەکەس ناتوانێ موتالایان بکا هەر ئەڵێی هەرگیز نەبوون و نین. کوێرەپیاوتەماشای کرد باسەکە لەم مەبەستەی ئەو پێی خۆش بوو زۆر دوورکەوتۆتەوە، پرسی دەی چلۆن بوو کە هاتنە ماڵی من، چەشنی زۆرکەسان کە ئێستا لە ماڵی خۆیانا ناژین، لە ماڵی منا تاقمێک بنەگر بوونکە قسەی دروستیان بە گوێیا نەئەچوو، ئەکرێ بڵێین ئێمەیان بە شەق لەپلیکانان بەرەو خوار کرد، ماڵەکەتان زۆر لێرەوە دوورە، نا، هاوسەریدوکتۆر پرسی هیچ هەوڵتان نەدا وەریگرنەوە، ئەم رۆژانە ماڵەوماڵکردن بۆتە شتێکی ئاسایی، دوو جار هەوڵم دا، ئێستاش هەر لە جێیخۆیانن، بەڵێ، کوێرەپیاو پێیخۆش بوو هەڵوێستی بزانێ، ئێستا کەزانیتان ئێرە ماڵی ئێمەیە دەتانهەوێ چ بکەن، ئێوەش دەتانهەوێ ئێمەوەک ئەوان لە ماڵی خۆمان وەدەر بنێن، نا، نە تەمەنم ئیزنی ئەم کارەمپێدەدا و نە تواناشم هەیە، بێتوو ئەم کارەشم لە دەس هاتبا لام وایەشتی ئاوا دزێوم نەئەکرد، سەبر و لەسەرەخۆیی بۆ نووسەران پێویستە. کە وایە ماڵەکەمان بۆ چۆل کەن، بەڵی، ئەگەر نەتوانین رێچارەیەکی تربدۆزینەوە، من نازانم رەنگە چ رێچارەیەک پەیدا بێ. هاوسەریچاوپزیشک گومانی بردبوویە بەر وڵامی نووسەرەوە، لام وایە ئێوە وهاوسەر و ئاشناکەتان لە ماڵێکا بنەگر بووبن، بەڵێ، لە راستیدا لە ماڵیئەوا نیشتەجێین، فرە لێرەوە دوورە، زۆر نا، کە وایە ئەگەر ئیزنبفەرموون من پێشنیارێکم هەیە، فەرموون، ئەڵێم چۆنە هیچمان لەشوێنی خۆمان نەبزووین، جارێ هەر دوو لا نوا و پەسارێکمان هەیە،منیش هەر وا ماڵەکەم ئەخەمە ژێر چاوەدێری و هەر کات چۆڵ بوو خێرائەگوێزمەوە، ئێوەش هەر ئەم کارە بکەن و زوو زوو سەر بدەن و هەرکات چۆڵ بوو وەرنەوە ئێرە، هیچ ئەو بیرەم بەلاوە پەسند نیە، منیشچاوەڕوانی ئەمە نەبووم، بەڵام گومانم هەیە کە ئاخرین رێگا هەڵبژێرن،ئاخرین رێگا وەک چی بێ، وەک ئەمەی کە ئێوە ئێرەمان لێوەرگرنەوە،بەڵام ئەگەر ئاوا بێ، بەڵێ ئەگەر ئاوا بێ ئێمە ناچارین

نوایەکی تربدۆزینەوە، ژنی کوێرەپیاو هەڵیدایە، نا هەر بیریشی لێمەکەنەوە، واباشترە دەس لە خۆمان نەدەین هەتا بزانین چۆن دەبێ، نووسەر گوتی‌رێ‌چارەیەکی تریشم بە بیرا هات، کوێرەپیاو پرسی چ ڕێگایەک، ئێمەلێرە میوانتان ئەبین، ماڵەکە جێی هەموومانی ئەبێت، ژنی کوێرەپیاوگوتی نا، ئێمە هەر وەک جاران لە لای دۆستەکەمان دەمێنینەوە و ڕووی‌کردە ژنی دوکتۆر و درێژەی دا لام وایە پێویست ناکا لەو بارەوە هیچ لەئێوە بپرسم و بە دوای وڵامێکدا بگەڕێم، نووسەر گوتی دیارە وڵامی‌منیش کە هەر پێویست ناکا، من خۆم بە قەرزداری هەموو لایەک ئەزانم،لە تەواوی ئەم ماوەیەدا چاوەڕوان بووم کە یەکێک بێت و داوای ماڵەکەبکاتەوە، هاوسەری چاوپزیشک گوتی وەختێک ئادەمیزاد کوێرە زۆرشتێکی ئاسایی و سروشتییە کە رازی بێ بەو شتەی وا هەیەتی، لەوەتی‌کوێریی پەرەگر وڵاتی داگرتووە ئێوە چۆن ژیاون، هەر سێ ڕۆژ بەر لەئێستا بەندی قەرەنتینەمان هەڵبواردووە، دەی دەی، کە وایە ئێوەدەس‌بەسەر بوون، بەڵێ، زۆر تاڵمان رابوارد، تاڵتر لە تاڵ، چ‌کارەساتێک، ئێوە نووسەرن، هەر وەک ئیستێک پێشتر گوتتان ئەرکی‌ئێوە ئەوەیە کە پلە و پایەی کەلام بناسن، کە وایە دەزانن کە ئەو قسانەدەردێکمان دەوا ناکەن، بۆ وێنە ئەگەر کەسێک یەکێک بکووژێ باشتروایە روون و ئاشکرا و ڕێ و راست باسی بکەین کە ئەو کردەوەیە خۆی‌لە خۆیا ئەوەندە کردارێکی دزێوە و روح ژاکێنە کە پێویست ناکا بڵێین‌کارەساتێکی خۆفناک بوو، مەبەستتان ئەمەیە کە زیاتر لە رادەی‌پێویست وشەگەلمان بە دەستەوەیە، مەبەستم ئەوەیە کە ئیحساساتمان‌زۆر و پتەو نیە، یا ئەمەی کە ئیحساساتمان هەیە بەڵام ئەم واژانەی کەئەتوانن بە وردی بیدرکێنن نایانهێنینە کایەوە، جا بەو شێوەیە ئەوانمان‌لە دەس دەردەچێ، پێم خۆشە بزانم بارودۆخی ژیانتان لە قەرەنتینە داچۆن بووە، بۆچی، چونکە من نووسەرم، پێویست بوو خۆتان لەوێ‌بووبان، نووسەریش هەر وەک خەڵکی تر ناتوانێ هەموو شتێ بزانێ یالە هەموو شوێنێ ئامادە بێ، ناتوانێ هەموو شتێکیش تاقی کاتەوە، دەبێ‌لێرولەوێ بپرسێ و خەیاڵی بێنێتە کایەوە، رەنگە رۆژێکی تەواوی‌رووداوەکەت بۆ بگێڕمەوە، ئەو کات دەتوانن کتێبێک بنووسن، بەڵێ هەرئێستەش خەریکی نووسینم، چلۆن، خۆ ئێوە کوێرن، کوێرەکانیش‌ئەتوانن بنووسن، مەبەستتان ئەوەیە کە دەرفەتی ئەوەتان هێناوە کەئەلف و بێی برێیل فێر بن، من برێیل نازانم، کوێرەپیاو پرسی کە وایەچۆن دەنووسن، ئێستا نیشانتان ئەدەم لەجێی خۆی هەستا، لە ژوورەکەدەرکەوت و پاش ئیستێک گەڕایەوە، پەڕە کاغەز و قەڵەمێکی لە دەستابوو ئەمە دواین پەڕێکە کە نووسیومە، ژنی کوێرەپیاو گوتی خۆ ئێمەنابینین، نووسەر وتی منیش

نایبینم، هاوسەری چاوپزیشک پرسی کەوایە چۆن دەنووسن، لێرەدا، لە تاریک و روونی ژووورەکەدا سرنجی کەوتە سەر هێڵە تێکبەزیوەکان کە جاری وا بوو یەکتریان تەواوتێکهەڵشێلابوو، نووسەر بە پێکەنینەوە گوتی بە دەس پێیاکێشان،کارێکی سانایە، کاخەزەکە دەنێیتە سەر شتێکی نەرم، بۆ وێنە سەر چەندپەڕە کاخەزی تر، پاشان ئەمێنێتەوە نووسین، کوێرەپیاو گوتی بەڵام خۆئێوە چاوتان سۆمایی ناکا، قەڵەم بۆ نووسەرانی کوێر ئامرازێکی باشە،چونکە ناهێڵێ ئەمەی نووسیویانە ببینن، بەڵام شوێنی نووسراوەکەیان پێ نیشان ئەدا، تەنیا ئەبێ بە سەر پەنجە شوێنی دوایین دێڕی نووسراوبدۆزێتەوە، ئەم کات ئەتوانن هەتا قەراخی کاخەزەکە بنووسن و دیاری کردنی مەودای هێڵەکەی دواتریش هاسانە، هاوسەری دوکتۆر بە هێمنی کاغەزەکەی لێوەرگرت و گوتی هێندێک لە دێڕەکان کەوتوونە سەریەک، چۆن زانیت، من دەبینم، نووسەر بە هەڵپە گوتی ئێوە ئەبینن،سۆمایی چاوتان گەڕاوەتەوە، چۆن چۆنی، کەی، پێموایە تەنیا کەسێکم کە قەت موقراییم دانەهاتووە، چۆن، چۆن شتی وا ئەبێ، نازانم چۆن،رەنگە هیچ هۆیەک بۆ ئەو هەڵکەوتە نەبێ، هەر ئێوە تەواوی رووداو وکارەساتەکانتان بینیوە، هەر چی توانیومە دیومە، چارەیەکی دیکەمنەبووە، لە قەرەنتینەدا چەند کەس بوون، نیزیکەی سێسەد کەس، لەکەیەوە، لە ئەوەڵەوە، هەر وەک گوتم سێ رۆژە دەربـاز بووین،کوێرەپیاو گوتی وەک بزانم من یەکەم کەسم کە کوێر بووم، بێ گومانخۆفناک بووە، ژنی دوکتۆر گوتی دیسانیش ئەو وشەیە، ببوورن،بەجارێ ئەمەی نووسیومە، یانی لەم کاتەوە من و بنەماڵەکەم کوێربووین نووسیومە، هەموویم بەلاوە بە گاڵتەجاڕی هاتە بەر بیر، لەبارەی چیدا نووسیوتە، لە بارەی ئەو دەرد و کوێرەوورییەی بینیومانە، لەمەڕ ژیانمانەوە، هەموو کەس دەبێ باسی شتێک بکا کە دەیزانێ وئەوەی نایزانێ دەبێ بپرسێ، هەر بۆیە لە ئێوە ئەپرسم، منیش وڵامدەدەمەوە، نازانم کەنگێ، بەڵام رۆژێک وڵام دەدەمەوە. خێزانی چاوپزیشک هەر وا بە هێمنی کاغەزەی نایەوە دەستی نووسەر. تکایەشوێنی کار و نووسراوەکانتم نیشان بدەن، بەڵێ بە سەر چاو، لە تەکماوەرن، ژنی کوێرەپیاو گوتی دەکرێ ئێمەش بێین، نووسەر گوتی ماڵیخۆتانە، من تەنیا رێگام کەوتۆتە ئێرە. لە هۆدەی خەوا مێزێکی بچووک وچرایەکی خامۆشی لێبوو. ئەو برە نوورەی لە پەنجەرەوە خۆی بەژوورا دەکرد چەند پەڕ کاغەزی سپی لە لای چەپەوە دێنایە بەرچاو،چەند پەڕی تر بە نووسراوی لە لای راستەوە خۆیان دەنواند، لەنێوەڕاستا رووپەڕێکی نیوە نووسراو دیار بوو. دوو پێنووسی تازە لەتەنیشت چرا دانداربوون. نووسەر گوتی ئێرەیە. هاوسەری چاوپزیشک گوتی

ئیزن هەیە و بێ ئەوەی چاوەڕوانی ولام بێ کاغەزە رەش‌کراوەکانی دەس‌دایە، نیزیک بیست پەڕێک دەبوو، چاوی بە خەتی ورد وتێک‌بەزیو و لار و لوێری نووسەرا کە سەردەمی کوێری نووسرابوون‌داگیرا، نووسەر گوتبووی من تەنیا رێگام کەوتۆتە ئێرە و ئەوانە ئەونیشانانە بوون کە کاتی تێپەڕین بە ئێرەدا جێی هێشتبوو. هاوسەری‌دوکتۆر دەستێکی لە سەر شانی دانا و ئەو هەر دوو دەستی هێنایە پێش،دەستی ژنەی گرت و بە هێمنی بەرەو لێوی برد، گوتی خۆتان مەدۆڕێنن،مەهێڵن تێیا بچن، ئەم رستە چاوەڕوان نەکراو و پڕ رەمز و رازە زۆریش‌بەجێ نەبوو، یانی لەگەڵ بار و دۆخەکە یەکتری نەدەخوێندەوە.

کاتێک بە پاشەکەوتی سێ‌رۆژەوە گەڕانەوە ماڵ خێزانی چاوپزیشک‌رووداوەکەی گێڕایەوە، بەڵام کوێرەپیاو و ژنەکەی پەیتا پەیتا بە هەڵپەدەچوونە نێو قسەکانی. ئەو شەوە، هەر وەک وا جوان و هەق بوو، چەندلاپەڕەی لە کتێبی نووسەر بۆ هەموان خوێندەوە، ئەو پەڕانەی لەژووری کاری نووسەرەوە هێنابوونی. کوڕێژگەی خێل مەیلێکی بۆبیستنی چیرۆکەکە نەنواند و پاش ئیستێک خەوی لێ‌کەوت، سەری لەسەر کۆشی کچەی چاویلکەیی و لاقی لە سەر رانی پیرەپیاو بوو.

دوو ڕۆژ دواتر دوکتۆر گوتی پێم خۆشە بزانم مەتەبەکەم چی بەسەر هاتووە، لە حاڵی حازردا من و مەتەب بە کەلکی هیچ نایەین، بەڵام‌هاتوو ڕۆژێک خەڵک چاویان ڕوون بۆوە، ئامراز و کەل و پەلەکان بلێی‌هەر لە جێی خۆیان بن، خێزانی گوتی هەر وەخت پێت خۆشە دەتوانین‌بچین، هەر ئێستا پێم خۆشە، کچەی چاویلکەیی گوتی ئەگەر زەحمەت‌نەبێ وا چاکە لەو دەرفەتە کەلک وەرگرین و سەرێکیش لە ماڵی من‌بدەین، هەڵبەت لام وا نیە دایک و بابم گەڕابنەوە، تەنیا دەمهەوێ ویژدانم‌ئاسوودە بێ، هاوسەری چاوپزیشک گوتی دەتوانین سەرێکیش لە ماڵەئێوە بدەین. کەسی تر نەیدەخواست لەم دیدارانەدا بەشدار بێ، نەکوێرەپیاو و ژنەکەی کە دەیانزانی ماڵەکەیان وەزعی چۆنە و نە پیرەپیاوکە بە بۆنەی دیکەوە لە چۆنیەتی شوێنی ژیانی ئاگادار بوو، کوڕەخێلەش کە ناوی شەقام و شوێنی ژیانی خۆی فەرامۆش کردبوو. ڕۆژداهاتبوو، باران لێی کردبۆوە و هەتاوی کزی زەردەڵە تۆزە تینێکی‌دەخستە سەر لەشی ئادەمیزاد، دوکتۆر گوتی نازانم ئەگەر بێتوو بڕێکی‌دیکەی گەرم کا چمان بە سەر دێت و ژیانمان چۆن تێپەڕ دەبێ، لەهەموو لایەک خەریکە زبڵ و زاڵ وەسەر یەک دەگەڕێ و دەگەنێ،کەلاکی ئادەمیزاد و جانەوەر لێرولەوێ هەرد و بۆی هەڵگرتووە،خراپترین شت بۆ ئێستا ئەوەیە ئێمە هیچ رایەڵە و ڕێکخراوەیەکمان نیە،لام وایە هەر ساختومان و شەقام و گەڕەکێک دەبێ بۆخۆی‌ڕێکخراوەیەکی هەبێ، خێزانی گوتی دەوڵەتێک، ڕێکخراوێک، لەشی‌ئادەمیزادیش رایەڵەیەکی ڕێک‌وپێکی هەیە، هەتا رایەڵەکەی‌لێک‌هەڵنەپساوە لەش زیندووە، مەرگ تەنیا ئاکامی تێک‌چوونی ئەوڕێکخراوەیە، دەی باشە، کۆمەڵی کوێران بۆ درێژەی ژیان چلۆن دەتوانێ‌خۆی تەیار و ڕێک‌وپێک کات، بە دامەزراندنی تەکووز و ڕێک‌وپێکی‌نێوخۆی، ڕێکخستن و ڕێک‌وپێکی یانی وەدەس هێنانەوەی سۆمای چاو،ڕەنگە تۆ ڕاست بکەی، ئەو کوێرییە تەنیا مەرگ و چارەڕەشی بۆ ئێمەکردۆتە دیاری، چاوەکانی منیش وەک مەتەبەکەی تۆ کەلکیان نەبوو،کچەی چاویلکەیی گوتی ئێمە لە خێر و بەرەکەتی چاوی

ئێوەوە ئێستاش‌هەر ماوین، ئەگەر منیش کوێر بام دیسانیش هەر زیندوو بووین، دنیاپڕە لە کوێر، بە بڕوای من هەمووومان خەریکە دەمرین، تەنیا باس لە سەردرەنگ و زوویە، دوکتۆر گوتی لە مردنا هەمیشە باس لە سەر درەنگ وزوو بووە، بەڵام مردنێک لەوە ناخۆشتر نیە کە مرۆڤ بە هۆی کوێریی‌بمرێ، نەخۆشیی، خۆلێک‌دان، ڕووداو و کارەساتی جۆراوجۆر دەبنەهۆی مەرگی ئێمە و ئێستاش کوێری دەبێتە هۆی مردنی ئێمە، مەبەستم‌ئەوەیە کە کوێری و شێرپەنجە، کوێری و ئازارەباریکە، کوێری و ئیدز،کوێری و ڕاوەستانی دڵ وێکڕا دەبنە هۆی نەمانی ئێمە، ڕەنگە نەخۆشیی‌هەموو کەس لەگەڵ یەکتر جیاوازی هەبێ، بەڵام هۆی سەرەکی مەرگی‌ئێمە کوێرییە، هاوسەری چاوپزیشک گوتی خۆ ئێمە نەمر نین، کەس لەدەس مردن ڕزگاری نابێ، بەڵام دەکرێ کوێر نەبین، دوکتۆر گوتی ئاخرچلۆن، خۆ ئەو کوێرییە مەبەستێکی بەرچاو و ڕاستەقینەیە، خێزانی‌گوتی نازانم، کچەی چاویلکەیی گوتی منیش نازانم.

کردنەوەی دەرگا پاڵ پێوەنان و تێوەنووسانی نەدەویست، زۆر بەهاسانی کرایەوە، کلیلەکەی وێڕای دەستە کلیلەکەی دوکتۆر بوو کە کاتێ‌هاتن و بۆ قەرەنتینەیان بردن لە ماڵەوە بەجێ‌مابوو. ژنەکەی گوتی ئەوەژووری چاوەڕوانییە، کچە گوتی ئەو دیوەی منی لێ‌بووم، خەون وخەیاڵ نەبڕاوەتەوە، بەڵام نازانم کامەیانە، داخوا هەر ئەو خەیاڵەیە کەئەو ڕۆژە بەر لە کوێر بوون لە خەونمدا دەمبینی کە کوێر دەبم یا خەونی‌کوێریی بێ‌بڕانەوەی ئەو کاتەیە کە لەبەر نەخۆشیی چاوم بەرەو ئێرەدەهاتم، ئەو نەخۆشییەی مەترسیی کوێر بوونی بە دواوە نەبووە،هاوسەری چاوپزیشک گوتی قەرەنتینە خەون و خەیاڵ نەبوو، کوژرانی‌پیاوەش هەرواتر، دوکتۆر گوتی بمبە بۆ وەتاغی موعایەنە، خۆشم‌دەتوانم بچم، بەڵام تۆ بمبە، دەرگای ژوورەکە کرابوویەوە. ژنە گوتی‌ژوورەکە ژێر و ژوور کراوە، کاغەز لێرولەوێ پرش و بڵاون، داخڵەی‌پەروەندەکانیشیان دەرهێناوە، بێ‌گومان کاری کاربەدەستانی‌وەزارتخانەیە کە بۆ پشکنین وەختیان بە فیڕۆ نەداوە، ڕەنگە وا بێ‌،ئامراز و کەرەستەکان چی، وا دیارە دەستیان لێ‌نەدراوە، دوکتۆر گوتی‌لانی کەم ئەوەش هەر باشە، دەستی بۆ پێشەوە کوتا و بەرەو پێش‌هەنگاوی نا، دەستێکی بە سەر ئامراز و ئامێر و کەل و پەل و مێزەکەیاکێشا، پاشان ڕووی قسەی کردە کچەی چاویلکەیی و گوتی دەزانم‌کاتێک دەڵێی لە خەون و خەیاڵدا دەژی مەبەستت چیە. لەپشت مێزە تەپو تۆزاوییەکەی دانیشت و دەستی لە سەر دادا و پاشان وەک ئەوەی‌کەسێکی لە ڕووبەڕووی دانیشتبێ بە بزەیەکی تاڵ و گاڵتاوییەوە گوتی،نا دوکتۆر گیان،

زۆر بەداخم، دەردی ئێوە جارێ بێ دەرمانە، گوێ بگرەئامۆژگارێکت بکەم، هەمیشە ئەو پەندە کۆنەت لە یاد بێ، ئەگەر لە سەرسەبران بی لە سەر خێرانی. خێزانی گوتی برینمان مەکولێنەوە. داوای‌لێبووردنتان لێدەکەم، لەو شوێنە گەلێ موعجیزە رووی داوە، ئێستا لەهێز و دەسەلاتی سێحراوی من ئاسەوار و بەڵگەیەک بە دەستەوەنەماوە، هەموویان بردوون، خێزانی گوتی تەنیا موعجیزەی ئێمە ئەوەیەکە زیندوو بین و ئەو ژیانە نەبەگەیەی کە دەڵێی کوێرە و نازانێ بەرەوکوێ دەچێ بگەیەنینە سبەی، رەنگە هەر وا بێ وەک گوتم، رەنگەبەڕاستی نەزانێ ئامانجی کوێیە، ئاقڵ و هۆشی داوە بە ئێمە و خۆشی بەدەس ئێمە ئەسپاردووە و ئێمەش ئاوامان بە سەر هێناوە کە دیارە،کچەی چاویلکەیی گوتی جۆرێک قسە دەکەی کە دەڵێی تۆش کوێری،منیش جۆرێک کوێرم، کوێری ئێوە منیشی کوێر کردووە، رەنگە ئەگەرتاقمێکی پتر چاویان دیتبای منیش باشترم دیبایە، دوکتۆر گوتی وەکووئەو شایەدە دەچی کە بە شوێن دادگایەکدا دەگەڕێ کە کەسێکی نەدیار ونەناسراو بە دوویدا ناردووە هەتا سەبارەت بە مەبەستێکی نادیارشایەدی بدا، هاوسەری چاوپزیشک گوتی ئەوەڵین شایەدی من ئەوەیەکە ئێستا ئاخری زەمانە، بۆگەن ولاتی هەڵگرتووە، نەخۆشیی قوولەدەکەن، ئاو نیە، خواردن گەنیوە و وەسەر ژارگەڕاوە، کچەی چاویلکەیی‌گوتی دووهەمین شایەدیت چیە، وەرن چاوان هەڵێنین، دوکتۆر گوتی‌ناتوانین، ئاخر ئێمە کوێرین، چەندە جوانیان گوتووە کە کوێرتر لەهەموو کەس کەسێ بوو کە نەیدەویست ببینێ، کچەی چاویلکەیی گوتی‌بەلام من دەمهەوێ ببینم، دوکتۆر گوتی جا خۆ ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی‌کە ببینی، تەنیا فەرقەکەی ئەوەیە کە ئێدی لە هەموان کوێرتر نابی،لێی‌گەڕێ، ئێستا وا باشترە بڕۆین، ئێرە ئێدی شتێکی وای لێنیە بەکەلکی دیتن بشێ. لە سەر رێگای ماڵی کچەی چاویلکەیی بە مەیدانێکی‌گەورەدا تێپەڕین کە پۆل پۆل کوێر راوەستابوون و گوێیان بۆ وتاری‌چەند کوێری تر شل کردبوو، لە یەکەم نیگادا هیچ‌کام لەم تاقمانە وەک‌کوێر نەهاتنە بەرچاو، وتاردەران بە گەرمی روویان بەرەو گوێدێران‌وەردەسووڕاند و بیسەران بە وردی گوێیان شل دەکرد. وتاردەران‌باسی هاتنی ئاخری زەمان و رزگار بوون لە رێگای پەشیمانیی و تۆبەیان بە دیتنی رۆژی حەوتەم، بە هاتنە خوارەوەی فریشتان، بە وێک‌کەوتنی ئەستێران، بە کووژانەوەی خۆر، بە رووحی رەگەزیی، بە جگەگورگ، بە رۆنی بەور، بە تایبەتمەندی خوێندنەوەی نیشانەکان، بەراوێچکەی با، بە بەرامەی دڵبزوێنی مانگ، بە رقەوەنی تاریکایی، بەهێزی جندۆکە گرتن، بە خوێندنەوەی نیشانەکانی سەر پانێیان، بەچوارمێخە کێشانی سوورە گوڵ، بە زەروو لێ گرتن، بە خوێنی

پشیلەی‌ڕەش، بە خەونی نسیّ، بە تووڕەیی دەریاکان، بە مەنتیقی مرۆڤ‌خۆری،بە یەختەکرانی بیّ ئێش و ژان، بە دروشمەکانی یەزدانیی، بە کوێری خۆویست، بە بیر و رای کوور، قوپاو، ئاسۆیی، ئەستوونی، لار، لە سەریەک، پرش و بڵاو، تیژتێپەڕ، بە لاواز بوونی پەردەی گویّ، بە مردنی‌وشان و بە چی و چییان دەکرد. هاوسەری چاوپزیشک گوتی لێرە کەس‌باسی ڕێکخستن و ڕێکخراو ناکا، دوکتۆر گوتی ڕەنگە لە مەیدانێکی‌دیکەدا باسی بکەن. درێژەیان بە ڕێگای خۆیان دا. کەمێک کە چوونە پێش‌خێزانی دوکتۆر گوتی وەک گەڵاڕێزانی پاییز کەلاک کەوتوونە سەر یەک،دوکتۆر وەبیری هێنایەوە کە خەریکە هێزمان لە بەردا نەمێنیّ، زەمان‌دەبڕێتەوە، ئاو تەواو بووە، نەخۆشیی قوولە دەکا، خواردن گەنیوە و تۆپیشتر باست کردن، کچەی چاویلکەیی گوتی بە چی‌ڕا بزانم کە دایک وبابم لە نێو ئەو جەنازانەدا نین و بە پەنایاندا تێدەپەڕم و نایانبینم، ژنی‌دوکتۆر گوتی تێپەڕین بە پەنا مردووانـدا و نەدیتنیان داب و نەریتی کۆنی‌ئێمەیە.

گەڕەکی ماڵی کچەی چاویلکەیی چۆلتر لە هەموو دەمێک دەهاتەبەرچاو. لە بەر دەرگاوە مەیتی ژنیّ کەوتبوو. جیّ قەپ و چڕنووکی‌داعبای گەڕۆڵ شڕیان کردبوو، چاک بوو سەگی ئەسرین‌لێسەوە ئەمرۆلەگەڵیان نەهاتبوو، ئەگینا ناچار بوون نەهێڵن مەیتە ونجرونجر کات. هاوسەری دوکتۆر گوتی مەیتی جیرانی قاتی یەکەمە، شووەکەی پرسی کیّ، کوا، ئا لەو ئاستەیە، جیرانی قاتی یەکەم، دەتوانن بۆنی هەست‌پیّ‌بکەن، کچەی چاویلکەیی گوتی ژنەی چارەڕەش، بۆچی ناچار بووەبێتە شەقام، خۆ قەت لە ماڵ دەرنەدەکەوت، دوکتۆر گوتی ڕەنگە هەستی‌بە مردنی کردبیّ، ڕەنگە ترسابیّ بە تەنیّ لە ژوورەوەدا بیّ و برزیّ. ئێستا ناتوانین بچینە ژوورەوە، کلیلم پیّ نیە، دوکتۆر گوتی بەڵکوو دایک‌و باوکت گەڕابنەوە و لە ماڵیّ چاوەڕێت بن، من کە بڕوا ناکەم،هاوسەری چاوپزیشک گوتی هەقتە باوەڕ نەکەی، کلیلەکان ئەوەتان. دەستە کلیلێک لە چەنگی قرژ هەڵاتووی پیرێژنا بە تیشکی هەتاوی‌نیوەڕۆ دەدرەوشانەوە و خۆیان دەنواند. کچە گوتی بەڵکوو ئی خۆی‌بن، بڕوا ناکەم، پێم وا نیە وەختێک زانیبێتی دەمریّ لەخۆوە کلیلەکانی‌هێنابیّ، بەڵام ئەگەر کلیلەکانی بۆیە هێنابیّ هەتا من بتوانم بچمەوە ماڵ‌خۆ دەبوو بزانیّ منیش کوێرم و نایانبینم، ئێمە نازانین کاتێک تەمای‌گرتووە دەستە کلیلەکان بێنیّ چ فکرێک لە سەری داوە، ڕەنگە لای وابووبێت کە تۆ چاک بوویەوە، ڕەنگە گومانی کەوتبێتە سەر شتێکی‌نائاسایی، وەکوو ڕێچکە بەستنی ئێمە لە سەر پلیکانان، یان ڕەنگە رایەڵو پۆی لیّ‌شێوابیّ و شێت بووبیّ، بەڵام هەرچۆنێک بیّ

ویستوویەتی کلیلەکان بگاتە دەستی تۆ و هەر پێی ناوەتە دەر گیانی دەرچووە. ژنی دوکتۆر داهاتەوە و کلیلەکانی هەڵگرتەوە و لە دەستی کچەی چاویلکەیی نا و پرسی دەی ئێستا چ بکەین، هەر لێرە بەجێی هێڵین، دوکتۆر گوتی خۆناکرێ لە خەیابان بینێژین، چیمان بەدەستەوە نیە قەبری پێ هەڵکەنین،باخچۆڵەی پشت ماڵان چۆنە، زۆر باشە بەڵام کە وا بێ دەبێ بیبەینەقاتی دووهەم و پاشان بە پلیکانەکانی پشتەوەدا بیبەینەوە خوار، ئەوەتەنیا ڕێگایە، کچەی چاویلکەیی گوتی جا ئێمە ئەوەمان لە دەس دێت ودەتوانین، مەبەست توانین و نەتوانین نیە، مەبەست ئەوەیە داخوا دەکرێ جەنازەی ئەو ژنە بەڕەڵڵا کەین، دوکتۆر گوتی نا، ناکرێ، کە وایە دەبێ هێزێک بدەینە بەرخۆمان. هەر ئەم کارەشیان کرد، بەڵام هەڵکێشانی مەیتەکە بە پلیکاناندا کارێکی یەگجار دژوار بوو، هەڵبەت نەک لە بەرئەوەی قورس بوو، نا دەتگوت پەلە پووشە، بە تایبەتی کە سەگ و پشیلەشتێکی وایان پێوە نەهێشتبوو، بەڵکوو لە بەر ئەوەی مەیتەکەی رەق هەڵاتبوو، کاتی بادانەوە لە سەر پێگوڕکان تووشی کۆسپ دەهاتن،ناچار بوون لەم چەند پلیکانانە چەند جارێک وچان بدەن. دەنگە دەنگ وبۆگەنی کەلاک هیچ کامیان نەیانتوانی جیرانەکان بکێشنە دەر، کچەی چاویلکەیی گوتی هەر وەک دەمزانی دایک و بابم لێرە نین. کاتێک سەرەنجام گەیشتنە بەر دەرگا هێزیان لێ بڕابوو، بەڵام دیسانیش ناچاربوون بچنە پشتەوەی ساختومانەکە و بە پلیکاناندا شۆڕ بنەوە، هەرچۆنێک بێ لەوێڕا بە یارمەتی پیاوچاکان سەرەوخوار بوون، بارەکەیان سووکتر ببوو، خوارەکە و پێچکەی پلیکانان خۆشتر بوو، تەنیا دەبووووریا بن مەیتەکەیان لە دەستی هەڵنەخلیسکێ، بێتوو لە دەستیان رەهابووبا تازە هەپروون بە هەپروون دەبوو، بێجگە لەوەی کە دەردی دوایمردن زۆر بە ژانترە. باخچۆڵە ببوو بە لێڕەوارێکی زەنوێری تێک چڕژاو،گیا و گوڵ و فریزوو و بژارەوار چیمکوت راسابوون و بارانەی ئەوجارئەوەندەی تری جوان کردبوون، ئەو کەروێشکانەی هەزارە و دوولا وهەڵبەز دابەزیان دەکرد کەیفیان بە تفاقی تازە گوڵی دەکرد و مریشکیش کە لە سەردەمی زۆر تاڵ و تووندا دەتوانن هەڵکەن هەر گارە گاریاندەهات. وێکڕا لە سەر حەرزی پان ببوونەوە و پشوو سوار دەهاژان،مەیتی پیرێژن تاقەتی لێبڕیبوون و ئەویش لە پەنایان ماندوویی دەحەساندەوە، ژنی دوکتۆر هەر چاوی بە سەرێوە بوو و کەروێشک ومریشکی لێ دەردەکرد، کەروێشکەکان زیت و وریا رادەمان و سەری کەپۆیان هەڵدەقرچاند، بەڵام مامرەکان بە دندووکی تیژەوە ئامادەی پەلامار بوون. هاوسەری چاوپزیشک گوتی بەر لە رۆیشتن لە یادیبووە دەرگای کۆختەی کەروێشکان بکاتەوە، نەیویستووە کە لە برسان بمرن، دوکتۆر گوتی ژیان لەگەڵ

ئادەمیزادان دژوار نیە، لێ حاڵیبوونیان دژوارە. کچەی چاویلکەیی قولێکی گیا هەڵکەند و دەستی پیسی پێ خاوێن کردەوە، خەتای خۆی بوو، شوێنێکی ئەستەمی مەیتەکەی گرتبوو، بێتوو کوێر بی رووداوی وا دێتە پێش. دوکتۆر گوتی پاچێک،پێمەڕەیەک، شتێکمان دەوێ، لێرەدایە کە دەتوانین ببینین گەڕانەوەیڕاستەقینەی هەتا هەتایی تەنیا تایبەتی واژەکانە، وشەکان دێنەوە و بەبۆنەیەک دووپات دەبنەوە، ئەگەر لەبیرمان بێ جارێک بۆ دزەی گۆرینیئوتۆمبیل لە سەر زمان رەخسان و ئێستا بۆ ئەو پیرێژنەی کلیلەکانیهێناوەتەوە، کاتێک ژێر گڵ کران کەس فەرقیان ناکا، مەگین، کەسێک بەوردی لە سەریان بدوێ. خێزانی چاوپزیشک لە ماڵی کچەی چاویلکەییوەژوور کەوتبوو هەتا مەلافەیەکی خاوێن بێنێ، دەبوو قوماشێکی برێکخاوێن هەڵبژێرێ، کاتێک گەڕایەوە خوار مامرەکان چووبوونە زگ‌تەرمەکە، بەلام کەرۆیشکەکان لە گیای تازە دەلەوەڕان. هاوسەریچاوپزیشک تەرمەکەی لە قوماشەکەوە پێچا و بە شوێن پاچ وپێمەڕیەکدا رۆیی. لە هەماری باخچەکەدا چاوی پێیان روون بۆوە. گوتیجا ئەو کارە لە ئەستۆی من، زەوی تەڕە و هەڵکەندنی هاسانە، ئێوەبحەسێنەوە. لەبەر رەگ و پنجی داران شوێنێکی هێندێک رووتەنیهەڵبژارد، بەلام وا نەزانن کە کارێکی سووک و هاسان بوو، دار و بارتایبەتمەندی خۆیان هەیە و دەزانن چۆن لە جێی نەرمان رەگاژۆ بکەن وخۆیان لە تیخی تیژی تەور بپارێزن. دوکتۆر و خێزانی و کچەیچاویلکەیی هیچیان نەیانزانیبوو کە تاقمێک کوێر لە پێش هەیوانیماڵەکان کۆ بوونەوە، چونکە یەکیان سەرقاڵ بوو و دووەکەی تریش‌چاویان کەلکی نەبوو، هەڵبەت زۆریش نەبوون، وێدەچێ زرم و کوتیقەبر هەڵکەندن سەرنجی راکێشابن، تەنانەت زەوی نەرمانیش دەنگێکیهەیە، نابێ لە بیرمان بچێ کە هەمیشە لە ژێر زەویدا خڕکە بەردێک هەیەکە بە دەنگی بەرز وڵامی زەبری وەشاو دەداتەوە. تاقمێک ژن و پیاوچەشنی تاپۆ بە نەرمی لە پێش هەیوانەکان جوولانەوە، رەنگەتارماییەکیش بن کە لەبەر ئەوەی زۆر بەپرسیار بوون لە رێورەسمیبە خاک ئەسپاردنا بەشداریان دەکرد، هەتا نێژرانی خۆیان بێتەوە یاد. پاش تەواو بوونی قەبرەکە ژنی دوکتۆر سەرەنجام وەبەر چاوی هاتن،بەژنی پڕ ژان و برکی راست کردەوە و دەستی هەڵێنا و ئارەقینێوچاوانی ئەسترێ. دوایە لەخۆوە تووشی هەڵگڕان هات و بێ بیرکردنەوە رووی قسەی کردە ئەو کوێرانە و تەواوی دنیا و بە دەنگیبەرز هاواری کرد، سەرلەنوێ هەڵدەستێتەوە، سرنج بدەن کە نەیگوتسەرلەنوێ ژیان دەس پێدەکاتەوە، ئەو مەبەستە گرینگییەکی ئەوتۆشینەبوو، ئەگەرچی فەرهەنگی وشان هەر بۆیە نووسراوە کە بیسەلمێنێ،دڵنیامان کاتەوە

یـا پێشـنیار بکـا کـە ئـەم دووە لـە هـەموو بارێکـەوەهاومانان. کوێرەکـان لـە ترسـان خزانـەوە ژوورەکانیـــان، لـــە مانـــای ئەوقســـانە حاڵـــی نـــەدەبوون، هـــەر وەهـــا چـــاوەڕوانی وەهـــا غەیبزانییەکنەبوون، دیار بوو بۆ بیستنی وتارە سێحراوییەکان نەچووبوونەمەیدانەکە، تەنیا دوو شت کەم بوو کە ئەم وتارانەی پێ تەواو بێ، سەریتاجیلۆکە و خۆکوژیی دووپشک. دوکتـۆر پرسی بۆچی گوتت سەرلەنوێروحی دێتەوەبەر، لەگەڵ کێ دەدوای، لەگەڵ چەند کوێران کە هاتبوونەپێش هەیوانی ماڵەکان، لەپڕ وام بـە سـەرهات و لام وایـە بـازرەم کـردوون،دەی باشـە بۆچی ئەو قسەیەت کرد، نازانم، هەر ئەوەی بە مێشکمدا هاتکاوێژم کردەوە، رەنگە جارێکی دیکە ئەگەر رێمان بکەوێتەوە ئەوگۆڕەپانەی وتاری لێدەدرا تۆش دەچی و موعیزە بۆ خەڵک دەکەی،بەڵێ، وتارێک لە بابەت ددانی کەروێشک و دنـدووکی مریشکەوەپێشـکەش دەکـەم، ئێستا وەرە یاریدەم، وەرە ئێرە، باشە دەی لاقەکانیبگرە، منیش لێرەوە هەڵیدێنم، وریا بە خلۆر نـەبێوە نێـو گۆڕەکـە، زۆرباشـە، ئـاوا باشـە، وردە وردە دایهێڵـە خـوار، دەی زیـاتر، زیـاتر، لـە ترسیمریشکان قەبرەکەم تۆزێک قوولتر هەڵـکەندووە، وەختێـک پـێپرکـەیلـێبکـەن خـودا دەزانێ چەندەی هەڵدەدڕنەوە، زۆر باشە. بە پێمەڕە گڵیوەسەر کرد و زۆر بە جـوانی شـێلای و کۆگڵی لە سەر هەڵنەدا و تەواورێکی زەوی کردەوە، دەتگـوت لـەوەتی هەیـە کـاری هـەر ئەوە بووە. پاشانچڵێکی سوورەگوڵ چنی و لە سەر گۆڕەکەی دانا، کچەی چاویلکەییگـوتی بڵێی گیانی بێتەوەبەر، ژنی دوکتۆر گوتی نا، ئەو نا، ئەوانەی کەهێشتا زینـدوون زیـاتر پێویسـتە گیانێکیان بێتەوە بەر و ناتوانن، دوکتۆرگوتی ئێمە هەر لە ئێستاوە بە مـردوو حیسـابین، خێـزانی وڵامی دایەوەبەڵام ئێمە زیندووین. پاچ و پێمەڕەکەی بردەوە جێی خۆی، چـاوێکی بەکـەلێن و قوژبنی حەوشەدا گێڕا هەتا دڵـنیا بـێ کـە هـەموو شـتێکرێـکوپێکـە، لـە خـۆی پرسـی کـام رێکوپێکی و وڵامی دایـەوە، ئـەورێکوپێکییـەی هەڵـدەگرێ مـردوو لـە نێـو مـردوان بـن و زیندوو لە نێوزینـدوان، مـامر و کەرۆیشـک هـەم خـۆراک دەخـۆن و هـەمیش دەبنـە خـوردو خۆراک. کچەی چاویلکەیی گوتی پێمخۆشە نیشانەیەکی بچووک بۆدایک و بابم دابنێم، تەنیا دەمهەوێ کە بزانن زیندووم، دوکتۆر گوتینامهـەوێ ناهومێـدت کـەم، بـەڵام دەبـێ لـە پێشـدا ماڵــێ بدۆزنــەوە کــە زۆرئەســتەمە، ئــەوەت لــە بــیر بــێ ئەگــەر ئێمــەش رێنوێنمــان نەبایــە ماڵەکەماننەدەدیتەوە، ئێوە راست دەکەن، تەنانەت نازانم کە هـەتا ئێسـتا مـردوون یازینـدوون، بەڵام بێتوو نیشانەیەکیان بۆ بەجێ نەهێڵم، دڵـم ناحەسێتەوە ووەک ئـەوە وایـە بـە هیـوای خـودا بەڕەڵڵام کردبن. هاوسەری چاوپزیشکگوتی باشـە چ نیشـانەیەکیان بـۆ دابنـێین، کچـە گـوتی

نیشـانەیەکی کـە وەبەردەسـت بـێ و بناسـرێتەوە، زۆر حـەیف کـە هـیچ شـتێکی رابـردووم بەلاوەنـەماوە، ژنی دوکتـۆر تێـیهەڵـڕوانی، کچـە لـە سـەر یەکـەمین پلیکـانی دەربازبوونـەوە دانیشتبوو، شل و شەویق دەستی لە سەر ئەژنۆیان رۆنابوو،نیگەرانیی لە سەر روخساری جـوان و دڵڕفێنی شـەپۆلی دەدا، پرچـیپەرێشـانی کەوتبوونـە سەرشـانی، لەپـڕ گـوتی دەزانم دەبـێ چ نیشانەیەکدانێی. بە پڕتاو لە پلیکانان سەرەولێژ بوو، خێرا خۆی بە ماڵـەکەیانا کـردو لـەڕێوە بـە دەزووو مقەستەوە گەڕایەوە، کچەی چاویلکەیی کە هەستیبە کرتـە کـرتی مقەسـت و بـڕانی پرچی کرد، بە دڵـەڕاوکەوە، گـوتی ئـەوە چدەکـەی، هاوسـەری چاوپزیشـک گـوتی ئەگـەر دایک و باوکت بگەڕێنەوە وقولێک موو بدۆزنەوە کە بـە دەسگیرەوە هەڵواسـراوە پێـتوایـە جگە لەکچەکەیان دەکەونە بیری کێ، کچە گوتی دەتهەوێ وەگریانم بخەی،هێشتا قسـەکەی تەواو دەرنەبڕیبوو کە سەری وەسەر ئەژنۆی کرد و لەبەرامبەر خەم و پەژارە و هەستی بـزواوی دەروونیدا خۆی پێڕانەگیرا،پاشـان بـێ ئـەوەی بزانـێ کامـە هەسـتی دەروونیـی بـەرەو ئێـرەی کێشاوە،تێگەیشت کە خەریکە بۆ پیرێژنی نهۆمی یەکەمیش دەگری، هەر ئەورمووزنە قرژنـەی کە گۆشتی کاڵی دەخوارد، هەر ئـەو کەسـەی بـە دەسـتیویشـک و رەق و بـێگیـانی کلیلـی ماڵەکەی بۆ هێنابۆوە. ئەودەم هاوسەریچاوپزیشک گوتی ئای لەو دەور و زەمانە، خـۆ هـەموو شتێک پێچەوانەبۆتەوە، ئـەو شـتەی هەمیشـە سـەرچاوەی مـەرگ بـوو بۆتـە سـەرچاوەیژیـان، دوکتـۆر گـوتی دەسـت و دەسـەڵاتی وا هـەن کـە کـاری سـەیر وسـەمەرە و گەورەتریشـیان پێدەکرێ، خێزانی گوتی پێداویستی چەکێکیبەهێزە، خۆشەویستم ئێستا ئیدی تەنینی فەلسـەفە و خـەیاڵات و سـیحر وجـادوو بەسـە، وەرن دەس بدەینـە دەسـتی یـەکتر و ژیـان رابـوێرین. کچەیچاویلکەیی خۆی چەپکە قژەکەی بە دەسگیرەوە گـرێ دا، پرسـی بلـێیدایـک و بـابم تووشی بن، ژنی دوکتۆر گوتی دەسگیرە وەکوو دەستیماڵـەوە وایـە کـە بـەرەو پـێش درێـژ کرابێ، بە کورتی سەفەر و دیدارەکەیانئاوا کۆتایی پێهێنا.

ئەو شەوە دیسانیش بە پەیڕەوی رابردوو نۆرەی کتێب خوێندنەوەبوو، چ رێگایـەکی تریـان بۆ رابواردن و سەرقاڵ بوون پێشک نەدەهات،بۆ وێنە مخابن کە دوکتـۆر نەیـدەزانی ویۆڵـۆن لـێبـدا، دەنـا بەڕاسـتی لـەمنهـۆمی پێنجـەوە گوێتـان لـە هـەوای خـۆش دەبـوو، ئـەو کـات جیرانەچرووکەکانیان دەیانگوت یان خۆشیی لە ژێر چنگی داون یا لەبێشەرمییان پێیان وایە بـە پێکەنین و گاڵتە کردن بە چارەڕەشی خەڵکدەتوانن خۆیان لە چارەڕەشی رزگار کـەن. ئێسـتا جگە لە کەلام دەنگێکیتر نایەتە گوێ و ئەوانەش، بـە تایبـەتی وشـەکانی کتێـب بـە پـارێزەوە

دەبنەراویژ، تەنانەت ئەگەر شک و گومان یەکێک لە جیرانەکان بەرەو پشتدەرگای ئێرە راکێشێ، شتێکی لە ورتەورت واوەتر گوێ لێنابێ،ورتەورتی کەسێ کە دەتوانێ بڕانەوەی لە دوا نەبێ، چون کتێبەکانی ئەمدنیایە لە سەر یەک هەر وەک سەبارەت بە کائینات دەدوێن بێ سنوورن. بەتلێکی شەو رابرد کە کتێب خوێندنەوە کۆتایی پێهات، پیرەپیاو گوتی کارمان بۆتە گوێ راگرتن لەم کەسەی کتێب دەخوێنێتەوە، کچەی‌چاویلکەیی گوتی من ناڕازی نیم، دەتوانم هەتا هەتایە لێرە بمێنمەوە،منیش ناڕازی نیم، مەبەستم ئەمە بوو کە تەنیا بە کەلکی ئەو کارە دێین،یانی دانیشین و گوێ بۆ کەسێ راگرین کە بەسەرهاتی ئادەمیزادانی‌رابردوومان بۆ بخوێنێتەوە، دەبێ لە بەختەوەری خۆمان شاد بین کەهێشتاش جووتێکمان چاوی ساغ لەگەڵە، ئاخرین چاوی روون و گەشی‌دنیا، ئەگەر بێتوو رۆژێک ئەو چاوانەش کوێراییان دابێ، یانی ئەومەبەستەی قەت پێم‌خۆش نیە هەر بیریشی لێبکەمەوە، ئەو دەم ئەمداوەی ئێمەی لە ئینسانییەت گرێدابوو دەپسێ، کچەی چاویلکەیی گوتی‌من هەتا ئەو جێیەی دەتوانم دەستم لە هومێد بەرنادەم، هومێدی‌دۆزینەوەی دایک و بابم، هومێدی گەڕانەوەی دایکی ئەو کوڕەبچکۆلانەیە، وا دیارە لە بیرت چوو باسی ئومێدێک بکەی کە هەموومان‌پێیەوە زیندووین، چ هومێدێک، ئومێدی گەڕانەوەی سۆمایی چاوان، خۆهەڵاوەسین بەم هومێدانەوە کارێکی بێهوودە و شێتانەیە، بەڕاستی من‌دەتوانم بڵێم کە تەنیا بەم ئاوات و ئارەزووانەوە زیندووم، چۆن، یانی‌ئەگەر ئومێدی چاک بوونەوەم نەبوایە حاڵم شڕ بوو، باسی ئەوەمان‌کرد، تۆ وێنەیەکی تر بێنەوە، وێنەی دیکە ناهێنمەوە، بۆچی، چونکەشتەکە سرنجی تۆ راناکێشێ، لە کوێوە دەزانی، چما تۆ چەندە من‌دەناسی کە لات وایە چم پێ‌خۆشە و چم پێ‌ناخۆشە، تووڕە مەبە،نامهەوێ ئازارت بدەم، پیاو هەموو وەک یەک وان، وا دەزانن چونکە لەکۆشی ژنێ بەربوونەوە بە هەموو سوڕ و ترێکی ژنان دەزانن، من زۆرکەم لە بابەت ژنانەوە دەزانم، لە بابەت تۆشەوە هەر هیچ نازانم، بەڵام بباسی پیاوان بکەین، بە پێ‌ودانی ئەمڕۆ ئێستا من پیر و یەک چاو وکوێرم، هیچی دیکەت دژ بە خۆت پێ شک نایە بیانڵێی، ئەوەندەم پێ شک‌دێ هەر بە خەیاڵیش بە لایاندا ناچی، ئادەمیزاد هەتا پیرتر دەبێ دەتوانێ‌ناو و نیتکەی ناحەزتر لە خۆی هەڵبدا، من کە جحێڵم هەر لە ئێستاوەپەروەندەم رەش و تاریکە، تۆ هێشتا کارێکی دزێوت نەکردووە، لەکوێوەدەزانی، خۆ تۆ هەتا ئێستا لەگەڵ منا نەژیاوی، من تا ئێستا لەگەڵ تۆنەژیاوم، بۆچی بەو راوێژە قسەکەی خۆم لە پارسەنگم دەنێیەوە، بە چراوێژێک، هەر ئەو راوێژە، من تەنیا وتم تا ئێستا لەگەڵ تۆ نەژیاوم، دەی‌دەی، خۆت لاڕێ مەکە، هەدا دە، هەدا

نادەم، دەمهەوێ بزانم، کە وایە بابگەڕێینەوە سەر ئومێد و ئارەزۆکان، زۆر باشە، ئەمەی نەمدەویست‌باسی بکەم هەر ئەوە بوو، چ بوو، ئاخرین تاوانی من لە سەر لیستەی‌ژیانم، تکایە روونتر بدوێ، من هەتەڵۆکە و مەتەڵۆکە نازانم، ئەم ئومێدەشێتانەیەی کە هەرگیز چاومان ساخ نەبێتەوە، بۆچی، هەتا هەر ئاوادرێژە بە ژیان بدەین، مەبەستت هەموو خەڵکە یا تەنیا خۆم و خۆت،لێم‌گەڕێ با بەردی لە سەر دانێم، ئەگەر پیاوێک بوایەی وەکوو پیاوانی‌دیکە دەکرا خۆ لە ولام هەتلە بکەی، بەلام تۆ خۆت گوتت پیرەپیاوی وئەگەر عومری درێژ خاوەنی مانایەک بێ، پیرەپیاوەکان نابێ خۆ لەراستەقینە ببوێرن، کە وایە ولامم بدەوە، تەنیا من و تۆ، دەی بۆچی‌دەتهەوی هاوژیانم بی، دەتهەوێ بەلای هەموانەوە باسی بکەم، ئێمەدزێو و چەپەڵترین ژیانمان تێپەڕ کردووە، چما دەتهەوێ چ بلێی کە لەوەپیستر بێ، زۆر باشە، ئەگەر هەر پێداگری دەیلێم، راستێکەی ئەوەیە من‌شێت و شەیدا و ئەویندارى ئێوەم ئەی خاتوونی بەرێز، دەی باشەدەربڕینی هەستی ئەوین ئەوەندە دژوار بوو، ئادەمیزاد کە دەگاتەتەمەنی من لە گاڵتە پێ‌کران دەترسێ، تۆ بۆ گاڵتە پێ‌کردن نابی، باشە بالێی‌گەڕێین، تکایە دەس هەڵگرە، دەس هەڵناگرم و ناهێڵم تۆش واز بێنی،شتێکی بێ‌تام، بە زۆری لە زمانت دەرکێشام و ئێستا، ئێستا نۆرەی منەکە قسە بکەم، قسەیەکی وا مەکە پاشان پەشیمان بییەوە، لیستە و سیایی‌ئاکارت لە یاد بێ، بێتوو ئەورۆ درۆ نەکەم قەی ناکا سبەی پەشیمان‌بمەوە، تکایە دەس هەڵگرە، تۆ دەتهەوێ هاوژیانم بی و منیش ئەو شتەم‌پێ‌خۆشە، بە تەواوی لە سەری داوی، لێرە بەولاوە وەکوو ژن و مێردان‌پێکەوە دەبین و ئەگەر بە ناچاری لە دۆستەکانیشمان هەڵبڕاین دیسانیش‌هەر لە یەک جیا نابینەوە، بێ‌گومان دوو کوێر لە کوێرێک باشتر دەبینن،ئەوە شێتییە، تۆ منت خۆش‌ناوێ، کام ئەوین و خۆشەویستی، قەت‌ئەویندارى کەس نەبووم، تەنیا لەگەڵ پیاوان جووت بووم. کە وایە لەگەڵمن هاودەنگی، نەخێر نەوەڵلا، باسی یەک روویی و راستیخوازیت کرد،جا ئەگەر حەقیقەتی هەیە بڵێ هەر بەڕاستی خۆشم دەوێی، ئەوەندەم‌خۆش دەویی کە حازرم هاوژیانت بم، ئەوەش یەکەم جارە لە ژیانمدابەرەو رووی کەسێک قسەی ئاوا دەکەم، ئەگەر لە پێشدا منـــــــــــــــــت لـــــــــــــــــە شـــــــــــــــــوێنێک
دیتبایە، ئەم قسەت بە منیش نەدەگوت، منێکی پیر، سەر سپی و وەریو،چاوێن لە چاو و پرووش، راستە ئەگەر ئەو دەم بوایە وام نەدەگوت،بەلام هەل و مەرجی ئێستا ئەوەی هەڵدەگرێ و من وا دەڵێم، دەی باشەبزانین سبەی دەڵێی چی، بەتاقیم دەکەیەوە، کچێ

دایکت چاک، بابت چاک‌من کێم تۆ بەتاقی کەمەوە، ژیـان هـەر چـۆن بـێ و هـەر تەمایـەکی بیگریێئەوەیە، هەر لە ئێستاوە ژیان تەمای خۆی گرتووە.

ئەو قسانەیان بەرەو رووی یەکتر دەکرد، چاویان لە سەر یـەک‌نەدەتررووکانـد، جـار و بـارە روومەتیان گوڵی دەکرد و خوێنی تێدەزا،چونکە یەکیان قسەیەکی درکاندبوو کە هـەر دوو لا خوازیاری بوون،سەلماندیان کە ژیان ئەو رێگایەی بـۆ دیـاری کـردوون و دەبـێ لـە پەنایـەکتر بژین، کچەی چاویلکەیی دەستی هێنانە پێش بۆ ئەوەی تەنیابکەونە نێو پەنجەی پیاوەکە، نـەک ئەوەی بخوازێ بچێ بۆ شوێنێ،دەستی گەیشتە پەنجەی پیرەپیاو، پیرە بـە ئـارامی کێشـایە لای خۆی وئاوا لە پاڵ یەکتر ئۆقرەیان گرت، دیارە ئەوە یەکەم جار نەبوو، بەڵام ئەوکەڕەت باسـی زەماوەند و دەسگیرانەتی لە گۆڕێدا بوو. کەس متەقی‌نەکرد، هیچ کەس پیرۆزبایی لێ‌نەکردن، کـەس داوای بەختـەوەری‌ئەبـەدی بـۆ نـەکردن، راسـتییەکەی ئێسـتا وەخـتی جێـژن و بـەزم و رەزمنـەبوو و کاتێـک تـەماکان وەک ئـەم بابەتـە وەهـا قـورس و پتـەو بـن، تەنانـەت،جێی سەرسوڕمان نیە ئەگەر کەسێک لای وا بێ بۆ ئەم شێوە کردار وئاکارە بێ‌گومان ئینسـان دەبـێ کوێر بێ، کە وایە بێ‌دەنگی باشـترین بـەزمو رەزم و شـادمانییە. بـەڵام هاوسـەری چاوپزیشـک جـێوبـانێکی تـەخت وخـۆش و لـەباری لـە سەرسـەرا سـاز کـرد و کورێژگـەی خێلـی بردەئەوێندەری و پێی گوت لەوە بەولاوە تۆ لێرە دەخەوی. بـەڵام ئـەوەی ئەوشـەوە لـە دیـوی دانیشتنا رووی دا سەرەنجام دەریخست ئەو بەیانییەی‌ئاوی بە لێشاو پاک و خاوێنی بـۆ هـەموان کردە دیاری، کامە دەستی‌نەهێنی پشتی پیرەپیاوی شۆردبوو.

کوێری

سبەی ئەو رۆژە هێشتا هەموو لە جێوباندا بوون کـە خێـزانی دوکتۆربـە مێردەکـەی گـوت ئازووخەیەکی وامان نـەماوە و دەبـێ دیسـانوەدەرکـەوین و کـڕوکاش بکـەین، خەیاڵـم وایـە ئەوڕۆ بچمەوە ژێرخانی‌فرۆشگەی گۆرین، هەڵبەت ئەگـەر کەسـێک نەیدۆزیبێتـەوە دەتـوانین بەشی‌یـەک دوو حـەوتوان خـورد و خـۆراک پاشـەکەوت کـەین، منـیش دێم و لەیـەک دوو کەسی دیکەش دەخوازم بێن، وام پێ باشە هـەر پێکـەوە بچین،ئـاوا چـاکترە و مەترسـیی گـوم بوونیش کەمترە، باشە هەتا کـەنگێ دەتـوانی‌بـاری شـەش کەسـی لـێ‌قـەوماو هەڵـگری، هـەتا ئەوەندەی هێزم لەبەردا بێ،ئەگەرچی هەق بە تۆیە و خەریکە وردە وردە ماندوو دەبم، جـاری وایەکوێرایی بە ئاوات دەخوازم هەتا لە چنگ ئەو کوێرەوەرییە زیادییەرزگاریم بێت، ئێمە فێـر

بووین تۆمان پشت و پەنا بی، ئەگەر تۆ نەبوایەی کوێرایەکی دیکەش دەکەوتە سەر کوێریمان، هەتا بتوانم ئەو بارەهەڵدەگرم، هەر ئەوەندەشم پێدەکرێ، هەر وەک ئەو گوتی ئەگەررۆژێک تێبگەین هیچ کارێکی چاک و خراپمان لە دەس نایە دەبێئەوندەمان غیرەت هەبێ کە ئەو دنیایە بەجێ هێڵین، کێ ئەو قسەیەی کرد، ئەو پیاوە بەختەوەرەی دوێنێ تووشی بووین، دڵنیام کە ئەورۆ ئەوقسەیە ناکا، هیچ شتێک وەکوو ئومێدی راستەقینە بیرورای ئادەمیزادناگۆڕێ، بەختەوەرانە ئەو هومێدی هەیە، خودا بکا هەمیشە هەر وا بێ،لە راوێژتڕا وا دیارە ئاڵۆز و پەشێوی، ئاڵۆز، جا بۆچی دەڵێی لەشتێکیان بێبەش کردووی، وا دیارە برینم دەکولێنێوە و باسیرووداوەکەی نێوان من و کچە لەو بەقوڕگیراوە دەکەی، بەڵێ، بەڵامئەوەندەت لەبیر بێ کە ئەو دەیهەویست پێکەوە جووت بین، نا، وا نیە،بیرگە فریوت دەدا، تۆ ئەوت دەویست، دڵنیای، چۆن دڵنیا نیم خۆ منکوێر نەبووم، دەی دەتوانم سوێند بخۆم، تەنیا لەگەڵ خۆت درۆ دەکەی،سەیرە کە بیرگە ئاوامان فریو بدا، ئاخر ئەو شتەی بە دڵ پێشکەشمانکەن زیاتر ئی ئێمەیە هەتا ئەوەی بە زۆرەملی بیئەستێنین، بەڵام ئیدیئەو بە دەورمدا نەهات و منیش خۆم تێنەگەیاند، ئەگەر مەیلتان لێبادەتانتوانی یارمەتی بیرگەی یەکتر بکەن، بیرگە هەر بە کەلکی ئەو کارانەدێ، تۆ بەخیلی، نا بەخیل نیم، تەنانەت ئەو شەوەش نەبووم، زگم پێتانسووتا، زگم بە خۆشم سووتا کە نەمدەتوانی یاریدەتان بدەم. دەی،وەزعی ئاو چۆنە، خراپە. لە سەر نانی بەیانی سەبارەت بە رووداوەکانیدوێشەو برێکیان جەفەنگ لێدا و بزەیان کەوتە سەر لێوان، لەبەر کوڕەبچکۆلەکە قسەکانیان دەپێچایەوە و خۆیان دەپاراست، بەڵام بێتووەبیرمان بێتەوە کە لە قەرەنتینەدا چەندی پەند و گۆڵمەز دیوە دەزانین‌کە ئەو قسە بادانەیان کارێکی بێجێ بووە. پاشان دوکتۆر و خێزانیکەوتنە رێ و ئەوجارەیان تەنیا سەگی ئەسرینلێسەوە کەوتە دوویان.

پەسا پەسا شەقامەکان پیستر دەبوون. دەتگوت لە تاریکیدا بارستاییزبڵ و زاڵ پتر دەبوو، دەتگوت لە دەرەوەڕا، لە وڵاتێکی نەناسیاوەوە کەهێشتا ژیانی ئاسایی تێدا بەردەوامە شەوانە دەهاتن و زبڵ و زاڵ وخشت و خاڵیان لێرە بەتاڵ دەکرد، بێتوو لە وڵاتی کوێران نەبووباین لەپشت ئەم تاریکییە روونەدا تارمایی ئەو داشقە و کامیۆنانەمان دەبینیکە پڕاوپڕن لە زبڵ و زاڵ، خشت و خاڵ، وردە خشت، خۆڵەمێش، رۆنیسووتاو، ئێسقان، بوتری، ورگ و ریخۆڵە، باتری بەتاڵ، توورەکەینایلوێن و هەزاران خاڵوار کاغەز، ئەوەی نایهێنن بەرماوی خورد وخۆراکە، تەنانەت تویکڵە میوەیەکیش بە تیتووش وەگیر ناکەوێ هەتازگێکی پێ نیوە تێر بین

و چاوەڕوانی ڕۆژی خۆشتر بین کە هەمیشە لەقوژبنێک خۆی حەشار داوە. هێشتا لای بەیانییە، بەڵام گەرما خەریکەتاقەتی ئادەمیزاد لە بنە بێنێ. بۆگەنی کۆما زبڵەکان بۆتە هەور و تەم،دوکتۆر گوتی هەربینا ئەوڕۆ و سبەی نەخۆشیی پەرەگر و لێوەگرولاتی تەنییەوە، کەس بە سلامەت رزگاری نابێ، چمان پێناکرێ، ژنەگوتی ئەگەر باران نابارێ خۆ تۆفان هەڵدەستێ. خۆزگە وا نەبوایە، لانیکەم باران توونیایەتی دەشکێنێ و شالاوی با بۆگەن رادەدا. سەگیئەسرینلێسەوە ناسەکنێ و بۆن بە هەموو جێیەکەوە دەکا، رادەوەستێو کۆما زبڵێک تێکوەردەدا، رەنگە شتێکی خۆشی تێدا بێ کە بۆیناذۆزرێتەوە، بێتوو تەنیا بوایە لێرە جووڵەی نەدەکرد، بەڵام ئەو ژنەیگریابوو رۆیشتووە و سەگەش بە ئەرکی خۆی دەزانێ بکەوێتە شوێنی،خوا دەزانێ کەی لستنەوەی ئەسرینی دێتەوە بەر. هات و چۆ دژوارە، لەهێندێک شەقامان، بە تایبەتی ئەوانەی سەرەولێژن بارانی بەرێژەو بۆتەسێلاو و ئوتۆمبیلەکانی بردووە و بە دار و دیوار و یەکتری داداون ودەرکە و شووشەی ماڵ و دووکانانی شکاندووە، ئێستا تەختی پیادەرێو شەقام بە وردە شووشە چێنراوە. کەلاکی پیاوێک لە نێوان دووئوتۆمبیلدا گیری کردووە و خەریکە دەرزێ. ژنی دوکتۆر سەریوەردەسووڕێنێ. سەگە نیزیکتر دەکەوێتەوە بەڵام مەرگ دەیتۆقێنێ،سەرەڕای ئەوەش دوو هەنگاوێک دەچێتە پێش، لەپڕ مووی لێ قرژ دەبن،پڕ بە گەرووی دەلوورێنێ، چارەڕەشی و گرفتی ئەم سەگە ئەوەیە زۆرلە ئادەمیزادان نیزیک بۆتەوە و چەشنی ئەوان هەست بە ژان وکوێرەوەری دەکا. بە گۆڕەپانێکا رابردن کە پۆلپۆل کوێر راوەستابوونو گوێیان بۆ قسەی کوێرەکانی تر شل کردبوو، لە یەکەم نیگادا هیچکامیان وەک کوێر نەدەهاتنە بەرچاو، وتاردەران بە گەرمە سەریان بۆلای گوێدێران وەردەسووڕاند و ئەوانیش بە وردی گوێیان هەڵخستبوو. ئەوان باسی چاکەی رایەڵ و پۆی رێکخراوە گەورەکان و خاوەنیەتیتایبەتی، بازاڕی ئازاد، ئابووریی بازاڕ، بازاڕی بوورس، ماڵیات، سوود،دەس بە سەردا گرتن، بەرهەم هێنان، دابەشین، خواردن، هەژاری وسامانداری، پەیوەندییەکان، سەرکوت و سەربزێوی، بلیتی شانس وبەخت، بەندیخانە، یاسای سزا دان، یاسای کۆمەلایەتی، رێ و شوێنیهات و چۆی ئوتۆمبیل، فەرهەنگنامە، رێنوێنی تەلیفوون، رایەڵەی داوێنپیسی، کارخانەکانی چەکسازی، هێزە چەکدارەکان، گۆڕستانەکان،پۆلیس، قاچاغ، موخەددەرات، هات و چۆی بە ئیزن و بێ ئیزن،لێکۆڵینەوە لە سەر دەرمان، قومار، مزەی قەشە و کفن و گۆڕ،دادپەروەری، وام، حیزبە سیاسییەکان، هەڵبژاردن، پاڕلمان، دوەڵەتان،بیروڕای کووڕ، قوپاو، ئاسۆیی، ئەستوونی، لار، لە

سەر یەک، پرش وبلاو و تیژتێپەڕ، لاواز بوونی پەردەی گوێ، مردنی وشەکان و چی وچیان دەکرد. ژنی دوکتۆر بە شووەکەی گوت خەریکن باسی ڕێکوپێکیو ڕێکخستن دەکەن، دوکتۆر گوتی بەڵێ گوێم لێیە و ئیتر متەقی نەکرد. درێژەیان بە ڕێگای خۆیان دا، هاوسەری چاوپزیشک چوو هەتا چاوێک لە نەخشەی شار بکا کە لە سووچی خەیابانێک هەڵاوەسرابوو،نەخشەکە ڕێنوێنێکی چاک بوو. زۆر لە فرۆشگەکە نیزیک بووینەوە،دروست لێرە بوو کە ڕۆژێکی ڕێ لێ گۆڕاو و پەشۆکاو لە پرمەی گریانیدابوو، ئەوێ ڕۆژێ بەختەوەرانە توورەکەی شووژن ئاخنی خورد وخۆراک لە باسکیدا قورساییان دەکرد و تەنانەت زۆر سەیر کووریانداهێنابوو، لە بەر چارەڕەشی و لێقەوماوی پەنای بۆ سەگێک بردبوو کەدڵنوایی کرد و ئەسرینەکانی لستەوە، هەر ئەو سەگە ئێستا لێرەیە و لەمسەگەلەی وا خەریکن زۆر نیزیک دەبنەوە دمڕێنێ و کەڵپیان لێ گر دەکا. دەڵێی پێیان دەڵێ ئێوە ناتوانن هەڵمفریوێنن، خێرا بڕۆن و ئاوڕمەدەنەوە. جارێک بۆ لای چەپ و جارێک بۆ لای ڕاست و پاشاندەرگای فرۆشگە. بەڵێ ئێرەیە، خۆیەتی، بەڵام هیچ بوونەوەرێک هات وچۆی پێداناکا، ئەو خەڵکەی وەک مێرووولە ڕێچکە دەبەستن و دێن ودەڕۆن و لە فرۆشگەدا خول دەخۆن و روح وەبەر ئێرە دێنن هەرئاسەواریشیان نەماوە. ژنی دوکتۆر لە شتێکی ناخۆشتر دەترسا و بەمێردەکەی گوت زۆر درەنگ هاتووین، هیچ نەماوە، بۆچی وا دەڵێی،ئاخر کەس نایە و ناچێ، ڕەنگە هێشتاش حەمباری ژێرخانننەدیترابێتەوە، منیش تەنیا هومێدم ئەوەیە. لە وەختی ئەم قسانەدادروست بەرەو رووی فرۆشگەکە ڕاوەستابوون. سێ کوێر لە پەنایانوێستابوون، هەر وەک چاوەڕوانی درەوشانەوەی چرای سەوزیڕێنوێن بن. هاوسەری چاوپزیشک سرنجی نەکەوتە سەر روخساریانکە جۆرێک سەرسوڕمان و پەشۆکاوی و ترسێکی نادیار شەپۆلی تێدادەدا، ژنە نەیدیت کە یەکیان زاری داپچڕی هەتا قسەیەک بکا بەڵام هەرلەڕێوە وێکینایەوە و شانی هەڵاویشت، گریمان ئەوەیە کابرا کوێرە لەدڵی خۆیدا گوتبێتی هێندەی پێناچێ کە هەموو شتێک روون دەبێتەوە. دوکتۆر و خێزانی کە لە بەرینایی شەقامەکە دەپەڕینەوە بیروڕایدووهەم کابرای کوێریان نەبیست، بۆچی ئەو ژنە گوتی نابینێ، یانی چینابینێ کەس هات و چۆ بکا، سێهەم کابرای کوێر گوتی زمان ئاواراهاتووە، ماوەیەک پێش کە هەڵەنگووتم، پێت گوتم چاوت لەبەر پێیخۆت بێ، ئێمە هێشتا خوو و خدەی دیتنمان هەر پێماوە، یەکەم کوێرگوتی ئەی خوایە هەزاران جار ئەم قسەیەم بیستووە.

شەبەقی رۆژ تەواو سەراسەری فرۆشگەی روون کردبـۆوە. کـەم وزۆر تـەواوی قەفـەزە و تاقەکان سەرەونخوون کرابوون، جگە لە زبڵ وزاڵ چی تـر نـەمابوو، خێـزانی دوکتـۆر گـوتی سەیرە، راستە ئازووخەیەک‌نەماوە، بەڵام بۆچی کەس لێرانـە وەبـەر چـاو نایـە. دوکتـۆر گـوتی راست‌دەکەی، زۆر سەیرە، سـەگەکە بـە ئـارامی دەیمڕانـد، دیسـانەوە مـووی لـێ‌قـرژ ببـوون. هاوسەری چاوپزیشک گوتی لێرە بۆگەنێکی ناخۆش دێ،شـووەکەی گـوتی هـەموو جێیـەک هەر وایە، ئەو بۆگەنە نیە، بـۆنێکی‌دیکەیـە، بـۆ رزیـو دێ، بـێ‌گومـان تـەرمێک لـە سـووچێک کەوتووە، من کەهیچ نابینم، کە وایە خەیاڵ هەڵیگرتووی. سەگە لووراندی. دوکتۆر گوتی‌ئـەو سـەگە بـۆ وا دەکـا، بـۆنێکی کـردووە، دەی ئێسـتا چ بکـەین، راوسـتەبزانم، بێتـوو تـەرم بێـت جێیەکی باشی بـۆ چـاک دەکـەین، تـازە ئیـدی لـەمردوو ناترسـین، بـۆ مـن هاسـانترە چونکـە تەرمـەکانیان نـابینم. بـەرەودەرگای ژێرخـان بـزووتن. سـەگ بـە دوایانـەوە بـوو، بـەڵام جارجارڕادەوەستا و سڵەی دەکرد، دەیمڕاند و پاشان بەپێی ئەرکی سەرشانی‌دەکەوتە رێ. کـە خێزانی دوکتۆر دەرگای کردەوە بۆگەنەکە زیاترشەپۆلی دایەوە، مێردەکەی گـوتی ئـای لـەو بۆگەنە، خەریکە جەرگ و دڵم‌بێتەدەر، تۆ هەر لێـرە راوەسـتە، زوو دێمـەوە. ژنـە لـە رێ‌ڕەودا بەرەو پێش‌چوو، هەتا زیاتر تێڕادەچوو تاریکایی پتـر باڵـی دەکیشـا و سـەگە وەکوئـەوەی بـە زۆری رایکێشن بە دوایا دەڕۆیی. بۆگـەن پـۆنگی خواردبـۆوە. لـەنێوەی رێیـەدا رشـایەوە، کـە هێڵنجی دەدا بە خۆی گوت باشە لێـرە چرووی داوە، پاشـان ئـەو فکـرە ئەوەنـدە لـە مێشـکیدا خـولی دا هـەتا گەیشـتەدەرگای ژێرخـان. رشـانەوە سـەرەگێژەی پـێ‌گرتبـوو، هـەر بۆیـە سرنجی‌نەکەوتە سەر ئەو تیزماڵکە نوورەی لە خوارەوەڕا بەرەو ژوور دەهات،لە پـەنا دەرگـا و ئاسانسۆری باریدا چەند گڕی بچووک پرتە پرتیان‌دەکرد. جارێکی تر رشانەوە دڵ و دەروونی تێک‌هەڵدا، وا دەهـاژا و لـەتاوان خـۆی دێنـا و دەبـرد کـە سـرنجی سـەگەی راکێشـا. سـەگ بەرزلووراندی، لوورەیەکی دوور و درێژ و بـێ‌بڕانـەوە و پـڕ داخ و دەرد، گلـە وگازندەیـەکی کە چەشنی دوایین هاواری مردۆکانی ژێرخان لەسەرسەراوە دەنگی دایـەوە. دوکتـۆر دەنگـی قلـپ بوونـەوە و هێڵـنج وکۆخـەی بیسـت، بـە هـەموو دەمایـە خـۆی هـەڵات، هەڵـەنگووت و کەوت،هەستایەوە و دیسانەوە کەوتەوە، سەرەنجام خێزانی گرتە ئامێز وپرسـی چ رووی داوە، ژنە بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی لێرەم بەرە دەر،تکایە لێـرەم بـەرە دەر، بـۆ یەکـەم جـار پـاش پەرەگرتنی نەخۆشیی کوێری‌خێزانی گرتە ژێـر بـاڵ و بـردی، بـەڵام نەیـدەزانی بـۆ کـوێ، بـۆ شوێنێک کەلەم دەرکانـە دوور کەونـەوە، دوور لـەم گرانـەی کـە نەیـدەبینین. هـەر کـەوەدەر

کەوتن ژنەکەی خۆی پێڕانەگیرا و بە بانگ و سەلا لە پڕمەی گریانی دا، خەریک بوو سەری بە هەنیسکانەوە هەڵقەندرێ، فرمێسکی‌وشک نەدەبوونەوە مەگین بە تێپەڕ بوونی زەمان و شەکەتی، هەر بۆیەسەگە لێی نیزیک نەکەوتەوە، تەنیا بە شوێن دەستێکا گەڕا کەبیلێسێتەوە.

دوکتۆر دیسانەوە پرسی چ رووی داوە، چت دیت،هاوسەری بە هەنیسک دان و پچڕپچڕ گوتی تێکرا مردوون، کێ مردووە،ئەوان، ئیتر لەبەر گریان و شیوەن چی دیکەی قسە بۆ نەهات. بە سەرخۆتا زاڵ بە، مەچۆقە، هەر وەخت هاتیوە سەرخۆ بیگێڕەوە. ئیستێک‌دواتر خێزانی گوتی هەموویان مردوون، مێردەکەی پرسی چت دیت،دەرگای کردەوە، نا، تەنیا لە لێوار و دەور و بەری دەرکەکان چەند گڕی‌بچووکم دیت کە وردە وردە سەمایان دەکرد و یەکتریان بەر نەدەدا،رەنگە هەڵمەدووکی ئەو تەرمانە بێ کە ئاوریان گرتووە، دەبێ چ رووی‌دابێ، رەنگە ژێرخانەکەیان دۆزیبێتەوە و بە شوێن خورد و خۆراکدارامالیان بردبێ، چاکم لە بیرە کە ئینسان زۆر زوو لە سەر پلیکانەکان‌هەڵدەخلیسکا و دەکەوت، هەر ئەوەندە بەسە یەکێک نخوون بێتەوە، جائەو دەم وێکڕا بە دوویا خلۆر دەبنەوە، رەنگە قەت نەگەیشتبنە شوێنی‌دڵخواز، ئەگەریش پێیان تێنابێ بە هۆی گیرانی پلیکانان نەیانتوانیوەبگەڕێنەوە، بەلام خۆ تۆ گوتت دەرگا گاڵە درابوو، رەنگە کوێرەکانی دیکەدەرگایان داخستبێ و ژێرخانیان کردبێتە گۆڕستانێکی گەورە،هەمووشی تاوانی منە، وەختێک بە توورەکەی پڕەوە بە وێدا تێپەڕیم‌بێ‌گومان شکیان کردووە و بە شوێن دۆزینەوەی ئازووخەدا چوون، بەمانایەکی دی ئەوەی دەیخۆین لە دمی خەڵکمان بڕیوەتەوە و ئەگەرساف لە ساف تالانیان کەین خوێنیان لە ئەستۆمانە، بە کورتی‌هەموومان کوژەرین. وەڵلا چاکت دڵخۆشیی دامەوە، هیچ نامهەوێ باری‌تاوانێکی نادیار بخەیە سەر ئەستۆی خۆت، بارگرانی تێر کردنی شەش‌کەسی تەوەزەل لە سەرومالت زیادە. ئاخر کوا من بێ تۆ هەر وا زیندوودەمام، زیندوو دەمای هەتاکوو تووشی پێنج کەسەکە دەبوویەوە، بەلام‌باشە هەتا کوێم دەر دەبرد. هێندەی دیکە نابا، کاتێک پاشەکەوتمان تەواوبوو دەبێ بۆ دۆزینەوەی خورد و خۆراک تەواوی جێیەک ژێر و ژووکەین و دەس بەرین بۆ بەری داران و تووشی هەر جانەوەرێک بووین‌بیخۆین، هەڵبەت ئەگەر هەتا ئەودەم پشیلە و سەگ ونجڕونجڕمان‌نەکەن. سەگە لە جێی خۆی چەقی و هیچی نەکرد، ئەو مەبەستەپەیوەندییەکی پێیەوە نەبوو، لە خۆڕا نەبوو کە ببوو بە سەگی‌ئەسرین‌لێسەوە.

ژنەی دوکتۆر زۆر بە زەحمەت دەیتوانی پێ هەڵێنێتەوە. ئەو زەبرەی‌دیبووی هێزی لێ‌بڕیبوو. بە حاڵی شڕ و مێردی کوێرەوە وەختێک‌فرۆشگەیان بەجێ‌دەهێشت دیار نەبوو

کامیان یارمەتی ئەوی تری دەدا. تەوژمی تیشکی تاو گێژی کردبوو، بە خۆی گوت رەنگە موقرایی دابێ،بەلام نەترسا، تەنیا هەناوی لەبەردا نەبوو. نە دمەونخوون بوو و نە لەهۆشەوە چوو. پێویست بوو راکشێ، چاوێک لە سەر یەک دابنێ و بەرێک‌وپێکی پشوو بکێشێ، دڵنیا بو ئەگەر تۆزێک بحەسێتەوە حاڵی‌دێتەوە سەرەخۆ، دەبوو بێتەوە سەرخۆ، توورەکەکانی هەر وا بەتاڵبوون. پێی خۆش نەبوو لە سەر زبڵ و زاڵی شەقام درێژ بێ، تەنانەت‌نەیدەویست مەیتەکەشی بەرنەوە ژووری فرۆشگە. چاوێکی بە دەور وپشتی خۆیا گێڕا. لەو لای شەقامەوە، تۆزێک سەرتر، کلیسایەک دیاربوو. بێ‌شک وەک هەموو شوێنێک پڕ بوو لە خەڵک، بەلام بۆ حەسانەوەجێیەکی باش بوو، لانی کەم هەمیشە وا بووە. بە مێردەکەی گوت دەبێ‌بڕێک بێمەوە سەرخۆ، بمبە بۆ ئەوێ، ئەوێ کوێیە، بەداخەوەم، راوەستەبا پێت بڵێم، ئەوێ کوێیە، ئەوێ کلیسایە، بێتوو هێندێک راکشێم دێمەوەسەرخۆ، کە وایە با بڕۆین. دەبوو شەش پلیکان بۆ دەرکی کلیسا وەسەرکەون، ژنە زۆر بە کوێرەوەری سەرکەوت، بەتایبەت کە دەبوومێردەکەشی رێنوێنی کردبا. دەرگای کلیسا لە سەر گازەرای پشت‌بوون، ئەوە بۆخۆی یارمەتییەکی گەورە بوو، چونکە بەڕاستی هێزیان لەبەردا نەمابوو. سەگە لە بەر دەرگاوە سڵەی کرد. ئەگەرچی سەگەل لەچەند مانگی رابردوودا بە مەیلی خۆیان کوێیان پێ‌خۆش بوایە رووبان‌تێدەکرد بەلام هەر لە کۆنەوە لە مێشکی هێندێکیاندا نەچوونە ژووری‌کلیسا وەکوو گەلالەیەکی داڕێژراو چەسپیبوو. خزمەتی وەفادارانەی ئەم‌سەگانە، ئەو کاتەی برینی پڕ چڵک و کێمی پیاوچاکانیان دەلستەوە،ئەویش بەر لەوەی بەم ناو و پلە و پایەوە بناسرێن، کردەیەک بوو لەرووی دڵسۆزی و خۆ بەخت کردن، چونکە دەزانین کە هەر سواڵکەرێک‌با زۆریشی برین لە سەر لەش و هەروەها لە سەر رووحی بێ کەبێ‌گومان زمانی سەگانی ناگاتێیە، ناتوانێ ببێتە پیاوچاک. بەلام سەگ‌وێرای و پێی نایە جەغزی شوێنێکی پیرۆز، دەرگا ئاوەلا بوو، دەرکەوانی‌لێ‌نەبوو، بەلام گرینگترین بەڵگە وەژوور کەوتنی ژنێ بوو کە گریابوو،نازانم چلۆن ئاوا شەل و کوت پێ دەگوێزێتەوە، بە بێ‌وازی تەنیا دووقسان بە مێردەکەی دەڵێ، بمگرە، کلیسا لیپاولیپە و هەر جمەی دێ، بستەجێیەکیش وەگیر ناکەوێ، بە سەر راستی دەکرێ بڵێین تەنانەت‌بەردێکیش وەگیر ناکەوێ کە ئینسان سەری وێبکا، سەگی‌ئەسرین‌لێسەوە جارێکی تر سەلماندی کە رۆژی خۆی بە کەلک دێ، بەچەق و لوور و یەک دوو راماڵی بێ رق و قین جێیەکی بۆ هاوسەری‌چاوپزیشک کردەوە هەتا یەک‌تەختە لێی بکەوێ و چاو لە سەر یەک‌دابنێ و بێهۆش بێ. شووەکەی نەزمی دەستی گرت، رەگی دەستی‌رێک‌وپێک و

بێ‌هیز هەڵیداویشت، پاشان هەوڵی دا هەڵیئەستێنێ، نەدەبوودرێژ بێ، دەبێ لەڕێوە خوێن بگاتە مێشکی، هات و چۆی خوێن لەمێشکیدا دەبێ زۆر بێ، باشتر وایە دەستی وەبەر پەشتی بدا و داینیشێنێ‌و سەری لە نێوگەڵی بگرێ و پاشان بیداتە دەس سروشت و وزەی کێشەر. سەرەنجام چەند جار هەوڵی سەر نەکەوتوانە توانی‌هەڵیئەستێنێ و داینیشێنێ. دوای تاوێک ژنی دوکتۆر هەناسەیەکی‌هەڵکێشا، مچوڕکێکی پێداهات و وردە وردە وەهۆش هاتەوە. مێردەکەی گوتی ئێستا هەستە، سەرت هەر دانەوێنە، بەڵام ئەو هاتبۆوە سەرخۆ وسەری لە گێژەوە نەدەهات، سەگە بەر لەوەی تخێل بێ جێگاکەی تۆزێک‌بۆ لستبۆوە و تروسکەی دەهات، ژنە بە تێڕوانینێک ئەو مەبەستەی بۆدەرکەوت. سەری بۆ لای کۆڵەکە باریک و بەرز و سەر بە کەوانەکان‌وەرسووڕاند هەتا لە سووڕ و خولی خوێنی دڵنیا بێ. پاشان گوتی حاڵم‌باشە، بەڵام دروست لەم کاتەدا بە بیریدا هات نەکا شێت بووبێ یان‌سەرەگێژە تووشی خەیاڵاتی کردبێ، ئەوەی هاتە بەرچاوی جێی باوەڕنەبوو، بە تیزماڵکە دەسرەیەکی سپی چاوەکانی مەسیحی چوارمێخەکێشراویان بەستبوو، لە پەنا ئەو دیمەنی ژنێ دەهاتە بەرچاو کە بەزەبری حەوت شیران دڵیان ئەنجنیبوو، چاوی ئەویش بە تیزماڵکەدەسرەیەکی سپی بەسترابوو، تەنیا ئەم ژن و پیاوە ئاوایان بە سەرنەهاتبوو، چاوی تەواوی وێنەکانی کلیسا بە پارچەیەک داپۆشرابوون،پەڕۆیەکی سپییان لە دەوری سەری پەیکەرەکان هاڵاندبوو، بە زەبری‌فڵچە هێڵێکی سپی ئەستووریان لە تابلو نەققاشییەکان هەڵسووبوو، ژنێک‌خەریک بوو کیژێکی فێرە خوێندن دەکرد، هەر دوو چاویان داپۆشراو،پیاوێک بە کتێبێکی ئاوەڵاوە کە منالێکی لە سەر دانیشتبوو، چاویان‌داپۆشراو، پیاوێکی دی کە تەواوی لەشی وەبەر تیران درابوو، چاوی‌داپۆشراو، پیاوێکی تر سینگ و دەست و پێی پڕ برین و چاوی داپۆشراو،یەکی دی شێرێک بە دەستەوە، هەر دوو چاویان داپۆشراو، پیاوێکی دیکەبەرخێک بە دەستەوە، هەرتکیان چاویان داپۆشراو، پیاوێکی ترهەڵۆیەکی پێ‌بوو، هەر دوو چاویان داپۆشراو، پیاوێکی دیکە نێزەیەک بەدەستەوە و لە سەر کەلاکی پیاوێکی گەوزیوی خاوەن شاخ و سم‌وێستاو، هەر دوویان چاو داپۆشراو، پیاوێکی دی تەرازوویەک بەدەستەوە، چاو داپۆشراو، پیرەپیاوێکی سەر وەریو سوێسنەیەکی سپی‌بە دەستەوە، چاو داپۆشراو، پیرەپیاوێکی تر کە خۆی هاویشتۆتە سەرشمشێرێکی رووت، چاو داپۆشراو، ژنێک و کۆترێک، هەر دوویان چاوداپۆشراو، پیاوێک و دوو قاڵاو، هەرسێک چاو داپۆشراو، تەنیا چاوی‌ژنێک دانەپۆشرابوو، چونکە چاوە لە قاپێلک دەرپەڕیوەکانی لە سەرکەشەفێکی زیو بە دەستەوە بوو. خێزانی بە

دوکتۆری گوت ئەگەر بڵێم چدەبینم باوەڕ ناکەی، چاوی تەواوی تابلۆکانی کلیسایان داپۆشیوە،سەیرە نازانم بۆچی، منیش هەرواتر، رەنگە کاری کەسێک بێ کەوەختێک زانی ئەویش هەر کوێر دەبێ ئیمانی لەرزۆک بوو، ویشدەچێ کردەی قەشەی ئەو گەڕەکە بێ، رەنگە لە دڵی خۆیدا گوتبێتی کاتێکخەڵک نەتوانن وێنەکان ببینن، ئەوانیش هەقیان نیە کوێرەکان ببینن، خۆئاخر وێنەکان نابینن، لە هەڵە دای، وێنەکان بە چاوی ئەو کەسانەیبۆیان دەڕوانن دەبینن، بەڵام ئێستا هیچ کەس لە کوێرایی بێبەش نیە،خۆ تۆ هێشتاش دەبینی، وردە وردە کەمتر دەبینم، تەنانەت ئەگەرموقرابیم رۆنەڕژێ، رۆژ بە رۆژ زیاتر کوێر دەبم، چونکە کەسێک نیە منببینێ، رەنگە قەشە چاوی نەققاشییەکانی سپی کردبێ، ئەوە تەنیابۆچوونی منە، تەنیا بۆچوونی مەنتیقی هەر ئەوەیە، تاقە بۆچوونێکە کەسەرە دەدا بە دەرد و پەژارەمان، ئەو پیاوە دێنمە بەرچاوم کە لە وڵاتیکوێرەوە دێتە ئێرە هەتا زەمانێکی کە بۆی دەگەڕێتەوە ئەویش کوێر بێ،دەرگا گاڵەدراوەکان، کلیسا چۆڵەکان و بێدەنگی دێنمە بەر زەینم،پەیکەرە و تابلۆکان دێنمە بەرچاو، ئەو دەبینم کە دڕوا و هەر جارە لەیەکیان رادەمێنێ، لە میحرابەکان وەسەر دەکەوێ و تیزماڵکە قوماشەکانگرێپووچکە دەدا هەتا نەکرێنەوە و هەڵنەخووشێن، سەرلەنۆی رەنگیسپی لە نەققاشێکان دەداتەوە هەتا ئەو شەوە سپییەی کە تێیداپەلەقاژەیانە پڕ رەنگتر کا. ئەو قەشەیەی هاتۆتە ئێرە بێگومان دزێوترینبێ حورمەتی لە درێژایی مێژوو و تەواوی ئایینەکاندا ئەنجام داوە، هەتادادپەروەرانەترین و ئینسانیترین کوفر بێنێتە سەر زمانی، ئەویش ئەوەیەکە خوا دیتنی لێناوەشێتەوە. ژنی دوکتۆر دەرفەتی وڵام دانەوەی نەهێنا،کەسێک لە پەنای وەقسە هات، ئەوە دەڵێی چی، ئێوە کێن، ژنە گوتیکوێرێک وەک ئێوە، بەڵام وا حاڵی بووم کە دەتوانی ببینی، ئەوە تەنیاشێوە دوانێکە کە بە دژواری دێتە گۆڕان، هەزارجارم ئەو قسە کردووە،باشە ئەدی ئەو قسانە لە بابەت نەقاشی و چاوی داپۆشراوەوە لە کوێڕاهاتوون، ئاخرئەوە باسێکی راستەقینەیە، باشە جا ئەگەر کوێری چۆندەزانی، ئەگەر ئێوەش ئەوکارەی من کردم کردبات دەتزانی، بڕۆدەستیان پێدابێنە، دەست بۆ کوێران چاوە، باشە جا بۆ ئەو کارەت کرد،چونکە لام وا بوو بۆ گەیشتن بەو شوێنەی ئێمەی لێین دەبێ کەسێکیدیکە کوێر بووبێ، دەی باشە ئەدی ئەو مەسەلەیەی کە قەشەی ئێرەدەبێ چاوی تابلۆکانی داپۆشیبی چۆن ساز کراوە، من زۆر چاکیدەناسم، ناکرێ قەت کاری وای کردبێ، هەرگیز ناکرێ کردەوەیئادەمیزادەکان پێشبینی بکرێ. دەبێ راوەستی، دەبێ زەمان باژوێ،ئەوەی حکوومەتمان بە سەردا دەکا زەمانە، ئەوەی لەو سەری مێز

پەڕیبردنەوەی قوماری بە دەستەوە و ملانەمان لەگەڵ دەکا زەمانە، ئێمەدەبێ هەر بە گومـانیش بێ پەڕەکانی بردنەوەی ژیان، ژینی خۆمان بێنینەبەرچاو. باسی قومار کردن لە کلیسادا گوناهـە، ئەگـەر بـاوەڕم پـێناکـەیهەسـتە و دەس بگێـڕە، سـوێند دەخـۆی کـە چـاوی نەقڤاشـێکان داپۆشراوە،پێت خۆشە سوێند بە چی بخۆم، سوێند بە چاوت بخۆ، دوو جار سـوێنددەخۆم، بـە چاوەکانی خۆم و خۆت. راست دەکەی، بەڵێ راست دەکەم. ئەوانەی لە دەور و بەریان بـوون ئەو وتوویژەیان بیست و لە دوورەوەدیارە کە پێویست بە سوێند ناکا هەتا دەنگۆ دەم بـە دەم بگەڕێ و بەسرتە سرت دەس پێبکا و خێرا تووشی ئاڵ و گۆڕ بێ، سەرەتا بەناباوەڕی و پاشان بە نیگەرانی و جارێکی تر بە ناباوەڕی، زۆر جێی داخبوو کە لە نێو ئەوانا تاقمێکی خوڕافاتی و خەیاڵپەرست هەڵکەوتبوون،بیری کوێر بـوونی وێنـەی ئینسـانە پیرۆزەکـان، بـیری ئـەوەی کـە چاوانی پڕخۆشەویستی و خەمخۆریان تەنیا لە کوێرایی خۆیان راماوە بە جارێـک تـەقی، وەک ئەوە وا بوو کە پێیان گوتبن مردووی زیندوو گەمارۆیانداون، زیقە و هەرایەک بەس بوو هـەتا قیژە و هەڵڵا و گرمە ولاتهەڵگرێ، ئەو کات ترس هەموویانی راستەوە کرد، خۆف تێکـڕای بەرەودەرگاکان رادان، ئەوەی نەدەبوو ببێ جارێکی تر خۆی نواند، لەبەرئەوەی ترس تیژتر لـە پێی بازرە بوو رادەکا، پێی راکردوو کـاتی راکـردنهەڵدەخلیسـکێ، بەتایبـەت ئەگـەر مـرۆڤ کوێر بێ شڵپ بەردەبێتەوە، ترسحوکمی لێدەکا هەستەوە، هەسـتە هەڵـێ، دەنـا وەبـەر پێیـان دەکەوی وجیق و فیقت دێتە دەر، خۆزگە توانیبای راسـتەوە بـێ، بـەڵام لـەو بگـرە وبەردەیـەدا کەسی دیکەش رایانکردووە و کەوتوون، دەبـێ زۆر خـۆڕاگربی کـە بـە دیـتنی دیمـەنی ئـەو هـەمووە ئـادەمیزادەی بـە سـەر یـەکا کـەوتوونو تێـکدەبـەزن و بـە دوای دەسـت و پێیەکـدا دەگەڕێن هەتا پێیان رزگار ودەرباز بن، وەپێکەنین نەکەوی. ئەو شەش پلیکانەی کلیسا وەکوو هەڵدێرو هەڵـەمووتی لی دێ، بـەڵام ئاخرییەکـەی هەڵـدێران دەردەسـەرێکی ئەوتۆسـاز ناکـا، کـەوتن و هەسـتانەوە ئـادەمیزاد دەزرینگێنێتـەوە و چوسـت وچـالاکی دەکـا، کـەوتن و خـۆ گرتنەوە ورەی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە، یەکەمفکرێکی بە مێشکا رادەبرێ ئەوەیە کە ئێـرە جێـی چاکـە و لـە هەڵـکەوتنیتاڵـی مەرگاویـدا ئەمـە ئـاخرین فکـرە. ئـەوەی هەمیشـە نـەگۆڕە هەلپەرەستیتاقمێکی دیاری کراوە کە بە قازانجی خۆیان دەرفەت لە چارەڕەشیخەڵک دێـنن و هـەمووش دەزانـن کـە لـە رۆژی بناوانـەوە، رەگەزاورەگـەز وپشتاوپشـت هـەر وا هـاتووە. راکردنی ئەو کەسانەی دەستیان لە روحیخۆیـان شـۆردبوو مـاڵ و سـامانی پـێ بـەجێهێشـتن، بـەڵام کاتێـک ویسـت وداخـواز بـە سـەر ترسـیاندا زاڵ بـێ بـۆی دەگەڕێنـەوە، پاشـان دەبـێ

ئەومەسەلە دژوارە چارەسەر بکرێ کە چ شتێک ئی منە و چ شتێک هی تۆ،لەپڕ تێدەگەین کە بڕە خورد و خۆراکەکمان نەماوە، ڕەنگە ئەوە فێڵ وتەڵەکەی ناجوامێرانەی ژنێک بێ کە گوتی چاوی تەواوی نەقاشییەکانداپۆشراوە، هەر بەڕاستی هێندێکان ئامادەن دەس بۆ هەموو کارێکیدزێو بەرن و بۆ ئەوەی پەنچکە نانێکی رەق لە زاری خەڵکی هەژاربڕفێنن هەزار درۆ و دەلەسە تێکدەخەنەوە. ئەو جار تاوانی سەگە بووکە ژوورەوەی بە چۆلی بینی و رۆیی هەتا هەموو ولات ژێر و ژوور بکاو پاشان پاداشتی کردەی خۆی وەرگرێتەوە، کارێکی دادپەروەرانە وسروشتی بوو، بە لێکدانەوەیەکی تر رێگای پەیدا کردنی خورد و خۆراکیبە دوکتۆر و خێزانی نیشان دا و ئەوانیش بە بێ پەشیمان بوونەوە وهەست کردن بە گوناە لەم دزییە کلیسایان بە چەند توورەکەی نیوەپڕەوە بەجێهێشت. ئەگەر تەنیا نیوەی ئەوەی فڕاندوویانە بیخۆن رازیدەبن، لە بابەت نیوەکەی دیکەوە دەڵێن نازانین خەڵک چۆن ئەو شتانەدەخوا، تەنانەت لەم لێقەومان و چارەڕەشیانەدا کە داوێنی هەمواندەگرێتەوە هەمیشە تاقمێک وەزعیان خراپترە.

گێڕانەوەی ئەم رووداوە سەیر و دەگمەنانە تەواوی ئەندامانیتاقمەکەی خستە شەمزان و سەرسوڕمانەوە، دەبێ ئەمە بزانین کەخێزانی دوکتۆر لە بەر ئەوەی وشەی بەجێورێی بۆ دەربڕینی هەستیخۆی نەدیتەوە تەنانەت نەیتوانی ترسی قورس و گرانی پشت دەرگایژێرخانی فرۆشگەکەیان بە جوانی بۆ بگێڕێتەوە. باسی چاویداپۆشراوی تابلۆکان شوێنێکی قووڵی لە سەر خەیاڵیان دانا، هەڵبەتشوێن تێکردنەکە جیاواز بوو، بۆ وێنە کوێرەپیاو و خێزانی لەرێوەئۆقرەیان لێهەڵگیرا، بە بڕوای ئەوان ئەم کردەیە بێ حورمەتییەکیدزێوی دوور لە بەخشین بوو. ئەو مەبەستە کە تەواوی مرۆڤەکان کوێربوون بەلایەکی ئاسمانیی بوو کە هیچکەس وەئەستۆی خۆی نەدەگرت،ئەو بەلایانە دەرجیان نایا، هەر بۆیە بەستنی چاوی وێنە پیرۆزەکانتاوانێکی قورسی هەرگیز نەبەخشراو بوو، جا ئەگەر کاری قەشەی گەڕەک بێ زۆر خراپتر. هەڵوێستی پیرەپیاوی چاوبێن لە چاو جیاوازبوو، دەتوانم بیهێنمە بەرچاو کە چەندە داترووسکاوی، مۆزەخانەیەکدێنمە بەر چاو کە لەودا چاوی تەواوی پەیکەرەکانیان داپۆشیوە، نەکلەبەر ئەمەی کە پەیکەرتاش کاتێک گەیوەتە چاوەکان نەیویستووەبەردەکە بتاشێ، بەڵکوو بە قەولی ئێوە چاویان بە پەرۆیەک بەستوون،دەتگوت هەر جۆرێک کوێری بەس نەبوو، سەیرە کە چاوبێنەکەی منوەها شوێنێک لە سەر بینەر دانانێ، تەنانەت جاریوایە ئادەمیزاد دەخاتەسەر خەیالان، دوایە هەم بە خۆی و

هەم بە قسەکەی پێکەنی، بەلام کچەی چاویلکەیی گوتی هیوادارە کە قەت جێیەکی ئاوا تووک لێ کراو بەخەونیش نەبینێ، کامووسەکانی خۆی لێی سەر و زیاد بوون. ئەو رۆژەهەر چی کۆنە خۆراکی مابوویان خواردیان، ئەوە باشترین شێویان بوو،ژنی دوکتۆر گوتی رۆژ بە رۆژ پەیدا کردنی خورد و خۆراک دژوارتردەبێ، رەنگە وا باش بێ لە شار دەرکەون و بڕۆنە دێ، لانی کەم ئەوەی‌لەوێندەرێ وەدەستیان دەکەوێ خاوێن و سلامەتە، رەنگە لەوێ مەڕ ومالات بەرەگێڕەوەیان بۆ نەبێ و بکرێ بدۆشرێن، کە وایە جارێ‌شیرمان دەبێ و کانیاو و چالاویش هەن، دەتوانین ئەو چێشتەی پێمان‌خۆش بێ سازی کەین، مەبەست ئەوەیە جێیەکی چاک و پەنا پەیدا کەین،پاشان هەموو بیروڕایان دەربڕی، هێندێکان شۆر و شەوقێکی زیاتریان‌نواند، بەلام لە هەموان روون بوو کە ئەم تەمایە زۆر پێویستە، کوڕەخێلە بێ ئەملا و ئەولا قبوولی کرد، رەنگە ئەم وچانەی قوتابخانەی زۆربە دلەوە نووسابێ. هەمیشە پاش خواردن خۆیان لە خەو خۆش دەکرد،هەمیشە هەر وایان دەکرد، تەنانەت لە قەرەنتینەشدا کە ئەزموون فێری کردبوون لەش بە حەسانەوە زیاتر لە بەرامبەر برسییەتیدا خۆ رادەگرێ. بەلام ئەو شەوە هیچیان نەخوارد، تەنیا پاروویەکیان خستە بەر دلی کوڕەخێلە هەتا بڕێک تێر بێ و نەمینگێنێ، ئەوانی تر دانیشتن و گوێیان‌بۆ کتێب خوێندنەوە شل کرد، لانی کەم رووحیان پاراو دەبوو و گلەییان‌نەدەکرد، کۆسپ ئەوەیە کە جاری وایە بێ‌هێزی لەش فکری ئادەمیزادئالۆز دەکا، نەک ئەوەی زەین ئۆگری نەبێ، نا، بەلام مێشک بەرەو دنیای‌نیوەخەوالوو خزی، چەشنی ئەو داعبایەی زستانەخەوی بە سەردا زالدەبێ، دنیا مالاوا، لە ئاکامدا نائاسایی نەبوو کە بیسەران ئارام ئارام‌چاویان لێک‌نا و بە چاوی رووح کەوتنە دوای هەلس و کەوت و هەورازو لێژی چیرۆک هەتا دیمەنگای پڕ ژاوە ژاوتر لە خەویان راپەڕێنێ، نەک‌تەپەی وێکنانی کتێب، ژنی دوکتۆر ئەم وردەکارییانەی دەزانی و وەرووی خۆی نەدێنا کە هەر ئێستا حەوت پاشایان بە خەو دەبینن.

بە روالەت کوێرەپیاویش لەم گێژەدا خولی دەخوارد، بەلام وانەبوو. راست بوو چاوی نووقابوون و سرنجێکی ئەوتۆی نەدەدایە چیرۆک‌وێژ،بەلام بیری چوونە لادێ و ژیانی ئەوێندەرێ خەوی لە چاوان تاراندبوو،بە بڕوای ئەو دوورکەوتنەوە لە مال هەلەیەکی گەورە بوو، ئەگەرچی‌کابرای نووسەر پیاوێکی راست و دروست بوو، باشتر وا بوو سیلەچاوێکی بە سەر مالەوە بێ و جاروبارە سەرێکی لێ‌هەلێنێ. کە وایەتەواو بەخەبەر بوو، بێتوو بەلگەیەکی تر بخوازن، ئاماژە دەکەینەدەریای شیری بەرچاوی کە رەنگە تەنیا خەو رەشی هەلگێڕێ،

بەڵامناکرێ لەمەش دڵنیا بین، چونکە ناکرێ کەسێک هەم خەوتبێ و هەمبەخەبەر بێ. کوێرەپیاو کاتێک لەپڕ تاریکایی ژێر پێلووی چاوی هەستپێ‌کرد، وەیزانی سەرەنجام شک و گومانی رەویوە، بە خۆی گوتخەوتووم، بەڵام نەخێر نەخەوتبوو، هەر وا بێ بڕانەوە دەنگی خێزانیدوکتۆری دەبیست، کوڕەخێلە کۆخی، پاشان ترسێکی قورس سواریشانی بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی دەڵێی لە کوێرییەکڕا بۆ کوێرییەکی ترخلۆر بۆتەوە و پاش کوێری سپی ئێستا نۆرەی کوێری رەشە. لە ترسانوەک مێژۆکە دەلەرزی، خێزانی پرسی چیە، چ قەوماوە و ئەویش زۆرنەفامانە بێ ئەوەی چاوان هەڵێنێ وڵامی دایەوە کوێر بووم، وەک ئەوەیباس و رووداوێکی تازە بێ، ژنەکەی بە دڵسوزی گرتییە ئامێزی،نیگەران مەبە هەمووومان کوێرین و هیچمان لەدەس نایە، دنیام بە تاریکیبینی، وامزانی خەوتووم، بەڵام نەخێر بەخەبەرم، هەر بشخەوی باشە، بخەوە و بیریشی لێ‌مەکەوە. ئەم ئامۆژگارییە گەردی خستە سەر دڵی،کابرا دڵی بتۆقی و خێزانی تەنیا پێی بڵێ بخەوە. تۆرا و ویستی وڵامێکیتاڵ بداتەوە، کە وایە چاوی هەڵێنا و دیتی. دیتی و هاواری کرد مندەبینم. هاواری یەکەم جێی باوەڕ و متمانە نەبوو، بەڵام کە بوو بە چەندجار هیچ گومانی بۆ کەس نەهێشتەوە، من دەبینم، من دەبینم، شێتانەژنەکەی لە ئامێز گرت، پاشان بەرەو خێزانی چاوپزیشک گورمی بەستو ئەمیشی گرتە ئامێزی، یەکەم جار بوو کە ئەم ژنەی دەبینی، بەڵاملەڕێوە ناسییەوە، پاشان باوەشی بە هەموان داکرد، هەڵەی نەدەکرد،ژنەکەی هاتە پشت سەری، نەیدەویست لێی دوور کەوێتەوە و هەرجارەی باوەشی بە یەکیاندا دەکرد، ئاوڕی دەدایەوە و ژنەکەیدەگرتەوە ئامێز، پاشان رووی کردە دوکتۆر و گوتی من دەبینم، مندەبینم دوکتۆر، لەمێژ بوو ناوی لێ‌هەڵنەدابوو، چاوپزیشک پرسی داخواهەموو شتێک بە روونی دەبینی، بەڵێ وەک پێشوو، یانی شوێنەواریسپیاییت لەبەر چاو نەماوە، نەخێر، تەنانەت پێم وایە باشتریش دەبینم وئەوە مەبەستێکی بەرچاوە، من قەت چاویلکەم نەدەکردە چاوم. پاشاندوکتۆر قسەیەکی بە زماندا هات کە هەموو لە بیریدا بوون بەڵامنەیانەدەوێرا بیدرکێنن، رەنگە گەیشتبینە دوایی ئەو کوێرییە، رەنگەسەرلەنوێ هەموو چاومان روون بێتەوە، ژنی دوکتۆر بە بیستنی ئەموتەیە کەوتە گریان، دەبێ کەیفی ساز بێ بەڵام دەگریا، مرۆڤ چەندەکردەوەی سەیری هەیە، هەڵبەت کە کەیفی ساز بوو، ئەی خودایە،تێگەیشتنی هاسان بوو، چونکە لەنەکاو تەواوی خۆڕاگری رووحییبنەبڕ ببوو دەگریا، وەکوو ساوایەک دەچوو، ئەم گریانە یەکەم نیشانەیهەبوونی نابەئاگای بوو. سەگی ئەسرینلێسەوە لێی هاتە پێش، هەمیشەدەزانێ کە پێویستیان پێیەتی، هەر بۆیە ژنی دوکتۆر

باوەشی پێداکردووە، ئەویش نەک لەبەر ئەوەی مێردەکەی خۆش نەوێ یان خێرخوازی هەموان نەبێ، بەڵام لەم کاتەدا هەستی تەنیایی وەهای باڵئەنگاوتبوو کە خۆی پێ ڕانەگیرا و لای وا بوو تەنیا توونیایەتی سەیری ئەو سەگەی ئەسرینەکانی دەلستەوە دەتوانێ بە سەر هەستیدا زاڵ بێ.

شادمانی ئۆخژنی خستە دڵ و دەروونی هەموو لایەک و وەک شنەی شەماڵی کوێستان تەپ و مژی دڵەڕاوکەی رادا، کچەی چاویلکەیی پرسی ئێستا چ بکەین، خۆ من دوای ئەو رووداوانە خەوم لێناکەوێ، پیرەپیاوگوتی هیچ کەس خەوی بە چاودا نایە، بە بڕوای من وا باشترە هەر لێرەرۆنیشین، بەڵام دوکتۆر وەکوو ئەوەی لە قسەکەی خۆی بە شک بێ ئێستێک تێما، پاشان درێژەی دا چاوەڕێ بین، چاوەڕوان مانەوە. گڕی چرای سێ پلیتەی نەوتی شۆق و شەبەقی لە سەر روخساریان رەخساندبوو. لە پێشدا هەموو بە هەڵپە دەدوان، دەیانویست بە وردی بزانن چ قەوماوە، داخوا تەنیا ئاڵ و گۆڕ لە چاویدا رووی دابوو یا لەمێشکیدا شتێکی هەست پێ کردبوو، پاشان وردە وردە رۆمرکان و سڕکەوتنەوە، هێندێک دواتر کوێرەپیاو بە بیریدا هات بە خێزانی بڵێ باسبەی بچینەوە ماڵی خۆمان، ژنەکەی وڵامی دایەوە بەڵام خۆ من هێشتاش کوێرم، گرینگ نیە، من دەبمە چاوساغت، تەنیا ئەو کەسانەی لەوێ بوون و بە گوێی خۆیان بیستیان دەیانتوانی تێبگەن چلۆن ئەمرستە ساکارانە بە ئیحساساتێکی جیاوازی وەکوو پارێزگاری لێ کردن،فیز و هەوا و دەسەڵاتەوە تاماو درابوونەوە. دووهەمین کەسێکی کەچاوی چاک بوونەوە و شەپۆلی رووناکی بوونە میوانی کچەی چاویلکەیی بوو، بەتڵێکی شەو چووبوو، چراکە کە خەریک بوو نەوتی لێبڕێ پتەپتی دەکرد. چاوی زەق کردبوون، دەتگوت سۆمایی لە جیاتی ئەوەی لە ژوورەوەڕا سەرهەڵداتەوە دەبوو لە دەرەوەڕا بگەڕێتەوەچاوی، لە ناکاو گوتی دەڵێی دەبینم، وا باشتر بوو بە پارێزەوە بدوێ،هەموو بابەتەکان وەک یەکتر ناچن، تەنانەت زەمانێکی دەیانگوت کوێرایی هەر نیە، تەنیا مرۆڤی کوێر هەن، کەچی ئەزموونی ژیان فێری کردین کە ئادەمیزادی کوێر هەر نین و تەنیا کوێرایی هەیە. لێرە سێ کەسمان هەیە کە دەبینن، بێتوو یەکی تر چاوی روون بێتەوە دەبنەزۆربە، بەڵام تەنانەت ئەگەر لەبەر شادیی گەڕانەوەی سۆمایی ئەوانیدی نەهێننە بەرچاو، دیسانیش ژیانیان زۆر خۆشتر دەبێ، هەڵبەت ئەودەرد و کوێرەورییەی هەتا ئەمڕۆ کێشاویانە لە جێی خۆیەتی، ئێستا ئەوژنە ببینن، چەشنی پەتێکی پساوە، وەکوو فەنەرێک وایە کە لە ژێرتەوژمی بێ بڕانەوەی بێسنوورا دەرپەڕیبێ. رەنگە هەر بۆیە بووبێ کەکچەی چاویلکەیی بەر لە هەموان ئامێزی پێداکرد، لێرەدا سەگی ئەسرینلێسەوە نەیدەزانی لە پێشدا کامیان دڵنوایی بکا،

چونکەهـەردووکیان وەک ڕێژنـە بـارانی بـەهاریان فرمێسـک هەڵـدەوەراند. دوامـین کەسـێکی باوەشی پێداگرت پیرەپیاوی چاوبێن لە چاو بوو، ئێستا نرخ وپلە و پایەی وشان دەزانین، یـەک دوو ڕۆژ پێشـتر سـەرمان لـە وتـوویـژیئـەم دووە لـە بابـەت بەسـتنی پـەیمان و بەڵـێنی ژیـانی هاوبەشـــەوە ســـوڕما وداترووســـکاین، بـــەڵام ئێســـتا هـــەل و مـــەرج گـــۆڕاوە، کچـــەی چاویلکەیی پیرەپیاوێکی بێداروبار بەرەو رووی خۆی دەبینـێ، سـەردەمی هەسـت وخـەیاڵاتی تیژتیپەڕ و هاودەنگی بەدرۆ لە ئادەی چۆلا بە سەر چووە،چرچ و لۆچ و تەپڵەسەری بێتـووک حاشا هەڵنەگرن، چاوبێنی رەش وچاوێکی کوێر لێک جیاواز نین، بە واتەیەکی تر ئەوە هەموو قسەیهەمبانەی پیرەپیاون بۆ کچەی بـەرباس. لـێم رامێنـە، مـن هـەر ئـەو پیـاوەم کـە دەتگـوت دەتهەوێ هاوبەشی ژیانی بی و کچە وڵامی داوە دەزانم، تۆئەو پیاوەی کە پێکەوە بە جـووت دەژین، لە راستیدا ئەم قسانە زۆربەنرختر لەم رستانە بوون کە خەریک بوو بێنە سەر زمان و ئـەم لەباوەش گرتنە بارتەقای ئەم وتانەن. سێیەم کەس کـە بـۆ بـەیانی ئـەو شەوەسـۆمای لـە چـاوان زایەوە چاوپزیشک بوو، ئێستا ئیدی جێگای دوو دڵینەبوو، پێویست بوو پشـوو درێـژ بـن هـەتا هەموویان چاویان چاک بێتـەوە. ئـەوجار باشـتر وایـە خۆمـان لـە لێکدانـەوەی دوور و درێـژ و سروشتیی وچاوەڕوان کراو کە پێشتر بە تێر و تەسەلی باسمان کردن بپـارێزین، ئێترچەنـد پـات کردنەوەیان تەنانەت لە بارەی کەسـایەتیە سـەرەکیەکانی ئەوبەسـەرهاتەوە پەسـند نیـە، لێـرەدا دوکتۆر ئەو پرسیارەی کە لە بیر ومێشکی هەمواندا خـولی دەخـوارد هێنایـە گـۆڕ، دەی باشـە، بڵێی لە دەرەوەچ باس بێ، لە ژوورەوەی ئەم ساختومانەی کە تییدا دەژیان وڵامێک هاتەگوێ، لە نهۆمی خوارەوە یەکێک هاتبووە سەر پێگۆڕکە و هاواری دەکردمن دەبینم، من دەبیـنم، بـە رواڵەت وا دیارە خۆر دەیهەوێ لە بانیئاسمانی شارێکی شاد و شادمانا بدرەوشێتەوە.

بەرچایی رۆژی دواتر بوو بە میوانداری. ئەوەی لە سەر مێزەکە بووهەم کـەم بـوو، هـەمیش ئیشتای ئینسانی کوێر دەکردەوە، بەڵام هەر وەکلە کاتی خۆشی و شادمانیدا دیومانە، ئـۆخژن و تین و تاو بەردڵی گـرتن وشـادی بـوو بـە باشـترین خۆراکیـان، هـیچ کـەس پرتـە و بۆڵـەی نەکرد،تەنانەت ئەوانەی هێشتاش کوێر بوون پێدەکەنین، دەتگوت ئەو چاوانەیتـازە روناکییـان تێزابوویەوە ئی خۆیان بوو. دوای بەرچایی کچەیچاویلکەیی فکرێکی بە مێشکیدا هات، ئەرێ پێتان چونە بچمەوە ماڵە خۆمو کوتە کاغەزێک لە سەر دەرگا بەجێ هێڵم و لـێی بنووسـم کـە من لێرەمهەتا ئەگەر دایک و باوکم گەڕانەوە بزانن لە کـوێ بمدۆزنـەوە، پیرەپیـاوگوتی ئیـزن بدە منیش وێڕای تۆ بێم، دەمهەوێ بزانم لە دەرەوە چ باسە،کوێرەپیاویش بە خێزانی گـوت بـا

ئێمەش وەدەر کەوین، رەنگە ئێستاکابرای نووسەریش چاوی چاک بووبنەوە و لە بیری گەڕانەوە بۆ ماڵیخۆیدا بێ، لە سەر رێیە شتێکیش بۆ خواردن پەیدا دەکەین، کچەیچاویلکەیی گوتی ئێمەش هەرواتر. ئیستێک دواتر کە تەنیا مانەوەدوکتۆر لە پەنا خێزانی دانیشت، کوڕێژگەی خێل لە سەر جێیە ویژینگیدەدا، سەگە وەرکەوت و لمبۆزی لە سەر دەستەکانی دانا، جار و بارچاوی هەڵدێنا هەتا نیشانی بدا کە وشیارە. ئەگەرچی ماڵیان زۆر لەشەقامەوە دوور بوو بەڵام لە پەنجەرەوە زەنازەنا و قریوە قریویشادی و شادمانی دەهاتە گوێ، رەنگە خەیابانەکان قەرەباڵغ بن، جار بەجار لە نێو ئاپۆرەدا یەکێک قریوەی ئەم دوو وشەیەی لە گەرووڕاهەڵدەداشت، من دەبینم، من دەبینم، ئەمانەی رووناکی کلچێوکی لەچاوی کێشابوون دەیانقریشکاند و ئەوانەی کە تازە هەستیان بە دیتندەکرد بە هەڵپە هاواریان دەهات من دەبینم، من دەبینم، ئەو داستانەی کەخەڵک تێیدا دەیانگوت من کوێر بووم، بەڕاستی هی دنیایەکی دیکەیە. کوڕەخێلە پچڕپچڕ شتێکی گوت، بێگومان خەون دەبینێ، رەنگە دایکیلە خەودا دیبی و لێی بپرسێ دەمبینی، دەمبینی، هاوسەری چاوپزیشکپرسی بلێی خەڵک چیان بە سەر هاتبێ، دوکتۆر وڵامی دایەوە رەنگەوەختێک ئەو کوڕە خەبەری بێتەوە چاوی چاک بووبنەوە، خەڵکیش هەرواتر، رەنگە هەتا ئێستا بەری چاویان روون بووبێتەوە، دۆستی چاوبێنلە چاومان دەبێ بۆ زەبرێک ئامادە بێ، بۆچی، لە بەر ئاومرواریەکەی، بەسرنجدان بەو مەبەستە کە ماوەیەکی زۆر بە سەر ئاخرین موعایەنەیداتێپەڕیوە دەبێ باری چاوی خراپتر بووبێ، کە وایە هەر کوێر دەبێ، نا،هەر کە ژیان بگەڕێتەوە سەر باری ئاسایی و هەموو شتێک سەرلەنوێوەک خۆی لێ بێتەوە لە داهاتوویەکی نیزیکدا برینکاری دەکەم، بۆچیئێمە کوێر بووین، نازانم، رەنگە رۆژێک بزانین، پێت خۆشە بزانی بڕوامچیە، بەڵێ دەی، پێم وایە ئێمە کوێر نەبووین، کوێرین، چاومان هەیەبەڵام نابینین، کۆمەڵێک کوێر کە دەتوانین ببینین، بەڵام نابینین.

خێزانی دوکتۆر هەستایە پێ و بەرەو پەنجەرە بزووت. چاوێکی بەشەقامی پڕ زبڵ و زاڵ و ئەو خەڵکەی هاواریان دەکرد و گۆرانیاندەگوت داگێڕا. پاشان سەری بەرەو ئاسمان وەرسووڕاند و هەمووشتێکی بە سپی بینی، بە خۆی گوت ئێستا نۆرەی منە. لە ترسان سەریبەردایەوە. شار هەر وا لە جێی خۆی بوو.